بەرگی دووەم

# گەڵاوەریوەکانی درەختی تەمەنم

## یاد و بیرەوەریی

## 1971 - 1981



حوسێن موحەممەد عەزیز

2018ز - 2718ك

حوسێن موحەممەد عەزیز
گەڵاوەریوەکانی درەختی تەمەنم
بەرگی دووەم/ 2018

ISBN 91- 975903-4-

گەڵاوەریوەکانی درەختی تەمەنم ( یاد و بیرەوەری )

بەرگی دووەم ( 1971 – 1981 )

چاپ: دووەم / Pdf

دوکتۆر حوسێن موحەممەد عەزیز

بابەت: یاداشت

ساڵ: 2019

کوردستان، سولەیمانی

وێنەی بەرگ: کۆمەڵێ پێشمەرگەی شۆڕشی ( 1961 )، کۆتایی ساڵی ( 1974 ) گیراوە، لە گۆڤارێکی ( ئەڵمانی )ەوە وەرگیراوە.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی ( 1037 )ی ساڵی ( 2018 )ی پێدراوە.

# ئەم ژیننامەیە پێشکەشبێ بە

ئەو دایکە بەسۆزە دڵسۆزەی، بە شیری سپی خاوێنی نێو کانیی مەمکەکانی بەخێویکردم. بە ئەو دایکە کۆڵهەڵگرە بەپەرۆشەی، لە هەموو دایکێ پتر، بە دەسمانەوە تووشی چەرمەسەری و کوێرەوەری بوو. بە ئەو دایکە خۆڕاگرە ورە بەرزەی، ژان و ئازارێکی زۆری چێشت و خۆشی لە ژیانی خۆی نەدی. بە ئەو دایکە کۆڵنەدەرە سەربەرزەی، لە ئاستی ئەو هەموو ناخۆشیی و چەرمەسەرییەدا ، سەری بۆ هیچ کەس دانەنەواند و چەڵەمەکانی ژیان پشتی پێ کوڕ نەکرد. بە ئەو دایکە بیر تیژە ژیرەی، بە وەرەی بەرزی خۆی، کۆسپ و تەگەرەکانی سەر ڕێی ژیانی تەختکرد و جەرگی تاریکایی شەوی شەقکرد، بە خاتوو ( رەحمە حەسەن )ی دایکم!




ئەو باوکە بەڕێزەی، گەورەیکردم و خوێندنی پێ تەواوکردم، تا لە ژیاندا بوو، نەیهێشت، دەس لە کەس پانکەمەوە!
ئەوەی نوێی کورد!

# نـــــــــاوەڕۆك

بەشی سێیەم



بەشی چوارەم

بەشی پێنجەم

بەشی شەشەم

بەشی حەوتەم

بەشی هەشتەم



* * *

# لەبری پێشەکی، چەن سەرنجێکی کورت!

تا ئێستە، هێندێ بیرەوەری ئاسایی نووسەران و خەباتی ڕامیاریی ڕامیارەکانی کوردم خوێندووەتەوە. نووسەرەکانیان لە زەریای ستایش و خەباتی ڕامیاریی خودی خۆیان، تێکۆشانی سەرکردە و پارتەکانیاندا نقوومبوون. لە هەمان کاتدا، کەموکووڕی خۆیان و بنەماڵەکانیان، ڕاستیی ڕووداوەکانیان لیفەپۆشکردووە! جگە لە ئەوەی هێرشێکی زۆریشیان، بۆ سەر هاوڕێ و هاوخەباتەکانی دوێنێیان کردووە و سووکایەتییەکی ناشایستەی زۆریان، بە یەکدی کردووە. ئەم جۆرە نووسین و دەربڕینانە، پێش هەموو کەسێ، لە ناو و ناوبانگی خۆیان کەمدەکاتەوە. ئینجا کارێکی زۆر خراپیش، لە شێوازی بیرکردنەوە، هەست و هۆشی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان دەکا، لە نووسیندا، فێری ڕێبازێکی دزێو و ڕەوشتێکی خراپیان دەکا. هەروەها ناسنامەی نەتەوەیی، کەلتووریی و کۆمەڵایەتیی کوردیش، لەکەداردەکا!

زۆر جێی داخە، هێندێ لە ئەو بیرەوەرییانە، کێشە و باسی تاکەکەسی، گرفتی گشتیی ڕامیاریی و نەتەوەییان تێکەڵاوکردووە، قسەی سەرزارەکیی و بازاڕییان بەکارهێناوە، لەگەڵ نووسینەکانیاندا تێهەڵکێشیانکردووە، وەک ئەوەی ئەم ڕەوشتی نووسینەیان، بە شیرەوە خواردبێ، یا بیر لە ئەوە نەکەنەوە، بۆ کێ دەنووسن و وا دەزانن، تەنیا هەر خۆیان دەیخوێننەوە! بۆیە تکتک ڕقوکینەی لێ دەتکێ، تۆڵەسەندنەوەیەکی بێ تام و بێ سنووری پێوە دیارە. ئەمەش لە ڕێزی نووسەرەکە و باوەڕەکەی کەمدەکاتەوە، دڵی نەیارەکانی خۆشدەکا!

ئەز پێم وایە، گەر هەر نووسەرێ یا هاوبیرێ بیەوێ، مێژووی دامەزراندن و خەباتی ڕامیاریی و نیشتمانیی، هەردوو پارتی نەتەوەیی (کاژیک) و (پاسۆک) بنووسێتەوە، پێش هەموو شتێ دەبێ، لە ڕقوکینە و تۆڵەسەندنەوە، هێرشکردن و تاوانبەخشینەوە، زیادەڕۆیی و خۆهەڵکێشان، پشگوێخستن و بەکەمزانینی ڕۆڵی کەسانی دیکە، ستایش و پێداهەڵدانی خۆی و خەڵکی دوورکەوێتەوە. تەنیا چی ڕاست و درووستە، هەر ئەوە بنووسێ و پەنا بۆ بەڵگەنامەکانیش بەرێ.

ئاشكرایە، مێژووی تێكۆشانی هیچ ڕێكخراوێكی پیشەیی و دیمۆكراسیی، خەباتی هیچ پارتێكی ڕامیاریی نەتەوەیی و نیشتمانیی، بە تەنیا باڵ، بە هیچ نووسەر و ڕامیارێ نانووسرێتەوە، بەڵكوو دەبێ، چەن كەسانێكی بەئاگا، شارەزا و بەئەزموون، پێكەوە ئەو كارە گرنگە بكەن، ئەگینا ئەوە مێژووی ئەو ڕێكخراو و پارتە نییە، بەڵكوو مێژووی پڕ لە شانازیی خودی خۆیەتی!

بۆیە ئەم بەرگی دووەمەی بیرەوەرییەكانم، مێژووی (كاژێك) و (پاسۆك) نییە و ئەو كارەش بە تەنیاباڵ بە من ناكرێ. چونكە لەلایەكەوە، هەر لە ڕۆژی دامەزراندنی ئەو دوو پارتەوە تا ئەوڕۆ، ئاگام لە هەموو كار و چالاكیی، خەباتی ڕامیاریی و نەتەوەییان نەبووە و نییە. لەلایەكی دیكەشەوە، باوەڕم بە ئەوە نییە، تاكەكەسێ بتوانێ، ئەو مێژووە بە دەسپاكیی و ڕاستی تۆماركا. لەبەرئەوە ئەم نووسینەی من، هەڵسەنگاندنی ڕۆڵی مێژوویی ئەو دوو پارتە نییە، بەڵكوو تەنیا هەر، بیرەوەریی تایبەتی ئەو سات و كاتانەی خۆمە، كە كارم تێدا كردوون.

لە هەمان كاتیشدا هیوادارم، خوێنەری هێژا و هاوبیرە دێرینەكانم، وەك چەمكێكی چكۆلانەی مێژووی ئەو سەردەمانەی بە كردەوە، كارم لە ئەو دوو پارتەدا كردووە و ئاگاداری زۆر شت بووم، لێم وەرگرن و پەسەندیكەن. لەبەر ئەوە نەهاتووم، هەر لە ئەو ڕۆژەی (كاژێك) و (پاسۆك) دامەزراوە تا ئەوڕۆ، باسی بیروباوەڕ، شێوازی ڕێكخستن، كار و چالاكییەكانیان بكەم، بەڵكوو وەك پێشتر ڕوونمكردەوە، تەنیا هەر هێندەی لە نێوان سالأنی (1970-1981)دا، كارم تێدا كردوون و ئاگام لە ڕووداوەكان بووە، بیرەوەرییەكانی خۆم نووسیوەتەوە. بە ئەو هیوایەی، ئەو هاوبیرانەی كارم لەگەڵ كردوون و لە ژیاندا ماون، لە نزیكەوە ئاگایان لە هێندێ یا زۆربەی ڕووداو و مێژووی، ئەو ماوەیەی تێكۆشانی ئەو دوو پارتە هەیە، ئەوی بە ڕاستی دەزانن، لێم قەبووڵكەن و كەڵكی لێ وەرگرن. ئەوانەشی بە ڕاستی نازانن، هەڵەوپەڵەكانم بۆ ڕاستكەنەوە، گەلێ قەرزاربارم دەكەن و لە ناخی دڵەوە، سوپاسی هەستی بەرزیان دەكەم.

لێرەدا دەمەوێ، دوو خاڵ ڕوونكەمەوە:

1. ئەم بەرگی دووەمەی بیرەوەرییەکانم، بەشی هەرە زۆری، لە ژیانی خەباتی ڕامیاریی، چالاکی پارتایەتیی و پێشمەرگایەتی سەردەمی شۆڕشی (11ی سێپتێمبەر دەدوێ، وەك ئەوەی باسی بنەماڵە و ژیانی تایبەتی خۆم بکا.

2. بەشێ لە گوتاری کۆتایی بەرگی یەکەمم، ئەوەی پێوەندیی بە سەرەتای کارکردنم لە (کاژێك)دا هەیە، بۆ سەرەتای دەسپێکی بەشی یەکەمی ئەم بەرگە گواستووەتەوە، تا زنجیرەی باسەکان نەپچڕێن، چونکە پێوەندییەکی زۆریان، بە یەکدییەوە هەیە.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەشدا هەر ئەوە ماوە ، زۆر بە ڕاشکاوی بڵێم: ئەوا (58) ساڵ، بەسەر دامەزراندنی (کاژێك) و (42) ساڵیش بەسەر دامەزراندنی (پاسۆك)دا تێپەڕدەبێ. (56) ساڵ بەسەر بەرپاکردنی شۆڕشی (11. 9. 1961) و (41) ساڵیش بەسەر هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێی ساڵی (1976)دا کۆتاییدێ، تەمەن و گۆڕانکاری بیر و ژیانی تایبەتی خۆم، هەر هێندە ڕێیان پێ داوم، تەنیا ماوەی (10) ساڵ، کارم لە ئەو دوو پارتەدا کردووە. بابەتەکەشم زۆر بە توندی، بە ڕەوشی ئەو سەردەمەی هەردوو شۆڕشەکە و هێزە ڕامیارییەکانەوە بەستووەتەوە.

لە ئەو ماوەیەی کاریشم لەگەڵ ئەو دوو پارتەدا کردووە، هەم وەك ئەندامێك و نەتەوەییەکی نیشتمانپەروەر، هەم کاتێ لێشیان دوورکەوتوومەتەوە، وەك هاوڕێیەکی دڵسۆز و بەئەمەك، چیم لە توانادا بووبێ، بە زیادەوە کردوومە و بە ئەرکی سەرشانی خۆشم زانیوە. بۆیە چاوەڕێی هیچ جۆرە پاداشتێ، لە هیچ کەس و لایەنێ ناکەم. هەرگیز پەشیمانیش نیم، لە ئەو سەردەمانەی نەتەوەیی بووم، لە ڕیزەکانی (کاژێك) و (پاسۆك)دا، بە دڵ و بە گیان کارمکردووە، هەرچەندە تووشی گەلێ زیانی گەورە بووم، هەڕەشەیان لێ کردووم و چەندین جاریش، سووکایەتییان پێ کردووم.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە کارکردنی نێوخۆی هەردوو پارتەکەدا، سیستەمێکی ناوەندێتی توند پێڕەوکراوە، بەڵام ئەز هەرگیز، چاوم لە هیچ جۆرە هەڵە و کارێکی خراپی، سەرکردایەتی هەر هەردوو پارت نەنووقاندووە، ئەوەی بە ڕاستم نەزانیبێ، زۆر بەڕاشکاوی ڕەتمکردووەتەوە و جێبەجێم نەکردووە، هەمیشەش ڕەخنەم، لە شێوازی کارکردن و بۆچوونەکانیان گرتووە، کەچی سزاشیان نەداوم!

لێرەدا پێویستە، لە ناخی دڵێکی خاوێنەوە، سوپاسێکی بێ کۆتایی هەموو ئەو هاوڕێ، هاوبیر، دۆستە بەڕێز و خۆشەویستانە بکەم، کە دەستی یارمەتییان بۆ درێژکردم و دەرگەی ماڵەکانیان بۆ ئاواڵەکردم، بۆئەوەی لە نزیکەوە، چاوم پێیان بکەوێ و دەمەتەقێیەکی گەرمی دۆستانە، لەسەر هێندێ بابەت بکەین، تا هێندێ بەسەرهات و ڕووداوی مێژوویی، نەتەوەیی، ڕامیاریی و کۆمەڵایەتیی یەکلاکەینەوە، وەك خۆیان چۆن بوون و ڕوویانداوە، هەر بە ئەو شێوەیەش تۆماریانکەین، بە تایبەتی ئەو بابەتە گرنگانەی، پێوەندییان بە گەشتی ژیانی دۆست و کەسەکانیانەوە هەبوو. یەزدانی مەزن دەس بە باڵیانەوە بگرێ و هەر لە خۆشیدا بن!

لەگەڵ ڕێزی بێ ئەندازەمـــدا ...

دوکتۆر حوسێن موحەممەد عەزیز

کوردستان – سولەیمانی

11. 9. 2017

# پێشەکی چاپی دووەم

بە داخێکی زۆرەوە، یەکەمین چاپی ئەم بەرهەمە، هەڵەیەکی زۆری هونەریی و زمانەوانیی تێدابوو، چونکە لە کاتی مۆنتاژدا، بە هەڵدا چووین. زۆر لە ئەوە دەچێ، ئەو بەشەی پێیدا چوویبوومەوە، ئەوەمان چاپ نەکردبێ و کۆنەکەمان چاپکردبێ. بەڵام هاوڕێیەکی خۆشەویستی فەیسبووک کاک (سەلاح سالار)، بەرهەمەکەی خوێندبووەوە، هەرچەندە دەسخۆشانەی لێ کردبووم، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەڵەکانیش ئاگاداریکردبوومەوە. لەبەرئەوە پڕ بە دڵ سوپاسیدەکەم و زۆر داوای لێبووردنیش، لە خوێنەرانی هێژای گەلەکەم دەکەم و هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخوازم.

بۆئەوەی خوێنەری کورد، لە دەرەوەی وڵات بیبینێ و کەڵکی لێ وەرگرێ، چەن هاوڕێیەکی بەڕێز داوایان لێ کردم، بەرهەمەکانم لە لاپەڕەکانی ئینتەرنێتدا بڵاوکەمەوە. بۆیە منیش بە ڕاستم زانی، وەک سەرەتایەک بۆ دووەمین جار، هەردوو بەرگی بیرەوەرییەکانم چاپکەمەوە و لە ئینتەرنێتدا بڵاویانکەمەوە، تا خوێنەری کورد، بە ئاسانی و بێ ئەرک دەسیکەوێ.

لە ئەم چاپە نوێیەدا، جگە لە ئەوەی، هەموو هەڵەکانم ڕاستکردووەتەوە، چەندین وێنە و کۆپلەی نوێشم، لە بەشە جیاجیاکاندا بۆ زیادکردووە و هێندەی دیکە، بابەتەکەم دەوڵەمەندترکردووە.

لەگەڵ ڕێزی نووسەردا

دوکتۆر حوسێن موحەممەد عەزیز

کوردستان – سولەیمانی

2018 .9 .11

## سەرەتای پێوەندی من و (کاژێك)

(عەلی توفیقی حەسەنە قووچ)، ئێستە بە دوکتور (سەربەست ئاغا) ناسراوە، ساڵی (1963)، هاوڕێی ڕۆژانی خوێندنی ناوەندیی (شۆڕش)م بوو. دوای ڕێککەوتننامەکەی (11. 3. 1970)ش، لە (پارتی)دا لێپرسراوی بووم. ئەو کاتانەی پێکەوەبووین، خۆی لێ نزیکدەکردمەوە، زۆر خەریکی دەمەتەقێی نەتەوەیی و رامیاری بووین. زۆربەی کات، باسی جوگرافیای (کوردستان)، مێژوو و کێشەی کوردمان دەکرد، دەمەتەقێمان لەسەر بیری نەتەوەیی و مارکسیزم دەکرد و بەراوردمان لە نێواندا دەکردن. هێندێ جاریش، پەرتووکەکانی (ساتیع ئەلحەسەری) و دوکتور (عەبدوللا عەبدولدایم)ی بۆ دەهێنام و دەیگوت: ئەمانە بخوێنەرەوە، زۆر کەڵکیان لێ وەردەگری. دواتریش پێکەوە نێوەرۆکی پەرتووکەکانمان بۆ یەکدی باسدەکرد و دەمەتەقێمان لەسەردەکرد.



منیش هەموو جارێ دەمگوت: کورد پێویستی بە چەن بیریارێکی وا بلیمەت و شارەزا هەیە، تا بتوانن، تیۆرییەکی ڕێکوپێک بۆ کورد دابڕێژن و پارتێکی نەتەوەیی شۆڕشگێڕی، خاوەن دیسیپلینیش دامەزرێنن. ئەویش پێدەکەنی و دەیگوت: زۆر ڕاستە!
کەمی درەنگتر، زەرفێکی بۆ هێنام، دوو نامیلکە و پەرتووکێکی تێدابوو، کردمەوە و بینیم، بە کوردی نووسرابوون. گوتی: ڕەنگە ئەمانە بۆ تۆ باشتربێ، چونکە سەبارەت بە کێشەی کورد و ڕەوشی (کوردستان) نووسراون، پێشی گوتم: کامیان لە پێشدا بخوێنمەوە!
لە ماڵەوە تەماشامکردن، یەکەمین نامیلکە هی (کامیل ژیر) بوو، هەمووی هۆنراوەبوو، پێشەکییەکەیم خوێندەوە، (جەمال نەبەز) نووسیبووی، زۆرم بە دڵبوو، شێوازێکی گاڵتەجارانەی هەبوو. لەبەرئەوە یەکسەر، دەسم بە خوێندنەوەی هۆنراوەکانیش کرد، ئەوانیش زۆر ئاسان و ڕەوان بوون، چونکە هەمووی باسی کورد و (کوردستان) بوو، بیر و هۆشی ڕێبوارێکی ماندووی ڕێی کوردایەتی، وەک منی ڕووناکدەکردەوە!

ئینجا وەڵامەکەی خوالێخۆشبوو (حەمەی مەلاکریم)م خوێندەوە، بە هیچ شێوەیە بۆنی بیر و تێڕوانینی کوردانەی لێ نەدەهات، پتر لە ئەوە دەچوو، پیان گوتبێ، شتێکی وا کرچوکاڵ بنووسێ و دژی بیری کوردایەتی بێ! جگە لە ئەوەی بە زمانێکی خراپ نووسرابوو، کوردییەکەشی ڕەوان و پاراو نەبوو!
بەڵام کاتێ وەڵامەکەی (ئەبەز)م خوێندەوە، لە سەدا سەد یاری دید و بۆچوونەکانی گۆڕیم. هەر زوو (عەلی)م دۆزییەوە، داوام لێ کرد، سەبارەت بە ئەو دوو نووسەرە، هێندێ زانیاریم بداتێ. ئەویش هەرچی زانی، بۆی باسکردم. ئیدی وەک ئەوە وابوو، هەردوو نووسەر (زێر) و (ئەبەز)، لە مێژەوە بناسم!
ئەو کاتە، ئەو بیروباوەڕانەم زۆر بە دڵبوو، چونکە نەک هەر ئەو کاتە، بەڵکوو ئەوەتەی (پارتی)ش دامەزرابوو، هێڵێکی بیر و فەلسەفەیەکی دیاریکراو، ستراتیژێکی نەتەوەیی و نیشتمانیی ڕوونی نەبوو، لە ئەو باوەڕەشدابووم، هەرگیز ناشیبێ! لەبەرئەوە، لەنێو ریزەکانی (پارتی)دا، گەڕەلاوژێیەکی ئایدۆلۆژی و فەلسەفی بڵاوبووبووە، هەر کەسێ بە ئارەزووی دڵی خۆی، لە ئاوازێکی دەخوێند، بە گەز و جاوی خۆی، ڕووداوەکانی دەپیوا و لێکیدەدایەوە. لە شانەکانیشدا بۆ ئەندامەکانی باسدەکرد، کەسیش نەبوو، لێیان بپرسێتەوە، چی بۆ ئەو خەڵکە باسدەکەن!
هەروەها، هیچ جۆرە کەرەسەیەکی ڕووناکبیری و خۆراکێکی نەتەوەیی نەبوو، تا دەرخواردی مێشکی ئەندامەکانی بدەن و پێیانبگەیەنن. منیش هەروابووم، هەموو ئەو پەرتووکە نەتەوەییانەی دەمخوێندنەوە، بۆ ئەندامانی شانەکەم باسدەکرد و ئەوانیش زۆریان پێخۆشبوو، چونکە تا ئەو کاتە، هیچ لێپرسراوێ، بابەتی ڕۆشنبیری وایان بۆ باس نەکردبوون، بەڵکوو لە کۆبوونەوەی شانەکاندا، تەنیا هەر باسی گرفت و ڕەوشی (کوردستان) دەکرا، ئابوونەی مانگانەیان لێ وەردەگرتن، ئیدی ئاوبێنە و دەسبشۆ!
لەبەرئەوە بیرمدەکردەوە و لەبەرخۆمەوە، بە دەنگی بەرز دەمگوت: ئاخر نەتەوەیەک، خاکی داگیر و دابەشکرابێ، دەوڵەتە داگیرکەرەکان، بە هەموو شێوەیە هەوڵبدەن، لە بوتەی نەتەوەکانی خۆیاندا بیتوێننەوە، چۆن بە ئەو شێوەیە، لە بندەسی و چەوساندنەوە ڕزگاریدەبێ؟! چۆن دەتوانێ، ئامانجە نەتەوەیی و ڕامیارییەکانی خۆی بەدیبێنێ، گەر ڕابەر و پارتە ڕامیارییەکانی، هەڵسوکەوتیان ڕاست نەبێ و بە ئەو شێوەیە، ئەندامەکانی خۆیان گۆشکەن و هەڵسوکەوتیکەن؟!
(عەلی) ڕۆژبەڕۆژ یارمەتیدەدام و هانیدەدام، بخوێنمەوە، خۆم پێبگەیەنم و پتر لە گرفتەکان بگەم. ئێوارەیەکی پاییزبوو، لەنێوشار پیاسەماندەکرد، بە درێژی باسی ئەو ڕەوشە خراپەی (پارتی)مان دەکرد، بە دوای چارەسەرێکی بنەبڕیدا دەگەڕاین و هەردووکیشمان، لەسەر ئەوە ڕێکبووین، تەنیا چارەسەر هەر بیری نەتەوەیی و پارتێکی نەتەوەیی شۆڕشگێر نەبێ، هیچ شتێکی دیکە، دادی کورد نادا، سەیر ئەوەیە هەردووکیشمان (پارتی) بووین!

گوتم: کەواتە چی بکەین، باشە؟! ئەم نەتەوەییانەی تۆ باسیاندەکەی کێن و لە کوێن؟!
گوتی: لە (کوردستان)ن و دەتەوی، بیانناسی؟ گوتم: بەڵی، با بزانین، بەرنامەیان چییە؟ چۆن بیردەکەنەوە؟ کێ سەرکردایەتیاندەکا؟ گوتی: باشە، دوای ماوەیەکی دیکە، برادەرێکت پێ دەناسێنم.

## ئاشکرابوون

دوو رۆژی پێچوو، (عەلی) هات و برادەرەکە خۆی دەرچوو، گوتی: با قسەبکەین، زۆر شتی بۆ باسکردم و هێشتا لای من، تەمومژی هەبوو، دەمویست، هەموو شتەکان بەتەواوی روونبێنەوە. دوایی گوتم: (وریا براخاس)ی هاوڕێشم، هەر لە هەمان گێژاودا دەژی، با هەرسێکمان پێکەوە دانیشین و دەمەتەقێیەکەین. جا هەر بەڕاستی، هیچ جۆرە بروایەکمان بە (پارتی) نەمابوو، چونکە ئەو پارتە نەبوو، لە رووی بیروباوەڕ و سەرکردایەتییەکەیەوە، هیواکانی خۆمانی لەسەر هەڵچنین. تا دەهات، پتر لێی بێزار دەبووین، ئەو لێپرسراوانەی لە (سولەیمانی) دەمانناسین و دەمانبینین، هیچیان پێ نەبوو، شایانی ئەوەش نەبوون، ئەندامی ناوچە و لق بن، چونکە لە ئەو ماوەیەی گەڕابوونەوە و دەسبەکاربوون، هەوڵێکیان نەدا، ئەو بەرەلاخانەیە چاککەن، چەن کۆڕی بۆ ئەندامان و جەماوەری پارتەکەیان بگرن، هێندێ بابەتی رۆشنبیرییان بۆ باسکەن. هەرچی مرۆڤی خراپ و هەلپەرست هەبوو، وەک مێش چۆن بە شیرینییەوە دەنیشێتەوە، پێیانەوە نیشتبوونەوە. بەتایبەتی خۆم لە لیژنەی ناوچە و لقەوە نزیکبووم، رۆژانە ئاگام لە زۆر شت بوو، گەلێ گرفت روویدەدا، بۆیان چارەسەرنەدەکرا، هیچ کارێکیان نەبوو، چاڵیان بۆ یەکدی هەڵدەکەن. یا هەموو ئیشەکانیان، لە ئەوەدا چڕکردبووەوە، چاودێری جەلالییەکان و نەتەوەییەکان بکەن، بۆئەوەی رێکخستنەکانیان بدۆزنەوە. لەبەرئەوە زۆر کەسیان، وەک توولە و تانجی رسنکردبوو، راوەکەرویشکی ئەو دوو رێبازەیان پێ دەکردن، بەتایبەتی لە ریزەکانی (رێکخراوی قوتابیانی پارتی) و (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)دا، ئەو کارە قێزەونە، زۆر بەزەقی دیاربوو.
جگە لە ئەوەی هەموو شەوێ، ئەندامانی لق و ناوچە، شوێن و مێزی تایبەتی خۆیان، لە یانەی فەرمانبەران هەبوو، تا درەنگانی دادەنیشتن، دەیانخواردەوە و رایاندەبواردا! بە کورتییەکەی لە ئەو ماوەیەدا، هەموو شتێکیان دەکرد، تەنیا هەر کوردایەتی و پارتایەتی نەبێ!
گوتم: با بچین، (وریا) لە ماڵەوەیە و چاوەڕێماندەکا. ئەو شەوە تا درەنگانی، هەرسێکمان پێکەوە دانیشتین، دەمەتەقێیەکی تێروتەسەلمان کرد، لە زۆر بابەتی گرنگ دواین. دوای ئەوەی زۆر بەروونی و بەڕاشکاوی قسەمانکرد، هەموو سەرەداوەکانمان پێکەوە بەستەوە، بڕیارماندا، نامە بۆ سەرکردایەتی (کاژیک) بنووسین. ئیدی بە ئەو شێوەیە، لە رۆژی

(**1970 .10 .12**)وە، خۆمان بە نەتەوەیی دەزانی، لە ڕیزەکانی ڕێکخستندا، بۆ دروشمە سەرەکییەکەی (کاژیک)؛ کوردستان بۆ کورد یەکسانی بۆ گەل خەباتمان دەکرد. لەبەرئەوە تا ماوم، ئەو مێژووەم بیرناچێتەوە.

<u>**پەلگەنامەی ژمارە (1) ل (414-417)**</u>

بێگومان ئەوە دووەمین جاربوو، لە ژیانی ڕامیاری خۆمدا، لە ڕیزی ئەو پارتەدا خۆم ببینمەوە. هەرچەندە یەکەمین جار، ساڵی (1964) بوو، لە قوتابخانەی نیوەندیی (شۆڕش) بووم، باوکم زۆری لێ کردم، کار لەگەڵ (لاوانی نەتەوەیی)دا بکەم. لەگەڵ ئەوەشدا ماوەیەکی کورت کارمکرد و شتێکی وا نەبوو، هەر باوەڕیشم پێی نەبوو. بەڵام ئەم جارە، بەتەواوی بڕیاری خۆم بوو، بە هەموو هێزی بیر و هۆشی خۆمەوە، ئەو بیر و ڕێبازەم هەڵبژارد!

دوای ماوەیە وەڵاممان بۆ هاتەوە و وەرگیراین. (عەلی) لێپرسراوی هەردووکمان بوو. سەبارەت بە (یەکێتی خوێندکارانی نەتەوەیی کورد)، چەن کۆبوونەوەیەکمان کرد و هێندی بابەتی بۆ باسکردین. بەڵام زۆری نەخایاند، (عەلی) چووەدەرەوە و لە هێزی (خەبات) بوو بە لێپرسراوی دارایی. دواکۆبوونەوە گوتی: هاوبیرێکی دیکە دێ و پێوەندیتان پێوە دەکا، ئیدی ماڵاواییمان لێ کرد و ئەو ڕۆی.

## مژدە تایەر

دوای چەن ڕۆژێ، لێپرسراوی نوێم (مژدە تایەر) هات، پەرلە تهێنییەکەی گوت و خۆی پێ ناساندم. (مژدە) دوای (عەلی) دووەمین کەس بوو، لە (کاژیک)دا بیناسم. بەڵام لە دوورەوە دەمناسی، چونکە دوای ڕێککەوتنامەکەی ساڵی (**1970**)، یەکێ لە ئەو چوار ئەندامەی (ی. ق. ک. ع.)ی لقی (سولیمانی) بوو، کە بە تۆمەتی (کاژیک)، لە (پارتی) و (قوتابیان) دوورخرانەوە. جگە لە ئەوەی، لە کۆلێژی ئەندازیاریش دەیخوێند و ڕۆژانە لە زانکۆ دەمبینی. لەبەرئەوە بەگومان دەمزانی، (کاژیک)ە. بۆیە لێی ئەسڵەمیمەوە و یەکسەر باوەڕی خۆم نایە. من و (مژدە) پێکەوە کارماندەکرد. (وریا براخاس)یشیان، لای من دانا.



ئیدی کە ڕێباز و باوەڕەکەم بەڕاست زانی، بەتەواوی بڕوام پێ هێنا، زۆربەی کاتی خۆم، بۆ ڕێکخستن و بیرەکەی (کاژیک) تەرخانکرد. پرۆژەیەکی تایبەتی کارکردنم، بۆ خۆم و هۆشیارکردنەوەی هاوەڵەکانی دەوروبەرم دانا. بەتایبەتی ئەوانەی لە (پارتی) و (قوتابیان)دا، کارم لەگەڵ دەکردن و دەمناسین. کارەکە زۆر ئاسانتربوو، کەلالەیانکەم و دواتریش، خۆمیان لێ ئاشکراکەم و بەڕاشکاوی قسەیان لەگەڵ بکەم.
لەبەرئەوە لە ماوەیەکی کەمدا توانیم، زۆربەی برادەرەکانی خۆم، لە چوارچێوەی ڕێکخستنەکانی (کاژیک)دا ڕێکخەم، بە شێوەیە تا دەهات، ڕۆژبەڕۆژ ژمارەی هاوبیرەکان زیادیاندەکرد. ناچاربووم، پێشنیازی بۆ سەرکردایەتی بنووسم، واز لە پێوەندی تاکەکەسی بێنن، یا دووەدوو هاوبیرەکان، لە شانەکاندا ڕێکخەین و ئەوانیش پێشنیازەکەیان پەسەندکردم. یەکەمین هەنگاوم ئەوەبوو، هەموویانم لە شانەیەکدا ڕێکخست. بۆ نموونە: (وریا براخاس) و هونەرمەند (زاهیری مەلاعەلی)م، لە شانەیەکدا کۆکردەوە. چونکە پێشتر هەرسێکمان، لە ساڵی (**1967**)ەوە، (مەلایی) بووین و لە (بەکرەجۆ) لە ئامادەیی کشتوکاڵ، لە ڕێکخستنی ڕێکخراوی (پۆلا)دا پێکەوە کارماندەکرد.



وریا براخاس



زاهیری مەلاعەلی

(سەروەت موحەممەد ئەمین) ناسراو بە دوکتور (کوردۆ عەلی) و (دلێری ڕەشیدە قەندی)ش، لە شانەیەکی دیکەدا بوون. بەڵام (برایمی حەمەعەلی وەستا حبیب)، بەتەنیا مایەوە، چونکە کۆن (جەلالی) بوو، کەمێ لێی دەسڵەمینەوە!



دلێر ڕەشید



سەروەت موحەممەد ئەمین

هەروەها شانەیەکی سێ کەسیشم، لە (سەلاح)ی برام، (جەلال سەعید رەشید) و (تایەر مەولوود)ی برا چکۆلەکەی رەوانشاد (شەریف مەولوود) درووستکرد، هەرسێکیان خوێندکاری ئامادەیی بوون، بایەخێکی زۆرم پێ دەدان، چونکە هێشتا کەرەسەیەکی خاوبوون، زۆر بە ئاسانی پەروەردەدەکران. ئیدی جگە لە ئەم **(3)** شانەیەی (کاژیک)، هەفتەی جارێ کۆبوونەوەماندەکرد، لە (پارتی) و (قوتابیان)یشدا دەبووایە، بەلانی کەمەوە، لە مانگێکدا **(8)** کۆبوونەوە بکەم!

بەکورتی، لە هەرەتی لاوێتیدا بووم، چەپکێ تیشکی چالاکی بووم، ماندووبوونم نەدەزانی، رۆژ نەبوو، کۆبوونەوە نەکەم، یا کارێکی رامیاری و نەتەوەیی جێبەجێ نەکەم، یا لە کاتی بێ ئیشیدا نەخوێنمەوە. لە هەموو کۆبوونەوەکانیشدا دەبووایە، هاوبیرەکان ئامادەبوونایە، هیچ جۆرە بڕوبیانوویەک نەیدەخوارد، مەگەر پێشەکی، داوای پارمەتییان بکردایە. هەموو هەفتەیەک کۆبوونەوە هەبووایە و نەبووایە، هەر هاوبیرێ دەبووایە، راپۆرتی تایبەتی هەفتانەی، بۆ سەرکردایەتی بنووسیایە. ئەوەی سەبارت بە کورد، (پارتی)، دوژمن و رەوشی (کوردستان) دەیزانی، یا لەئەملا و ئەولا دەیبیست، هەمووی تێدا بنووسیایە. راپۆرتەکانیش زۆر نهێنیبوون، دەپێچرانەوە و هیچیان لەسەر نەدەنووسرا، وەک خۆشیان دەیانگوت: تەنیا ئەندامانی سەرکردایەتی بۆیان هەیە، بیکەنەوە و بیخوێننەوە!

هەروەها، هیچ هاوبیرێ بۆی نەبوو، بێ پرسی (کاژیک)، وەک دەڵێن: پەنجە بە ئاودا بکا و دەبووایە، بۆ هەموو شتێ پەیوەندی بە کورد، (کوردستان)، کاری رامیاری، کۆچکردن، نووسین و چاوپێکەوتنەوە هەبووایە، پێشەکی پرسی بە لێپرسراوەکەی بکردایە و وەلامیان بدایەتەوە، ئینجا ئەو کارەی بکردایە. تەنانەت یەکەمین گوتارم، ساڵی **(1971)** نووسی و بۆ هەفتەنامەی (برایەتی)م نارد، لە پێشدا ئەوان سەیریانکرد، ئینجا قایلبوون، بڵاویکەمەوە!

هیچ ئەندامێ بۆی نەبوو، خۆی ئاشکراکا و لە هیچ شوێنێ، بە ناوی (کاژیک)ەوە قسەبکا. کەس لە لێپرسراوەکەی خۆی پتر، کەسی دیکەی نەدەناسی. مەگەر کاتێ دەمەتەقێ، لەگەڵ برادەرێکدا بکردایە، هەستی پێ بکردایە، ئەو برادەرە، نەتەوەییانە بیردەکاتەوە و بە (کاژیک)یان دابنایە! ئەگینا جگە لە ئەو کەسانەی، پێکەوە کاریاندەکرد، کەسی دیکەیان نەدەناسی. ئەو کاتە، زۆر باوەڕم بە ئەو جۆرە دیسیپلینە هەبوو. چونکە دوژمنەکانی (کاژیک) هەوڵیاندەدا، سیخوورە نۆکەرەکانیان، لە ریزەکانی رێکخستنەکەماندا بچێنن، سەبارەت بە رێکخستن و چالاکییەکانی (کاژیک)، هێندێ زانیارییان دەسکەوێ، بەتایبەتی دەزگەی (پاراستن)ی سەر بە (پارتی)، زۆر سەرقاڵی ئەو کارە بوو. چونکە زۆر باش دەیانزانی، نەتەوەییەکان لە ریزەکانی (پارتی)دا، خۆیان حەشارداوە و چالاکی دەنوێنن.

کاتێ ساڵی (**1971**)، لەگەڵ جەلالییەکانیشدا تێکەڵبوونەوە، ئیدی ئەو چاودێریکردنە، زۆر زیادیکرد، چونکە ئەوان دوژمنێکی سەرسەختی بیری نەتەوەیی بوون! لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی، زەفەر بە (کاژیک) بەرن، چونکە ڕێخستنەکە، زۆر نهێنیبوو، هیچ جۆرە نهێنییەکی ڕێخستنەکە، بە هیچ جۆرێ دەرنەدەچوو، ژمارەی ئەندامەکانیشی زۆر کەمبوون، هیچ کۆبوونەوە و چالاکییەکیشی نەبوو، تا ئەندامەکانیان بناسن و کەڵکیان لێ وەرگرن.

بەکورتی دەتوانم، زۆر بەڕاشکاوی بڵێم: ڕێخستنێکی جەماوەری نەبوو، بەڵکوو تا بڵێی، ڕێخستنێکی پۆلیسی داخراوبوو، لە بازنەیەکی چکۆلانەی داخراوی بۆشدا دەخولایەوە، ئەوەش تەنیا بۆ ترسنۆکی، سەرکردەکانی دەگەڕایەوە. ڕاستە، نەتەوەی کورد سەربەست و سەربەخۆ نییە، بە دوژمنانی نێوخۆ و داگیرکەری بیانی چواردەوری تەنراوە، پێویستە، ڕێخستنێکی نهێنی و بەهێزی هەبێ. بەڵام ئەو دیسیپلینە توندە دەبێ، هەر لەنێو ڕیزەکانی ڕێکخستنەکەدا بێ، دەرگە بە ڕووی جەماوەردا دانەخرێ و خۆیانیان لێ نەشارنەوە، بە شێوەیە بێ، ئەندامانی سەرکردایەتی (کاژیک)، سڵ لە سێبەرەکەی خۆیان بکەنەوە!

هەرچەندە (مژدە) کوڕێکی پاک و بوێر بوو، بەڵام باشبوو، زوو لایانبرد و لێپرسراوێکی دیکەیان بۆ دانام. چونکە بەڕاستی، ئاستی ڕۆشنبیری نزمبوو، بە هیچ شێوەیە توانای دەمەتەقێ و شیکردنەوەی نەبوو. پێم وایە، ئێستەش هەر وایە و هیچ نەگۆڕاوە!

ئەو ماوەیەی ئەو لێپرسراومبوو، جگە لە ئەوەی هەفتەی جارێ دەهات، ئابوونەی مانگانەی خۆم و هاوبیرانی شانەکانی خوارەوە و ڕاپۆرتی هەفتانەی ئەندامەکانی وەردەگرت، کەمی دەنگوباسی ڕۆژانەی بۆ باسدەکردم، کە خەڵکی ئاسایی سەرشەقامەکانیش دەیانزانی، هیچی دیکەی پێ نەبوو، هیچیشی لێوە فێرنەبووم، تەنانەت توانای ئەوەشی نەبوو، کارەکانی ڕێکخستنەکەی ئەو هێڵەی ئێمە بەڕێوەبەرێ. جگە لە ئەوەی لە ئەو تەمەنەدا، قوماری دەکرد و خەریکی خواردنەوەش بوو!

لە ئەو ماوەیەدا، ساڵی (**1972**) گرفتێکی زۆر، لە ڕیزەکانی (ی. ق. ک. ع.)دا ڕوویدا. باشبوو، سەرۆکەکەی (ئەنوەر عەبدوڵڵا) دوورخرایەوە، (عادل موراد)یان دانا و (فەرهاد عەونی)ش سکرتێربوو. هێندێ لە قوتابیانی سەر بە باڵەکەی جەلالی، لە لیژنەی ناوچە، لق و سکرتارییەتی (قوتابیان) دانران و تێکەڵبوونەوە. خەریکبوو، وردەوردە گیانێکیان، بەبەر جەستەی مردارەوەبووی ڕێکخراوەکەدا دەکردەوە. ڕەوانشاد دوکتۆر (فازیلی مەلامەحموود)، لە هۆڵی ڕووناکبیری زانکۆی (سولەیمانی)، کۆڕێکی گەورە و گرنگی، بۆ ئەندامانی یەکێتی قوتابیان سازکرد و گەلێ شتی بەکەڵکی ڕوونکردەوە.

## زانکۆی سولەیمانیی

لە ڕاستیدا، یەکەمین ڕۆژ (1. 9. 1971) چوومە زانکۆ، لەسەر کورسی هۆڵەکەمان دانیشتم، هەموو جەستەم دایەزرابوو. هەرچەندم دەکرد، هێز و توانای ئەوەم نەبوو، بەردەوامبم. چونکە لە لایەکەوە، خەفەتی ئەو هەموو ئەرککێشان و پارەیەم دەخوارد، کە لە ئەو ماوە درێژەدا، لە (بەغدا) چاوەڕێی ئەنجامی کۆلێژی سەربازیم دەکرد و بەفیڕۆ ڕۆیشت. لە لایەکی دیکەشەوە، بەزەیم بە خۆمدا دەهاتەوە، هەر لێکمدەدایەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئاخر ئەوانەی لە کۆلێژی سەربازی وەرگیراون، چییان لە من زیاترە؟! ئینجا سەرەڕای ئەوەی، ماوەی ساڵ و نیوێ بوو، لە خوێندن دابڕابووم، لەگەڵ ژیانی زانکۆ و تێکەڵاوی کوڕ و کچیشدا، ڕانەهاتبووم. بەڕاستی نەمدەزانی، چی بکەم!



پۆلی یەک - زانکۆ، ڕۆژی (24. 10. 1971) لە نێوان دوو (مەنسووری شێخ کەریمی حەفید) دام. (مەنسوور) بە مۆڵەت لە کۆلێژی سەربازی هاتبووەوە

ئەو کاتە لەگەڵ خوالێخۆشبوو دوکتۆر (بەختیار عەبدوڵڵا)دا پێکەوەبووین. ئەو لێپرسراوی یەکێتی قوتابیانی کۆلێژەکەمان بوو. هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە گوتی: دەبێ، کارمان لەگەڵ بکەی، هەرچەندە جەلالییەکان دژبوون، بەڵام ئەو بەزۆر لە کۆمیتەی کۆلێژەکە دایناو، وەک نوێنەری خوێندکارانی قۆناغی یەکیش، بە ڕاگرایەتی کۆلێژەکەی ناساندم. ئیدی هیچ چارێکم نەبوو، یا دەبووایە، بمخوێندایە، یا سەربازییم بکردایە. بۆیە خوێندنەکەم هەڵبژارد و وردەوردە، دەسم بە کارکردنکرد و خۆم بە خوێندنەکەمەوە گرت.



خوالێخۆشبوو دوکتۆر (بەختیاری عەبدوڵلا فەندی)

ئەو ساڵە دوکتۆر (تاریق عەمادی)، لێپرسراوی کاروباری خوێندکارانی کۆلێژەکەمان بوو، پێوەندی نێوانمان زۆر باشبوو. ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (زانیاری)ش بوو، هەر ژمارەیەک دەردەچوو، چەن دانەیەکی دەهێنا و دەیگوت: بۆمان بفرۆشە. منیش لەنێو خوێندکارەکاندا ساغمدەکردەوە.

ژیانی زانکۆ، لەگەڵ ژیانی قوناغەکانی ژیانی دیکەی خوێندندا، گەلێ جیاوازی هەیە. گەر یەکێ لێی بزانێ، لە نێوان خوێندن و ژیانی زانکۆدا، هاوسەنگییەک ڕاگری و هیچیان پشگوێ نەخا، وا بزانم، بە خۆشترین سەردەمی ژیانی مرۆ دادەنرێ. جگە لە ئەوەی بەرنامەی خوێندن، هەڵسوکەوتی خوێندکار و مامۆستاکان، شێوازێکی نوێ و تایبەتی هەیە، توانا و دەسەلات پتر دەبێ، زۆر لایەنی پراکتیکی تێدا هەیە، چوارچێوەکەشی فراوانترە، چونکە لە هەموو نێوچەکانی (کوردستان) و (عێراق)ەوە، خوێندکار و مامۆستا دێن، تێکەلاوییەکی کۆمەلایەتی گرنگ دروستدەبێ و ئاشنایەتی لە نێوانیاندا پەیدادەبێ.

لە ئەو ماوەیەدا، کۆمەڵێ برادەری نوێم پەیداکرد. بۆ یەکەمین جاربوو، لەگەڵ هێندێ خوێندکاری عەرەب و توورکماندا، تێکەلاویم و دۆستایەتی پەیداکەم، تەنانەت هێندێکیان لە (بەغدا)وە هاتبوون، ساڵەکەی زۆر ساردبوو، نەوتیان دەس نەدەکەوت، لە نزیک ماڵی ئێمە و لە بەشی نێوخۆیی دەژیان، عەلادینێکی زیادمان هەبوو، دامێ و هێندێ ترشیاتیشم بۆ بردن. دوای مانگێ لە یەکێ لە ڕۆژنامەکانی (عێراق)دا، چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ دوواتیاندا سازکرد بوو، باسی یارمەتییەکەی منیان کردبوو.

گەرچی زانکۆی (سولەیمانی)، وەک باخێکی گەورە وابوو، بە هەموو گوڵێکی جوان، گەشاوە و بۆنخۆش رازابووەوە، لە هەموو ناوچەیەکی (کوردستان)ەوە، بەسەدان کیژی نەشمیلە، نازدار، باڵابەرز، قەدباریک، مەمکقووت، سوور و سپی، چاورەش و چاوکاڵی تێدا کۆببووبووەوە، بە جلی رەنگاورەنگی جوان، خۆیان دەرازاندەوە، بە شێوەیە بوو، مرۆ هەر بە تەماشاکردنیان، کەلەی سەری مەستدەبوو!

بەڵام لە لایەکەوە، هێندە دڵم لە کچان رەنجابوو، هێندە لە دڵداری نائومێدبووبووم. لە لایەکی دیکەشەوە، هەرچەندە جاروبار، دڵە هەتیوەکەم وەک ئەندامێکی زیندووی جەستەم، لێرە و لە ئەوی، بۆ کیژێکی ناسک و جوان لێیدەدا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، لە ماوەی ئەو (4) ساڵەی زانکۆ دەمخوێند، گیرۆدەی دوای خۆشەویستییەکی راستینەی وەک ئەوەی (حەلیمە) و (ژیان) نەبوومەوە، تا کەمێ زلخاوی بیر و هۆشمی پێ بدەمەوە، دەردی دڵەی زامدارمی پێ تیمارکەم! لەبەرئەوە زۆر گۆشەگیربووم، پتر خەریکی خوێندن و کاری رامیاری بووم. ئێستەش هێندێ جار، بیری لێ دەکەمەوە و دەڵێم: تۆ بڵێی، وەک لە ژیاندا زۆر شتم لەکیسچوو، ژیانی زانکۆشم بەخۆرایی لەدەسچووبێ؟!

سیستەمی خوێندنەکەمان کۆرسات بوو. ئەو بابەتانەی پێش نیوەی ساڵ، لە یەکەمین کۆرسدا دمانخوێند و تاقیکردنەوەمان تێدا دەکرد، پێوەندییان بە بابەتەکانی دوای نیوەی ساڵ و دووەمین کۆرسەوە نەبوو، بەتەواوی لە کۆڵماندەبوونەوە. هەرچەندە وانەکانمان زۆر نەبوون، ئەو بابەتانەی پێوەندیشیان بە کشتوکاڵەوە هەبوو، بۆ من شتێکی نوێ و قورس نەبوون. بەڵام ئەو بابەتانەی نەمخوێندبوون، وەک کیمیا، فیزیا، ماتماتیک ... زۆر قوورسبوون، یا ئەو وانانەی بە ئینگلیزی دەمانخوێند، زۆر بەگران لێیان تێدەگەیشتم. لەبەرئەوە زۆر ماندوویاندەکردم.

لە راستیدا، گەر هێندێ برادەری خوێندکاری هاورێی بەرێزم نەبوونایە، هێندێ جار یارمەتییان نەدامایە و بە کوردی تێیان نەگەیاندمایە، هەر زۆر خراپتردەبووم. چونکە من لە ئامادەیی کشتوکاڵ، ئەو بابەتانەم نەخوێندبوو، لە زانکۆش چەن پەرتووکێکی دیاریکراو نەبوو، تا خۆمیان پێوە خەریککەم، بەڵکوو دەبووایە، فریای دەمی مامۆستا بکەوتینایە و بەپەلە بمانئووسیایەتەوە.

جگە لە ئەوەی لەلایەکەوە، زۆر تاقەتم نەبوو، لەلایەکی دیکەشەوە، کاری (قوتابیان، پارتی و کاژیک)، بەتەواوی سەرقاڵیکردبووم، کاتی ئەوەم نەبوو، وەک پێویست، خۆم بۆ خوێندنەکەم تەرخانکەم. لەبەرئەوە چەن جاری بە دەمی و بە نامەش، داوام لە سەرکردایەتی (کاژیک) کرد، رێمبدەن، واز لە (قوتابیان) و (پارتی) بێنم. بەڵام ئەوان داواکارییەکەیان پەسەند نەکردم.

هەر لە سەرەتای پۆلی یەکیشەوە، لەگەڵ دوکتۆر (کاوسی حاجی عەزیز بەگ)دا، لە نزیکەوە یەکدیمان ناسی و تا خوێندنیشمان تەواوکرد، هەمیشە پێکەوەبووین، ئەو پێوەندییەشمان، تا ئەورۆ هەر بەردەوامە.

جگە لە ئەوەی، چەن برادەرێکی خۆشەویستی دیکەش هەبوون، وەک خوالێخۆشبوو (حەمە قەراخی – حەمەدۆستان، پرۆفیسۆر دوکتۆر تاریق حەمەکەریم، ئەحمەدی عارفی فێتک، ئەنوەری حاجی عەبدولرەحمانی مەلاسەعید، دوکتۆر ئەحمەد حەمەئەمین، عەلی مەحموود غەفوور، ئازادی عەبدوڵلا فەندی، دوکتۆر شێروان نووری غەفوور، ئاراسی کەریم حەداد، عەلی حەمەرەشید رەشان) و هێندێکی دیکەش، چەن کۆمەڵی بووین، زۆربەی کات، لە زانکۆ پێکەوە بووین.



پۆلی یەک لەگەڵ دوکتۆر (کاوس)ی هاوڕێی دێرینم، ڕۆژی (8. 11. 1971) لە زانکۆ گیراوە.

هەرچەندە ئەو کاتە لە کۆلێژی کشتوکاڵ، ژمارەی خوێندکارە کچەکان، لەچاو ژمارەی خوێندکارە کوڕەکاندا، زۆر کەمبوون. بەڵام بەڕاستی، پیرەکەمان لە ماوەی ژیانی زانکۆدا، لە کچانەوە زۆر دوورەپەرێزبووین، بەتایبەتی من پێوەندیم لەگەڵ کچاندا، زۆر سنووردار و دیاریکراوبوو. چونکە لە خۆشەویستییەکەمدا تێکشکابووم، دڵم بەتەواوی ڕەنجابوو، باوەڕم بە ڕەگەزی مێ نەمابوو. هەرچەندە ڕەوانشاد (جەباری حاجی ڕەشید)، زۆر دڵخۆشیدەدامەوە و هانیدەدام، واز لە ڕەشبینی بێنم و پێوەندییە کۆنەکان،

لە بیر خۆم بەرمەوە، بەلام کەلکی نەبوو. چونکە هەر دەردی تووشی دڵ بوو، تا بە شێوەیەکی سرووشتی و هێدیهێدی، برینەکەی ساڕێژ نەبێ، لە دڵ دەرناچێ، ناڕوا و ناڕوا و ناڕوا!

جگە لە ئەوەی، کارکردنم لە (کاژیک)دا، زۆر کاری لە باری دەروونم کردبوو، خۆم لە زۆر شتی خراپ و ناشیرین دووردەخستەوە. هێندی خوێندکاری دیکە هەبوون، هێندی کردەوەی سەیریان دەنواند، پێم جوان نەبوو، خۆمم لێ دووردەخستەوە. یەکێ لە ئەو کارانە، تێکەلاوییان لەگەل کیژان بوو، خۆیان لە کارەکانیان هەلدەقورتاند.

## ڕێکخستنەکانی ڕێکخراوی ( پارتی ) لە دەرەوە و نێوەوەی زانکۆ

ئەو کاتە، من هەر لە ڕێکخستنی (پارتی)دا، لە دەرەوەی زانکۆ کارمدەکرد. دوای ئەوەی یەکردەوە، هەردوو باڵەکەی مەلایی و جەلالی یەکیانگرتەوە و تێکەلاوبوونەوە، هێندی لە ئەو برادەرانەی خوێندنیان تەواوکردبوو، ڕەوانەی لای ئێمەیان کردن. یەکێ لە ئەو برادەرانەش، هاوڕێم (سەباحی غالب) بوو.

ڕۆژێ کوڕێکی بارێکی لاواز هات و خۆی پێ ناساندم، خوالێخۆشبوو (ئاوات عەبدول غەفوور) بوو، گوتی: لەبری (جەمال قاسم)، لەمەودوا من لێپرسراوی ئێوەم. سەرەتا من نەمدەناسی، بەلام دوایی زانیم، کێیە. ئامادەی کۆبوونەوەکەی نەبووم و یەکسەر چووم بۆ لیژنەی ناوچە. بە (شێخ ڕەووفی شێخ عارف) و مامۆستا (جەمال قاسم)م گوت: من بە هیچ شێوەیە، لاریم لە ڕێککەوتن و تێکەلاوبوونەوە نییە، لەگەل یەکێتی ڕیزەکانی گەلیش دام، بەلام بۆم هەرس ناکرێ، کۆنە جەلالییەک بێنن و لێپرسراوی من بێ.

گوتیان: باشە، چارەسەرێکی ئەو گرفتانە دەکەین. ئەوەبوو، یەکسەر منیان بەرزکردەوە و بووم بە ئەندامی ڕێکخراوی قوتابیانی (پارتی). ئەندامانی ڕێکخراوی ئەو کاتەش، (هیوای جەلال حەمدی، کەمال جەلال، کەمالی حەسەن چاومار، ئاوات عەبدولغەفوور و حەمەسەعی فەقێ عەلی جگەرەفرۆش) بوون. مامۆستا (جەمال قاسم)یش، لێپرسراوی یەکەمی ڕێکخراوەکە بوو.

بەلام ڕێکخراوی (پارتی) زانکۆ جیابوو، چونکە ئەوان خوێندکاران، مامۆستایان و فەرمانبەران تێکەلاوبوون، ڕێکخراوی تایبەتی خۆیان هەبوو. لە خوێندکارانی زانکۆ، تەنیا هەر من لە ڕێکخراوی قوتابیانی دەرەوەی زانکۆ کارمدەکرد و حەزیشم نەدەکرد، بمگوێزنەوە و لە ڕێکخستنی زانکۆدا کاربکەم.

## فەرهاد عەبدولحەمید

لە یەکەمین کورسی خوێندنی ساڵی (**1971**)دا بووم، (مژدە) ماڵاوایی لێ کردم و سێیەمین لێپرسراو، بە پەرلەی تایبەتەوە هات. بێگومان، پێشتر (فەرهاد)م دەناسی، چونکە لە یەک کۆلێژ بووین و دەشمزانی، لە (کاژیک)دا کاردەکا. هەرچەندە لە سەردەمی ئەمیشدا، چالاکییەکی ئەوتۆم نەدی و گۆڕانکارییەکی نوێ ڕووی نەدا. بەڵام لە ڕووی ڕووناکبیری و زانیارییەوە، لە (مژدە) گەلێ بە تواناتربوو، کەسایەتیشی بەهێزتربوو.

(فەرهاد) لە بنەڕەتدا، خەڵکی خۆرهەڵاتی (کوردستان) بوو. لە سەردەمی پاشایەتیدا، باوکی لە کونسوڵخانەی (ئێران) لە (سولەیمانی) فەرمانبەربوو، ماوەیەکی زۆر لە (عێراق) ماوەتەوە. بەڵام دوای کودەتاکەی (**14. 8. 1958**)، باوکی بۆ (ئێران) گەڕاوەتەوە، منداڵەکانیشی بەجێهێشتووە و لە (سولەیمانی) جێگیربوون.

(فەرهاد)، کوڕێکی تا بڵێی، بێدەنگ و هێمن، ڕووخۆش و خۆشەویستە، کوردێکی پاک و تێگەیشتووە، ئەویش وەک هاوبیرەکانی دیکەی، بە دەس دەزگەی پاراستن و کلکەکانیانەوە، چەرمەسەری زۆری دیوە. بەڵام لە ئەو کوردانە نەبوو، کۆڵبدا و دوای پلەوپایە بکەوێ. ئێستەش هەر لە (سولەیمانی) دەژی و بە شێوەیەکی بەردەوامیش، پێوەندیمان هەیە.



## شاکیر فەتاح

دەمێبوو، بە دوای پەرتووکی (کوردایەتی)یەکەی (زەردەشت)دا عەودالبووم. (کاوس)ی هاوڕێم گوتی: لای مامۆستا (شاکیر) دەسدەکەوێ. ئەو کاتە ماڵەکەیان، لە گەڕەکی (شۆڕش) بەرانبەر ماڵی ئەوان بوو. لە گەراجەکەی ماڵی خۆیاندا، پەرتووکخانەیەکی

پچووکی داتابوو، تیواران لێی دادەنیشت، نووسەر و ڕووناکبیران، سەریان لێ دەدا. ئیمەش چووین، ماوەیە لای دانیشتین و زۆر ڕیزی لێ گرتین. هێندێ پرسیارمان لێ کرد و چەن پەرتووکێکیشم لێ کڕی. ئیدی بە ئەو شیوەیە ئاشنابووین و زووزوو سەرمان لێ دەدا. سەبارەت ویژە، میژوو و کیشەی کورد، دەمەتەقیمانده‌کرد. ئەویش زۆر هۆگری ئیمە بووبوو، گەر ماوەیە سەرمان نەدایە، گلەیی لێ دەکردین. دوایی ورده‌ورده، هێندێ برادەری خۆمم، بە پەرتووکخانەکەی فێرکرد و هەر جارەی لەگەل برادەرێکدا سەرماندەدا. هەر برادەرێکیش، پەرتووکێکی (زەردەشت)ی لێ دەکڕی.

ماموستا هێندێ جار، چەن بیرەوەرییەکی خۆشی خۆی بۆ دەگێرایەوە. قسەکانی زۆر کوردپەروەرانە بوو، هەمیشە ئیمەی بۆ تیکۆشان و کوردایەتی هاندەدا. تەنانەت داوای هێندێ شتم لێ کرد، بۆمان بنووسی، یەکسەر قایلبوو، بەلام گوتی: بە مەرجێ ناوی منی لەسەر نەبێ!



( 1988 – 1914 )

## کۆنگرە

(ی. ق. ک) لەنێوان ڕۆژانی **(2– 3) مانگی (4)**ی سالی **(1972)**، لە زانکۆی (سولەیمانی)، حەوتەمین کۆنگرەی خۆی گرت و منیش ئەندامی کۆنگرە بووم. هەردوو ئەندامی پەلیتبیرۆی (پارتی) خوالیخۆشبووان (سامی عەبدولڕەحمان) و (عەلی عەبدوللا)، بەشدارییان تێداکرد و لە نزیکەوە سەرپەرشتییاندەکرد. میوانێکی زۆر لە (بەغدا)، پارچەکانی دیکەی (کوردستان) و خوێندکارانی کورد لە (ئەورووپا)وە هاتبوون.



زانکۆی سولەیمانی، بەردەرگەی هۆڵی راپەڕین، لە یەکەمین ڕۆژی کۆنگرەی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)دا گیراوە. لە ڕاستەوە (سەلاح رەشید، خوالێخۆشبوو یاسینی غەفووری مەلاعەلی، حوسێن موحەممەد عەزیز، دلێر ڕەشید و برایم ...)

لە کۆنگرەکەدا، لەسەر کێشەی کوردە فەیلییەکان، لەنێوان ئێمە و (یەکێتی نیشتمانیی قوتابیانی عێراق)ی سەر بە (بەعس)، گرفتێکی گەورە درووستبوو. ئەوان دەیانگوت: دەرکردنی فەیلییەکان، بە بڕیارێکی تایبەتی سەرکردایەتی (بەعس) و ئەنجوومەنی شۆڕش بووە، بە هیچ جۆرێ نابێ، ناویانبێرێ. تا (سامی عەبدولڕەحمان) هەستا، چەن قسەیەکی جوان و ڕێکوپێکی کرد، بوو بە چەپڵەلێدان و بڕیارەکەمان، بەزۆر بەسەردا سەپاندن. هەرچەندە هیچ کەڵکی نەبوو، چونکە فەرمانڕەوایانی (بەعس) بە هیچ شێوەیە، گوێیان لە بڕیاری کۆنگرە نەدەگرت و خراپتریش، کوردە فەیلییەکانیان دەردەکرد!

دوای ئەوەی دەمەتەقێ تەواوبوو، گرفتەکان چارەسەرکران، ئینجا لیژنەکانی بەڕێوەبردنی کۆنگرە هەڵبژێران. من بەر لیژنەی پێڕەو و پرۆگرام کەوتم. ئەندامانی لیژنەکەمان، لە ژمارەیەکی زۆر پێکهاتبوو. سەرۆکی لیژنەکە دوکتۆر (ڕەنجی نوری شاوەیس) بوو. هەرچیمان سەبارەت کوردەکانی بەشەکانی دیکەی (کوردستان) پێشنیاز دەکرد، ڕەتیانکردەوە و دەیانگوت: نابێ!

بەڕاستی لە داخاندا نەمدەزانی، چی بکەم. ئاخر (یەکێتی خوێندکارانی نیشتمانیی عێراق)، داکۆکییان لە هەموو خوێندکارانی عەرەبی دەوڵەتەکانی دیکەی عەرەب دەکرد و کورسی خوێندنیان بۆ دابیندەکردن، کەچی کوردەکانی خۆمان، ڕێی ئێمەیان نەدەدا، باسی خوێندکاری پارچەکانی دیکەی نیشتمانەکەمان بکەین. منیش لە بێدەسەڵاتیدا، کۆبوونەوەکەم بەجێهێشت!

ئێواره من و (وریا براخاس)، لەگەڵ هێندێ برادەری خۆشەویستی خەڵکی (خانەقی)، وەک (دوکتۆر عەبباس، دوکتۆر موحسین و دوکتۆر خەسرەو گوڵ موحەممەد)، لە ژووری ئوتێلەکەی (دوکتۆر عەبباس) یەکمانگرتەوە، تا درەنگانی دانیشتین، گەلێ دەمەتەقێمان، لەسەر ئەو باسە کرد، بەڵام هیچی لێ پەیدا نەبوو. چونکە بەرنامەی (پارتی) و (قوتابیان) خۆی وابوو، هیچ بایەخێکیان بە ئەو کێشە گرنگانە نەدەدا و ئێستەش هەر وایە، هیچی لێ نەگۆڕاوە و باوەڕیش ناکەم، گۆڕانکاری بەسەردا بێ!

دواڕۆژی کۆنگرەکە، هەرچی گرفت هەبوو، بەجارێ تەقییەوە. کاتێ هەڵبژاردن دەسپێکرد، هەر لیستبوو، بڵاودەکرایەوە و دەڵاڵەکانیان دەگەڕان، دەنگیان بۆ ئاغاکانیان کۆدەکردەوە. وا بزانم، لە لقی قوتابیانی (سولەیمانی)، چوار کەس دەرچوون: هەردوو خوالێخۆشبوو (مەزنی عوسمان فایەق، فەرەیدوون عەبدولقادر کەرکووکی، دلێر رەشید و جەلال کەریم) بوون. جگە لە (جەلال)، سیانەکەی دیکەیان لە بنەوە (کلاژیک) بوون و منیش لێپرسراوی (دلێر) بووم.

دوای ئەوەی کۆنگرە تەواوبوو، لەسەر داوای قوتابیان و زانکۆ، ئەندامانی کۆنگرە، بۆ ئوتێلەکەی هاوینەهەواری (دووکان) بانگهێشتکران. ئەو ڕۆژە، من و (جواد مولا) و (فەرەیدوون عەبدولقادر) پێکەوەبووین. لە هەردووسەر، هەر باسی ڕێکخراوەکەیان و کارەکانی (جەمال نەبەز)ی بۆ دەکردین و بەئاشکرا، هەموو شتێکی دەگوت.



**جواد مولا**

## دابەشکردنی پۆستەکان

دوای کۆنگرە، (دلێر رەشید) بە لێپرسراوی لق و منیش یەکسەر، بە ئەندامی لیژنەی ناوچەی قوتابیان دانراین. پاش ماوەیەکی کەمیش، بە لێپرسراوی یەکەمی لیژنەی ناوچە و ئەندامی لقی (سولەیمانی) هەڵبژێررام. ئەندامانی لیژنەی ناوچەش (سەلامی مەلا عەبولرەحمان، سەلاح رەشید ...) بوون. هەر لە هەمان کاتیشدا، لیژنەی ناوچەی (پارتی) پێشیانخستم و لە ڕێکخراوی قوتابیاندا، بە جێگری (جەمال قاسم) دانرام.

بڕیاربوو، یەکێ لە خوێندکارەکانی زانکۆ، ببێ بە ئەندامی لیژنەی ناوچەی (پارتی)، بۆ ئەو کارەش، من یەکەمین کەس بووم، بە تێکڕای دەنگ پاڵێورام. بەڵام ئەو بڕیارە، هەر جێبەجێ نەکرا!

بە ئەو شێوەیە، ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، لەلایەکەوە (پارتی)، پتر بڕوای خۆیان پێدەدامێ. لەلایەکی دیکەشەوە، ئەرکەکانی سەرشانم زیادیدەکرد. هەرچەندە لای من ڕێکخستنەکەی (کاژیک) گرنگتربوو، هەموو توانایەکم، هەر بۆ ئەو تەرخانکردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، (پارتی) و (قوتابیان)یش، کاتی خۆیان نەبردم و وەک کانییەکیش وابوو، وردەوردە، ئەندامە باشەکانمان لێ هەڵدەهێنجا، پێوەندییمان پێوەدەکردن و لە ڕیزەکانی (کاژیک)دا ڕێکماندەخستن!

## حەمەساڵح هیتلەر

ئەم پیاوە خێرنەدیوە، خەڵکی گەرەکی خۆمان بوو. جارێکیان خۆی بۆی گێڕامەوە و گوتی: کاتی خۆی کۆمۆنیستبووم، لە قوتابخانە وێنەی چەکوش و داسێکم، لەسەر کورسییەکەم هەڵکەندبوو، کەس هیچی پێ نەدەگوتم و ناووناتۆرەیان لێ نەدەنام. بەڵام کاتێ وازم لە پارتی کۆمۆنیست هێنا، ئەم جارەیان، خاچێکی هەڵگەڕاوەی نازییەکانی (ئەڵمان)م، لەسەر کورسییەکەم درووستکرد، کەچی یەکسەر ناوی (حەمەساڵح هیتلەر)یان بەسەردابڕیم!

مامۆستا (حەمەساڵح)، کوردێکی زۆر ڕووناکبیربوو. سەرەتا لە (پارتی گەلی کورد)دا کاریکردووە. پاشان ڕۆژی (27. 3. 1964)، ئەو پارتە لەگەڵ (کاژیک)دا یەکیانگرتووە، ئەویش بووە بە (کاژیک)، بەڵام خۆی دەیگوت: هەر زوو، وازم لە ئەو بەزمەش هێنا!

پیاوێکی سەیربوو، هەموو مێژوو و بیروباوەڕی ئایینە جیاوازەکانی خوێندبووەوە، بەتەواوی لە واتای ژیان تێگەیشتبوو. لە ئەو دواییانەدا، سەری بچووایە، نوێژی نەدەچوو. کەچی هەموو ئێوارەیەکیش، دوای نوێژی خەوتنان، لە یانەی مامۆستایان، چارەکە عەرەقەکەی خۆی دەخواردەوە!

گەلی ئێوارە دوای نانخواردن، هێندێ جار دووقۆڵی، هێندێ جاری دیکەش، لەگەڵ هەردوو مامۆستای کۆچکردوو دوکتۆر (حەمەی مارف) و (حەمەئەمین حەسەن کاکەیی)دا، بەنێو شاردا پیاسەماندەکرد. ئەوان سەبارەت هێندێ بابەتی جیاجیای هەمەچەشنە، دەمەتەقێیاندەکرد، من پتر گوێگربووم، بەتایبەتی کاتێ هەردوو مامۆستا (هێلەر) و (کاکەیی) دەسیانپێدەکرد، زۆر چێژم لە قسەکانیان دەبینی و کەڵکم لێ وەردەگرت. چونکە هەردووکیان زۆر زیرەکبوون و زانیارییەکی زۆر، لە مێشکیاندا کەڵەکەبووبوو. هەروەها لە بیروباوەڕ و ئایینیشدا، دژی یەکدی قسەیاندەکرد، چونکە یەکەمیان نەتەوەیی و موسوڵمان، دووەمیشیان کۆمۆنیست و کاکەیی بوون!

شەوێکیان دووقۆڵی پیاسەماندەکرد، زۆر گەڕاین و دواییش بە یانەی مامۆستایان شکایەوە. (حەمەسالح) لە ئەو دواییانەدا، خوویەکی هەبوو، کاتێ بۆ شوێنێ دەچووین، یەکسەر دەیگوت: دەچین بۆ چاخانە، بەڵام هەر کەس پارەی چای خۆی دەدا. ئەو شەوەش گوتی: با بچین بخۆینەوە، بەڵام ئەم جارەیان، هەر کەس لەسەر خۆی نا، بەڵکوو دەبێ، لەسەر من بێ. گوتم: بۆ لە یاساکەی خۆت لادەدەی، چی قەوماوە؟! گوتی: نەخێر لام نەداوە، بەڵام زۆرم گەڕاندی، هەقت بۆ دەکەمەوە!

چووین و دانیشتین، گوتی: تۆ لە ئەو باوەڕەدای، کورد بە هیچ بێ؟! گوتم: نازانم، خۆ من لای خوا نەهاتوومەتەوە. گوتی: کەواتە بۆ کاری ڕامیاری دەکەی، کە هیچ نازانی؟! گوتم: ئەدی تۆ دەڵێی چی؟ گوتی: من دەڵێم، بە هیچ نابین و شەڕیش بێتەوە، لەسەر ئەو جادانە ڕامکێشن، ناچمەدەرەوە. چونکە باوەڕم بە ئەو پیاوانە نییە. ئیدی هەروا بەدەم مشتومڕەوە، شەوێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد.

## ساڵی ( 1972 )

مانگی یەکی ساڵی (1972) بوو، تاقیکردنەوەکانی کۆرسی یەکەم دەسپێکرد. جگە لە وانەی کیمیا، هەرچی چۆنێ بوو، لە هەموو وانەکانی دیکەدا دەرچووم. ماوەی دوو هەفتە پشووماں وەرگرت، بەڵام بۆ من تەنیا هەر، لە خوێندن پشوومبوو، ئەگینا وەک خوێندکارەکانی دیکەی هاوڕێم، لەبەر کاری پارتایەتی و ڕامیاری، چێژم لێ نەدی. بەئارەزووی دڵی خۆم نەگەڕام و ڕام نەبوارد. بگرە ئەندامانی لیژنەکەمان، بە ئیشی قوتابییانەوە خەریکبووین و هێندێ ڕۆژیش، هەر لە زانکۆ بووین.

هەرچەندە زانکۆکەمان، تەمەنی (4) ساڵی دەبوو، لەچاو زانکۆکانی دیکەی (عێراق)دا، کۆرپەیەکی ساوابوو. بەڵام لە ئەو بڕوایەدام، خۆشترین زانکۆبوو، چونکە زۆر دڵگیر و جوان بوو، ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، بەرەو پێشکەوتن دەڕوێ، سەرۆکایەتی زانکۆ هەمیشە

خەریکبوون، پۆل و هۆڵی گەورەی نوێیان دروستدەکرد، بەش و کۆلێژی تازەیان دەکردەوە، کێڵگەکانی (بەکرەجۆ)، بەتەواوی ئاوەدانبووبوونەوە، چەندین کرێکار و کارمەند، کاریان تێدا دەکرد. جگە لە بەرهەمێکی زۆری کشتوکاڵ، شوێنێکی باشیشبوو، بۆئەوەی خوێندکارانی کۆلێژی کشتوکاڵ، سەردانیبکەن و بەکردەوە، پرۆسەکانی کشتوکاڵ ببینن و فێربن، لە هەموو دەوڵەتەکان و نێوەندەکانی ئەکادیمیای جیهانەوە، پشگیریدەکرا و داتی پێدانرابوو.

لەبەرئەوە پۆلپۆل کادیرە ئەکادیمیکە ئاوارەکانی کورد، بۆ زانکۆ و نیشتمانەکەی خۆیان دەگەڕانەوە و کاریاندەکرد، مانگ نەبوو، لە دەوڵەتەکانی دەرەوە، کەرەسەی نوێی تایبەتی، بۆ تاقیگەکانی زانکۆ نەیەت. جموجۆڵ و چالاکییەکی سەیر، لەنێو زانکۆدا دەبینرا. هەمیشە یاری وەرزش، ئاهەنگگێران، سەیران و گەشت، لەنێوان کۆلێژەکانی زانکۆ و زانکۆکانی دیکەی شارەکانی (عێراق)دا ڕێکدەخرا. ئیدی بە شێوەیە بوو، کاتی خوێندکاران بەیانیان دەچوون بۆ زانکۆ، حەزیان نەدەکرد، بەجێیبێڵن و بڕۆنەوە، بەڵکوو زۆربەی ڕۆژ، تا ئێوارە دەمانەوە و بێتاقەتیش نەدەبوون، بەتایبەتی ئەوانەی سەودای ئەڤین لە کەللەی دابوون و گرفتاری داوی خۆشەویستی پەریزادێ بووبوون. کەچی نازانم، ئێستە بۆ وای لێهاتووە، هەر لە زانکۆ ناچی! بۆچی سەرکردەی پارتەکان، وەک هەموو دەزگە و بەڕێوەبەرایەتییەکانی دیکەی (کوردستان)، زانکۆشیان تووشی نەخۆشی (پارکینسۆن) نەکردووە و جومگە سەرەکییەکانیان تێک نەشکاندووە؟!! بۆچی نەیانتوانیوە، ئەو دەسکەوتە گرنگ و مەزنانە بپارێزن؟! ئاخر نەتەوەی کورد، تا سەرەتای ساڵەکانی (**1925**)یش، لە هەموو مێژووی خۆیدا، نەک هەر زانکۆی نەبووە، بەڵکوو قوتابخانەی سەرەتاییشی بە خۆیەوە نەدیوە!

پشووی نیوەی ساڵ تەواوبوو، دەستەدەستە لە هەموو لایەکەوە، خوێندکاران بۆ کۆلێژەکانی خۆیان گەڕانەوە. زانکۆ و شارەکەیان جەنجاڵ و ئاوەدانکردەوە. دووەمین یادی ڕێککەوتننامەی (**11. 3. 1970**)مان، لە زانکۆ و شارەکەدا، بە جوانترین شێوە کردەوە. زۆر بە گەرمییش، پێشوازیمان لە جێژنی (نەورۆز) کرد و وەک جێژنێکی نەتەوەیی کورد، ڕێزمان لێ گرت.

ئەو ساڵەش بۆ یەکەمین جاربوو، زانکۆی (سولەیمانی)، فیستیڤاڵی ساڵانەی خۆی دەسپێبکا، هەموو بەش و کۆلێژەکان، زۆر بە شێوەیەکی جوان ڕازابوونەوە، زۆربەی خوێندکارە کوردەکانی زانکۆ، بە جلوبەرگی کوردی ڕەنگاوڕەنگەوە ئامادەبوون و خۆیان ڕازاندبووەوە. خوێندکاران زۆر بەگەرمی، پێشوازییان لە میوانەکان دەکرد، کەرەسە و ئامێری زانستانە، لە بەشەکاندا دانرابوون، پیشانی میوانەکانیان دەدا و بۆیان

باسدەکردن. ئیدی بە ئەو شێوەیە، فیستیڤاڵ ماوەی (3) ڕۆژی خایاند. دەرگەکانی زانکۆ بۆ میوانەکان، لەسەر گازی پشت بوو، وەک دەڵێن، هێندە میوان هات، ڕێ بەر ڕێبوار نەدەکەوت!

## بابەکر پشدەری

ڕۆژێکی زستانی ساڵی (1972) بوو، لەناکاو (سەروەت)ی هاوڕێم، تێلیفۆنی بۆ کردم و گوتی: کارێکی زۆر پەلە و پێویست هەیە، بە تێلیفۆن ناکرێ و دەبێ، هەر ئێستە بتبینم. منیش دەمودەس، بۆ جێی دیاریکراو ڕۆیشتم و یەکدیمان بینی.
گوتی: (شێخ مەنسووری حەفید – پارێزەر)، پێوەندی پێوەکردووم و داوای لێ کردووم، هاوکاری لەگەڵ بکەم و پێکەوە سەردانی (بەغدا) بکەین، تا چاومان بە (بابەکر پشدەری) بکەوێ، بەڵام نازانم، مەبەست لە ئەو بینینە چییە. منیش گوتم: هەر ئێستە، هەمووی بنووسە و چاوەڕوانی فەرمانی سەرکردایەتی (کاژیک) بکە، تا بزانین، چی دەڵێن. هەر ئەو ڕۆژە نامەکەیم گەیاند. بەیانی زوو وەڵامەکەی هاتەوە و (5) دیناری ئەو سەردەمەشیان بۆ ناردبوو. ڕۆژی دوایی، لەگەڵ (شێخ مەنسوور)دا، بەرەو (بەغدا) سواربوون و ڕۆیشتن.
دوای هەفتەیە هاتەوە و لە ئەو بارەیەوە، ڕاپۆرتێکی درێژی بۆ سەرکردایەتی نووسی. بەڵام ئەوەی بەدەمی بۆ منی باسکرد، ئەوەبوو، لەگەڵ (بابەکر) و یەکێکی دیکەدا، لە قاوەخانەی (بەرازیلی) لە شەقامی (ڕەشید)، هەر چواریان چەن جارێ یەکدیان دیبوو. (بابەکر) باسی بارودۆخی (کوردستان) و (عێراق)ی بۆ کردبوون. گوتبووی: لەسەرداسەدێ جەنگ لە نێوان کورد و میریدا دەسپێدەکاتەوە، (بارزانی) تێکدەشکێ، چونکە سەرکردایەتی (بەعس)، باوەڕیان پێی نییە. لەبەرئەوە بەڵێنیانداوە، ئۆتۆنۆمییەکە بە ئێمە بدەن. هەروەها داوایان لێ کردبوون، هاوکارییان لەگەڵ بکەن، پێوەندی بە خەڵکەوە بکەن و لە (کوردستان)، ڕێکخستنێکی نوێ دامەزرێنن. ئێمەش پەیمانماندانێ، هاوکارییان لەگەڵ بکەین.
دوای ئەوەی هەردووکیان لە (بەغدا) گەڕانەوە، بەرەو (تەوێڵە) ڕۆیشتن و چاویان بە ڕەوانشاد (فەتاح ئاغا) و هێندێ بەرپرسی دیکەی شۆڕش کەوتبوو. ئەوانیش پلانی تەواویان بۆ دانابوون و جارێکی دیکەش، سەردانی (بەغدا)یان کردەوە.
ئەوی ڕاستییێ، (سەروەت) ئەنجامی هەموو هاتوچۆ و پێوەندییەکانیان، بە ڕاپۆرت دەنووسی و منیش، بۆ سەرکردایەتی (کاژیک)م دەنارد. بەڵام لە ئەوە پتر نازانم، چییان باسکردبوو، چیشیان بڕیاردابوو! چونکە هیچ هاوبیری بۆی نەبوو، ئەو ڕاپۆرتانە

بکاتەوە و بیانخوێنێتەوە، تا بزانێ، چییان تێدا نووسراوە. لەگەڵ ئەوەشدا هێندەم بیرە، لە دوا دانیشتنیاندا، هەردووکیان لای (بابەکر) ئاشکرابووبوون، کە پەیوەندییان بە بەرپرسانی شۆڕشەوە هەیە. ئەوەی باشبوو، (مەنسوور) ترسی لەسەر نەبوو، چونکە لەگەڵ (بابەکر)دا، لە کۆنەوە ناسیاوبوون، بەڵام (سەروەت) ترسا، لەبەرئەوە (پارتی)، ناردی بۆ (قەرەداغ) و ماوەیە لە ئەوێ کادیربوو.

## کۆچیدوایی شێخ لەتیفی حەفید

هێشتا هەر سەرمەستی یادەکانی هەردوو مانگی (مارس) و (مای) بووین، لە گەرمەی خۆشی، سەیران و بەزموڕەزمەکانی بەهاری تەڕ و سەوزدا بووین، هەواڵی کۆچیدوایی (شێخ لەتیف)مان پێگەیشت. ڕۆژی (21. 5. 1972)، لە یەکێ لە نەخۆشخانەکانی شاری (بەغدا)، بە نەخۆشی ماڵاوایی لێ کردین. هەموو خزمان و دۆستانی (شێخ)، خۆیان ئامادەکرد، بەپیر تەرمەکەیەوە بچن، لە ناشتن و پرسەکەیدا بەشداربن. بەڵام (پارتی) بە فەرمی، بە دۆست و ئەندامەکانی خۆی ڕاگەیاند، بەشداری لە پرسەکەیدا نەکەن. هەرچەندە ئەو کاتە، لە دوای سەربانەکەی (سیتەک)ی ڕۆژی (14. 3. 1970)وە، هیچ جۆرە پەیوەندییەکم، لەگەڵ (شێخ کاوە) نەمابوو، ئەو ماوەی دوو ساڵ و سێ مانگە، بە ڕێکەوتیش تووشی یەکدی نەبووین. جگە لە ئەوەی، من ئەندامی ڕێکخراوی قوتابیان و لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی (ی. ق. ک.)ی (سولەیمانی)ش بووم، بەڵام ئەو فەرمانەی (پارتی)، یەک تۆز کاری تێ نەکردم و وەک پێویست، بەشداری پرسەکەم کرد و ئەرکی سەرشانی خۆم جێبەجێکرد.
زۆربەی خەڵکی شار، شێخانی ناوچەکانی (کوردستان)، تیرە و هۆزە کوردەکان، زۆر بە پەرۆش و گەرمییەوە، پێشوازییان لە تەرمەکەی کرد. پرسەکەی بە شێوەیە بوو، تا ئێستە لە ماوەی ئەم پەنجا ساڵەی مێژووی شاری (سولەیمانی)دا، پرسەی وا جەنجاڵم، بە چاوی خۆم نەدیبوو. (3) ڕۆژ لە هۆڵە گەورەکەی (مزگەوتی گەورە)، بۆی دانیشتین، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، خەڵک پتر ڕووی تێ دەکرد. دوای بانگ و نوێژی بە کۆمەڵی مزگەوتیش، هەر تاوە ناتاوێ، لەسەر مێژووی ژیان و تێکۆشانی (شێخ)، چەندین گوتاری گرنگ و پڕ بایەخ، لە بڵندگۆی مزگەوتەکەوە دەخوێنرایەوە و بە دەنگە گەورەکەی، شاری پڕکردبوو.
کاتێ ئەندامانی لقی (4)ی (پارتی)، ئەو پەرۆشە گەورەیەی کۆمەڵانی خەڵک، ئەو ئاپوورە زۆرە بێسنوورەی خەڵکی شار و هۆزەکانی کوردیان بینی، هەر تووشی هیستریا بوون! ئینجا نوێنەرێکی بارەگەی (بارزانی) هات و لقی (4)یش، دوارۆژی پرسەکە هاتن و ویستیان، هەڵیانسێنن. بەڵام (کاوە) و شێخان ڕەتیانکردەوە، داواکەی (سەرداری حەمە ئاغا)یان پەسەندنکرد.



(1972 – 1913)

سالی (1964) لە شارۆچکەی (قەڵادزێ) گیراوە

(شێخ لەتیف)، هەرچەندە بەبەردەوامی، لە گوندی (سیتەک) دانیشتبوو، سەری خۆی کزکردبوو، خۆی لە کاری رامیاری و شۆڕش هەڵ نەدەقورتاند. بەڵام هێندەی بەسەر هەموو لایەکەوە هەبوو، هێندە بێ جیاوازی، راژەی خەڵکی کردبوو، هێندە دالدەی پەناهێنەرانی لیقەوماوی دابوو، جگە لە ئەوەی (پارتی) دەبوایە، ڕێزیان لە گۆڕەکەی باوکیان بگرتایە، خۆشی کوردێکی تێکۆشەر و نیشتمانپەروەر بوو، پیاوی ئەوە نەبوو، بە ئەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن!

ئاخر نازانم، هۆی چی بوو، هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە، (پارتی) دژایەتیاندەکرد؟! خەڵکیان هاندەدا، لە گوندەکانیدا ئاژاوەبنێنەوە. وەنەبێ، ئەو ئاژاوەنانەوەیەش، لەبەر خاتری چاوی کاڵی جووتیاران بووبێ، یا دژی پیاوێکی دەرەبەگی وەک (شێخ) تێژیان کردبێ. بەڵکوو (شێخ) لەگەڵیاندا نەبوو، خۆشی نەدەویستن و هەنگاوەکانیانی، بە هەڵە دەزانی، بۆیە دژایەتییاندەکرد.

لەبەرئەوە کادیرەکانی (پارتی) ڕاسپێررابوون، ناوی (شێخ) بە خراپە بێنن و سووکایەتی پێ بکەن. ئاخر، قسە نەستەقەکەی (شێخ)، تا ماوەیەکی زۆریش، لەنێوخەڵکدا هەر دەگوترایەوە. کادیرێ ویستبووی، لەرێی پیاوەکانی (شێخ)ەوە، قسەی ساردوسووکی پێ بڵێ. (شێخ)یش بانگیکردبوو، پێی گوتبوو: کوڕم! کاتێ من کوردایەتیم کردووە، تۆ لە سکی دایکتدا، توقووڕچت لە کێری مشتەری دەگرت!

## ڕەفیق پشدەری

دووەمین ڕۆژبوو، لە گەرمەی پرسەکەدا بووین، (کاوە) دیارنەما، پرسیم: لە کوێیە؟ گوتیان: زۆر ماندووبوو، بورایەوە و لەگەڵ باوکت ڕۆیشت. دوای پرسەکە چوومەوە بۆ ماڵەوە. دایکم گوتی: (کاوە) لە سەرەوە لە ژوورەکەی تۆ نووستووە. منیش سەرکەوتم و بینیم، لە سەربانەکەی بەردەمی ژوورەکەم، (بەکری مەلاسەعیدی شۆفێری شێخ، دوکتۆر لاوچاک حەفید) و چەن پیاوێکی خۆیان دانیشتبوون و چاوەڕێیاندەکرد، هەستێ.

دایکی (بەکر)، شیری بە (شێخ لەتیف) دابوو، واتە شیربرای بوو. (شێخ) هەر لە (سیتەک) بوو، لەبەرئەوە (بەکر) هەر لەگەڵ (کاوە)دا بوو. بەڵام کاتێ تووڕەدەبوو، جنێوی خۆی دەدا، سویچی قەمەرەکەی فڕێدەدا و دەڕۆی، تا ئاشتیان نەکردایەتەوە، نەدەگەڕایەوە!

پاشان چوومەخوارەوە، چاوەڕێی هاوڕێی خوێندکارەکانم (شیروان نووری غەفوور، ئاراسی کەریم حەداد و عەلی حەمەرەشید)م دەکرد، بێن و پێکەوە دانیشین، وانەی فیزیا بخوێنین، چونکە نزیکی تاقیکردنەوەکانی کۆرسی دووەم بووبووینەوە.

لەپڕ پیاوێکی چوارشانەی تێکسمراوی بەخۆ هات، دەستی جلی کوردی لەبەردابوو، جامانەیەکی بەستبوو، شێوەکەی لە (پشدەری) دەچوو، هەر بە ئەو شێوە زمانەش سلاوێکرد و هەواڵی (کاوە)ی پرسی. چووەسەرەوە و (کاوە)یان بۆ خەبەرکردەوە، خۆی بە ژووردا کرد و دەرگەیان داخست. نازانم، چۆن زانیبووی، (کاوە) لە ماڵی ئێمە پشوودەدا؟!

لە (بەکر)م پرسی، ئەوە کێ بوو؟ گوتی: (ڕەفیق پشدەری)ە. من لە مێژبوو، ناوی ئەو پیاوەم بیستبوو، بەڵام پێشتر نەمدیبوو. لەگەڵ ئەوەشدا دەمزانی، پیاوێکی باش نییە و سەر بە دەزگەی سیخووڕی دەوڵەتە. هەرچەندە نەمزانی، بۆچی هاتووە و چییان باسکردووە، بەڵام زۆرم پێ ناخۆشبوو، لای (کاوە) بینیم، بەتایبەتی لە ماڵی ئێمە، ئەوچاوپێکەوتنە ڕوویدا!

دوای ماوەیە کابرا ڕۆی. برادەرەکانیشم هاتن و لە دەرەوە چاوەڕێیاندەکرد. سەرکەوتم و دەرگەی ژوورەکەم کردەوە، (کاوە) لە جێگەکەی من ڕاکشابوو، خەو بەریدابوو، هەستا و یەکدیمان ماچکرد. منیش سەرەخۆشیم لێ کرد. دەسی بۆ پەرتووخانەکەم ڕاکێشا و گوتی: ئەم هەموو پەرتووکانە چین؟! هەموویانت خوێندووەتەوە؟ تۆ لە کۆلێژی کشتوکاڵی یا لە یاسا دەخوێنی؟! کەمێ قسەی ئاسایمان کرد، پاشان نانمانخوارد. لەپڕ پیاوێ هات و بە گوێیدا چرپاند، ئەویش بەپەلە خۆی گۆڕی و گوتی: بتبینمەوە و ئیدی ڕۆی. بەڵام نەمزانی، چی پێ گوت، کێی دیکە چاوەڕێیدەکا و بۆ کوێ

دەچی، وا بە ئەو پەلەپەلە دەربازبوو؟! ئیدی لە ئەو کاتەوە، ئەو پیاوەم بیتی، دڵم لێی کرمیبوو. پاشان هاورێکانم هاتنەسەرەوە و ئەو شەوە، بەدەم کۆششکردنەوە، کاتێکی خۆشمان بەسەربرد.



(1982 – 1950)

پرسە لە مزگەوت تەواوبوو، بەلام تا یەک مانگیش، لە ماڵەوە هەر دانیشتین، پەیتاپەیتا لە هەموو (کوردستان)ەوە، خەڵکێکی زۆر دەهاتن. ئیدی بە ئەو شێوەیە، دوای پتر لە دوو ساڵ زویربوون، پرسەکەی باوکی ئاشتیکردینەوە و ئەم جارەش، یەککەوتینەوە، تا لە شاریش بوو، زووزوو سەرم لی دەدا. رۆژی پێش ئەوەی، لەگەڵ دایکیدا بەرەو (سیتەک) برۆن و لە ئەوێش، جارێکی دیکە پرسە بۆ باوکی دانێن، چووم بۆ لای و گوتی: هەر ئاقیکردنەوەکانت تەواوبوو، دەبێ، سەرم لی بدەی، دەمەوێ، هێندێ قسەت لەگەڵ بکەم. بەلام بەداخەوە نەمتوانی، لە کاتی پێویستی خۆیدا بچم، بۆیە ئێستەش نەمزانی، ئیشەکەی چی بوو، یا گەر بچوومایە، چی بۆ باسدەکردم؟!

## شێخ کاوە و کاژێک

ئەز زۆر بەراشکاوی دەڵێم: هەموو ئەو شتانەی، لە ئەو ماوەیدا، لە پرسەکە و ماڵی خۆمان بیستم و بینیم، هەموویم بەدەمی بە (کاژیک) گەیاند. بەلام لای (پارتی)، هیچ شتێکم نەدرکاند، چونکە نەک هەر بە هیچ شێوەیە، بڕوام پێیان نەبوو، بەڵکوو دەشترسام، بۆ سبەینێ هەر خۆیان، هەمووی بۆ (کاوە) بگێڕنەوە!

دوای ماوەیە، سەرکردایەتی (کاژیک) بەدەمی، وەلامیان بۆ ناردم و گوتیان: خۆت لە (کاوە) نزیککەرەوە و هەولبدە، بە لای خۆماندا رایکێشی. ئیدی منیش، ئەو کارەم بەتوندی گرت و زووزوو، نامەم بۆ دەنووسی. کاتێ لە (سولەیمانی)ش بووایە، سەردانمدەکرد و بەپێی کاتی خۆی، پێکەوە دەبووین و قسەم بۆ دەکرد. هەرچەندە گوێی بۆ شلدەکردم، بەلام لە ئەو بڕوایەدا نەبووم، قسەکانی منی بە دڵ بووبێ، یا خۆی بەکەلکی کاری رامیاری بێ، چونکە ئەو هەر خەریکی گاڵتەکردن بوو، بیری لای خۆشی ژیان و رابواردن بوو!

دوای ماوەیە، (کاوە) لە مەبەستەکەم تێگەیی و زۆر بە روونی گوتی: (فەتاح ئاغا) بۆ پرسەکەی باوکم هات بۆ (سیتەک)، زۆر دڵنەواییکردم و گەلێ قسەی جوانی بۆ کردم. من هەموو بیروباوەڕەکانیم بە دڵە، چونکە بیروباوەڕەکانی هەموو ئامانجەکانی (شێخ مەحموود)ی باپیرمە. بەلام زۆر بیروباوەڕێکی سەخت و گرانە، بۆ ئەم رۆژە دەس نادا و سەرناگرێ. کاتێ ئەم قسانەی بۆ دەکردم، تەماشایدەکردم و پێدەکەنی.

هەرچەندە تا ئەو کاتە، تەنیا هەر باسی مێژوو و شۆڕشەکانی کورد، باری نەتەوەیی و رامیاری (کوردستان)، درندەیی داگیرکەران، بێتوانای و بێدەسەلاتی سەرکردایەتی کوردم بۆ کردبوو، ئەگینا هیچ شتێکی نهێنیم، بەئاشکرا نەدرکاندبوو. چونکە ئەوە شێوازی کارکردنی ئێمە نەبوو، هەرچی هەیە، یەکسەر باسیکەین، خەلک بۆ سەر رێ و باوەڕەکەمان بانگکەین، بەلکوو دەبووایە، پێش ئەو ماوەیە، بە شێوەیەکی ئاراستەوخۆ و وردەوردە، هەموو شتێکی بۆ روونکرێتەوە، ئینجا گەر زانرا، ئەو بیروباوەڕەی بۆ هەرسدەکرێ، ئامادەی کارکردن و گیانفیدایی هەیە، ئەوا تەنیا هەر ئەو کاتە دەتوانرێ، بەئاشکرا سەرەداوی ئەو باسەی لەگەل دامەزرێنرێ و هەموو شتێکی بۆ روونکرێتەوە. بەلام ع ئەویش و ع منیش، ئەو خورمایەی خواردبوومان، دەنکەکەیمان لە گیرفانی یەکدیدا بەجێهێشتبوو. لەبەرئەوە دەمانزانی، چی دەڵێین و چیمان لە یەکدی دەوێ!

لەگەل ئەوەشدا باش تێگەیشتبووم، (کاوە) نایەوێ، بەتەواوی خۆی بە هیچ لایەکەوە ببەستێتەوە، بەتایبەتی لەگەل (کاژیک)دا، چونکە جگە لە ماندووبوون و چەرمەسەری زیاتر، هیچ جۆرە بەرژەوەندی و کەلکێکی، نەک هەر بۆ ئەو، بەلکوو بۆ هیچ کەسێکی دیکەشی تێدا نەبوو. ئەویش تاقەتی ئەو کوردایەتییە خەستوخۆلەی نەبوو، وەک باپیری دەرویش ئاسا، شانی بداتە بەر، تاڵ و کرمێش لەسەر خۆی بێ. بەلام لە وەلامدا، هەر هێندەم پێ گوت: کوڕێ تا دەمرێ، هەر بەتەمای دووچاوی ساغە، منیش ئەوڕۆ ئەو کوڕەم و هیوای هەرە گەورەم ئەوەیە، (کوردستان) ئازاد و سەربەخۆ بێ!

## گومان و بێباوەڕی

دوای ئەوەی دواهەواڵم گەیاند، لێپرسراوەکەم (فەرهاد عەبدولحەمید) هات و گوتی: لە سەرکردایەتییەوە پێیان ڕاگەیاندووم، (کاوە) پێوەندی لەگەڵ (بابەکر پشدەری) و (ڕەفیق پشدەری) هەیە. چەن جارێکیش لە (سولەیمانی) و (بەغدا)، لەگەڵ لێپرسراوانی (ئەمن) و (موخابەرات) دانیشتووە. بەڵام جۆری پێوەندییەکەی نازانین، چۆنە. بەڵکوو هەوڵی لەگەڵ بدەی و جۆری ئەو پێوەندییەمان بۆ ڕوونکەیتەوە.

بەڕاستی، ئەو هەموو بایەخەی سەرکردایەتی (کاژیک)، بە (شێخ کاوە)یان دابوو، زیاد لە پێویست و قەبارەی خۆی بوو. بۆیە هەر زوو لە ڕێکخستنەکە و سەرکردایەتیش، گومانم پەیداکرد، لە هەموو ڕاپۆرتەکانی هەفتانەمدا، گەلێ پرسیارمدەکرد، هێندێ جار وەڵامم دەستدەکەوتەوە و هێندێ جاری دیکەش، خۆیان لێ دەکرد بە کەڕەی شاڵی! هێندێ لە وەڵامەکانیانم بە دڵبوو، بڕواشم بە هێندێکی دیکەیان نەبوو. بەڵام بۆ چارەسەرکردنی ئەو بارە نالەبارەی نێوانمان، بۆئەوەی هەموو ڕاستییەکان، سەبارەت بە (کاژیک) بزانم، گەلێ جار داوای کۆنفرانس یا کۆنگرەم دەکرد. ئەوانیش دەیانگوت: چاوەڕێی وەڵامی سەرکردایەتی بکە و ئەوا پتر لە (**45**) ساڵ، بەسەر ئەو پرسیارانەدا تێپەڕیبوو، سەرکردایەتی نەک هەر وەڵامی نەدامەوە، بەڵکوو (کاژیک)یش نەما!

جگە لە ئەوەی، کەرەسەی ڕۆشنبیری نوێیان نەبوو، تەنیا هەر نووسراوە کۆنەکانی ساڵانی شەستەکانیان بۆ دەناردین. کاتێکیش لە ئەو بارەیەوە دەمپرسی، دەیانگوت: کەرەسەی بیروباوەڕ، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیا، کۆن نابێ و لە هەموو سەردەمێکدا، وەک خۆراکێکی گیانی بەکاردێنرێ و کەڵکی لێ وەردەگیرێ. منیش بڕوام بە ئەو وەڵامانە دەکرد، چونکە تەماشای ئایینی ئیسلامم دەکرد و لێکمدەدایەوە، چۆن پێش (**1400**) ساڵ، قورعان بۆ پەیامبەر هاتووە، وەک موسوڵمانەکان دەڵێن، یەک پیتی لێ زیاد و کەم نەکراوە، نەگۆڕاوە و هەر وەک خۆی ماوەتەوە، موسوڵمانەکانیش باوەڕیان پێی هەیە و کەسیش داوای شتی نوێیان لێ ناکا! بە هەمان شێوەش، لە فەلسەفەی مارکسیزمم دەڕوانی، هەمان لێکدانەوەم بۆ دەکرد و بە ئەو شێوەیە، خۆمم هەڵدەخەڵەتاند!

بۆیە ئەو داواکارییەی سەرکردایەتی (کاژیک)، سەبارەت بە (کاوە) لێیان کردم، بە بیانووی ئەوەی کەم دەیبینم، ڕەتمکردەوە. چونکە ئەو کاتە، هەموو کەس دەیزانی، (شێخ موحەممەدی هەرسین) و (موحەممەدی عەزیز)، سەر بە (کاژیک)ن، لە بارەگەی (بارزانی) کاردەکەن و یەکەمین باوەڕپێکراوی سەرۆک (بارزانی)شن. لەبەرئەوە گومانم پەیداکرد، ئەو زانیارییانە بۆ سەرکردایەتی (کاژیک) بێ، بەڵکوو بۆ دەزگەی پاراستن یا بارەگەی (بارزانی) بێ. منیش لەلایەکەوە، ئەوەم بە سیخووڕی دەزانی و لە هەموو

ژیانیشمدا، سیخوڕیم بۆ هیچ کەس و لایەنێ نەکردووە، زۆر بە چاوێکی سووکیشەوە، لە ئەو جۆرە کەسانەم ڕوانیوە. لەلایەکی دیکەشەوە، زۆر ڕقم لە ئەو دوو دوومەڵە گەورەیەی (پاراستن) و (بارەگەی بارزانی) بوو، کە لەسەر دڵی (پارتی) هەڵتۆقیبوون!

شایانی باسە، هەردوو ناوبراو (شێخ موحەممەدی هەرسین) و (موحەممەدی عەزیز)، ڕۆژی (**2. 7. 1962**)، لە شاری (سولەیمانی) بە دووقۆڵی، (پارتی گەلی کورد)یان دامەزراند. نزیکەی ماوەی (**2**) ساڵ خەباتیانکرد و لە بوژاندنەوەی هەستی نەتەوەیی ڕۆڵەکانی گەلی کوردا، ڕۆڵێکی باشیان بینی.

بەلام (کاژیک) پێشتر هەبوو، ڕۆژی (**14. 4. 1959**) دامەزرابوو. لە ئەنجامدا ئەم دوو پارتە، لە یەکدی نزیکبوونەوە و ڕۆژی (**27. 3. 1964**) یەکیانگرت. ئەندامانی هەردوو پارت تێکەلابوون و ئەو دوو هاوبیرەش، بوون بە ئەندامی سەرکردایەتی (کاژیک).



موحەممەد عەزیز قادر (خاڵەحەمە)



شێخ موحەممەدی هەرسین
( **1979 – 1927** )

* * *

## سەرەتای گرفتە گەورەکە

هەر دوای ئەوەی، پرسەکەی (شێخ لەتیف) تەواوبوو، (جەمال قاسم)م بینی، گوتی: سبەینی لە لیژنەی ناوچە چاوەڕێتدەکەم، هێندێ شت هەیە، پێکەوە باسیدەکەین. بەیانی چووم و بینیم، (شێخ رەووفی شێخ عارف، حەمەڕەحیم * و جەمال قاسم) دانیشتبوون. سلاومکرد، زۆر بە ساردی وەلامیاندامەوە. ماوەیە دەنگ نەبوو، پاشان (خالەحاجی)، ڕووی دەمی تێکردم و بە تروفیزێکەوە گوتی: تۆ خۆت بە ئەندامی (پارتی) دەزانی؟!
گوتم: تا ئەم کاتەش، بەڵێ. گوتی: ئەی بۆچی جنێوت بە (بارزانی) داوە؟
منیش وەک لە بانی بەرمیەنەوە و تێگەیشتم، داخی شتێکی دیکەم پێ دەڕێژن، ئەگینا من و جنێودان بە (بارزانی)، کوجا مەرحەبا! گوتم: کێ ئەو هەواڵە درۆیەی پێ گەیاندوون؟ گوتی: دوکتور (موحسین).* ئیدی بەتەواوی کێشەکەم لا ڕوونبووەوە، چونکە پێش یەک دوو ڕۆژ پێکەوەبووین و لەسەر هێندێ بابەت، دەمەتەقێیەکی گەرمان کرد.



( 1994 – 1948 )

---

* (حەمە) کوری (رەحیم سمیل)ە بوو. باوکی لە کارگەی چیمەنتۆی (سەرچنار) کرێکاربوو. سەرەتا بە (هەڤاڵ جووجەڵە) و دوای شۆرشی ئیسلامی (ئێران)یش، بە (خاڵەحاجی) ناسرابوو. جگە لە خۆی، دوو برای دیکەشی کوژران. لە ئەم نووسینەدا، لەبری ناوی راستەقینەی خۆی و هەڤاڵ (جووجەڵە)، هەر بە (خاڵەحاجی) ناویدەبەم!

* دوکتور (موحسین) خەلکی (کۆیە) بوو، خزمی (عەلی عەبدوڵلا) بوو. پزیشکی ڤێتێرنێری بوو، لە (سولەیمانی) دامەزرابوو. بەهۆی دوکتور (عەبباس) و (خەسرەو گوڵ موحەممەد)ەوە ناسیم. لە ماوەیەکی کەمدا، زۆر لە یەکدی نزیکبووینەوە. یەکی لە ئەو هاوڕییانە بوو، ئومێدێکم پێی بوو، بیکەم بە (کاژیک)، کەچی وەک مار پێوەیدام!

سەبارەت پرسەکەی (شێخ لەتیف) گوتی: تۆ دەبووایە، وەک ئەندامێکی (پارتی)، گوێڕایەڵی فەرمانەکەی لقی (4) بوویتایە و نەچوویتایە. منیش زۆر سەیرم لێهات، چونکە بە ناوی (پارتی)ەوە، کەس هیچی بەفەرمی، بە من نەگوتبوو، نابێ، بەشداریی ئەو پرسەیەی ماڵی شێخان بکەی. ئەو پیاوە بێ ئەمەکە، ئەو قسانەی منی بە ناشیرینترین شێوە ڕازاندبووەوە، بەتایبەتی کاتێ ئەو ڕاپۆرتە سیخوڕانەیەی نووسیبوو، لە (سولەیمانی)ەوە بۆ (کۆیە) گوێزرابووەوە، چاوی بە چاوم نەدەکەوتەوە، تا دوو قسەی ڕەقی پێ بڵێم!

پاشان هەموو دەمەتەقێکەی نێوان خۆم و (موحسین)م بۆ گێڕانەوە. ئیدی (خالەحاجی) ئاگری لێ دەباری و گوتی: تۆ دەزانی، ئێمە چەن بڕوامان بە تۆ هەبوو؟ تەنانەت یەکەمین پاڵێوراوی لیژنەی ناوچەی (سولەیمانی) بووی، کەچی تۆ لە پشتەوە، خەنجەرمان لێدەدەی. لەبەرئەوە لە ئەم چرکەساتەوە، چالاکیی و ئەندامێتیت هەڵدەپەسێرین، تا بڕیاری کۆتایمان، لە کۆمیتەی ناوەندییەوە بۆ دێ و بەیەکجاری، لە (پارتی) دەردەکرێی، هەر شتێکیشت لێ ببیستین یا ببینین، ئەوا خۆت دەزانی، چیت لێ دەکەین. ئەمەیە دەڵێ: بیانووی تر نانی جۆیە!

منیش گوتم: تا ئەو کاتەی ئەندامی (پارتی) بم، هیچ کەسێ بۆی نییە، بە ئەو شێوە توندە، قسەم لەگەڵ بکا و هەڕەشەم لێ بکا. گەر ئێوە هێندە بەتەنگ (پارتی) و ناوی (بارزانی)ەوە دێن، بۆچی ڕۆژانە، بەدەیان کورد دەبن بە بەعسی و ناپاکی لە گەلەکەی خۆیان دەکەن، بانگیان ناکەن و هەڕەشەیان لێ ناکەن؟! گوتی: ئەوەیان ئیشی تۆ نییە، تەواو و هەستە بڕۆ دەرەوە.

ئەو کاتە (خالەحاجی)، لێپرسراوی دەزگەی پاراستن بوو. هەر خۆی هەموو شتێ بوو، کەسی بە پیاو نەدەزانی و تەنانەت ئەندامانی لقیش، ماستاویان بۆ دەکرد. (شێخ ڕەئووف)، زۆری پێ ناخۆشبوو، خۆی بەنووسینەوە خەریککردبوو. بەڵام نە ئەو و نە (جەمال قاسم)یش، یەک وشە لە دەمیانەوە دەرنەهات!

ئیدی بەتەواوی تێگەیشتم، ئەوانەی لە لیژنەی ناوچە کاردەکەن، وەک بووکەڵەی سەر شانۆ وان، (خالەحاجی) ئەکتەری سەرەکییە و بەئارەزووی خۆی هەڵیاندەسووڕێنێ، کەی ویستی، قورمیشیاندەکا، چۆنی بوێ، وایان هەڵدەپەڕێنێ، هەر کاتێکیش ویستی، قورمیشەکە خاودەکاتەوە، دەیانوەستێنێ! زۆر باشیش بۆم ڕوونبووەوە، هەر لە ساڵی (1964)ەوە، دووبەرەکییەکەی نێوان هەردوو باڵەکەی جەلالی و مەلایی، بەیەکجاری (پارتی) کوشتووە، هەرگیز پارت نەبووە و هەرگیزیش نابێتەوە بە پارت، تا ئەو جۆرە کەسانە، سەرکردایەتییەکەن، دەزگەی پاراستن و بارەگەی (بارزانی)ش، گەلێ لە (پارتی) گەورە و گرنگترن!

بەڕاستی، کاتی هاتمەدەرەوە، بەتەواوی وڕبووبووم. بڕوام نەدەکرد، ئەوە لە من ڕوویدا بێ. ئەوەتەی لە ڕیزەکانی (کاژیک)یشدا کارمدەکرد، بە هیچ شێوەیە، بڕوام بە (پارتی) نەمابوو. لە سەرەتای سالی (**1971**)یشەوە، چەن جاری داوام لە سەرکردایەتی (کاژیک) کرد، واز لە (پارتی) و (قوتابیان) بێنم، خۆم بۆ ڕێکخستنەکانی خۆمان تەرخانکەم، بەلام سەرکردایەتی ڕێیان نەدەدام. زۆر حەزمدەکرد، لە (پارتی) دوورکەومەوە، چونکە هەرگیز درۆم لەگەل باوەڕی خۆم نەکردووە و فێلیش لە باوەڕی خۆم ناکەم. بەلام حەزم نەدەکرد، بە ئەو شێوەیە، (پارتی) دەرمکا، بەلکوو پێم خۆشبوو، خۆم وازبێنم. چی بکەم؟ ئەوەش باجی سەرکردایەتی (کاژیک) بوو، وەک چۆن سمۆرە، گوێز لەنێو کلۆرەداردا دەشارێتەوە، ئەوانیش ئەندامەکانی خۆیان، لەنێو ڕیزەکانی (پارتی)دا، بۆ سیخووڕیکردن و دەنگوباسکۆکردنەوە حەشاردەدا!

ئەگینا گەر (کاژیک)م نەناسیایە و کارم لەگەل نەکردنایە، هەلبەتە هەموو توانای خۆمم، بۆ (پارتی) تەرخاندەکرد و زۆر بە دلسۆزیشەوە، ئیشم بۆ دەکردن. بەتایبەتی لە ئەو ڕۆژانەدا جادەکەی پانبوو، خەلک خواخوایانبوو، (پارتی) ئاوڕێکیان لێ بداتەوە، لە ڕیزەکانیدا کاربکەن، پێشکەون، دەسپانبڕوا و خۆیان بەسەر ڕۆلەکانی گەلدا بادەن. بەلام من لەپێناوی باوەڕەکەمدا، هەموو ئەو شتانە و بەرژەوەندی تایبەتی خۆمم لە گۆڕنا!

دوای ئەو کۆلینەوە بێسەروبەرەی (خالەحاجی)، یەکسەر خۆم لە (قوتابیان) وازمهێنا و بەلای هیچ ڕێکخستنێکی (پارتی)دا نەچوومەوە. بەلام ڕۆژێ لە مالەوە دانیشتبووم، خەریکی خوێندنەوە بووم، (فەرەیدوون عەبدولقادر کەرکووکی)، ئەندامی سەرکردایەتی (ی. ق. ک.) بوو، هات و گوتی: هەلبژاردنی لیژنەی ناوچە و لقمان هەیە، داواتدەکەن و دەبێ، بێی. هەرچەندە خەرەکم بۆ ڕست، بە گوێیدا نەچوو. پێکەوە ڕۆیشتین، لە هەلبژاردنەکەدا، بە لێپرسراوی ناوچە دەرچوومەوە و بووم بە ئەندامی لقی (سولەیمانی)ش. بەلام سووور دەمزانی، (خالەحاجی) وازم لێ ناهێنێ، (پاراستن) تازە نایەلێ، نەک هەر لە (قوتابیان)دا کاربکەم، بەلکوو ژیانیشم لێ تالدەکا. چونکە کەسێ ئەو تاوانە گەورەیەی بۆ درووستکرابێ، زۆر بێویژدانانە بلێن: جنێوی بە (بارزانی) داوە، ئیدی چۆن ڕێزی لێ دەگرن، (بارزانی) ئەو سەردەمەی سالی (**1972**)ش، کە کەس نەبوو، لە ئاستیدا بکۆکێ و بلێ لەل! بەتایبەتی دوای ئەوەی، سەرکردایەتی (بەعس)، هەولی لەنێوبردنیان دابوو، ئیدی هێندەی دیکە، لە دل و دەروونی ڕۆلەکانی کورددا، خۆشەویستربووبوو!

## خاڵەحاجی بۆ وایکرد؟!

من دەمزانی، (خاڵەحاجی) کوێی دیشێ و بۆ وا ئەم شتەی، بە قوورسی گرتووە؟ جێی خۆیەتی لێرەدا باسیبکەم، هەرچەندە لە بەرگی یەکەمیشدا، بە کورتی باسمکردووە. تازە هەردوو باڵەکەی جەلالی و مەلایی تێکەڵاوبوووبوونەوە، (پاراستن) گومانی لێ دەکردن، گوایە هێشتا ڕێکخستنی تایبەتی خۆیان هەیە.

ئەو کاتە من لە جووتیاران کارمدەکرد. ڕۆژێ (خاڵەحاجی) تیلیفۆنیکرد و گوتی: بەپەلە وەرە ئەم بەر، ئیشم پێت هەیە. چووم و دووبەدوو دانیشتین. زۆر بە شاتوبازووی مندا هەڵیدا و ڕێزێکی زۆری لێ گرتم. پاشان داوای لێ کردم، چاودێری هەردوو دوکتۆر (خەسرەو خاڵ) و (مۆفەق)ی پزیشکی چاوی بۆ بکەم. منیش لە هەموو ژیانمدا، ڕقم لە کاری سیخووڕی و چلکاوخۆری بووە. لەبەرئەوە زۆر بەڕاشکاوی پێم گوت: من لە جووتیاران کارم زۆرە، ئەو کارە بە من ناکرێ و داوای لێبووردن دەکەم، بەڵکوو ئەو کارە بە هەڤاڵێکی دیکە بسپێری. گوتی: ئاخر زۆر پەلەیە و کەسی دیکەم لەبەردەستدا نییە. لەبەرئەوە ناچاریکردم، تیلیفۆن بۆ (کوردۆ)ی هاوڕێم بکەم و کارەکە بە ئەو بسپێرم. ئیدی لە ئەوەوە، نێوانمان درزی تێکەوت و ڕقێکی زۆر خراپی لێ هەڵگرتم. جگە لە ئەوەی، هەر لە کۆنەوە لە (سەرچنار)، خۆی و (محێدین)ی برایم دەناسی و خەڵک دەیانزانی، چەن ناوبانگیان خراپە!

(خاڵەحاجی) تازە هاتبووە (سولەیمانی) و دەیویست، هێڵی پاراستن دامەزرێنێ، تا ئاغاکانی دەسخۆشانەی لێ بکەن. جا لە ئەوەدەچوو، من یەکێ لە ئەوانە بوویم، ڕێکخا. بۆیە ئەو کارە قێزەونەی بە من سپارد. گەر بە قسەمبکردایە و کارەکەم بۆ ڕاپەڕاندایە، ئەوا لەسەدانسەد، کاری دیکەشی پێ دەسپاردم، دواتریش داوای لێ دەکردم، لە دەزگە ناوزڕاوەکەیدا کاربکەم. بەڵام بە ئەو وەڵامەم، هەموویم لە کورتی بڕییەوە!

## حەسەن زیرەك

لە دەنگخۆشە کوردەکانا، هەر لە منداڵییەوە، هۆگری دەنگی (حەسەن زیرەک) بووم. کاتێ گەورەشبووم، تەمەنم لە (**14**) ساڵان تێپەڕبووبوو، حەزم لە دەنگە بەسۆزەکەی (حەمەی ماملێ)ش کرد.

(زیرەک)ی بلیمەت، کارێکی زۆری تێکردم، هونەرمەندێکی لێهاتووی مەزنبوو، ڕاژەیەکی زۆری هونەری کوردی کردووە. ئاخر ئەو هونەرمەندە گەورە و بلیمەتە، گەر کورد نەبووایە، لەنێو هەر گەلێکی دیکەدا هەڵکەوتایە، جگە لە ئەوەی میلیۆنێردەبوو، ناویشی لە هەموو جیهاندا بڵاوئەبووەوە و کەس نەبوو، نەیناسێ! بەڵام بەداخەوە وەک گوتوویانە: قەدری زێڕ، لای زێڕینگەرە!

هونەرمەندی هەرە گەورەی کورد (حەسەن زیرەک)، ڕۆژی (29. 11. 1921) لە شارۆچکەی (بۆکان) لەدایکبووە، ڕۆژی (26. 6. 1972)، هەر لە (بۆکان) مردووە و لەسەر ڕاسپاردەی خۆشی، لە دامێنی کێوی (ناڵەشکێنە) نێژراوە. واتە تەنیا (51) ساڵ ژیاوە. ڕەوانی شادبێ!



ئەم وێنەیە ساڵی (1956)، لە دووکانی (حاجی ئەحەکریمی قەساب) گیراوە. لە ڕاستەوە: (عوسمانی مەلا، حاجی ئەحەکریم، حەسەن زیرەک، ئەکرەمی کوریم ئاغا، کەریمی ئەحەی هۆمەر، حاجی موحەممەدی شێخ عەزیزی باراوی - باوکم، ئەو سیانەی دیکە نەناسراون)

## هۆردووگەی قوتابیان

دوای ئەوەی تاقیکردنەوەکانی کۆرسی دووەممان تەواوکرد، بیرۆی سکرتاریەتی قوتابیان بڕیاریدا، ساڵانە چەن هۆردووگەیەکی ڕووناکبیری و کارکردن، لە نێوچە جیاجیاکانی (کوردستان) بکەنەوە. تا لەلایەکەوە، یارمەتی جووتیاران بدەین و لەلایەکی دیکەشەوە، هێندێ شتیان بۆ باسکەین. لە ڕووی نەتەوەیی و ڕامیاریشەوە، کەمێ وشیاریانکەینەوە. بڕیاربوو، هۆردووگەکەمان لە یەکێ لە نێوچەکانی دەوروبەری پارێزگەی (کەرکووک) بێ، بەڵام دەسەڵاتدارانی (بەعس) نەیانهێشت. ئاخر گەر سەرکردایەتی (پارتی) و شۆڕش، کەمێ ژیربوونایە، بەرژەوەندی گەلی کوردیان، لەبەر چاوبووایە، دەبووایە، هەر ئەو کاتە لە هەموو پلان و ئامانجەکانی (بەعس) تێبگەیشتنایە، (4) ساڵە ساڵی ڕەبەق، چاوەڕێی ئۆتۆنۆمییەکی شەپەلیدراویان نەکردایە، قوزەگامیشیان بە دیار ڕێککەوتننامەکە و بەڵێنەکانی دوژمنی داگیرکەرەوە نەشتایەتەوە!

پاشان ناچاربووین، هۆردووگەکە لە گوندی (هەشەزینی) سەر بە شارۆکەی (سەنگاو) دامەزرێنین، گوندەکەش زۆر لە (چەمچەماڵ)ەوە دوور نەبوو. ڕۆژی (1. 7. 1972)، لە گوندی (هەشەزینی)، لە خانووی قوتابخانەکەدا جێگیربووین. پتر لە (100) خوێندکاری ئاوەندیی، ئامادەیی، پەیمانگە و زانکۆکان دەبووین. لە هەموو شارەکانی (کوردستان)ەوە هاتبوون. دادوەر (حەمە قەرەداخی)، ئەندامی سکرتارییەتی قوتابیان، بەرپرسی یەکەمی هۆردووگەکە بوو. ئێمەش ئەندامانی لقی (سولەیمانی)، سەرپەرشتیمان دەکرد. من و (سەلامی مەلاعەبدولرەحمان)، ئەو کاتە ئەندامی لیژنەی ناوچەی قوتابیان بوو، پێکەوە کارماندەکرد، لە ماڵان دادەمەزراین و قسەمان بۆ جووتیاران دەکرد. هەرچەندە ئەو کاتە، بەرەو مارکسییەت هەنگاویدەنا، سووریش دەیزانی، من لە (کاژیک)دا کاردەکەم، چونکە چەن جارێ بەراشکاوی، قسەم بۆ کردبوو، لە زۆر شتدا، یەکمان دەگرتەوە و ڕێزی یەکیمان دەگرت. ئەو ساڵە لە هۆردووگە گەلێ کوڕی باش و کوردپەروەری وەک (ئەرسەلان بایز، دوکتۆر چیا عەبباس، سالار عەزیز، ڕەوانشاد مامۆستا عەزیز ...)م ناسی.

ڕۆژانە لە هۆردووگەکە، خوێندکارەکان یارمەتی جووتیارانی گوندەکەیان دەدا. مانگی (7) بوو، خەریکبوو دروێنەی گەنم و جۆ تەواودەبوو، بەڵام کاتی بژاری نێو مەرەزە و دەسکەنەی تۆک بوو. لەبەر ئەو خورە گەرمەی گەرمیان، زۆربەمان تووشی سەریەشە بووبووین. لەبەر کوێتەری مێشوولەی شەو و ڕۆژیش، ئارامسان لێ هەڵگیرابوو. شەوانە خەو لە چاوانمان نەدەکەوت. کاتێ ئیشی ئەو دەورووبەرەش تەواوبوو، بەیانیان زوو هەڵدەستاین، بەرەو گوندەکانی دیکەی دەورووبەر دەڕۆیشتین.

گەر ڕۆژی کارمانبکردایە، ئەوا بەیانی زوو، لە هۆردووگە نانماندەخوارد و دەڕۆیشتین. نانی نیوەڕۆشمان لە ماڵی ئەو جووتیارانە بوو، کە ئیشمان لەگەڵ دەکردن. هەموو ئێوارەیەکیش، چێشت لێ دەنرا و لە هۆردووگە نانماندەخوارد. هێندێ خوێندکار، بۆ ئامادەکردنی خواردن دانرابوون. ڕۆژانە بە ترۆمبێل دەچوون، لە (چەمچەماڵ) سەوزە و گۆشتیان دەکڕی.

## گوندی دێلێژە

ڕۆژێکیان لە (هەشەزینی)ەوە بەپێ، بەنێو دەربەند (یاسەرە) و بەگوێی ئاوەکەدا ڕۆیشتین، تا گەیشتینە گوندی (دێلێژە). گوندەکە لە شوێنێکی زۆر بەرز هەڵکەوتووە، هەرچواردەوری بە باخ و سەوزایی ڕازابووەوە. ئاوێکی زۆری هەبوو، حەوز و مزگەوتێکی گەورەی جوانی خاوێنی لێ بوو. ئەو گوندە هێندە دڵگیر و خۆش بوو، مرۆ دڵی نەدەهات، بەجێیبێڵێ. ماوەیە لە ئەوێش حەواینەوە و دوایی گەڕاینەوە. گوندەکە هێندە دڵگیرە، ئێستە سەیرانکەر، بە پۆل ڕووی تێ دەکەن.

## شەوانی هۆردووگە

شەوانە دوای نانخواردن، لەژێر چەتری ئەو ئاسمانە شینە خاوێنەدا دادەنیشتین. ئاسمان بە ئەستێرەی گەش رازابووە و هەر جریوەجریویانبوو. مانگیش وەک پرۆژێکتەرێکی سرووشتی، ئەو ناوەی ڕووناکردبووەوە. سرووشت کشوماتبوو، هەوایەکی خۆش و سازگارمان هەڵدەمژی. هەموومان کۆدەبووینەوە و هەر جارەی، باسی شتێکمان دەکرد. پاشان گۆرانیمان دەگوت و بەرنامەی گاڵتەوگەپ دەسپێدەکرد.

(زیباری نوری بەگ)ی شێربرام و (ئازاد کۆیی)مان لەگەڵ بوون، بەزمێکی خۆشی گاڵتەوگەپیان هەبوو. زۆربەی شەو دووقۆڵی پێشکەشیاندەکرد، خوێندکارەکان زۆر لایان خۆشبوو، داوایان لێ دەکردن و ئەوانیش بە گۆرانییەوە، گاڵتەیان بە زمانە کوردییەکەی مەلا و فەقێ موسوڵمانە کوردەکان دەکرد. ناونیشانەکەی (دەمەتەقێی دوو فەقێ لەسەر قەنداغ) بوو، هێندەی بیرم مابێ، دەیانگوت:

فەقێ زیبار: چا لە قەنداغی ئەفزەڵترە.

فەقێ ئازاد: نەخێر. قەنداغ لە چای ئەفزەڵترە. تۆ بڕێ، لۆ؟

فەقێ زیبار: لۆ؟

فەقێ ئازاد: زەوەباتی سوکەری تیا ئەسهەلترە. تۆ بڕێ، لۆ؟

فەقێ زیبار: لۆ؟

فەقێ ئازاد: غەسلی ئیستیکانەکەی ئەنزەفترە. تۆ بڕێ، لۆ؟

فەقێ زیبار: ئەدی کو وادەبێ، لۆ هەر دەبێ، من بڕێم لۆ، ئەدی کەی قسان بکەم؟!

ئیدی بە ئەو شێوەیە، هەردووکیان درێژەیان پێدەدا و خوێندکارەکانیش، تێر پێدەکەنین. یا (زیبار) هەڵدەسا و نوکتەی دەگێڕایەوە. هێندێ جاریش پەرۆیەکی بە سمتیەوە دەبەست و سووڕێکیشی بەدەمەوە دەدا! (ئازاد کۆیی)ش بە گۆرانی و تەنەکەلێدان دەیگوت:

یالا (زیبار) بایە
بۆ پێشەوە رایە
بادان هەر لە تۆیە
سمتت مەشکەی دۆیە

ئیدی دەبوو بە پێکەنین و هەرایەکی خۆش، ئەو سەری دیار نەبێ. ئەو هەموو ماوەیە، لە ئەوێ بووین، کەس دڵی لە کەس زویر نەبوو. (بورهان) ناوێکی خەڵکی شارۆچکەی (هەڵەبجە)شمان لەگەڵ بوو، خزمی (جەلالی عەیە کلاش) بوو. دەنگی زۆر خۆشبوو، هەموو شەوێ داوامان لێ دەکرد، گۆرانیمان بۆ بڵێ. ئەویش گۆرانی (کەمەرەشل)ەکەی (حەسەن گەرمیانی) بۆ دەگوتین و زۆر باشی دەگوت!

دوای ئەوەی ئەو باس و وردە ئاهەنگانە تەواودەبوو، هەر کۆمەڵی بۆ خۆیان پێکەوە دادەنیشتن و باسوخوازی جیاوازیان دەکرد. بەڵام من پتر، تێکەڵاوی خوێندکارەکانی (کەرکووک) دەبووم و قسەم بۆ دەکردن.

## چەمچەماڵ

ماوەیە لە هۆردووگە بووین، سەر و ڕیشمان زۆر هاتبوو. ڕۆژێ لەگەڵ برادەران (سالار عەزیز) و ڕەوانشاد مامۆستا (عەزیز)دا چووین بۆ (چەمچەماڵ)، سەروریشمان بتاشین. سەرتاشخانەیەکی لێبوو، ناوی سەرتاشخانەی (هەردووچاوەکەم) بوو!
کابرا تا سەروریشی تاشین، هەر زووزوو دەیگوت: ئاخر هەردووچاوەکەم، وانییە، هەردووچاوەکەم، خراپ نییە. هەردووچاوەکەم، باشە پەلەمەکە. هەردووچاوەکەم پیرۆزبێ، هەردووچاوەکەم بەخێرچن، هەردووچاوەکەم سەرتاشخانەی خۆتانە ... ئێمەش کە ڕۆیشتین، گوتمان: زۆر سوپاس هەردووچاوەکەم!
ئیدی هێندەی هەردووچاوەکەم دووبارەدەکردەوە، گەر ئەو دوو وشەیەمان، لە قسەکانی دەرهێنایە، هەمووی چەن ڕستەیەکی کەمی دەمایەوە. دوایی تێگەیشتین و گوتمان: ئەمە بۆیە، سەرتاشخانەکەشی ناوناوە هەردووچاوەکەم!

## ڕووداوێکی دڵتەزێن

داخم ناچێ، چەن ڕۆژێ پێش ئەوەی کارەکانمان تەواوکەین و هەر کەسێ بۆ شوێنی خۆی بگەڕێتەوە، زۆربەمان چووین، مەلە بکەین. کاتێ ئێوارە گەڕاینەوە، برادەرێکمان دیار نەبوو. بە ئەو شەوە، هەرچی شوێن هەبوو، هەمووی بە دوایدا گەڕاین، بەڵام بەداخەوە نەماندۆزییەوە. بەیانی زوو، لەگەڵ دوو کەسی شارەزای خەڵکی گوندەکەدا چووین بۆ سەر چەمەکە. پیاوەکان هەر چاویان بە ئاوەکە کەوت، گوتیان: لە ئەم گومەدا خنکاوە. لێم پرسین: چۆن دەزانن؟! گوتیان: نابینن، ماسییەکان لە ئەو ناوەدا کۆبوونەتەوە. پاشان خۆیان ڕووتکردەوە و تەرمەکەیان دەرهێنا.
لە ئەوە دەچوو، لە بەرزاییەکەوە خۆی هەڵدابێ، سەری لە لمی بن گۆمەکە چەقیبێ. ئەو داماوە، ئەو شەوە تا بەیانی، لەنێوئاوەکەدا مابووەوە، خوا بەشەخۆراکی ئەو شەوەی، بۆ ماسییەکان ناردبوو، هەر شوێنێ نەرمبوو، خواردبوویان و هەردوو گوێچکە، لچ و لێو، سەری لووت، کێر و گونیان قرتاندبوو. پاشان جلەکانیمان دۆزییەوە، هەڵمانگرت و هێنامانەوە بۆ هۆردووگەکە.
بەیانی باوک و کەسوکارەکەی لە (کەرکووک)ەوە هاتن. هەموومان لە دەوریان کۆبووینەوە، زۆر بە ماتومەلوولی و غەمگینییەوە ڕاوەستابووین. پێش ئەوەی باوکی تەرمی

جگەرگۆشەکەی، سواری ترومبێلەکەی بکا، ڕووی تێکردین و گوتی: ئەو هەر کوڕی من نەبوو، کوڕی کورد و برای ئێوەش بوو. بە قوربانی (کوردستان) بێ و دەبێ لە ئەو ڕێیەدا، هەر ماڵی قوربانی خۆی بێ!
سەیر ئەوەبوو، کاتێ ئەو باوکە کوردپەروەرە گەورەیە، ئەو قسە جوان و ڕێکوپێکانەی دەکرد، یەک تنۆک فرمێسک، لە چاوانی نەڕژا! بەڵام کەم خوێندکار هەبوو، لەناو ئەو قسە پڕ سۆزانە، خۆی پێ ڕاگیرابێ و لەبری ئەو باوکە قارەمانە، فرمێسکی بۆ کوڕەکەی نەڕشتبێ. زۆر بە داخەوە، ناوی ئەو ڕەوانشادەم بیرنەماوە، تا بینووسم.

## لقی قوتابیان

دوای ئەوەی هۆردووگەکە تەواوبوو و گەڕاینەوە، زۆر بە سەختی تووشی نەخۆشی (مەلاریا) بووم و لەنێوجێدا خستمی. ئەندامانی سەرکردایەتی قوتابیان، لە (سولەیمانی) بوون، لەگەڵ ناوچە و لقدا، سەیرانێکیان بۆ (تەوێڵە) ڕێکخست. من لەبەر نەخۆشی نەمتوانی، بچم. ماوەیە بە بێدەنگی، لە قوتابییاندا کارمکرد. بەڵام دوای ئەوەی (پارتی)، بڵاوکراوەیەکیان لەسەر دەرکردم و لە ڕیزەکانی ڕێکخستندا بڵاویانکردەوە، کۆمیتەی ناوەندی بڕیاریدابوو، بەیەکجاری دەرمکەن. ئیدی قوتابییە هەلپەرست و مەراییکارەکان، ئەوانەی چاویان لە شوێنەکەی من بڕیبوو، ڕاپۆرتێکیان بۆ لیژنەی ناوچە و لقی (پارتی) نووسیبوو، داوایانکردبوو، لە قوتابییانیش دوورمخەنەوە. (خاڵەحاجی)ش یەک و دووی لێ نەکرد و بێ ئەوەی پرس بە کەس بکا، داواکارییەکەیانی پەسندکرد. ئەم کارەش، ئەو درۆ و پروپاگەندانەی (پارتی) دەسەلماند، کە چەندین ساڵ بوو، بانگەشەیان بۆ دەکرد و دەیانگوت: ڕێکخراوە دیموکراسییەکان، چەن ڕێکخراوێکی پیشەیی بێلایەنن، هەموو خوێندکارانی (کوردستان)، لاوان، ئافرەتان ... دەتوانن، بە ئازادی کاری تێدا بکەن!
هەڵبەتە ئەوان وەک (یەکێتی خوێندکارانی نەتەوەیی کورد)ی سەر بە (کاژیک)، هێندە ڕاستگۆ و ئازا نەبوون، بەراشکاوی بە جەماوەری کورد بڵێن: ئەوی بڕوای بە بیروباوەڕی (کاژیک) نەبێ، لە ڕیزەکانی ڕێکخراوەکەماندا جێی نابێتەوە. چونکە ئەوان جەماوەریان هەڵدەخەڵەتاند و دەسیاندەبرین، مام ڕێوی ئاسا، بە فڕوفێڵ خەڵکیان لە دەوری خۆیان کۆدەکردەوە!
لە ئەو ڕۆژانەدا، (عادیل موراد) سەرۆکی (ی. ق. ک.) هات بۆ (سولەیمانی)، یەکدیمان بینی و گوتی: نابێ، وازبێنی. دوای نیوەڕۆ، سەردانی (عەلی عەبدوڵلا) دەکەم و لە ئەو بارەیەوە، تێلیفۆن بۆ لق بکا، تا لەسەر کارکردن بەردەوامبی. ئەو کاتە (عەلی عەبدوڵلا)، هەم پارێزکاری (سولەیمانی) و هەم ئەندامی پەلیتبیرۆی (پارتی)ش بوو. بەڵام وا دیار بوو، لەگەڵ (خاڵەحاجی)دا هیچی پێ نەکرابوو، تا لە قوتابییانیش دەری نەپەڕاندم، وازی لێ نەهێنام!

## گۆڕانکاریی و ژیانێکی نوێ

ساڵی (**1972**)، دایکم زۆری لە باوکم کرد، تا لەدەس کرێچێتی ڕزگارمانبێ. ئەوەبوو، لە پشت یانەی مامۆستایانەوە، پارچەیە زەوی (**347**) مەتریی کڕی. هەر ئەو ساڵە زوو دەسمانپێکرد، خانوویەکی گەورە و جوانمان دروستکرد. لە پشووی هاویندا، هیچ کارێکم نەبوو، سەرپەرشتی کرێکارەکانم دەکرد. سەرەتای پاییزبوو، خانووەکە تەواو بوو، گوێزامانەوە و چووینە ناوی، لەدەس کرێچێتی ڕزگارمانبوو، بە خانووی خۆمان شادبووین!

حەوشەکەمان نزیکەی (**200**) مەتردەبوو. منیش وەک کادیرێکی کشتوکاڵ، دیزاینێکی جوانم بۆ باخچەکە دانا و کردم بە دووبەشەوە. لە بەشە گەورەکەی و لە نێوەڕاستەکەیدا، بەشی چیمەنێکی گەورەم هێشتەوە. هەرچواردەورەکەشیم بە بلووکی گەورە جیاکردووە. لە ئەو دیو چیمەنەکەوە، چەندین داری قەیسی، هەڵووژە، هەنار و هەنجیرم ناشت. لەنێوان دارەکانیشدا، چەندین شەتڵی گوڵم هێنا و ڕواندم. لە بەشەکەی دیکەشیدا، لە دەرگەی دەرەوە بۆ هەیوانەکە، لە بەری لای چیمەنەکەوە، چەن قەلەمەمێوێکی جیاوازم چەقاند. لە بەری ئەو بەریشەوە، (**5**) دارسنەوبەری ڕێک و جوانم ناشت. پاش ماوەیە هەموویان ڕوان و گەورەبوون، مرۆ هەر حەزیدەکرد، لەنێو باخچەکەدا دانیشێ، هەرچی دەهات، باوەڕی نەدەکرد، ئەو باخە من دروستمکردبێ. بەڵام بەڕۆژ و بەیانیان بە تایبەتی، لەبەر جریوەجریوی چۆلەکەی سەر درەختەکان، زوو خەبەرماندەبووەوە!

باوکم دڵی بە ئەو خانوو و باخە زۆر خۆشبوو. سوێندیخوارد، تا لە ژیاندابێ، نەیفرۆشێ. ئەوەبوو، سوێندەکەی خۆی بردەسەر و تا ڕۆژی (**28 2 2008**) نەمرد، ئەو خانووە هەر مابوو، پاشان کوڕەکان ساڵی (**2010**) فرۆشتیان!



ماڵی خۆمان لەگەڵ دایک و باوکم ساڵی (**1991**) گیراوە.

## سیتەك

(مەنسوور)ی هاوڕێم، لە کۆلێژی سەربازی (بەغدا) دەیخوێند، ماوەی هەفتەیەک پشووی هەبوو، هاتبووەوە بۆ (سولەیمانی)، سەر لە دایک و خوشکەکانی بدا. ئەو لە پرسەکەی (شێخ لەتیف)دا ئامادە نەبوو. داوای لێ کردم، پێکەوە سەردانێکی (سیتەک) بکەین، سەرەخۆشی لە (کاوە) و (حەلاوە) خانی دایکی بکا. منیش زۆرم پێخۆشبوو، چونکە دەمێ بوو، بەڵێنمدابوو، سەریانبدەم. حەزیشمدەکرد، بزانم، سەبارەت بە چی دەیویست، قسەم لەگەڵ بکا!

ئەوەبوو، هەردووکمان پێکەوە چووین و (کاوە)ش، ڕێزێکی زۆری لێ گرتین. ڕۆژی دوایی، هەرسێکمان بەدەم پیاسکردنەوە، بەرەو ڕێی (سولەیمانی)، لە ئاوایی دوورکەوتینەوە. لەبن داربەڕوویەکی گەورەی نزیک جادەکە دانیشتین. (کاوە) تفەنگێکی کلاشینکۆفی پێ بوو، هەر لە دوورەوە، یەک دوو سمۆرەی لەسەر داربەڕووەکە بەردایەوە. گەر بڵێم، هەرگیز لە ژیانی خۆمدا، دەسراستی وام نەدیبوو، لە ڕاستی لام نەداوە!

کەمێ دانیشتین، هەروا قسەی ئاسایمان دەکرد. لەپڕ هێندێ گلەیی لە من کرد و گوتی: داوام لێ کردی، سەرم لێ بدەی، بۆ نەهاتی؟ منیش گوتم: تاقیکردنەوەکانمان تەواوکرد، یەکسەر لەگەڵ (یەکێتی قوتابیان) چووین بۆ هۆردووگەی قوتابیان لە گوندی (هەشەزینی)، ماوەی دوو هەفتە مامەوە. پاشان کاتێ گەرامەوە، زۆر نەخۆشکەوتم، نەمتوانی، بەڵێنەکەم جێبەجێبکەم، داوای لێبووردن دەکەم.

گوتی: لە هۆردووگە، چیتان دەکرد؟ منیش بیرم چووبووەوە، قسە بۆ کێ دەکەم، چونکە یەکەم (کاوە) وەک برام وابوو. دووەم لەپێناوی بیروباوەڕەکەشمدا، سڵم لە کەس نەدەکردەوە. گوتم: یارمەتی جووتیارانمان دەدا. هەروەها باسی خەباتی چینایەتی، ململانێی نێوان جووتیاران و دەرەبەگەکانی کورد، ڕۆڵی ئاغا و بەگ، لە داگیرکردنی زەوی و چەوساندنەوەی چینی جووتیارانمان بۆ دەکردن. دژی خاوەن موڵکەکان هاناندەدان و داوامان لێ دەکردن، سەر بۆ کەس دانەنەوێنن و داکۆکی، لە مافە ڕەواکانی خۆیان بکەن. هەروەها خاکی خۆیان و باوباپیرانیان، بە دوژمنی داگیرکەر نەفرۆشن، ناپاکی لە نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیان نەکەن.

ئیدی وەک دەڵێن: قسە، قسە دێنێ، لەسەر کێشەی جووتیار و زەوی، هۆردووگە و ڕۆڵی قوتابیان توورەبوو، لێمان بوو بە دەمەقاڵێ و گوتی: باشە تۆ لە زانکۆ دەخوێنی، هەقی ئەم قسانەت چییە، بۆ بەدەردی خۆتەوە دانانیشی؟! منیش گوتم: یەکێتی قوتابیان، هەموو ساڵێ ئەو هۆردووگایانە، بۆ ئەو مەبەستە دەکاتەوە. منیش وەک ئەندامێکی لقی قوتابیانی (سولەیمانی)، بەشداریمکرد و باوەڕم پێی هەیە.

ئیدی هێندە تووڕەبوو، لەتاوانا دوو فیشەکی بە دوو چۆلەکەوە نا، هەردووکیانی کوشت، پاشان هەردووکمان بێدەنگبووین. بەڵام (مەنسوور) دەمی نەکردەوە. لە ئەوەوە دیسانەوە، کەمێ ساردیی لە نێوانماندا دروستبوو. دوو ڕۆژ و شەوی لە ئەوێ بووین و پاشان گەڕاینەوە.
سەیر ئەوەیە، تا (شێخ لەتیف) مابوو، دیوەخانەکەیان هەموو ڕۆژێ جمەیدەهات، بەڵام کە ئەو ڕۆی، ئاگردانیان کوژایەوە، ئاخر خەڵک بۆ لای کێ بچووایە، چونکە (کاوە) و باوکی، زۆر جیاوازبوون؟!

## من و کاژیک

دوای ئەوەی لە (پارتی) و (قوتابیان)، بەتەواوی دوورخرامەوە، ئیدی هەموو کاتی خۆم، بۆ ڕێکخستنەکانی (کاژیک) و خوێندنەکەم تەرخانکرد. پێوەندیم بە زۆربەی برادەر و ناسیاوەکانمەوە کرد. داوام لێ کردن، کارمان لەگەڵ بکەن. لە ماوەیەکی کورتدا، ژمارەیەکی زۆرم، لە ڕیزەکانی ڕێکخستندا کۆکردەوە. ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، ئەو هێڵەی ئێمە زیادی دەکرد، بە شێوەیە بوو، هەموو ڕۆژەکانی هەفتە، خەریکی کۆبوونەوە بووم. هەر لە زانکۆ، ئەوانەی لەنێو خوێندکاراندا ڕێزیان هەبوو، سەر بە (پارتی) نەبوون، هەر زوو پێوەندیم پێوەکردن و ڕێکمخستن.
لەبەرئەوە لە زانکۆ، (پارتی) زۆر دژایەتی منیان دەکرد، منیان بە لێپرسراوێکی گەورەی (کاژیک) دەزانی. هەر هێندە منیان ببینیایە، لەگەڵ خوێندکارێکدا، کەمێ پیاسەمبکردایە، دەیانگوت: ئەوا مێشکی ئەویشی تێکدا! بۆیە نۆکەرەکانی دەزگەی (پاراستن)، یەک لەسەر یەک، ڕاپۆرتیان لەسەر دەنووسیم و لای (خاڵەحاجی)، هێندەی دیکە ئیسکیان تاڵکردبووم. منیش بە هیچ شێوەیە، گوێم نەدەدایە، وامدەزانی، گەر یەکێ (کاژیک) بێ، نابێ، لە هیچ شتێک و کەسی بسڵەمێتەوە و خۆی لە هەموو کوردێ، زیاتر بە کوردێکی پاک و دڵسۆزتر بزانێ!
(پارتی) و (قوتابیان) بە ئەو هەموو ئەندام و پێشمەرگەیەوە، چونکە خاوەنی بیروباوەڕێکی ڕاست و بەهێز نەبوون، هەر منیان لەگەڵ دۆستێ یا ئەندامێکی خۆیان ببینیایە، ترسیان لێ دەنیشت، وایاندەزانی، ئەو کەسەیان لێ هەڵدەگێڕمەوە. هەرگیز بیریان لە ئەوە نەدەکردەوە، بۆچی ئەو ئەندامە، هێندە بڕوای بە پارتەکەی خۆی نەبێ، دەمەتەقێ لەگەڵ من بکا و بڕوام پێبێنێ، کە من بەهەڵەداچووم و دوای کڵاوی بابردوو کەوتووم!
ئەو کاتە، تەمەنم (**22**) ساڵان بوو، لە هەرەتی لاوێتی، چالاکی و سەرەڕۆیی خۆمدا بووم. کەسم لە خۆم بە کوردتر نەدەزانی، هەرگیز سڵم لە کەس نەدەکردەوە. لەپێناوی

بیروباوەڕەکەشمدا، نەک هەر (پارتی)، بەڵکوو هەموو دونیاشم بە هیند نەدەزانی. ئەوان بە ئەو هەموو توانایەی هەیانبوو، لە ئێمە دەترسان. هەمیشە لەپاشملە نەک بەرەوڕوو، ئەو پەڕی بەربەرەکانی و دژایەتییان دەکردم. منیش هیچ جۆرە حسابێکم بۆ نەدەکردن و هەرگیز، سەریشم بۆ کەسیان شۆڕنەدەکرد. تەنانەت سڵاوی سەرجادەشم لێ بڕین. تەنیا پشتیشم هەر، بە پاکی خۆم قایمبوو، بەهۆی ئەو هاوبیرانەی لە (پارتی) و (قوتابیان)یشدا کاریاندەکرد، یا بەهۆی هێندی دۆستەوە، هەموو نهێنییەکانیانم دەزانی.
لەبەرئەوە دەمزانی، چی دەکەم و چۆن هەنگاودەنێم. جگە لە ئەوەی، ڕێکخستنەکەی ئێمەش، زۆر نهێنیبوو، ئەو هاوبیرانەی بە (کاژیک)یش ناسرابوون و پێکەوە کارمان دەکرد، زۆر تێکەڵی یەکدی نەدەبووین و پێکەوە نەدەگەڕاین. (خاڵەحاجی) و (قادر جەباری) شێتوهاربووبوون، لە زانکۆوە هەر ڕاپۆرتیان بۆ دەچوو، بەڵام هیچ جۆرە بەڵگەیەکیان، دەس نەدەکەوت!

## هێڵی سەربازیی

بیرم لە ئەوە کردەوە، ڕێکخستنێ لەنێو خوێندکارە کوردەکانی هەردوو کۆلێژی سەربازی و پۆلیسی (بەغدا) دروستکەم. هەرچەندە ئەوانەی لە ئەوێ وەرگیرابوون، زۆر کەمبوون و هەمووشیان برادەرمبوون، بەڵام سەرەتا، یەکەمین کەس (مەنسوور)م هەڵبژارد. چونکە هەر لە ساڵی (1970)وە، کاتێ پێکەوە چووین بۆ کۆلێژی سەربازی، هەمیشە پێکەوەبووین و بەشێوەیەکی بەردەوامیش، بەپێی بەرنامەیەکی تایبەتی، قسەم بۆ دەکرد.
کاتێ لە (بەغدا) بەسەردان دەهاتەوە، هیچ کاتێ لە یەکدی جیانەدەبووینەوە. بەزۆربەی برادەرەکانی خۆم ناساند، چەن جارێکیش پێکەوە، سەرمان لە مامۆستا (شاکیر فەتاح) دا. چەن دانەیەکیشی لە پەرتووکەکەی (زەردەشت) کڕی و لە (بەغدا)، بەسەر برادەرەکانیدا دابەشیکرد. ئیدی من لە ئەوە تێگەیشتم، (مەنسوور) هەموو بیروباوەڕەکانی (کاژیک)ی، بەتەواوی هەرسکردووە، بۆیە هێندی جاریش، چەن بڵاوکراوەیەکم پیشاندەدا.
لە سەردانێکیدا، برادەرێکی کوردی خەڵکی (کەرکووک)ی لەگەڵ خۆی هێنابوو، ناوی (عەبولئیلا موحەممەد ئەمین) بوو، دواتر بە ملازم (شوان) ناسرا. بەمنی ناساند، گەلێ ڕێزم گرت، داوەتی نانخواردنم کرد و لەماڵەوە دانیشتبووین، هێندێ قسەم بۆ کرد. (مەنسوور) هەرچەندە زۆر سەری لێ دەخوڕا، بە شێوەیەکی ئاراستەوخۆ، کاری بۆ ئەو بیروباوەڕە دەکرد و چەن کەسێکی لە دەوری خۆی کۆکردبووەوە، ئامادەشبوو، هەموو کارێکمان بۆ بکا. بەڵام تا کۆلێژی سەربازی تەواونەکرد، نامەی بۆ (کاژیک) نەنووسی و قایل نەبوو، کارمان لەگەڵ بکا.

مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی (**1972**) بوو، ڕەوانشاد (کەریمی شێخ سەلام)، لە (بەغدا)وە بە سەردان هاتەوە. ئەو کاتە لە کۆلێژی پۆلیسی دەیخوێند. سەرم لێ دا و کاتێکم بۆ دانا، تا پێکەوە هێندێ دەمەتەقێیکەین. لە پیاسەیەکی دوورودرێژی ئێوارانی جادە و شەقامەکانی (سولەیمانی)دا، هەرچی هەبوو، زۆر بەراشکاوی بۆم باسکرد. بێ پرسیارکردن و دەمەتەقێ یەکسەر گوتی: من ئامادەم و دەمێکە، بە دوای ئەو ڕێکخستنەدا وێڵم. هێندێ گلەییکرد و گوتی: باشە، ئێمە جگە لە ئەوەی دراوسێین، هەر لە منالیەوە یەکدی دەناسین. لە قوتابخانەی ناوەندیی (شۆڕش)یش پێکەوە خوێندوومانە، بۆچی زووتر پێوەندیت پێوە نەکردم؟! هەر بۆ بەیانی نامەی نووسی و نامەی برادەرێکی دیکەشی دامێ، ئەویش هەر لە گەڕەکی خۆمان بوو، لە ئامادەیی بازرگانی دەیخوێند و پێوەندیمان پێوەکرد. ناوی (جەلال سەعید) بوو.

پارێزەر (عەتای حەمەمرادی پێنجوێنی)، ئامادەیی تەواوکردبوو، لە (بەغدا) لە کۆلێژی یاسا وەرگیرابوو. ماوەی ساڵێ بوو، (عەتا) لەگەڵ (سیروانی عوسمانی سەعەی مەلا عەبباس)، لە شانەیەکدا لای من بوون و پێکەوە کارماندەکرد. زۆر خۆم لەگەڵ (عەتا) ماندووکردبوو. باش بوو، کاتێ لە (بەغدا) دەیخوێند، (کەریم) و هێندێ هاوبیری دیکەشمان، پێوەندییان بە ئەوەوە هەبوو.

بەهۆی (وریا براخاس)ەوە. لەگەڵ (فەتاح عەبدولرەزاق ـ مەلافەتاح)دا، یەکدیمان ناسی و هێندێ شەو، من و (وریا) و (حەمەعەلی) دەچووین بۆ لای و تا درەنگانی دادەنیشتین، باسی کێشەی کورد و ئایندەی شۆڕشەکەمان دەکرد. هەرچەندە (مەلافەتاح) یەکێ لە ئەو کەسانە بوو، لەسەر (کاژیک)، لە لیژنەی ناوچەی (پارتی) دەرکرابوو، ئەوی دەیناسی، دەیزانی (کاژیک)ە، بەڵام لای ئێمە، باسی (کاژیک)ی نەدەکرد.

ئیدی وامان لێهات، بێ ئەوەی بەتەواوی، لەگەڵ یەکێکدا یەکدی بناسین، هەر بە گومان، ئەوی (کاژیک) بووایە، ڕێزێکی زۆرمان لێ دەگرت. وەک لەنێوخۆماندا باوبوو، دەمانگوت: کوڕی باشە و هاوبیرانی (کاژیک) دەبێ، پێوەندییەکی گیانی پێکیانەوە ببەستێ!

ئێمەش وامان لێهاتبوو، هەر کەسێ ناوی بە (کاژیک) بڵاوبووایەتەوە، لە دوورەوە خۆشماندەویست و داکۆکیمان لێ دەکرد. بۆ نموونە: من و (عەبدوڵلائاگرین)، ڕۆژێ لە ڕۆژان پێکەوە کارمان نەکردووە، هەر بەهۆی کۆڕ و کۆبوونەوەکانی یەکێتی نووسەرانەوە، یەکدیمان ناسی. بەڵام هەردووکمان دەمانزانی، (کاژیک)ین. بۆیە زۆر ڕێزی یەکدیمان دەگرت!

## سێیەمین ساڵی زانکۆ

وەک هەموو ساڵێکی دیکەی خوێندن، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، دەرگەی پەیمانگە و زانکۆکان کرانەوە. دیسانەوە زانست و زانیاری، باوەشی گەرموگوڕی، بۆ خوێندکارە خوێنگەرمە جگەرسوزەکانی گرتەوە. لە هەردوو پۆلی یەک و دووی کۆلێژدا، تەنیا چەن وانەیەکی گشتیمان لەبارەی ڕووەک و بەروبوومەکانی کشتوکاڵەوە خوێندبوو. بەڵام لە پۆلی سێیەوە، تەرخانی تایبەتی دەسپێدەکرد و هەر خوێندکاری دەبووایە، بەشێکی تایبەتی بۆ خۆی هەڵبژاردایە، ئەوەش یەکەمین ساڵ بوو، ئەو بەشە نوێیانە بکرێنەوە. منیش بەشی بەروبوومی کێڵگەم (**Agronomy**) هەڵبژارد.

هەر لە سەرەتای ساڵەوە بڕیارمدا، ئەم دوو ساڵە، زۆر بەتوندی بگرم و خۆم بە خوێندنەکەمەوە خەریککەم، تا نمرەیەکی باش بهێنم و لە دواڕۆژدا، لە خوێندنی باڵا وەرگیرێم، یا لە شوێنێکی وەک زانکۆ دامەزرێم، چونکە من وەک هێندێ کەسی دیکە نەبووم، پشتم بە (پارتی) قایمبێ، تا گەر هیچیش نەزانم و شیاوی ئەو شوێنەش نەبم، بەهۆی ئەوانەوە بە ئامانجی ئارەوای خۆم بگەم!

هەروەها ئەو ساڵە، زۆربەی خوێندکارەکانیش بەخۆکەوتن و بەڕاستی دەسیانپێکرد، تا نمرەیەکی باش بێنن. لەبەرئەوە پێشبڕکێیەکی زۆر گەورە، لەنێوان خوێندکارەکاندا دروست ببووبوو.

هەر لە ئەم ساڵەشدا، (سەروەت - کوردۆ)ی هاوڕێم، لە (قەرەداغ) گەڕایەوە و لە یەکێ کۆلێژی ئادابی زانکۆی (سولەیمانی) وەرگیرا. جگە لە ئەوەی هاوڕێیەکی گیانیبەگیانیم بوو، هاوبیریشم بوو، ئاگامان لە هەموو شتێکی یەکدی بوو، هەمیشەش پێکەوەبووین.

لە سەرەتای دەسپێکردنی خوێندنەوە، بەرنامەیەکی تایبەتیم، بۆ خۆم دانا و هەموو ڕۆژێ، دوای ئەوەی لە خوێندن دەبوومەوە و لە زانکۆ دەگەڕامەوە، کەمێ پشوومدەدا، ماوەی کاژێرێ، بە وانەکانی ئەو ڕۆژەدا دەچوومەوە. ئیدی لە کاتی پێداچوونەوە و تاقیکردنەوەکاندا، زۆر بە ئاسانی تێیدەگەیشتم و ڕەوانمدەکردن. ئەنجامەکەشی ئەوەبوو، لە هەموو تاقیکردنەوەکانی مانگانەدا، نەک هەر دەرچووم، بەڵکوو هەموو نمرەکانیشم، لەسەرووی (**80%**)ەوە بوو. مامۆستاکان و زۆربەی خوێندکارەکانی هاوڕێم، سەیریان لێدەهات، بە ئەو شێوەیە گۆڕاوم، یارمەتی هاوڕێکانیشم دەدا و وانەکانم بۆ باسدەکردن. ئەوەش خۆی لە خۆیدا، سەرکەوتنێکی گەورەبوو، بڕژ و کەلێنی نووشووستییەکانی دیکەی بۆ پڕدەکردمەوە. چونکە جگە لە ئەوەی، زۆربەی مامۆستاکانم دەناسی، کاتی بە ئەو شێوەیەش ئاومدایە، ئیدی پتر ڕێزیان دەگرتم و پێوەندیم لەگەڵیاندا زۆر باشتربوو. لەگەڵ ئەوەشدا، بە هیچ شێوەیە خوێندنەکەم، ڕێی لە کاری ڕامیاریی و چالاکییەکانم نەدەگرت و بگرە، لە جاران گەرمتربووم!

## قادر مستەفا و لیژنەی ناوچەی پارتی

گومانی تێدا نییە، من ئەو هەموو چالاکییە بنوێنم، ڕێکخستنەکانی قوتابیان و (پارتی)ش لەنێوخۆدا، ڕۆژبەڕۆژ بەرەولاوازی و ئاژاوە دەچوو، (پاراستن) وازم لێ ناهێنێ. چونکە هاوڕێکانی دەوروبەرم، یەک لە دوای یەک وازیان لێ هێنان و لەگەڵ ئێمەدا کاریان دەکرد. بۆ نموونە: هونەرمەندی خوالێخۆشبوو مامۆستا (قادر مستەفا)ی هاوڕێم، کاتێ خۆی جەلالییبوو. لە تێکەڵاوبوونەوەکەدا، بوو بە ئەندامی ڕێکخراوی (پارتی) لە کارگەی جگەرەکە. ماوەیە بوو، خەریکی بووم و ڕۆژانە قسەم بۆ دەکرد. خۆشی ئامادەییەکی زۆری هەبوو، کارمان لەگەڵ بکا. بەڵام مەرجی سەرکردایەتی ئەوەبوو، واز لە (پارتی) بێنێ. ئەویش یەکسەر نامەی وازهێنانی بۆ (پارتی) نووسی و لە ڕیزەکانی (کاژیک)دا وەرگیرا.



( 1943 – 2014 ) ئەم وێنەیە، ڕۆژی (16. 2. 1973) گیراوە.

دوای ئەو کۆمەڵە چالاکییانە، نزیک تاقیکردنەوەکانی کۆرسی یەکەم بوویبووینەوە، (قادر جەباری) بە دوویدا ناردم. منیش لێکمدایەوە، گەر بچم و بمگرن، ئەوا تاقیکردنەوەکانم لەکیسدەچێ. لەبەرئەوە واچاکە، جارێ نەچم و خۆمی لێ کەرکەم. دوای یەک هەفتە، مامۆستا (قادر)یان بۆ کۆلێنەوە بانگکرد، تا بزانن، لەسەرچی وازی لە (پارتی) هێناوە؟! سەیر ئەوەبوو، هەر بە ئەویشدا وەڵامیان بۆ ناردمەوە، کە بچم، چاکترە، ئەگینا بە شێوەیەکەی دیکە، هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکەن!

منیش پرسم بە لێپرسراوەکەم (فەرهاد عەبدولحەمید) کرد و گوتی: سەرێ لە دوکتور (کەمال خۆشناو) بدە، هەموو شتێکی بۆ باسکە، لە ئەو بڕوایەدام، یارمەتیتدەدا. ئەو کاتە دوکتور (کەمال) ڕاگری کاروباری خوێندکارانی زانکۆ و ئەندامی لقی (4)ی (پارتی)ش بوو. پێشتریش بەهۆی قوتابیان و (پارتی)ەوە دەمناسی. لە پۆلی (2)شدا، مامۆستامبوو، سەرەتاکانی باخداری پێ دەگوتین. چوومە لای و ڕێزێکی زۆری لێ گرتم. گرفتەکەم بۆ

باسکرد و تێمگەیاند. ئەویش هەر لەبەرچاوی خۆم، تێلیفۆنی بۆ (قادر جەباری) کرد و داوای لێ کرد، مۆڵەتمبدەن، تا تاقیکردنەوەکانم تەواودەکەم و ئەو کاتە، سەریان لێ بدەم. ئاغای (جەباری)ش، داواکەی دوکتۆری نەشکاند.

دوای ئەوەی لە تاقیکردنەوەکانم بوومەوە، لەسەر بەڵێنەکەی خۆم، سەرم لە ناوچە دا. (قادر جەباری) و (عەبدوڵلای حاجی سەعید) دانیشتبوون. (جەباری) بە قسەی ناشیرین و هەڕەشەکردن، پێشوازی لێ کردم. هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەبوو، بەڵام هەر بەئاشکرا، شەری پێ دەفرۆشتم. جنێوێکی زۆری بە (کامیل ژیر) و (فایەق عارف) دا، بەڵام ناوی (شێخ موحەممەدی هەرسین، موحەممەدی عەزیز و عەبدوڵلا ئاگرین)ی نەهێنا. چونکە ئەوانە هەموویان، لە پەنا حەجەکەدا بوون و کاریان لەگەڵ بارەگەی (بارزانی) دەکرد! پاشان هەڕەشەی لێ کردم و گوتی: ئەم جارە، یەک ڕاپۆرتت لەسەربێ، سەرەوخوار لە ئەو ئاودەستەدا هەڵتدەواسم. منیش چیدیکە لە ئەوە پتر، ئەو سووکایەتییەم پێ قەبووڵ نەکرا، بۆیە گوتم: لەبەرئەوەی ئێوە، لە پارتێکی دیمۆکراسیدا کاردەکەن، ئەو کارەتان لەدەستدێ و دەتوانن، بشمکوژن! ئاخر تۆ تەنیا لەبەرئەوە هەڕەشە لە من دەکەی، چونکە کوردایەتی دەکەم. ئەگینا گەر دژی پیاوخراپ و دوژمنانی کوردن، بۆچی چەن خۆفرۆشێکی وەک (سدقی جەمیل)ی دانساز و (جەلالی فەقی حوسێن) ناگرن، چونکە ئەوان بەئاشکرا بەعسین و لێشتان ناترسن، ئیش بۆ (شوکری سەبری حەدیسی)ی پارێزگاری (سولەیمانی)ش دەکەن؟!



(2016 – 1944)

ئیدی بەتەواوی توڕەبوو، گوتی: ئەوە ئیشی تۆ نییە و نابێ، بە هیچ جۆری چالاکیت هەبێ. ئێوە بەکرێگیراوی بەرەی خۆراوان و نامەوێ، جارێکی دیکە لێرە بتبینمەوە. پاشان دەریکردم و منیش، بەدەم ئاخوداخێکی زۆرەوە هاتمەدەرەوە و ڕۆیشتم. لە ئەنجامدا دوو شتی گرنگم بۆ ڕوونبووەوە. یەکەم: گەر ئەم لێپرسراوانە بیانەوێ، تاوان

بۆ خەڵک درووستدەکەن. دووەم: ئیمەی نەتەوەیی نیشتمانپەروەریش، زۆر بێ پشتوپەنایین! بەڵام ئەو هەرەشەکردن و سووکایەتییکردنەی لێپرسراوانی (پارتی)، هەرگیز یەک تۆسقاڵ، ورەی نەڕوخاندم و لە چالاکی خۆشم نەکەوتم.
وەک دواییش بیستم، پێش من (کامیل ژیر)یان تەزاندبوو. پاشان سووکایەتیان بە (فەرهاد عەبدولحەمید) و (عومەر شەمەیی)ش کردبوو. وادیاربوو، هەستیان بە ئەوە کردبوو، ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، چالاکییەکانی ئیمە فراوانتردەبوو، ئەوانیش لە سڵق ڕووتردەبوونەوە! بۆیە تووشی هیستریابووبوون. بەتایبەتی دەزگەی (پاراستن)، ڕۆڵێکی گەورەی لە چاودێریکردنی ئیمەدا هەبوو. گوشاریان لەسەر لیژنەی ناوچە دانابوو، تا هەرەشەمان لێ بکەن و بمانترسێنن، بۆئەوەی واز لە (کاژیک) بێنین. بەڵام نەیاندەزانی، ئەوە خەیاڵێکی پووچی خاوە و هەرگیز بەدی نایە. چونکە هەموو ئەندامەکانی (کاژیک)، لە ڕووی باری دەروونی و باوەڕەوە، لە پۆڵا قایمتربوون. هەرگیز وازیان لە ڕێباز و بیروباوەڕی خۆیان نەدەهێنا. هەرەشەی ئەو ترسنۆک و هەلپەرستانەش، کاری تێ نەدەکردن!

## کۆرسی دووەمی ساڵی (1973)

کۆرسی دووەم، لە بەهاری (1973)دا دەسپێیکرد. زانکۆ وەک جاران جمەیدەهات. دەنگە بەسۆزەکەی هونەرمەند (حەسەن گەرمیانی)، هەموو کونوقوژبنێکی گۆرەپانە گەورەکەی زانکۆی پڕکردبوو. بە ئەو ئاوازە نوێیەی (سەوزەڵێ و خانم)ەکەی، هەست و هۆشی بەتجکردبووم. وشەکانی تێکەڵ بە خوێن و گیانم بووبوون. مەگەر هەر خۆم بزانم، (سەوزەڵێ) کێ بوو، چ جۆرە یادگارێکی شیرینیشی لای من بەجێهێشتبوو، تا چەن کاری لە بیر و هۆش و گیانی سڕبووم کردبوو؟! هەرچەندە بەدەس (پاراستن)ەوە، ژیانم لێ تاڵبووبوو، بەڵام گوێیم نەدەدایە و زۆر جار منیش بەدەم بادەوە، خەمی دڵ و دەروونی کەیلی خۆم، بە مەی بەبادەدا و سام (هێمن) ئاسا دەمگوت:

که دەستی ڕۆژگار، بابنا سەری من
سەری شووشەی شەراب، وا چاکە بادەم

## هەڵسوکەوتی لێپرسراوانی دەزگەی پاراستن

هەڵسوراوانی دەزگەی (پاراستن)، لە ئەندازەیان تێپەڕاندبوو. گەر بەرێکەوت لەسەرجادە، تووشی (قادر جەباری) یا (خاڵەحاجی) بوومایە، تەماشایاندەکردم و بەوردیی سەرنجیان دەدام. مۆرەیاندەکرد و دەیانویست، بزانن، ئەوانە کێن پیاسەیان لەگەڵ دەکەم.

ئێوارەیەکیان لەبەر دەرکیسەرابووم، بەرەومالەوە دەگەڕامەوە، (خاڵەحاجی)م بینی، سەری لە جیپەکە دەرهێنابوو، زۆر بەخرایی سەیریدەکردم. تا گەیشتمە نزیک ماڵی خۆمان، سێ جار خۆی و چەکدارەکانی، بەتەنیشتمدا تێپەڕبوون، سەریدەردەهێنا و لێم مۆردەبووەوە. منیش خۆم گێلکردبوو، هەر وەک لەگەڵ منیشیان نەبێ و ئاگام لێیان نەبێ، وابوو! بە ئەو کار و ڕەوشتە هەرزانەیەی دەیویست، شەڕەوڕەم لەگەڵ بکا، بمترسێنێ و بمروخێنێ، تا واز لە هەموو شتێ بێنم و کرتووشی بۆ بەرم. بەتایبەتی ئەو کاتە، لێپرسراوی یەکەمی پاراستنی هەموو پارێزگەی (سولەیمانی) بوو، بەدەیان کوڕی ئازای وەک ڕەوانشاد (بێستوونی مەلاعومەر، مستەفا چاوڕەش، سەروەری فەتاحی سەمەن ...) گەلێکی دیکەشی لەگەڵ بوو، کەسی بە پیاو نەدەزانی، تەنانەت ئەندامانی لق و (عەلی عەبدوڵلا)ی پارێزگاری (سولەیمانی)ش، سڵیان لێ دەکرد و خۆیان لە کێچەلەکانی دەپاراست!

ئەم پیاوە لەخۆیاییبووە، لە (سولەیمانی) چەن بارەگە و لە (ماوەت)یش گرتووخانەی تایبەتی خۆی هەبوو، چی بویستایە، سڵی لە کەس نەدەکردەوە و دەیکرد، چونکە کەس نەبوو، لێی بپرسێتەوە، (کوردستان) و شۆڕشەکەشی، وەک خانێکی گەورە وابوو، خۆی خانچی بوو، منیش خوێندکارێکی بێ پشتوپەنا بووم، دەیتوانی، هەموو شتێ بەرانبەرم بکا! ئەو (خاڵەحاجی)یەی، هەر لە قۆناغی ناوەندیی (شۆڕش)ەوە دەمناسی و دەمزانی، بابی چەندبوو، کەم ڕۆژ هەبوو، چێتی لێدان نەخوا!

بەڵام دوای ڕێککەوتننامەی (**11. 3. 1970**)، لە دەرەوە گەڕایەوە، وەک قارچک و دوومەڵان هەڵتۆقی. سیسێکی زەردی لاوازبوو، جلەکانی بەبەری شلبوو، هەر بۆیە خەڵکی شار ناویان نابوو: هەقاڵ (جووجەڵە)، کەچی وردەوردە هەڵاوسا، گوپەکانی بە ویسکی بەلاش، ئاوی قەل و مەزەی بەتامی ماڵان خڕبوون، هێندە گۆشتی گرتبوو، دڕابوو، وای لێهاتبوو، لە جلەکانی خۆیدا جێی نەدەبووەوە!

کارمەندانی دەزگەی (پاراستن)، دڵ و دەروونیان، بەشەوانی سووری ئافرەتە سۆزانییەکانی شار گەشابووەوە. بە هیچ شێوەیە، دەسیان لە داوێنپیسی و بێڕەوشتی نەدەگێڕایەوە. کەچی هەر خۆشیان، فەرمانی کوشتنی هێندێ ئافرەتی سۆزانیان دەرکرد و پاکتاویانکردن، کە پێشتر شەوانە، لەسەر سینە و مەمکیان ڕۆژیاندەکردەوە. بەڵام کاتێ لێیان تێردەبوون، خوێنیان دەڕشتن، تا نهێنییەکانیان ئاشکرانەکەن!

دیاربوو، زۆربەیان تووشی نەخۆشی دەروونی بووبوون، تۆڵەی کەموکوڕییەکانی ژیانی خۆیان، لە خەڵکی بەئابڕووی شارەکە دەکردەوە، باجەکەشی تەنیا هەر خەڵکە نیشتمانپەروەرە بێدەسەڵاتەکە، سەرکردەکانی (پارتی) و شۆڕشەکە دەیاندا. چونکە

هەرچی کاری خراپبوو، دەیانکرد، کەچی کەسی نەبوو، چاوێکیان لێ سوورکاتەوە و لێیان بپرسێتەوە. بۆیە وەک سەگی هاریان لێهاتبوو، پەلاماری نیشتمانپەروەرانی شارەکەیان دەدا.
بەڵام هەرگیز، داخی هێندی سەگ و گوورگم لە دڵ دەرناچی، کە دوای (خاڵەحاجی) کەوتبوون و هەموو فەرمانەکانیان بۆ جێبەجێدەکرد. چونکە هەموویان سوور دەیانزانی و چاک دەیانناسی، خۆی و براکانی چ قارەمانی بوون، کەچی سەرەڕای ئەوەش مەراییان بۆ دەکرد و وەک پیاوی وابوون، بەناوی کوردایەتییەوە، ئازاری خەڵکیان دەدا و ئافرەتی سۆزانیان بۆ دەکوشت!
ئەوەی لە نێوان سالانی (**1970**– **1974**)دا، لە کورد بەگشتی و خەڵکی (سولەیمانی) بەتایبەتی ڕوویدا، باوەڕناکەم، لە هیچ سەردەم و قوژبنێکی (کوردستان)دا ڕوویدابی. لە کۆتاییشدا ئەوەبوو، (خاڵەحاجی) دەستی لەگەڵ ژنی هاوڕێ و هەڤاڵێکی خۆیدا تێکەڵکرد، لێی داگیرکرد و وەک باسیاندەکرد، بە (**5**) منالەوە هێنای!
(قادر جەباری)، ئەو پیاوە ڕووناکبیرە چالاکەی، لە نێوچەی (گەرمیان) بەپاکی، سەرڕاستی و کوردپەروەری ناسرابوو، دوای ئەوەی دەستی هاوکاری، لەگەڵ (خاڵە حاجی)دا تێکەڵکرد، دەستی لە کورسی دەسەلات گیربوو، تێکەڵاوی خەڵکی چلکنی شار بوو، هەلپەرستەکانی دەورووبەری، ماستاویان بۆ ساردەکردەوە و مەراییان بۆ دەکرد، ئەویش گۆرا و فێری هەموو شتێکی خراپیان کرد.
ئەوەبوو، هەر دوای ماوەیە، جلوبەرگە خاکییە پێشمەرگەکانی داکەند، کڵاو و جامانەکەی فڕێدا، دەستێکی بە خۆیدا هێنا، جوانترین جلی ئەورووپایی لەبەردەکرد، وەک لە ئەو ڕۆژانەدا باسیاندەکرد و دەیانگوت: لە هەر شوێنێ کۆبوونەوە و ئاهەنگی ئافرەتان هەبووایە، وەک مووریان بۆ هەڵکڕوزاندبی، ئامادەدەبوو!
ئەندامانی لقی (**4**) و کۆمیتەی ناوەندیش، هەر ئێوارەیان لێدەهات، لە یانەی فەرمانبەران، لە شوێنی تایبەتی خۆیان دادەنیشتن، مێزیان بۆ دەرازاندنەوە و تا درەنگانی، لە چاوی خێزانی شەهیدان، پێکیان فڕدەکرد، (ڕەشۆل)یش قسەی خۆشی بۆ دەکردن! جا گەر سەرکردەکانی گەلێکی بندەستی مافزەوتکراو، ئەوە پیاوەکانی بێ، پیاوەکانیشی ئەوە ڕەوشتیان بێ، ئیدی چۆن دەتوانن، ڕازەی کۆمەڵانی ڕەشوڕووتی خەڵک بکەن؟! چۆن شۆڕشی گەلەکەمان سەردەکەوێ؟!

## چوارەمین لێپرسراو

پشووی هاوینی ساڵی (**1973**) بوو، (فەرهاد عەبدولحەمید) ویستی، سەری لە (توورکیا) بدا. پێش ئەوەی بڕوا، گوتی: بۆ ماوەی دوو مانگ و بە شێوەیەکی کاتی، هاوبیرێکی دیکە پێوەندیت پێوەدەکا.

ڕۆژێکیان یەکێ لە دەرگەی ماڵەوەی دا، کردمەوە، پیاوێکی لاوازی کەڵەگەت، بە ناوی (ئەحمەد شەریف)ەوە، خۆی پێ ناساندم. فەرمووم لێ کرد، بەڵام نەهات و گوتی: باشتر وایە، بگەڕێین. ماوەی (3) کاژێر بە نێوشاردا، پێکەوە پیاسەمانکرد و گەلێ شتی گرنگی بۆ باسکردم. من هەرگیز ئەو هاوبیرەم نەدیبوو، بە شێوەی قسەکردنیدا، لە خەڵکی (سولەیمانی) نەدەچوو. پێش ئەوەی جیاببینەوە، گوتی: پێویست ناکا، تۆ شوێنی من بزانی و هەموو هەفتەیەک، جارێک سەرت لێ دەدەم. گەر کارێکی زۆر گرنگ و پەلەشت هەبوو، ئەوا لە چاخانەی کاریزەبییەکانی بەردەرکیسەرا دەمدۆزیتەوە.

لە ڕاستیدا، سەیرم لە هەڵسوکەوت و قسەکانی دەهات، نەمدەزانی کێیە؟ خەڵکی کوێیە و چ کارەیە؟! کەسایەتی ئەم هاوبیرە نوێیەمان، لای من وەک مەتەڵێ وابوو، حەزمدەکرد، زۆر زوو هەڵبێنم و تێبگەم! چەن جارێکی دیکە یەکیمان بینییەوە. پتر لە دید و بۆچوونەکانی شارەزابووم. پێم وابوو، لە هەموو ئەو لێپرسراوانەی پێشتر ناسیبووم، ڕووناکبیر و چەسوورتر بوو، حەزمدەکرد، بە شێوەیەکی بەردەوام، کاری لەگەڵ بکەم و تێبگەم!

لە ئەو ماوەیەدا، گەلێ پرسیاری گرنگم لێ کرد و بە تەواوی، دەردە دڵی خۆم بۆ هەڵڕشت. بەڵام ناڕاستەوخۆ نەبێ، هیچی نەدرکاند و زۆر لە پرسیارەکانمی، بێ وەڵام هێشتەوە. دیاربوو، وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی دەزانی، بەڵام نەیدەویست، زۆر نهێنی بدرکێنێ. ئەمە گومانێکی زۆر گەورەی، لا پەیداکردم و دوایکەوتم، تا لە هەموو ڕاستییەکان بگەم.

## باری نێوخۆی کاژێك

ماوەی (3) ساڵ بوو، لە ڕیزەکانی (یەکێتی خوێندکارانی نەتەوەیی کورد)دا کارمدەکرد، تەنیا یەک کۆبوونەوەی فراوان، کۆنفرانس یا کۆنگرەیەک نەگیرابوو! تەنانەت یەک بڵاوکراوە و نووسینی نوێشم نەدیبوو، هەر بابەتە کۆنەکانی (کاژیک)م بۆ دەهات و دەمخوێندنەوە. ئەو هەموو ڕوداو و گۆڕانکارییە گرنگانە، لە (کوردستان، عێراق) و نێوچەکەدا سەریانهەڵدەدا، سەکردایەتی هیچ هەڵوێستێکیان بەنووسین نەبوو، تەنیا هێندێ شتیان بەدەمی باسدەکرد. لە ئەوە دەچوو، خەویان لێ کەوتبێ!

شێوازی کارکردنمان، زۆر داخراوبوو. بەسەبان ڕۆڵەی کورد لە شارەکانی (کوردستان)، بە دوای (کاژیک)دا دەگەڕان، بۆیان نەدەدۆزرایەوە. چونکە ڕەوشەکە زۆر ئاڵۆزبوو، (پارتی)ش لە ئاستی ڕووداوەکانی ڕۆژانەدا نەبوو. ناڕەزای و بێباوەڕییەکی زۆر، لە ڕیزەکانی گەلەکەماندا بڵاوبووبووەوە. (کاژیک)یش وەک تارماییەک وابوو، هیچی دیار نەبوو، کەسیش بۆی نەبوو، خۆی ئاشکراکا و بڵێ: من (کاژیک)م.

بەکورتییەکەی، (کاژیک) هەلیکی زێرینی مێژوویی بۆ هەڵکەوتبوو، سەرکردایەتییەکەی لەباریبرد. چونکە لە ئەوە دەچوو، ئەندامانی سەکردایەتی گرفتێکی گەورەیان هەبێ، نەتوانن، ئەو بۆشاییە گەورە رامیاریی و بیروباوەڕەی لە گۆڕەپانەکەدا درووستبووبوو، پڕبکەنەوە. یا لە ئاستی لێپرسینەوە و ئەو ئەرکە پیرۆزە مەزنە مێژووییەدا نەبوون. بۆیە کارەکانمان بە ئەو شێوەیە بەڕێوەدەچوو. ئیدی بەدەیان پرسیارم لا درووست بووبوو، بۆ سەرکردایەتیم دەنووسی، بەڵام هەموویان بێ وەڵامبوون. لەبەرئەوە، لە گومانێکی زۆر گەورەدا دەژیام، بەڵام نەمدەزانی، چی بکەم و پەنا بۆ کێ بەرم!

### فرمانێکی سەیر!

دوای ئەوەی (فەرهاد) لە (توورکیا) گەڕایەوە، پێی گوتم: لەمەودوا، هیچ جۆرە پێوەندییەکت، بە هاوبیر (ئەحمەد)ەوە نامێنێ. پاشان دوای هەفتەیەک، نامەیەکم لە لیژنەی پەیوەندی (کاژیک)ەوە بۆ هات، رۆژی (3. 8. 1973) نووسرابوو، داوایان لێ کردبووم، لە ماوەی شەو و رۆژێکدا، بەپەلە وەڵامیانبدەمەوە. نامەکەم کردەوە، چیم بینی؟! هەر سەرمسووڕما، چونکە تا بڵێی، شتێکی پڕ لە سەیروسەمەرەبوو، خەم و پەژارەیەکی زۆر دایگرتم، هەر بە جاری تێکیدام! نامەکە لە (3) خاڵی سەرەکی گرنگ پێکهاتبوو:

* سەرکردایەتی گشتی بڕیاریدا، وەک ئەندامی لە ڕیزەکانی (کاژیک)دا وەرگیرێی.
* لە یەکێ لە مەفرەزەکانی پێشمەرگەی نێوشاردا ڕێکخرێی.
* بە ئەم زووانە، دەمانچەیەک و هێندێ فیشەکت بۆ دەنێرین، ناپاکێکی ڕیزەکانی ڕێکخستن، بە سزای مەرگ بگەیەنی.

ئیدی بە شێوەیەکی وا سەرنجراکێش، ترشوخوێیان بە نامەکەوە کردبوو، هەر دیاربوو، نووسەرێکی خاوەن ئەندێشە نووسیبووی، زۆر بە شانوبازوومدا هەڵیانداپوو، وایان لێ کردبووم، هەر لە خۆمەوە، حەزم لە پیاوکوشتن دەکرد! **پەڵگەنامەی ژمارە (2) ل (418)** نووسیبوویان: ئەو ئابرووە گەورەیە، تەنیا هەر بە تۆ ڕەوادەبینین، تا سەری ئەو ناپاکە پانکەیتەوە. وەک سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئاییني ئیسلام بێ و دژی گاوورەکان هانم بدەن، لە جەنگی (بەدر)دا بەشداریم، تا ئەو ئابڕووە گەورەیەیان بە من ڕەوابینیبێ، بەڵێنی بەهەشت و (72) پەرییەکەم پێ بدەن!

بەراستی، گەر ئەو هەموو سستی و خاوەخاوە نەبووایە، گەر گومانم لە ڕێکخستنەکە پەیداتەکردایە، پەرۆش و گەرموگوڕییەکەی ساڵانی نێوان (1971- 1973)م بمایە، دوور نەبوو بێ دڵەراوکە، فرمانەکەم جێبەجێکردایە. بەڵام کاتێ بیرم لە هەموو شتەکان کردەوە و وردمکردنەوە، زۆر شتم بۆ ڕوونبووەوە و یەکسەر، بە ئەم شێوەیە وەڵاممدانەوە:

پێش ئەوەی ئەم فرمانە جێبەجێبکەم، چەن پرسیارێکتان ئاراستەدەکەم. وا بۆ ماوەی **(3)** ساڵ دەچێ، کارتان لەگەڵ دەکەم، تا ئێستە نەمزانیوە، ڕێکخستنی پێشمەرگەی نێو شارتان هەیە! چەن جاری داوام لێ کردوون، لە ڕیزەکانی (کاژیک)دا وەرگیرێم و تەنیا هەر لە (یەکێتی خوێندکاران)دا کارنەکەم، هەموو جارەکان بۆتان نووسیوم: هیچ جیاوازییەکیان نییە. ئەدی ئێستە بۆ وا بەپەلەپەل و لە یەک ڕۆژدا بڕیارتاندا، وەک ئەندامی لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی (کاژیک)دا وەرگیرێم، وەک پێشمەرگەیەکی نێوشاریش، لە یەکێ لە هێڵەکانی ڕێکخستنی پێشمەرگەی (کاژیک)دا کاربکەم؟!

گەر هێندە ڕێکخستنەکەمان بەهێزە و پێشمەرگەی نێوشارمان هەیە، ئایا لە من زیاتر، کەسی دیکەتان نەدۆزییەوە، بە ئەو پەلەپەلە بیکەن بە پێشمەرگە و ئەو کارەی پێ بسپێرن؟! گەر ئەو کارە هێندە پەلەیە، بۆ بە پێشمەرگەیەکی شارەزا، باوەڕپێکراو و دڵسۆزی دیکەی (کاژیک)ی ناسپێرن؟! ئایا هەر من باوەڕپێکراو و دڵسۆزم؟!

لە کاتێکدا، گەر ئەو فرمانەش جێبەجێبکەم، پێشەکی دەبێ، ناوی ئەو ناپاکە بزانم، ئەو کاتە هەڵوێستی خۆم دیاریدەکەم، ئەو کارە بکەم، یا نەیکەم، نەک یەکسەر بڕیاربدەم و بیکوژم، چونکە پیاوکوشتن، هەروا کارێکی ئاسان نییە!

ئەوە بۆچی تا ئێستە، ئەو هەموو کوردە خۆفرۆش و ناپاکانە لە (کوردستان) هەن، دەستتان لێ نەوەشاندوون؟ بۆچی ئەوانەی ناپاکییان بەرانبەر گەل و نیشتمانەکەمان کردووە، پاکتاویان ناکەن، هەر ئەو کەسانە پاکتاودەکەن، کە ناپاکییان لە (کاژیک) کردووە؟! ئاخر من تا ئێستە نازانم، ئێوە کێن؟ دەمەوێ، ئەندامێکی سەرکردایەتی (کاژیک) ببینم. تکایە وەڵام.

هەر زوو وەڵامدانەوە و ئەوانیش، بۆ بەیانی نامەیەکی دیکەیان بۆ ناردم. زیاتر سەرمسووڕما، سەرکردایەتی بۆ ئەم کارە، بۆچی وا هەموویان لەناکاو لە (سولەیمانی) کۆبوونەوە و پەیتاپەیتا، نامە بۆ من دەنێرن؟! گەر بە پڕوپاگەندەی خەڵکیش بێ، هێندی لە ئەندامانی سەرکردایەتی (کاژیک) لای سەرۆک (بارزانی)، هێندێکی دیکەیان لە (بەغدا) و (سولەیمانی)، هێندێکی دیکەشیان وەک (جەمال نەبەز)، لە وڵاتەکانی (ئەورووپا) دەژین. ئەوا (3) ساڵیش دەبێ، لە (کوردستان) ئاشتی هەیە و (پارتی) فەرمانڕەوایە، ئەو بۆ تەنیا جارێکیش، بۆ سەردانی نیشتمانەکەی خۆی نەگەڕاوەتەوە. ئیدی چۆن؟! بۆ؟! کەی ئەم سەرکردایەتییە چالاکە کۆبوونەوە، ئەم بڕیارە کتوپڕی و شۆڕشگێڕانەیەیان بۆ من دەرکرد؟!

لە نامەکەدا نووسیبوویان: کاتێ خۆی کە لە ڕیزەکانی (کاژیک)دا وەرگیراوی، سوێندت بە ئیسکوپرووسکی شەهیدان، خاکوخۆڵی (کوردستان)، گەورە و پچووکی نەتەوەی

کورد خواردووە، هەر فرمانی لە سەرکردایەتییەوە بێ، بێ دەمەتەقێکردن جێبەجێیکەم. ئێستە سەبارەت بە ئەو سوێندە گەورانە، چی دەڵێی؟!! ئەو پرسیارانەی کردووشتن، پێوەندی بە بڕیاری سەرکردایەتییەوە هەیە و ناتوانین، لە ئەم ڕۆژەدا بۆت ڕوونکەینەوە. ئامادەش نین، هیچ ئەندامێکی سەرکردایەتی خۆمان، لای هیچ هاوبیری ئاشکراکەین. گەر ئەو فرمانە جێبەجێدەکەی، ئەوا بێ کۆڵینەوە و پرسیارکردن دەبێ، بیکەی و کەی بڕیارتدا، چەکت بۆ دەنێرین و ناوی ئەو ناپاکەشت پێ دەڵێین.

هەر کە ئەو وەڵامە هیچوپووچەم خوێندەوە، یەکسەر بۆم نووسین: من پیاوکوژنیم و بە دوای یەکێکی دیکەدا بگەڕێن. ئیدی ئەوانیش جارێکی دیکە، ئەو باسەیان لەگەڵ نەکردمەوە. من گومانم بۆ دووبەرەکی دەچوو، ئەگینا بە هیچ شێوەیە نەمبیستبوو، هاوبیرێکی ئێمە، خۆی بە دەزگەی (پاراستن) فرۆشتبێ، چونکە گەر وابووایە، قسەی دەکرد و بە لانی کەمەوە، ناوی ئەو هاوبیرانەی دەدرکاند، کە دەیناسین و پاراستنیش بانگی دەکردن، یا هەڕەشەیان لێ دەکردن و بە شانازییەوە بڵاویاندەکردەوە، کە هێڵێکی ڕێکخستنی (کاژیک)یان دۆزیوەتەوە. یا گەر ئەو هاوبیرە، لەگەڵ (بەعس)ی داگیرکەردا هاوکاریکردبێ، ئەوا هەر زوو لێپرسراوانی (پاراستن)، دەهۆڵیان بۆ لێدەدایین و دەیانگوت: ئەمە (کاژیک)ە کوردپەروەرەکانن، داوای هەر چوارپارچەکە دەکەن و دژی ئێمە کاردەکەن، کەچی ئەم کادیرە پێشکەوتووەیان، پیاوی (بەعس)ە. لەبەرئەوە بە ناکۆکی و دووبەرەکی نێوخۆم زانی و گوتم: درەنگ یا زوو بێ، هەر دەتەقێتەوە و هەموو شتێ ڕووندەبێتەوە.

## پشگوێخستن

دوای ئەوەی بە ئەو شێوەیە وەڵاممدانەوە، نامەیەکم بۆ هات، تێیدا نووسرابوو: ئەو فرمانانەی پێمان سپاردی و جێبەجێت نەکرد، لەبیر خۆتی بەرەوە و لای هیچ کەسی نایێ، باسیکەی، ئەگینا بەتاوانێکی گەورەی دادەنێین. ئیدی هەر زوو تێگەیشتم، چەن کەسێکی هەرزەکاری دەروون نەخۆش و دڵڕەش، ئەو نامەیەیان نووسیوە. سەرەڕای ئەو هەموو چالاکی و ئەو هەموو هاوبیرانەی، لە دەوری (کاژیک) کۆمکردبوونەوە، سەرەڕای ئەو هەموو دژایەتییەی لێپرسراوانی دەزگەی (پاراستن)، بەرانبەر من دەیان کرد، هێشتا ئەوان گلەییان هەبوو، هێشتا ئەوان هەڕەشەیان لێ دەکردم! ئاخر لە دوای (**11**)ی مارسی (**1970**)وە، گەر دووکەسی وەک من نەبووایە، ئێوە چی بوون و کێتان لەگەڵ بوو؟!

ئیدی وردەوردە، ئەو هاوبیرانەی لاشم بوون، بە بیانووی جۆربەجۆرەوە گواستینانەوە. (سەروەت، برایم، وریا، زاهیر)یان لابرد. لە زانکۆش ڕەوانشاد (عوسمانی حاجی

ئەحمەدی سەرووپی، سامی موحەممەد ئەمین، حەمەڕەئوف حوسێن، عوسمان حەمەسالح، فەرەیدوون مەجید، سیروانی عوسمانی سەعەی مەلاعەبباس)یان لێ سەندمەوە. تەنیا هەر یەک شانەی سێ کەسیم لامابوو، ئەویش یەکێکیان (سەلاح)ی برام بوو!

بەڕاستی لە ئەو ماوەیەدا، زۆر بیرم لە ئەو کارە دەکردەوە. حەزمدەکرد، هەموو شتێکم بۆ ڕوونببێتەوە. تا بزانم، ئەمانە کێن؟ ئەو ناپاکە کێ بوو، کە ویستیان، من بیکوژم؟ ئەوانە چەن پرسیاری بوون، کە خانەکانی مێشکمیان دەکرۆشت، بە چەندین شەونخونی و بەدەم تلی نێوجێگەوە، تا بەرەبەیان خەویان لە چاوانم تۆراندبوو!

## سەرەتای تەقینەوەکە

مانگی (10)ی (1973) بوو، تازە دەسمان بە خوێندنی ساڵی نوێ کردبوو، (عەلی تۆفیق) نەخۆشبوو، لە (تاران) گەڕابووەوە، لەگەڵ (حەمەعەلی) و ڕەوانشاد ملازم (ئەنوەری مەجید سوڵتان)، لە (ئەوپلە)وە بە سەردان هاتبوونەوە. ئەو ئێوارەیە، من و (برایم)یش لە ئەوێ بووین. (عەلی) لە (ئێران)ەوە، کارتۆنی بیرەی (ئاسکۆل)ی هێنابوو. شتێکی هێندە بەتامبوو، هێشتا لە ژیانمدا، بیرەی وا خۆشم نەخواردبووەوە.

هەموومان دانیشتبووین و وردەوردە، دەمانخواردەوە و دەمەتەقێمانده‌کرد. درەنگانی (حەمەعەلی) گوتی: با من و تۆ بچین، لە ماڵی (هورمزەکوێر) مەی بکڕین. ماڵی (عەلی) لە گەڕەکی گاوران بوو، نزیک ماڵی ئەو مەیفرۆشە بوو. پێکەوە رۆیشتین و یەکسەر گوتی: منیان بەتایبەتی، بۆ لای تۆ ناردووە، تا لەبارەی (کاژیک)ەوە قسەبکەین. منیش پێکەنیم و گوتم: (کاژیک)ی چی؟! بۆ تۆ (کاژیک)ی؟! چونکە لە (کاژیک)دا، وایان فێرکرد بووین، لەگەڵ هیچ کەسێکدا نابێ، باسی کرفت و بیروباوەڕەکانی (کاژیک) بکەین، گەر ئەو کەسە، پێشتر هاوبیریشت بووبێ! بەتایبەتی (حەمەعەلی)، لەڕێی (وریا)وە هاتبوو. هەرچەندە کاتی خۆی، من پشگیریم نەکرد، بەڵام (وریا) و (عەلی تۆفیق) کردیان!

ئەویش گوتی: با درۆ لەگەڵ یەکدی نەکەین و من مامۆستا (عوسمان ڕەشید) ناردوومی، کە پێش ماوەیە، بە ناوی (ئەحمەد شەریف)ەوە ناسیوتە. ئیدی باسی هەموو کرفتەکانی بۆ کردم. منیش هەر گوێم گرتبوو، کە لێبووەوە، گوتم: با جارێ بڕۆین، مەیەکە بکڕین، برادەران چاوەڕێماندەکەن. سبەینێ قسەدەکەین. مەیمان کڕی و گەڕاینەوە. بەڵام من ماتییەکی زۆر خراپ دایگرتبووم، بە ئەو نیوەشەوە نەمدەزانی، چی بکەم و ڕوو لە کێ بکەم، تا دەردی گرانی دڵەی برینداری خۆمی بۆ هەڵڕێژم!

بەیانی زوو، پێش ئەوەی ئەوان لە خەوهەستن، خۆم کۆکردەوە و دەرپەڕیم. سواری تەکسییەک بووم، بەپەلە خۆم گەیاندە ماڵی (فەرهاد عەبدولحەمید) و لە شیرین خەودا

خەبەرمکردەوە. هەر حەپەسا، چونکە ئەوە یەکەمین جاربوو، سەر لە ماڵی ئەوان بدەم، بەتایبەتی پیشەکی کاتمان دیاری نەکردبوو، یەکدی ببینین. هەموو شتەکانم بۆ گێرایەوە. چونکە من لە ڕاستی ڕووداوەکان ئاگادارنەبووم، بە دووبەرەکیم زانی و بڕواشم بە (حەمەعەلی) نەبوو، لە ئەو ئاست و پلەیەدا بێ، ئەو نهێنییانە بزانێ و ئەو کارانەی لەدەسبێ. هەروەها ئەو شێوازەی ئەوانیشم بە ڕاست نەدەزانی، بە لادەر و تێکدەرم دانان!

(فەرهاد) گوتی: لە ژوورەکەی من دانیشە و چاوەڕێمبکە، ماوەیەکی دیکە دێمەوە. هەمووی ماوەی کاژێرێکی پێ نەچوو، هاتەوە و گوتی: وەڵامی لقی (سولەیمانی) ئەمەیە و دەبێ، گوێڕایەڵبی. بە هیچ شێوەیە گوێ لە هیچ کەسی ناگری. (عوسمان ڕەشید) ناکۆکی دروووستکردووە و لە ریزەکانی (کاژیک) دەرکراوە. (حەمەعەلی)ش دەسکەلای دەسی ئەوە. گەر هەر کامێکیان هاتن و پێوەندییان پێوەکردی، لێیان توورەبە، ورەیان بڕوخێنە و دەریانکە.

ئیدی من وربووبووم، هەستام و بەدەم بیرکردنەوەوە، بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە. دایکم گوتی: (حەمەعەلی) بە دواتدا دەگەڕێ و کوڕێکی دیکەشی لەگەڵ بوو. گوتیان: سەردەدەینەوە. زۆری پێ نەچوو، (ئەحمەد شەریف) لە دەرگەی دا و گوتی: هێندێ زانیاری هەیە، دەمەوێ، بۆت باسکەم. ئیدی کار لە دیسیپلین و نهێنیرکاندن دەرچوو بوو. هەرچی چۆنێ بوو، دەمویست، یەکێ بێ، گرێکوێرەی ئەم نهێنییانەم بۆ بکاتەوە و ڕاستیم تێ بگەیەنێ. جا تازە لای من، هیچ جیاوازییەک نەبوو، کێ دەبێ، با ببێ، مادام لێپرسراوەکان خۆیان ئامادەنین، هەموو شتێکمان بۆ باسکەن و گرفتەکانمان تێبگەیەنن، تا بە هەمووومان، چارەسەرێکی بنەبڕی بۆ بدۆزینەوە. لەبەرئەوە فەرمووم لێ کرد و هاتەژوورەوە. ئەوە یەکەمین جاربوو، لە دیسیپلینی (کاژیک) لابدەم و فرمانەکەی سەرکردایەتی فەراموشکەم!

جارێکی دیکە، بەناوی ڕاستەقینەی خۆیەوە (عوسمان ڕەشید)، خۆی پێ ناساندمەوە. پاشان دەسی بە قسەکردن کرد. منیش زۆر بە بێدەنگی و بایەخەوە، گوێم بۆ ڕاگرتبوو. کورتەی قسەکانی ئەمەبوو: هەموو شتێ درۆیە، ڕێکخستن نییە، دوای ئەوەی ساڵی (**1970**)، ئەو چەن کەسە، لە ڕیزەکانی قوتابیان و (پارتی) دەرکران، کۆمەڵێکیان کۆبوونەوە و ئەم ڕێکخستنەیان زیندووکردووەتەوە، تا گوشار بۆ (پارتی) بەرن و تۆڵەیان لێ بکەنەوە. (عەبدوڵلائاگرین) و ئەوانیش پیاوی پاراستنن. بۆیە کەس لە گوڵ کاڵتریان پێ ناڵێ!

سەرم لە مامۆستا (فەرەیدوون عەلی ئەمین) داوە، ئەویش لە ساڵی (**1972**)ەوە وازیهێناوە. (جەمال نەبەز) پیاوێکی درۆزن و ترسنۆکە. بەحساب خۆی هەموو شتێکە،

هاوبیریکمان سەریداوە، لە ترساندا خۆی شاردووەتەوە و گوتوویەتی: من ئاگام لە (کاژیک) نییە. (شێخ موحەممەدی هەرسین) و (حەمەی عەزەدوم)یش هەر زوو، خۆیان بە بارەگەی (بارزانی) و پاراستن فرۆشتووە. ئەوانە دەسیان بڕیوین، ناپاکییان لە (کاژیک) و نەتەوەی کورد کردووە. تۆش هاوبیریکی پێشکەوتوو و چالاکی، بە پێویستمان زانی، لە ئەم ڕاستییانە ئاگادارتکەینەوە. ئێمە لقی (بەغدا، کەرکووک) و ناوچەی (هەڵەبجە)مان لەگەل دایە. تۆش دەبێ، هەڵوێستی خۆت ڕوونکەیتەوە.
زۆربەی ئەو قسانەی سەبارەت بە ڕێکخستن و سەرانی (کاژیک) بۆی باسکردم، بە ڕاستم زانی. بەڵام تووشی بێباوەڕی بووبووم و ورەمڕوخابوو. لەبەرئەوە نەمدەزانی، باوەڕ بە کێ بکەم. هەرگیز ئەوەم لە ئەم هاوبیرە چاوەڕێ نەدەکرد، بە ئەو شێوەیە پەت بپچڕێ و پەلاماری هەموو لایە بدا. نەمدەزانی، سەرانی (کاژیک) بەناوی کوردایەتییەوە، دەسیانبڕیووین. ئەی هاوار ماڵوێران خۆم، چیم بە خۆم کرد؟! دەسی ئەو هەموو خەڵکەم بۆ کێ بڕی؟! بۆ بە گژ (پارتی) و کۆمۆنیستەکانمدا کردن؟! هەموو هەوڵەکانم، بە فیڕۆڕۆی، بێ ئەوەی بە خۆم بزانم، کڵاویان لەسەرنام و بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، ئێمەیان خەڵەتاند! چی بکەم؟ چۆن تۆڵەیان لێ بکەمەوە؟!
هەرچەندە قسەکانی مامۆستا (عوسمان) کاریتێکردم، وردەوردە تا دەهات، ڕووی گەشی سپی و خاوێنی، سەرکردەکانی (کاژیک)م لا ڕەشدەبوو. بەڵام ئەم جارەیان بڕیارمدا، نە بە قسەی ئەوان و نە بە قسەی (عوسمان)یش بکەم، بەڵکوو هەوڵبدەم، بە شێوازی تایبەتی خۆم، لە ڕاستییەکان بگەم و چارەسەریان بۆ بدۆزمەوە. بۆیە زۆر بە ڕێزەوە پێم گوت: گەر ئەم زانیارییانە، هەموویشیان ڕاستبن، وا چاکتر نییە، پەنا بۆ دەزگەکانی سەرووی (کاژیک) بەرن، یا ڕاپۆرتێکیان بۆ بنووسن، یا داوای لیژنەی کۆڵینەوە بکەن، یا داوابکەن، کۆنفرانسێ بگیرێ، بەشێوەیەکی ڕێکوپێک و ڕەوایانە، هەموو گرفتەکان چارەسەرکەن؟!
کاتێ ئەو وەڵامەی بیست، خەریکبوو، بگری و گوتی: بۆ (کاژیک) هەیە، تا داوای ئەو شتانەیان لێ بکەین؟! مەگەر تەنیا داوا لە (عەبە) بکەم، ئەویش ئامادە نییە، خۆی دەرخا، چونکە خۆی شاردووەتەوە.
سەبارەت ئەو ناپاکەی، فرمانی کوشتنیان بە من سپاردبوو، لێم پرسی، کێ بوو؟ گوتی: (کەماڵی جەمال موختار) بوو. بەڵام من هەرگیز براوم پێ نەکردن، (کەماڵ) شتێکی وا بکا! ئینجا منیش گوتم: گەر حەزدەکەی، هەفتەی داهاتوو، هەر لێرە یەکدی دەبینینەوە و پێکەوە بڕیاردەدەین. گوتی: باشە. ماڵئاواییکرد و ڕۆی.
ڕۆژی دوایی، لە زانکۆ (فەرهاد)م بینی و هەموو دەنگوباسەکانم بۆ گێڕایەوە. زۆری پێ ناخۆشبوو، گوتی: تۆ لە فرمانەکانی سەرکردایەتی لاتداوە. منیش گوتم: کام سەرکردایەتی؟!

من جگە لە تۆ، کەسی دیکە ناناسم. گەر لە سەروو ئێمەوە، چەن کەسێکی دیکە هەن، بەناوی سەرکردایەتییەوە کاردەکەن، حەزدەکەم، بیانبینم و دەمەتەقێیان لەگەڵ بکەم، تا لە ڕاستی و دروستی ڕوداوەکان تێبگەین، بە هەمووومان چارەسەری کەموکووڕی و گرفتەکان بکەین. گوتی: وەڵامت لێ دەگێڕمەوە.

هەمووی دوو ڕۆژی پێ نەچوو، (عوسمان) لەبەر دەرکیسەرا، (عەبدوڵلائاگرین)ی دیبوو. (ئاگرین) لەرێی (فەرهاد)ەوە، دەنگوباسەکانی پێگەیشتبوو. لەسەر ئەوە لێیان بووبوو بە هەرا و (عوسمان) ویستبووی، پەلاماریبدا، وەک گێڕایانەوە، (ئاگرین) خۆی قوتارکرد بوو. ئیدی کێشەکە بەتەواوی تەقییەوە و زۆربەی هاوبیران پێیان زانی. دوای ئەوە (عوسمان) هاتبوو بۆ ماڵی ئێمە، بە دایکمی گوتبوو: سبەینێ دوای نیوەڕۆ، چاوەڕێمبکا، سەری لێ دەدەم. منیش هەواڵەکەم بە (فەرهاد) گەیاند و بڕیارماندا، ئەو لە ژوورەکەی ئەو دیو خۆی حەشاربدا و منیش دەمەتەقێی لەگەڵ بکەم. هەموو قسەکانیشی تۆمارکەین. پاشان هەردووکمان بەسەریدا بڕوخێین و دەریکەین. چونکە کێشەکەی گەیاندبووە سەرجادە!

ڕۆژی دوایی، ڕیکۆردەرێکمان هێنا و وایەرمان بۆ ژوورەکەی دیکە ڕاکێشا. ویستمان، تاقیکەینەوە، هەرچییەکمانکرد، ڕیکۆردەرەکە ئیشی نەکرد. (فەرهاد) گوتی: من بەپەلە دەچم، ڕیکۆردەرێکی دیکە دێنم. گەر هات، بە قسەوە خەریکیکە، تا دێمەوە. هەمووی (10) خولەک بەسەر ڕۆشتنەکەی (فەرهاد)دا تێپەڕ نەبووبوو، (عوسمان) خۆی بەژووردا کرد و گوتی: چاوم لێ بوو، (فەرهاد) ڕۆی، بۆیە هاتم. ڕاپۆرتێکی درێژی لە گیرفانی دەرهێنا، بۆی هەڵدام و گوتی: فەرموو ئەمەش بۆ (عەبە) بنێرە، با لە (کاژیک)دا پێشتخا! (عوسمان) هێندە تووڕەبووبوو، وای لێهاتبوو، هەموو جەستەی دەلەرزی. دەتگوت شێتبووە، جگەرەکەی لە لێوی نەدەکردەوە. منیش زۆر بە هێواشی پێم گوت: ئێوە کە خۆتان بە کادێری پێشکەوتووی (کاژیک) دەزانن، ئەوە هەڵسوکەوتتان بێ، لەسەرجادە پەلاماری یەکدی بدەن، نە دەمەوێ، ڕاپۆرتەکەت بخوێنمەوە، نە دەشمەوێ، گوێت لێ بگرم. داواشت لێ دەکەم، جارێکی دیکە سەر بە ئەم ماڵەدا نەکەیتەوە. چونکە هیچ کێشە و گرفتێ، بە ئەم شێوەیە چارەسەرناکرێ. دیارە تۆ دەتەوێ، ئاژاوەبنێیتەوە! من بەتەمای هیچ پلەوپایەیەکیش نیم، هەمووی پیرۆز بە خۆتان بێ. ئیدی ئەو ڕۆشتنەی ڕۆی، جارێکی دیکە نەهاتەوە و تەنانەت لەسەرجادەش نەمبینیەوە.

**کەمالی جەمالی موختار**

نایشارمەوە، کاتێ زانیم، ئەو ناپاکەی فرمانی کوشتنی لە (کاژیک)ەوە دەرچووبوو، منیش فرمانەکە جێبەجێکەم، (کەمال)ی هاوڕێم بوو، هەزاران جار سوپاسی خوای گەورەم کرد، کە هێندە بە هێمنی و ژیرانە، هەنگاومناوە، ئەو فرمانەم ڕەتکردووەتەوە و

ئەو کارە چەپەڵەم نەکردووە. چونکە (کەمال)، یەکێ لە هاوڕێ نزیکەکانم بوو، ساڵی (**1970**) ناسیم. ئەو کاتە لە کۆلێژی ئادابی (بەغدا) دەیخوێند. کاتێ چووم بۆ کۆلێژی سەربازی، ئەو ماوەیەی لە (بەغدا) بووم، بەتەواوی لە یەکدی نزیکبووینەوە و پتر لە یەکدی تێگەیشتین. (کەمال) تا بڵێی، کوڕێکی هێمن، لەسەرخۆ، کەمدوو، پاک، زیرەک و ڕووناکبیر بوو. زۆر ڕێزی خۆی و خەڵکی دەگرت. هێندێ جار فیلمان لە یەکدی دەکرد و هەردووکمان دەمانویست، قسە لە یەکدی دەربێنین. بەڵام بێ کەڵکبوو، چونکە لە فێکەی یەکدی دەگەیشتین. گەلێ شەوم لە ماڵی ئەوان بەسەربردووە.



کەماڵی جەماڵ موختار لە حەفتاکاندا

(کەمال) لە نێوەڕاستی شەستەکانەوە، (کاژیک) بوو. بەڵام هێندەی کەموکووڕی دیبوو، نەیتوانی بوو، بێدەنگبێ، هەمیشە ڕەخنەیگرتووە و هەڕەشەی کوشتنیان لێ کردووە. ئەوەی دوایی بۆی گێڕامەوە و باسیکرد، گوتی: تا (جەمال نەبەز) نەگەڕێتەوە، لیژنەیەکی کۆڵینەوە درووست نەکەن، لە دوواتی وەک (شێخ موحەممەدی هەرسین) و (حەمەی عەزیز) نەپرسنەوە، جارێکی دیکە تا ماوم، کار لەگەڵ (کاژیک) ناکەم. بەڵام نە لە ئەوە پتری بۆ ڕوونکردمەوە، نە هۆی وازهێنانەکەشی بۆ باسکردم.

کاتێ لە (بەغدا) خوێندوویەتی، بەدرێژایی ئەو چوار ساڵە، لە ڕۆژنامەی (برایەتی) لەگەڵ (ڕەفیق چالاک)، کاری ڕۆژنامەگەری کردووە، وازی لە کار و چالاکی ڕامیاری هێناوە. کاتێکیش زانکۆی تەواوکردووە، ماوەی چەن مانگێ، لە (کەرکووک) سەربازبووە. دوای ئەوە هەڵهاتووە و لە شاخبووە. لە دەرێشەوە لە (حاجی هۆمەران)، لەگەڵ چەن ڕۆژنامەنووس و هونەرێکدا، گۆڤاری (دەنگی پێشمەرگە)یان دەرکردووە. هەروەها لە وێسگەی شۆڕش کاریکردووە و لە (چوارتا)، تا دوای هەرەس ماوەتەوە.

لە ئەو ماوەیەی لە (بەغدا) بووە، لەگەڵ (شێرکۆی هەژار)، پێکەوە کاریانکردووە. پاشان تێکچوون و لە یەکدی دوورکەوتوونەتەوە. لەبەرئەوە درۆیەکی ڕەشی قێزەونی بۆ هۆنیوەتەوە، گوایە ئەو ماوەیەی لە (کەرکووک) سەربازبووە، زووزوو هاتوچۆی (سولەیمانی) کردووە، دەنگوباسی کۆکردووەتەوە، بە میری گەیاندووە و ناپاکیکردووە. بەڵام گەر (کەمال)، لە شوێنێکی دیکەش سەربازبووایە، هەر لەبەرئەوەی لەگەڵ (شێرکۆی هەژار) ڕێک نەبووە و نێوانیان تێکچووە، بە ناپاک و پیاوی (بەعس) تاوانباریدەکرد. بە مەرجێ جگە لە هاوبیرەکانی (کاژێک)، هیچ کەس و لایەنێکی دیکە، ئەو هەواڵە درۆیەیان نەبیستبوو. چونکە گەر ڕاستبووایە، هەڵبەتە هەر زوو بڵاودەبووەوە!

کاتێ (کەمال) ئەو هەواڵانەی زانی، کە بەدرۆ بۆی دروستکرابوو، فرمانیشیان بە من کردبوو، پاکتاویکەم و جێبەجێم نەکرد، گەلێ سوپاسیکردم. ئێستە لە (سوید) دەژی و هەر هاوڕێ بەڕێزەکەی جارانمە، کە ساڵانێکی زۆرە، لاپەڕەی ئەلیکترۆنی بەنێوبانگی (کوردستانپۆست)ی دامەزراندووە و بەڕێوەیدەبا. (کوردستانپۆست)یش وەڵامێکە، بۆ هەموو ئەو کەسانەی، ئەو هەموو بوختانەیان بۆ دروستکرد!

## شێخ کاوە

(شێخ کاوە)، جارجار سەردانی (سولەیمانی) دەکرد، بەڵام بەزۆری لە (بەغدا) بوو. دوای ئەوەی لە (پۆڵەند)، نەشتەرگەری گەدەی کرد، گەڕایەوە و منیش سەرم لێ دا. دیوەخانەکەی لەبەر دۆست و ئاسیاو جمەیدەهات. هێندێ کۆمۆنیست دەوروەیاندابوو، قسەیان بۆ دەکرد، وایاندەزانی، دەتوانن، کاری تێ بکەن و بە لای خۆیاندا ڕایکێشن!

پێی گوتم: ئێشم زۆر پێتە و دەمەوێ، قسەت لەگەڵ بکەم، بەیانی سەرێکم لێبدە. ئەوە بوو، بەیانی پێکەوە دانیشتین و گوتی: لە بارەگەی (بارزانی)ەوە، کردوویانم بە فرماندەی بەتالیۆن لە هێزی ڕزگاریی. تۆ دەڵێی چی؟ منیش گوتم: گەر خۆت پێی قایلی، ئەوا لێی مەوەستە و پرسیش بە کەس مەکە. گەر بە دڵیشت نییە، ئەوا هیچ. گوتی: من کوڕەزای (شێخ مەحموود)ی نەمرم، باپیرم پاشای (کوردستان) بووە، بچم لە ژێردەسی ڕەئیس (عەبدوڵڵا)دا کاربکەم؟! چۆن شتی وا دەکەم.

منیش گوتم: ئەی دایکت دەڵی چی؟ چونکە دەمزانی، بێ پرسی دایکی، هیچ شتێ ناکا. جگە لە ئەوەی مەبەستم لە بۆچوونی دایکی، پتر رای کۆمۆنیستەکانی دەوروبەریان بوو! گوتی: دایکم رازی نییە و نایەوێ، لێی دوورکەومەوە.

لە راستیدا من دەمزانی، (کاوە) پێوەندی لەگەڵ هەموو لایەنەکاندا هەیە. بەتایبەتی دوای ئەوەی باوکی مرد، ئیدی لە جۆری بیرکردنەوە و بڕیارداندا، گەر چاوی دایکی لێ دیار نەبووایە، تا ئەندازەیەکی زۆر، سەربەستبوو.

لە (بەغدا) زۆربەی کات، لەگەڵ (بابەکر پشدەری) و (رەفیق پشدەری) و ئەو جۆرە کەسە گوماناتلێکراوانەدا بوو. لە (سولەیمانی)ش هەمیشە، دەوری دایکی بە کۆمۆنیست گیرابوو. ئەوانیش دەیانویست، لەرێی (حەلاوە) خانەوە، کەلک لە (کاوە) وەرگرن و بەلای خۆیاندا رایکێشن.

لەگەڵ شۆڕشیشدا، سەردداوەکەی (معاویە)ی هەر مابوو، نەیدەویست، بیپسێنێ! بەڵام دیاربوو، ئەو (کاوە)یەی من دەمناسی، (کاوە)کەی جاران نەبوو، زۆر گۆڕابوو، فێری خواردنەوە، رابواردن و قومارێکی سەیربووبوو، بێ ئەوانە کاتی بەسەرنەدەبرد، بۆیە لەگەڵ کەسدا نەبوو، لەسەر هەر لایەکیش بووایە، ئەو لایە دۆڕابوو!

## کۆرسی یەکەمی پۆلی سێ (1973- 1974)

دوای ئەوەی برادەرانی (کاژیک)، شانەکانیان لێ سەندمەوە، باری شانم بەتەواوی سووکبوو. بەڕۆژ دەمخوێند و بەشەویش لە یانەی فەرمانبەران، بەبادە خەمم بە بادەدا! مەراقێکی زۆرم هەبوو، ئاخی باخی ئاخی خەمێکی گەورە، لە قوڵایی دڵ و دەروون و هۆشمدا جێگیربووبوو، بەڵام کەس نەیدەزانی، بە چ دەردێکەوە دەتلێمەوە. ئینجا دژایەتیکردنی (پارتی) و (پاراستن)یش، لە ئەولاوە بووەستێ، کە زۆر جار، لە دڵی خۆمدا پێم دەگوتن، لە بێخەبەران کەشکەک سلاوات! ئیدی ئەو ساڵە، زۆر بە باشی خوێندم و هەر لە خولی یەکەمدا، لە هەموو وانەکاندا دەرچووم و نمرەیەکی باشیشم هێنا.

## مامۆستاکانی زانکۆ

هەڵبەتە، لە هەموو زانکۆیەکی جیهاندا، هەموو جۆرە کەسایەتییەکی جیاوازی تێدا هەیە. لە هەموو ناوچەکانی وڵاتیشەوە، هێندێ جار، لە وڵاتانی دەرەوەش، کادیری ئەکادیمیکی تێدا کۆدەبێتەوە. زۆربەی هەرە زۆری دوکتۆرەکانی زانکۆی (سولەیمانی)، لە کورد، عەرەبی عێراق و میسر پێکهاتبوون. هێندێ مامۆستای هیندی و پاکستانیشمان هەبوو. لەنێو دوکتۆرە کوردەکاندا، (عەلی عەسکەری، سەعدی غەریب و جەلال شەفیق)، زۆر

زیرەک و بە توانا بوون، شایانی ڕێزێکی بێ پایانیش بوون. چونکە خۆیان زۆر ماندوودەکرد. هەرچەندە دوکتۆر (عەلی عەسکەری) کەمێ تووڕەبوو، بەڵام هێندە زانیاری زانستی هەبوو، هەموو ئەو گرفت و کەموکوڕییانەی داپۆشیبوو.

## دوکتۆر سەعدی غەریب

دوکتۆر (سەعدی)، سەردەمێ ڕاگری کۆلێژەکەمان بوو. هەمیشە سەری قاڵبوو. زۆر تێکەڵاوی خوێندکاران نەدەبوو. جارێ خوێندکارێ سڵاوی لێ کردبوو، وەڵامی نەدابووەوە و پێی گوتبوو: خوێندکار چۆن سڵاو لە مامۆستا دەکا؟! لە کاتی وانە گوتنەوەشدا، جاروبار هێندێ شتی، هەر بە کوردی باسدەکرد. خوێندکارە عەرەبەکانیش هیچی لێ تێ نەدەگەیشتن!
دوکتۆر پتر لەگەڵ مامۆستا (غولام)ی کیمیادا هاوڕێبوو، هەردووکیان شەوانە لە یانەی مامۆستایان، تا درەنگانێ دەیانخواردەوە، قسەی خۆش و گاڵتەوگەپیاندەکرد. شەوێ من لەگەڵ هاوڕێکانمدا، لە ژوورەوە دانیشتبووین، هەردووکیان هاتن. چاوی بە من کەوت، کەمێ خۆی گێژکرد، جێگەش نەبوو، هەر سەیری ئەملا و ئەولای دەکرد. منیش خێرا ئەو هەلەم قۆستەوە و فەرمووم لێ کردن. هەرچی چۆنێ بوو، لای ئێمە دانیشتن. دوای ئەوەی کەمێ کەللەی گەرمبوو، بەتەواوی لەگەڵماندا کرایەوە و قسەی زۆر خۆشی بۆ کردین. پاشان لەسەر گرفتی هۆنراوە و وێژەی کوردی، لێمان بوو بە مشتومڕ.
من تا ئەو کاتە نەمدەزانی، دوکتۆر (سەعدی) لە ئەو بوارەشدا، شارەزاییەکی تەواوی هەیە و هۆنراوەش دادەنێ. دوایی کە هەستاین و ڕۆیشتین، پێی گوتم: ئێرە یانەیە و زانکۆش شوێنی خوێندنە. منیش لە مەبەستەکەی تێگەیشتم، کە نایەوێ، پەرە بە ئەو هاوڕێیەتییە بدا و لای خوێندکارەکانیش باسیکەم!

## دوکتۆر نازم مەحموود سولەیمان

دوکتۆر (نازم)، خەڵکی (سولەیمانی) بوو. دوای ئەوەی کۆمۆنیستەکان ساڵی (**1972**)، لەگەڵ (بەعس) بەرەیانکردەوە، لە دەرەوەی وڵات گەڕایەوە. لە کۆرسی یەکەمی پۆلی سێدا، وانەی (چەوەندەری شەکر)ی پێ دەگوتین. کەمێ زمانی دەیگرت و لە قسەکردندا، زۆر ڕەوان نەبوو. ئەندامی (پارتی کۆمۆنیستی عێراق) بوو. لەگەڵ پارتییەکاندا، زۆر نێوانیان خۆش نەبوو.
ڕۆژێ لە (بەکرەجۆ)، وانەی پراکتیکمان هەبوو. قسەی بۆ دەکردین. ئێمەش لەنێوخۆماندا قسەماندەکرد و پێدەکەنین. ئەویش وایدەزانی، بە ئەو پێدەکەنین. لێمان هاتەپێشەوە و

ئامێرێکی بەدەسەوەبوو، بەرزیکردەوە و ویستی، بکێشێ بە سەرمدا و گوتی: گەر تۆ خۆت بە سەرسەری دەزانی، من لە تۆ سەرسەریترم. منیش گوتم: ببوورە، من سەرسەری نیم و تۆش ئارەزووی خۆتە! ئیدی لە ئەوەوە رقی لێ هەلگرتم.
لە تاقیکردنەوەکاندا، هەمیشە لە پێشی پێشەوە دادەنیشتم، تا کەس سەرم لێ نەشێوێنێ و بەکاوەخۆ وەلامیدەمەوە. یەکەمین تاقیکردنەوەی مانگانەی ئەومان هەبوو، هیچ جۆرە پرسیارێکم لێ نەکرد. ئەویش لەنێو هەموو خوێندکارەکاندا هات و بەسەر سەری منەوە چەقی. هەر سەیری دەسی دەکردم و بە هیچ شێوەیە نەدەجولا. خواخوابیوو، تەماشای ئەملا و ئەولا بکەم، یا قۆپیبکەم، بمگرێ و دەرمکاتەدەرەوە. بەلام دوای ماوەیە بۆی دەرکەوت، من لە ئەو جۆرە خوێندکارانە نیم و خۆم بە باشی ئامادەکردووە. دەسێکی بەسەرمدا هێنا و گوتی: پرسیارت نییە؟ گوتم: سوپاس مامۆستا، نەخێر. لە ئەنجامدا لە (**90%**)م هێنابوو، گوتی: چاوەرێی ئەوەم لێ نەدەکردی. منیش گوتم: ئاخر مامۆستا من پێم گوتی، من سەرسەری نیم. ئیدی پێکەنی و هەر لە ئەو رۆژەشەوە، وەک دوو هاوەلمان لێهات.
دوای هەرەسی شۆرشی (**11**)ی سێپتێمبەریش، کاتێ گەرامەوە، گوتی: هەر شتێک پێویست بوو، پێم بلێ. سەیر ئەوەبوو، سالی (**1988**) خوێندنی دوکتۆرام تەواوکرد، لە (یەکێتی سۆڤیت)ەوە چووم بۆ (سوید). شەوێ لای مامۆستا میوانبووم. خۆی ئەو باسەی کردەوە و گوتی: من وامدەزانی، مامۆستا (جەمال ئەحمەد) رایسپاردووی، لە وانەکەی مندا ئاژاوەبنێیتەوە، چونکە ئەو (پارتی) بوو، بۆیە بە ئەو شێوەیە قسەم لەگەل کردی. شتێکی سەیرە، پێوەندی پارتایەتی و بیروباوەری رامیاری، کار لە رەوشتی مامۆستا بکا و بەگوێرەی بەرژەوەندی پارتەکانیان، هەلسوکەوت لەگەل خوێندکاراندا بکەن!

### یاسین مستەفا

(یاسین مستەفا)، کە بە (مەلایاسین) ناسرابوو، برای (عومەری مچە)بوو. لە زانکۆ مامۆستای وەرزشبوو، بەلام هەر لەسەر سەرسەرێتی خۆی بەردەوامبوو. وایدەزانی، لەنێوبازاڕ کاردەکا. کەم خوێندکار هەبوو، یەخەی نەگرتبێ و لەگەلیدا، تووشی گرفت نەبووبێ.
رۆژێ رەوانشاد ملازم (ئەنوەری مەجید سولتان)، سەردانیکردین. منیش بەنێوزانکۆدا گێرام. ئەو رۆژە یاری بوو، (یاسین) سەرپەرشتی یارییەکەی دەکرد. چاوی بە من و (ئەنوەر) کەوت، بەپەلە هات، پەلاماری (ئەنوەر)ی دا و گوتی: تۆ لێرە چی دەکەی؟ بۆ

میبازی هاتووی؟ برۆ، نابێ لە ئەم ناوە بووەستی. من یەکسەر لە فیکەی خۆم تێگەیشتم و زانیم، هێشتا داخی لێدانەکەی پیاوەکانی (کاوە)ی لە دڵ دەرنەچووە و دەیەوێ، بە ئیمەی بڕێژێ.

(ئەنوەر)یش پەلاماریدا و گوتی: من لێرە چیت لێ بکەم، گەر پیاوی وەرە، با بچینە دەرەوە. ئیدی مامۆستاکانی دیکە، (ئەنوەر)یان دەناسی، گەلێ سەرزەنشتی (یاسین)یان کرد، بەڵام ئەو پیاوە، هیچ قسەی وەرنەدەگرت، لە ئەم گوێیەوە بۆ گوێکەی دیکەی، زیاتر بڕی نەدەکرد!



لە ڕاستەوە ڕەوانشاد (ئەنوەری مەجید سوڵتان، حوسێن موحەممەد عەزیز، عەلی عومەرەگۆج و سیروان عوسمان)، ڕۆژی (24. 10. 1971)، لە زانکۆ گیراوە.

## مامۆستا میسرییەکان

مامۆستا میسرییەکان بە گشتی، دوکتور (فارووق ئەلتوهامی ئەلعورابی) بە تایبەتی، بۆ خوێندکارە کوردەکان، لە هەموو مامۆستاکانی دیکە باشتربوون. زۆر دڵیاندەدایەوە و بەتەواوی، لە ڕەوشی خوێندکارە کوردەکان و خەڵکی (کوردستان) تێگەیشتبوون. زۆر دژی بەرنامەی (بەعس)یش بوون، یارمەتییاندەداین.

مامۆستاکانی بەشی خۆمان، لە منەوە زۆر نزیکبوون، گەلێ جار پێکەوە دادەنیشتین و دەمەتەقێماندەکرد، پرسیاریان لێ دەکردم و منیش بەگوێرەی توانای خۆم، شتەکانم هەڵدەسەنگاند، بەپێی پێویستی پرسیارەکان و بارودۆخەکەش، وەڵامم دەدانەوە و شتەکانم بۆ ڕووندەکردنەوە. چونکە حەزیاندەکرد، سەبارەت بە گەلی کورد، هێندێ زانیاری پەیداکەن، بەتایبەتی دوای ئەوەی (موحەممەد ئەنوەر سادات)، سەردانی (ئیسرایل)ی کرد و

ڕێککەوتننامەی ئاشتی (کامپ دیڤید)یان مۆرکرد، سەرکردایەتی (بەعس) زۆر دژبوون، دژایەتییەکی زۆری میسرییەکانیان دەکرد و ئەوانیش، لەگەڵ (ئەنوەر سادات)دا بوون! تەنانەت دوکتور (فارووق)، لە زانکۆی (زەقازیق)، ڕەزامەندی وەرگرتنی خوێندنی بۆ هێنام، ماستەر لای خۆی لە (میسر) تەواوکەم، بەڵام (عێراق) و (میسر) تێکچوون و ڕێیان نەدام، لە ئەوێ بخوێنم. من ئەو کاتە خوێندنم تەواوکردبوو، لە بەشی بەرووبوومی کێڵگە مامۆستابووم و هەر لەگەڵ دوکتور (فارووق)یشدا کارمدەکرد.



وێنەی (**4**)، ڕۆژی (**2. 3. 1976**) لەنێو زانکۆی سولەیمانی لەگەڵ دوکتور (فارووق) گیراوە.

## بەرەی نیشتمانیی بەعس و پارتی کۆمۆنیستی عێراق

من قسەم لەسەر ئەوە نییە، هەموو پارتی لە ئەم جیهانەدا، بەرژەوەندی تایبەتی خۆی، پێش بەرژەوەندی هەموو شتێکی دیکەوە دەخا. بەڵام کاتی ڕۆژی (**8. 2. 1963**)، سەرکردایەتی (بەعس) بە کودەتایەکی خوێناوی، دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرت، بڵاوکراوەی ژمارە (**13**)یان دەرکرد و پێش هەموو پارتە ڕامیارییەکان، زۆر بەتوندی، پەلاماری پارتی (کۆمۆنیست)یان دا. گەر ئەو کاتە، شۆڕشی کورد لە ئارادا نەبووایە، سەرۆک (بارزانی) باڵەی نەدانایە، لە ئەو بڕوایەدام، تووبریانەکردن! کەچی دوای (**9**) ساڵ داڵدەدان و پاراستنیان، جارێکی دیکە (حەلیمەی کۆمۆنیستی عێراق، بۆ سەر دابونەریتە کۆنەکەی خۆی گەڕایەوە!) لەگەڵ ئەو (بەعس)ەی بە خوێنی سەری (کۆمۆنیست) و کورد تینووبوو، بەرەیەکی نیشتمانی نێوەڕۆک پوچەڵیان کردەوە.

کۆمۆنیستەکان بە ئەو کارەیان، پێش هەموو لایەنێ، بە دەستی خۆیان، چاڵی مەرگی خۆیان هەڵکەن. لە نێوەوە و دەرەوەی (کوردستان) و (عێراق)، زیانێکی زۆریان بە بزووتنەوەی شۆرشگێرانەی کورد گەیاند. چونکە هەر لە ساڵی (**1973**)وە، ڕێککەوتننامەی بەرەی نیشتمانییان، لەگەڵ (بەعس)دا مۆرکرد و تا ساڵی (**1979**) بەردەوامبوو، بەخراپترین شێوە، دژایەتی (پارتی) و جوڵانەوە نەتەوەیی و رامیارییەکەی کوردیان دەکرد، بە قسە و کردەوە، دژی شۆرشی کورد بوون. زۆربەی کادیرەکانیان چەکدارکرد و وەک سەگی هاری پاسەوانی بەرژەوەندییەکانی (بەعس) لە (کوردستان)، لە گیانی گەلی کورد بەربوون. سەرانی (بەعس)، بە هەموو شێوەیە هانیانئەدان، لە هێندێ شوێنی (کوردستان)، دژی پێشمەرگە بجەنگن.
لە ئەنجامدا، شەڕ و پێکدادان لە نێوان هێزەکانی پێشمەرگە و چەکدارە کۆمۆنیستەکاندا ڕوویدا. کۆمۆنیستەکان بە ئەو کارە دزێوەیان، ڕووی جاش و بەکرێگیراو، نۆکەر و چڵکاوخۆرەکانی (بەعس)یان سپیکردەوە. ئەوان وای بۆدەچوون، گەر شۆرشەکە تێکبشکێ و (پارتی) لە (کوردستان) نەمێنێ، زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لە ڕیزەکانی پارتی (کۆمۆنیست)دا ڕێکدەخەن، (کوردستان) بەتەواوی دەبێ بە قەڵایەکی کۆمۆنیستی، (بەعس)یەکانیش ڕێیان لێ ناگرن و (کوردستان)یان بەرەوڕوودەکەنەوە!
لە زانکۆی (سولەیمانی)، کەم ڕۆژ هەبوو، لە نێوان خوێندکارە کۆمۆنیست و پارتییەکاندا، دەمەقاڵە و پێکدادان درووست نەبێ. تەنانەت ڕۆژێکیان کار لە دەمەقاڵەدا نەما، بوو بە شەڕەچەقۆ و چەن خوێندکاری برینداربوون. لە ئەولاشەوە بەعسییەکان بسکەی سمێڵیان دەهات و بە هەردوولا پێدەکەنین! هەڵبەتە لە مێژە بە تەمای ئاژاوەیەکی وا گەورە بوون، بێ ئەوەی خۆیانی پێوەماندووکەن، پلانەکانیان سەریگرت، لە (کوردستان) کوردی کۆمۆنیستیان، بە گژ کوردی پارتیدا ئەکرد و دوژمنایەتییەکی نوێیان، لەنێوان هەردوولا و ڕۆڵەکانی گەلدا ئەفراندبوو!

### شەڕی دەربەندیخان

کۆمۆنیستەکان چەکیان لە (بەعس) وەرگرتبوو، ئەوانیش بە هەموو شێوەیە هانیانئەدان و پشگیرییانئەکردن، دەیانویست، لە هەموو نێوچەکانی (کوردستان)، تەنگ بە هێزی پێشمەرگە و ڕێکخستنەکانی (پارتی) هەڵچنن. هەر لە کۆنەوە، لە پارێزگەی (سولەیمانی) لە نێوچەی (قەرەداغ) و (دەربەندیخان)، قوورساییەکی لەبەرچاویان هەبووە و زۆربەی دانیشتووانەکانیان، سۆزێکی تایبەتیان بۆ دەربڕیوون.

کۆتایی ساڵی (**1973**) بوو، کۆمۆنیستەکان ویستیان، پێگە و دەسەلاتی خۆیان لە ئەو نێوچانەدا، بەتەواوی قایمکەن، بۆیە (بارزانی) فرمانیدا، سنووری بۆ سەرپێچیی و دەستدرێژییەکانیان دانێن، تا لە ئەوە پتر، توانایان نەبێ و فریانەکەون، جگە لە سەری خۆیان، سەری لایەنەکانی دیکە بخورێنن!

لە نێوچەی (دەربەندیخان)، چەکدارەکانی پارتی (کۆمۆنیست)، پەلاماری بنکەکانی هێزی پێشمەرگەیان دا و سزای ئەندامانی پارتییان دەدا. لەبەرئەوە هێزێکی چەکدار لە پێشمەرگەکانی هێزی (خەبات)، رەوانەی ئەو نێوچەیە کران، تا تەمبیانکەن. شەڕێکی سەخت لە نێوان هەردوولادا بەرپابوو، گەلێکیان لە یەکدی کوشت. لەنێو ئەو کوژراوانەدا، لە کۆمۆنیستە ناودارەکان (سەلام سولەی) و لەنێو پێشمەرگە نەتەوەیی و ئازاکانیشدا، (عومەری سالح مەنسوور) بوون.

## عومەری سالح مەنسوور

(مەنسوور)ای هاوڕێم، لە خوارووی (عێراق) بە سەردان هاتبووەوە. ئێوارە هەموو برادەران، لە یانەی فەرمانبەران کۆبووبووینەوە، تا درەنگانی دانیشتین و لەسەر باروودۆخی (کوردستان) دەمەتەقێماندەکرد. دوایی لێبووینەوە و ویستمان بڕۆینەوە، تووشی (فەهمی عەلی ڤینکە) بووین، زۆر بێتاقەتبوو، دڵی پڕبووبوو لە گریان و گوتی: بیستووتانە، (عومەری سالح مەنسوور) شەهیدبووە؟! ئیدی ئێمە وەک لە بانی بەرماندەنەوە، هەرچییەکمان خواردبوو و خواردبووەوە، کاکە (فەهمی) پێی هەڵێنایینەوە! هەر بە ئەو شەوەش، هەموومان یەکسەر چووین بۆ مزگەوتی (شێخ مستەفای نەقیب) لە گەڕەکی (حەوشی گەورە) و تا نیوەشەو، بە دیار تەرمەکەیەوە بووین.

زۆر بەداخەوە، قارەمانێکی وا گەورە، خۆی بۆ ئەو پیاوانە بەکوشتدا، کەچی جگە لە چەن پێشمەرگەیەکی نزیکی دڵسۆزی ئەمەکداری خۆی، کورەکەی و چەن هاوبیرێکی نەتەوەیی، یەک ئەندامی ناوچە و لقی (پارتی)، لە مزگەوتەکە ئامادەنەبوون!

کەس وەک رەوانشاد (ئەنوەری عەلی نەجار)، بە کوڵ بۆی نەدەگریا و نەیدەلاوانەوە. (شێخ ئەحمەدی نەقیب)یش تا درەنگانی، لەسەر تەرمەکەی نوێژیدەکرد. ئێمەش هێندە گریاین، (لە چاوانماندا، نم نەما بۆ گریان!) پاشان نیوەشەو بڵاوەمان لێ کرد و ئەو شەوە، لە ماڵی (مەنسوور) نووستم، تا بەیانی زوو، پێکەوە بەشداری ڕێوشوێنی ناشتنەکەی بکەین.

لە راستیدا، من لە نزیکەوە رەوانشاد (عومەر)م نەدەناسی. بەلام ئەوانەی لە نزیکەوە دەیانناسی، لە باسی پیاوەتی و ئازایەتی ئەودا، بە چۆکدا دەهاتن. ئەو کورە کوردە

مەردە بوێرە، هەر لە سەرەتای شۆڕشی (11)ی سێپتێمبەری ساڵی (1961)ەوە، پێشمەرگەیەکی ئازا و چالاک بوو. جێی شیاوی خۆی، لە دڵ و دەروونی خەڵکی (کوردستان)، هەزارانی گوندەکان و سەرکردایەتی شۆڕشدا کردبووەوە. خۆشەویست و تاکە ڕۆشنایی نەتەوەییەکانی کوردیش بوو. بەتایبەتی جێی باوەڕی سەرۆک (بارزانی) بوو. ئەو پێوەندی و ڕێزە بە شێوەیە بوو، تەنانەت کاتی ڕۆژی (8. 11. 1973) شەهیدکرا، بارەگەی (بارزانی) سێ ڕۆژ، پرسەیان بۆ دانا. چونکە گەلێ جار، دەستی مەردانە و کوشندەی، لە هێزەکانی داگیرکەر و خۆفرۆشەکانی کورد وەشاندبوو.



(1973 – 1942 )

لە کۆتایی ساڵی (1969)دا بوو، زۆر شەو خۆی و پێشمەرگەکانی، دەهاتنە نێوشاری (سولەیمانی) و دەسیان لە دوژمنانی کورد دەوەشاند. دەسوەشاندنەکەی بە شێوەیە بوو، بەرپرسە گەورەکانی جەلالی، شەو نەیاندەوێرا، لە ماڵەکانی خۆیاندا بنوون و هەر ئێوارەیان لێ دەهات، بەرەو بارەگاکانی خۆیان لە (بەکرەجۆ) دەکشان. نەبا بەر زەبری لێدانی هێزی پێشمەرگەکانی (عومەر)ی کورد بکەون. بۆیە ئەوان کوشتنەکەیان، بەلاوە ئاساییبوو!

بەیانی ڕۆژبووەوە، لە مزگەوتەوە تەرمەکەیان هەڵگرت و بە شەقامەکانی نێوشاردا گێڕایان. ئەندامانی لیژنەی ناوچە و لق، فەرماندەی بەتالیۆن و هێزەکانی نێوچەی (سولەیمانی)، لە پێشەوە دەڕۆیشتن. لە دواشیانەوە پتر لە (100) هەزار خەڵکی شار، دەوروبەری (سولەیمانی) و پێشمەرگە، بە دوای تەرمەکەیەوە بوون و بۆ دواجار، ماڵاواییان لە گیانی پاکی کرد. نزیکی گردی (سەیوان) بووبووینەوە، من و پارێزەر (شێخ مەنسووری حەفید)، لیوا (مەنسوور) و ڕەوانشاد (ئازادی شێخ جەلالی حەفید) پێکەوە دەڕۆیشتین. من بەتەواوی گێژبووبووم. چونکە شەوی پێشوو نەنووستبووم و لە ناخاندا، ئاگام لە خۆم نەبوو.

## چوار ئەفسەرەکە

ملازم (مەنسوور)، کۆلێژی سەربازی تەواوکرد. لەگەڵ (نەوشیروانی فوئاد مەستی)، لە سوپای (عێراق)دا ئەفسەربوو. زستانێکی ساردی کۆتایی ساڵی (**1973**) بوو، هێندەم زانی، لەگەڵ ملازم (شێرکۆی عەبدوڵلا دەرویش)دا، بە جلوبەرگی سەربازییەوە، خۆیان کرد بە ماڵی ئێمەدا. دوای ئەوەی دانیشتن و پشوویەکیاندا، پاشان ڕووی دەمیان تێکردم و گوتیان: دەمانەوێ، بچینەدەرەوە و پێوەندیمان، بە هەڤاڵ (حەمەڕەحیم)ەوە هەیە. ئێستە دەبێ، بڕۆین، چونکە چاوەڕێماندەکا. منیش لەبەردەم (شێرکۆ)دا، هیچ قسەم نەکرد و هەر هێندەم گوت: لای ئەو، ناوی من مەبەن، گەر زووش لێبوونەوە، ئەوا من لە ماڵەوە چاوەڕێتاندەکەم. ئیدی خۆیان گۆڕی، جلی کوردییان لەبەرکرد و ڕۆیشتن.

بۆ بەیانی (مەنسوور)م بینییەوە، نامەیەکی دامێ و گوتی: ئەم نامەیەم بۆ سەرکردایەتی (کاژیک) نووسیوە، بۆم بگەیەنە. منیش گوتم: چی تێدا هەیە، وا بە کراوەیی دەمدەیتێ؟! گوتی: حەزدەکەم، بیخوێنیتەوە و رای خۆتم پێ بڵێی. منیش کاتێ خوێندمەوە، نووسیبووی: <u>کاتی ئەوە هاتووە، پێوەندی بە (کاژیک)ەوە بکەم، گەر (کاژیک)یش نەبووایە، خۆم بیرم لە ئەوە دەکردەوە، ڕێکخراوێکی نەتەوەیی دامەزرێنم!</u>

کە ئەوەم خوێندەوە، لەلایەکەوە خەریکبوو، لە خۆشیاندا باڵبگرم، چونکە هەوڵەکەم لەگەڵ (مەنسوور)دا بەفیڕۆ نەڕۆی. لەلایەکی دیکەشەوە دڵم پڕبووبوو، بیرم لە ئەوە دەکردەوە، کە کورد و (کاژیک)، هێشتا چانسیان زۆر ماوە. چونکە گەنجی وامان هەیە. بڕواناکەم، لە ئەو کاتەی من لە (کاژیک)دا کارمدەکرد، تا ئەو ساتە، هیچ کەسێ بە ئەو کورت و پوختییە، بە ئەو دڵسۆزی و پڕ واتا بەرزەوە، ئەو چەن دێڕەی نەک هەر بۆ (کاژیک)، بەڵکوو بۆ هیچ ڕێکخراو و پارتێکی کوردی و کوردستانی نووسیبێ!

بەلام لە دڵی خۆمدا هەر لێکمدەدایەوە و دەمگوت: نامەکەی بۆ کێ بنێرم؟! حەزیشم نەدەکرد، گرفتەکانی نێوخۆی (کاژیک)، نەک هەر بۆ (مەنسوور)، بەڵکوو بۆ هیچ کەس و هاوبیرەکانی لای خۆشم باسکەم، چونکە هێشتا هیوایەکم مابوو، کێشەکەی نێوان سەرکردایەتی و کادیرە پێشکەوتووەکانی (کاژیک)، بەلایەکدا بکەوێ و ڕاستی لای لایەکیان بدۆزمەوە!

بۆ بەیانی ماڵاواییم لە هەردوکیان کرد و (خاڵەحاجی)، بەرەو (چوارتا) بەڕێیکردن. هێندە بەسەر چوونەدەرەوەی ئەو دوو ئەفسەرە لاوەدا تێپەڕنەبووبوو، هەردوو ملازمی ڕەوانشاد (حەمەشەوقی) و (ئەحمەد فەتاح) هاتنەوە. ماوەیە لەگەڵ ئەوانیشدا بووم، پاشان (خاڵەحاجی) ئەوانیشی ڕەوانەی (چوارتا) کرد.

ئینجا تێگەیشتم، ئەم کارە بە بەرنامەیەکی ڕێکوپێک دەکرێ و (خاڵەحاجی)ش بە ناوی شۆڕشەوە، نامەی بۆ هەموو ئەفسەرە کوردەکان ناردووە و داوای لێ کردوون،

ڕیزەکانی سوپای (عێراق) چۆڵکەن و بین بە پێشمەرگە. لەبەرئەوە زۆربەی زۆری ئەفسەرە کوردەکان، بەدەم داواکارییەکەی شۆڕشەوە چوون و لە ماوەیەکی کەمدا هەڵاتن.
هەڵبەتە ئەمەش، کاریگی زۆر باشبوو، شۆڕش کردی و ئەفسەرەکانیش بە برواوە، وازیان لە ڕیزەکانی سوپای دوژمنی داگیرکەری دەوڵەتی (عێراق) هێنا و لە ڕیزی سوپای شۆڕشگێڕی (کوردستان)دا خەباتیاندەکرد. چونکە هەر هیچ نەبێ، ئەو کۆمەڵە لاوە خوێنگەرمە خاوەن باوەڕە، (پارتی) بۆ کۆلێژەکانی سەربازی و پۆلیسی ناردبوون، ئەگینا بە خەوی شەویش نەیاندەبینی، بەرگی ئەفسەرییان لەبەربایێ!

## هەڵبژاردنی مامۆستایان

سەرەتای مانگی (2)ی ساڵی (**1974**) بوو، لە هەموو (عێراق)دا، هەڵبژاردنی سەندیکاکانی مامۆستایان دەسپێکرد. لە (کوردستان) بەعسییەکان و کۆمۆنیستەکان، بە یەک لیست دابەزین، بەربەرەکانی لیستی (پارتی)یان دەکرد. بەڵام لە (عێراق)ی عەرەبی، هەر یەکەیان بە لیستێکی جیاواز دابەزین، چونکە (بەعس) ڕێی نەدەدان، لە ئەو نێوچانەدا، پارتی کۆمۆنیست دەسەڵاتی هەبێ!
بێگومان هەموو نەتەوەییەکان، دەنگیان بۆ لیستی (پارتی) دا. لە ئەنجامیشدا هەر لیستەکەی ئەوان بردییەوە و سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەسهێنا. لیستی بەعسییەکان و کۆمۆنیستەکانیش، دەنگێکی زۆر کەمیان هێنا و هەر بەتەواوی تێکشکان.
ئاخر کۆمۆنیستەکان، ئەوەیان نەدەزانی، یا زۆر ساکاربوون و شتی لە کاری ڕامیاری فێرنەبووبوون، کە گەلی کورد بە قۆناغی ڕزگاریخوازی نیشتمانیدا تێپەڕدەبێ و داوای مافە نەتەوەییە ڕەواکانی خۆی دەکا. (پارتی) و شۆڕشیش لە ئەو پێناوەدا، بە هەزاران شەهیدیان دابوو، ئیدی چۆن جەماوەری گەل، دەنگ بە نوێنەری ڕاستەقینەی کورد نادەن و دەنگ بە لیستێکی نامۆی زوڵەکی دژ بە کورد و (کوردستان) دەدەن؟!
یەکێ لە پاڵێوراوە کۆمۆنیستەکان، هونەرمەند (حەسەن گەرمیانی) بوو. هەرچەندە زۆرم پێ ناخۆشبوو، لەسەر لیستی ئەوان خۆی پاڵاوتبوو، چونکە زۆرم خۆشدەویست و هاوڕێیەکی نزیکمبوو، بەڵام دوایی کە دەرنەچوون، پێم گوت: تۆ وات دەزانی، خەڵک خۆشیدەویی و ڕێزت دەگرن، لەبەرئەوەی هونەرمەندێکی باشی و کۆمۆنیستی، ئیدی کە دەنگت خۆشبوو، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، گوێ بە بیروباوەڕ و نیشتمانپەروەری نادەن، یەکسەر دەنگ بۆ تۆ دەدەن؟! ئەویش وەک نەریتی خۆی، پێکەنی و هیچ قسەی نەکرد!

* * *

**مانگەشەو سەر لە ئێوارە دیارە!**

سەرەتای ساڵی (**1974**)، سەرەتای گرژی و ئاڵۆزی، نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و دەوڵەتی (بەعس) بوو. چونکە ماوەی (**4**) ساڵەکە، بەرەو تەواوبوون دەڕۆی و هێشتا، زۆر خاڵی ڕێککەوتنەکە، جێبەجێ نەکرابوو، ناکۆکییەکی زۆریش، لەنێوانیاندا هەبوو.

هەڵبەتە هەر لە سەرەتاوە، ڕێککەوتننامەی (**11. 3. 1970**)، هێندە درز و کەلێنی گەورە و گچکەی تێدابوو، بەشی ئەوەی دەکرد، لایەکیان لێی پەشیمانبێتەوە و شەرەدەسپێبکاتەوە. هێندە ناکۆکیش، لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و بەعسییەکاندا هەبوو، هێندە پیلانیانگێڕا و شەڕی پچووکپچووک، لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا، کەسێ کەمێ دووربین بووبێ، یەکسەر تێدەگەیی، ئەو ترەکەڵەکەی نێوان (پارتی) و (بەعس)، تاسەر بڕناکا و تێکدەچێتەوە. بەتایبەتی دوای ئەوەی سەرکردایەتی (بەعس)، ڕۆژی (**29. 9. 1971**) هەوڵی لەنێوبردنی سەرۆک (بارزانی) دا. ئیدی لە کۆتایی ساڵی (**1972**)وەوە، لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕش و میری (عێراق)دا، هیچ جۆرە بڕوا و متمانەیەک نەما. ڕۆژبەڕۆژ (بەعس) لە (کوردستان)، پتر شوێنپێی خۆی قایم دەکرد و بەهێزتردەبوو. قوڵە و بنکەی سەربازی گەورەگەورەی درووستدەکرد. خەڵکی راودەنا، گرتن و کوشتن بەردەوامبوو، شاڵاوی پرۆسەی بەعەرەبکردنی ناوچەکانی (کوردستان)، نەک هەر ڕانەگیرابوو، بەڵکوو لەزیادبوونیشدابوو. کەسانێکی دەروون نەخۆش و خۆفرۆشیان، لە دەوری خۆیان کۆکردبووەوە. دۆستی نوێیان لەنێوەوە و دەرەوەی وڵات پەیداکردبوو. نەوتیان خۆماڵیکردبوو، پارەیەکی زۆریان دەسکەوتبوو، چەکێکی زۆری کۆکوژییان کڕیبوو، سوپایەکی گەورە و دژەکوردیان پێکەوەنابوو.

بەکورتییەکەی، ئەو (بەعس)ەی ساڵی (**1974**)، نە ئەو (بەعس)ە بێ ئەزموونەی ساڵی (**1963**) و نە ئەو (بەعس)ە لاوازەی ساڵی (**1970**) بوو. بەڵکوو زۆر بەهێزبووبوو، توانا و دەسەڵاتێکی زۆر گەورەی هەبوو. لاقیان لەسەر زەوی چەقاندبوو، سەریشیان لە ئاسمان توووندکردبوو! بۆیە بە هیچ شێوەیە، ملیان بۆ داخوازییەکانی سەرکردایەتی شۆڕش نەدەدا و ڕۆژبەڕۆژیش، پتر لە بەڵێنە پووچەکانی خۆیان پەشیماندەبوونەوە!

سەرکردایەتی (پارتی)ش، جگە لە ئەوەی بڕوایەکی تەواو و پتەویان، بە برایەتی درۆزنانەی کوردی بندەس و عەرەبی سەردەس، هاوپەیمانێتی لاسەنگی نێوان (پارتی) و (بەعس) هەبوو، لە ماوەی ئەو (**4**) ساڵەدا، نە خۆیان بۆ ئەو ڕۆژەڕەشە ئامادەکرد بوو، نە زۆر شتی باشیشیان، بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەیان کردبوو!

بەلام لە سەرەتای ساڵی (**1974**)ەوە، ئینجا سەرکردایەتی (پارتی) زانیان، تای تەرازووی دەسەڵاتدارانی (بەعس) قوورسترە، لە (کوردستان) و (عێراق)یش، بەتەواوی ڕەگی

قوولیان داکوتاوە. لەبەرئەوە کەمی بەهۆش خۆیان هاتنەوە و کەوتنە خۆیان. هێندێ چەکی قورسیان، بۆ ناوچەکانی (گەرمیان) و (قەرەداغ) نارد. دڵنەوایی هێزەکانی پێشمەرگەیان کرد و بانگیانکردنەوە. لە زۆربەی ناوچەکاندا، هێزەکانی پێشمەرگە سەرلەنوێ رێکخرانەوە. ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ (ئێران)، رۆژێ لە رۆژان نەپچڕابوو، دەمەزەردکرایەوە و دەرگەی سنوورەکان بەئاشکرا کرانەوە. دەستەدەستە کوردپەروەران، لە هەموو ناوچەکانی (کوردستان)ەوە رایاندەکرد و پەنایان بۆ شۆڕش دەبرد. ئیدی بارودۆخێکیان ئەفراندبوو، کەس بەتەمای ئاشتی و رێککەوتن نەمابوو. هەر ئێمەی نەتەوەیی هیچ نەبووین و هیچ جۆرە پلانێکمان نەبوو!

## یەکلاکردنەوە

دووەمین کورسی پۆلی سێیەم دەسپێکردبوو، خوێندکارە کوردەکان، زۆر بە نابەدڵی هاتوچۆی زانکۆیان دەکرد. چونکە کەس نەیدەزانی، چیمان بەسەردێ و نەک هەر چارەنووسی خوێندن، بەڵکوو پاشەڕۆژی هەموو کار و پیشەکانیش لە (کوردستان)، بە ئاییندەی شۆڕشی کورد و پەیوەندی رامیاری، نێوان هەردوو سەرکردایەتی (پارتی) و (بەعس)ەوە بەسترابووەوە. لەبەرئەوە زۆربەی هاوڕێکانم، پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کرد بوو. هێندێکیان هەر لە چیابوون. منیش نەمدەزانی، چی بکەم. یەخەی (فەرهاد)م گرت و لێم پرسی: گەر شەڕبووەوە، چی بکەین؟! روو لە کوێ کەین؟! گوتی: هێندەی لە سەرکردایەتییەوە ئاگادارکراوم، جەنگ دەسپێدەکاتەوە و جەنگی ئەم جارەش، زۆر سەخت دەبێ. زانکۆ دادەخرێ و خوێندن دەوەستێنرێ. ئێمەش ناتوانین، هیچ جۆرە یارمەتییەکی هیچ کەسی بدەین. چونکە شۆڕش، شۆڕشی (پارتی)ە و هەر کەسی دەبێ، خۆی خەمی خۆی بخوا!

هەرچەندە (فەرهاد)، درۆی لەگەڵ نەدەکردم و ئەوەی ڕاستی بووایە، پێی دەگوتم. بەڵام کاتی گوێم لە ئەو قسە پڕوپووچانە بوو، بەجاری وەک رێکخستن و سەرکردایەتی، نەک وەک بیروباوەڕ، هیچ جۆرە بڕوایەکم بە (کاژیک) نەما. بەیەکجاری هەموو وێنە تەماوی و تەڵخەکانم لا روونبووەوە. بەتەواوی هەموو کێشە و گرفتەکانی نێوخۆی (کاژیک)م بۆ دەرکەوت. هەر زوو بەهۆی ئێمەوە دەیانویست، جێپێی خۆیان، لەنێو کۆمەڵانی خەڵک و شۆڕشدا بکەنەوە. ئینجا زانیم، مامۆستا (عوسمان) هەرچییەکی بۆ باسکردووم، هەمووی ڕاستبووە. دەسیانبڕین و هەڵیانخەڵەتاندین. منیش بە نەزانی و لە بێئاگایی خۆم دوایانکەوتم. کۆمەڵی کوڕی کوردی نیشتمانپەروەری تازەپێگەیشتووم هەڵفریوان، بێ لانە و بێ خاوەن، بەرەڵای دەشتی چۆلوهۆلی بەلا و چارەنووسێکی نادیارم کردن.

ئای لە ئەو ڕۆژانە، چەن سەختبوون، خەو و خواردنم لی بێزرابوو. هەمیشە بیرم لە ئەوە دەکردەوە، ئەو سەرکردایەتییە ترسنۆک، بەزیو و هەلپەرستە، چۆن دەسیان بە زاخدا کردین؟! لە خۆم دەپرسی: بۆ ئەو هەموو درۆیەیان لەگەل کردین؟! گوناهمان چی بوو، بە ئەو شێوەیە غەدرمان لی بکەن؟! تۆڵەی خۆم و هاوبیرەکانم، لە کێ بسەنمەوە؟! بەڕاستی، بیرم لە زۆر شت دەکردەوە، زۆر خەممبوو، نەمدەزانی، چی بکەم، ڕوو لە کێ و لە کوی بکەم؟! بەلام بۆئەوەی لە ئەوە پتر، فێل لە خۆم و هاوبیرەکانم نەکەم، چیدیکە مۆلەت بە ویژانی خۆم نەدەم، یەکەمین هەنگاوم نا و هەموو پێوەندییەکانم، لەگەل (کاژیک) پساند. هەروەها ئەو چەن هاوبیرە کەمەی لاشم مابوون، ئاگادارمکردنەوە و پێم گوتن: (کاژیک) نەماوە، ڕێکخستنەکانی خۆی وەستاندووە و هەر هاوبیرێ دەیەوێ، بچێتەدەرەوە، ئازادە و دەبێ، خۆی مشووری خۆی بخوا! ئیدی لە ئەوە پتر تاقەتی حانەحەبەشێنی بێ سەرووبەرم نەبوو، هەموو شتێکیان بۆ باسکەم و لە بنی کولەکەکە بدەم، تا ئەوانیش یەخەی من بگرن و بە پرسیار دامگرنەوە، کە خۆشم وەک ئەوان، وەلامەکانیانم نەدەزانی!

**دوابڕیار**

دوای ئەوەی هەموو شتێکم بۆ ڕوونبووەوە، (کاژیک) هەر تەنیا دێیەکی زل و ماڵێکی وێران بوو، وەک ڕەشەبا و گێژەلووکە، لەپڕ هەلیدەکرد، تەنیا هەر دەنگی هەبوو، ڕەنگی نەبوو، جگە لە ئەفسانە و تەمومژێکی کاتی، هیچی دیکە نەبوو، سەرکردایەتی پارتەکە، پیاوی ڕۆژی تەنگانە و ڕووداو نەبوون، لەنێوجەرگەی خەبات و ئازارەکانی گەلدا پێ نەگەیشتبوون، تەنیا چەن کەسێکی ترسنۆکی دوورەپەرێزی ڕەشبین بوون، خایە و مایەیان تەنیا چەن بابەت و کەرەسەیەکی کۆن و سواو بوو، لە قسەی زل و ڕەخنەگرتن پتر، هیچی دیکەیان لەدەس نەدەهات، بڕیارمدا، جێی شیاوی خۆم، لەنێو ڕیزەکانی شۆڕشدا بکەمەوە. بەلام لەسەر حسابی بیروباوەڕ و (کاژیک)، نان و ناوبانگی خۆم نا، بەلکوو وەک کوردێکی بێلایەنی نیشتمانپەروەری دلسۆزی نەتەوە و نیشتمانەکەم، لە یەکێ لە هێزەکانی پێشمەرگەدا، چەک هەلگرم و داکۆکی لە (کوردستان)ە خۆشەویستەکەم بکەم. چونکە:

– لە زانکۆ کۆمۆنیست و بەعسییەکان، زۆر باش دەیانناسیم. لەبەرئەوە لەنێوشاردا نەمدەتوانی، هەروا بە ئاسانی، سەری خۆم کزکەم و دانیشم.

– ئەوە لە من نەدەوەشایەوە، سەر بۆ دوژمنی داگیرکەر شۆڕکەم و ناپاکی لە نەتەوەکەم بکەم.

« گەر سەری خۆشم کزکردایە، ناپاکیم لە نیشتمانەکەی خۆشم نەکردایە و کەسیش دەستی بۆ نەبردمایە، لە ئەو بڕوایەدا بووم، (خاڵەحاجی) وازی لێ نەدەهێنام و هەلێکی باشیشم، بۆ (پاراستن) دەڕەخساند، زەفەرم پێ بەرن، بە ناوی ناپاک و پیاوی (بەعس)ەوە، بەخۆڕایی خوێنیان بڕشتمایە. چونکە بە تۆمەتی ناپاکی لە کورد و شۆڕش، جگە لە ئەوەی کارێکی ئاسانبوو، هیچ گرفتێکی تێدا نەبوو، زۆر کەسی دیکەی بێ تاوانیشیان فتکردبوو! بۆیە هێندە گێل و گەمژە نەبووم، تا لە گرفت و ئەگەرەکان نەگەم، ئەو هەلە لە دەس خۆم بدەم و لە هەمان کاتیشدا، بۆ ئاحەزە ڕامیارییەکانی برەخسێنم، بە ئارەزووی دڵی خۆیان، درۆم بۆ هەڵبەستن و تاوانبارمکەن!

### شێخ ڕەزای گوڵانی

من و پارێزەر (شێخ مەنسووری حەفید)، ئێوارەی ڕۆژی (**7. 2. 1974**)، لە یانەی فەرمانبەرانی (سولەیمانی)، میوانی (فەرەیدوونی شێخ ئەیبی گوڵانی) بووین. ئەو کاتە (فەرەیدوون)، ئەفسەری پۆلیسبوو، لەگەڵ (شێخ ڕەزا)ی مامیدا کاریدەکرد. جگە لە ئەوەی (فەریدوون) خزمم بوو، هەم کوڕی گەڕەک و هاوڕێی منالی، هەم دراوسێش بووین. هەروەها (کاژیک)یشی زۆر خۆشدەویست. تەنانەت دنگۆیەکیش هەبوو، گوایە (شێخ ڕەزا)ش، هەر سەر بە (کاژیک) بوو!

لە کاتی قسەکردندا، من باسی ئەگەرەکانی نوێبوونەوەی جەنگ و گرفتی خۆمم بۆ کردن. (فەرەیدوون) قسەکەی پێ بڕیم و گوتی: بۆ سەری لە کاکە (ڕەزا) نادەی و لە ئەو بارەیەوە، قسەی لەگەڵ بکەی؟ ئەو کاتە (شێخ ڕەزا)، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (پارتی) و بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگەی (سولەیمانی)ش بوو. لەلایەکەوە پێوەندی خزمایەتیمان هەبوو، لەلایەکی دیکەشەوە، تێکەڵاویمان هەبوو و دراوسێشبووین. ئەمانەم هەموو لێکدایەوە و پێشنیازەکەی (فەرەیدوون)م پێ باشبوو. بۆیە لە ناچاریدا بڕیارمدا، پەنا بۆ خوالێخۆشبوو (شێخ ڕەزا) بەرم. ئەوەبوو، (فەرەیدوون) هەر خۆی، کاتێکی لە مامی بۆ وەرگرتم و منیش، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا، سەرم لێ دا.



(2004 – 1924)

هەر چوومەژوورەوە، لەبەرم هەستا، فەرمووی لی کردم و گوتی: ماشەڵڵا گەورەبووی! ئیدی ماوەیە بێدەنگبوو، خەریکی هێندێ نووسراوی بەردەستی بوو، لەپڕ سەری هەڵبڕی و گوتی: ڕاستە تۆ لەگەڵ (کاژیک) کاردەکەی؟! دیاربوو، (فەرەیدوون) هەموو شتێکی بۆ باسکردبوو، منیش گوتم: خەڵک وا دەڵێن. ئینجا بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: ئەی خۆت دەڵێی چی؟ گوتم: من بۆ کارێکی وا، هاتوومەتە لای بەڕێزتان، لە ئەوانەیە شەرپێیتەوە، (پاراستن) زۆر خراپ لێیان هەڵپێچاوم و لەگەڵ مندا، هەڵسوکەوتیان باش نییە. گەر بەڕێزتان دەتوانن، یارمەتیمبدەن و لە شەڕی (حەمەڕەحیم) دوورمخەنەوە، زۆر سوپاستاندەکەم. گوتی: باشە، بەڵام تۆ دەڵێی چی؟ گوتم: لێت ناشارمەوە، بە بیروباوەڕ (کاژیک)م. کەمێ پێکەنی و نامەیەکی بۆ نووسیم، دایمێ و گوتی: بیخوێنەرەوە. نووسیبووی: (بۆ هەموو لێپرسراوان و هێزی پێشمەرگەی (کوردستان)، هەڵگری نامە، حسین محمد عزیز، خوێندکاری زانکۆیە و لە هەر کوێیەک ویستی، بێ بۆ لام، تکایە دەست مەهێنتە ڕێی.)

**شێخ ڕەزای گوڵانی**

**1974 .2 .15**

لە خوێندنەوەی نامەکە بوومەوە و تەماشایەکمکرد، گوتی: باشە؟ منیش زۆر سوپاسمکرد و ڕۆیشتم. هەرچەندە نووسینەکەیم زۆر بە دڵ نەبوو، بەڵام وا دیاربوو، ئەویش نەیویستبێ، لە ئەوە زیاتر، هیچی دیکە بنووسێ. تا ئەوڕۆش ئەو نامەیەم بۆ یادگار هەڵگرتووە، بۆئەوەی هەرگیز بیرم نەچێتەوە، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان، لە ئەو شۆڕشە گەورە و فراوانە بێسەروبەرەی (**1961 .9.11**)دا، لاوێکی خوێندکار و کوردێکی نەتەوەیی وەک من، بە نووسراوی خزمێکی وەک کاکە (ڕەزا) جێبووەتەوە، کە ڕەنگە بەدەیان پیاوخراپ و سیخوڕی (بەعس)، تەزاتێنیان تێدا کردبێ!

**ڕەزای بابەگوڕوون**

دوور نییە، زۆر کەس سەیری لێ بێ، دەنگوباسی کوردێکی وا خۆفرۆش، لێرەدا بە ئەو شێوەیە تۆماربدەکەم! بەڵام پێش هەموو شتێ، (ڕەزا) برای شەهیدی نەمر (شێخ عەبدووڵ)ی دووکانداربوو، کە لە ڕەشبگیرییەکەی ڕۆژی (**1963 .6 .9**)دا دەستگیرکرا، لەسەر ئەوەی جنێوی بە سەرۆک (بارزانی) نەدا، لە سەربازگەی (سولەیمانی) گولەبارانکرا، چونکە لە بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەری تێکۆشەری کورد بوو. بەڵام (ڕەزا) لە ئەم دواییانەدا، وای لێهات، ئەگینا زووتر، هەر خەریکی کوردایەتی بوو.

(رەزا) لە خوارووی (عێراق) فەرمانبەربوو، بەڵام دوای ئەوەی، هەردوو باڵەکەی جەلالی و مەلایی یەکیانگرتەوە، گەڕایەوە، پێوەندی بە (خاڵەحاجی)وە هەبوو، چونکە زۆر حەزی لە ئەو جۆرە پێوەندییانە دەکرد، بێ دەسەڵات و پلەوپایە نەیدەتوانی، سەری خۆی کزکا و بژی!

دوای ڕێککەوتنەکەی (**11. 3. 1970**)، گەلێ جار خۆی بە خزمایەتی (فەتاح ئاغا)وە بادەدا. تەنانەت ساڵی (**1974**)یش، دوو هەفتە پێش ئەوەی جەنگ لە (کوردستان) دەسپێبکاتەوە، پێی گوتم: بەیانی دەچم بۆ (تەوێڵە) بۆ لای کاک (فەتاح) و کاتێ گەڕاشەوە، سەری لێدام و گوتی: بڕیارمداوە، ئەچمەدەرەوە و هەر لەنێوشار بمێنمەوە.

پێش ئەوەی بچمەدەرەوە بە سێ ڕۆژ، پێکەوەبووین و لێی پرسیم: نیازی چیت هەیە؟ گوتم: هەر بەیانی شەڕبێتەوە، یەکسەر دەیقوچێنم. گوتی: هەر ئیشێکت هەبوو، بەسەرچاو من بۆت رادەپەڕێنم. منیش بە هەلم زانی و لێم پرسی: پێوەندیت لەگەڵ (فەتاح ئاغا) ماوە؟ گوتی: ئەی چۆن، زۆر باشە. گوتم: دەتوانی، نامەیەکم بۆ بنووسی، گەر ڕێمکەوتە ئەو ناوە، پارمەتیمبدا. ئیدی هەر هەمان کات دانیشتین و گوتی: خۆت چی دەنووسی، بینووسە، دوایی من ناوی تێهێنی خۆم دەنووسم و بۆت واژۆدەکەم. منیش بە ئارەزووی دڵی خۆم، نامەیەکم ڕازاندەوە و گوتم: فەرموو جارێکی دیکە، بە دەسوخەتی خۆت بینووسەرەوە، ئینجا واژۆیکە.

لە ڕاستیدا، لە نامەکەی (شێخ ڕەزای گولانی) پتر، دڵم پێی خۆشبوو، چونکە دەمزانی، ئەم نامەیەیان کاریگەرترە. ئەوە بوو، جارێکی دیکە نامەکەی نووسییەوە و هەڵمگرت، تا کاک (فەتاح) هاوکاریمبکا و وەک پێشمەرگەیەک، لە ڕیزی لەشکری شۆڕشگێڕی (کوردستان)دا جێم بکاتەوە. سەردێڕی نامەکەش نووسرابوو: لە (**1**)ەوە بۆ (**2**).

ئەو کاتە، هێندە بەزەیم بە خۆمدا دەهاتەوە و بیرم لە ئەوە دەکردەوە، دوای ئەو هەموو خەبات و خۆماندووکردنە، بە نامەی یەکێکی وەک (ڕەزا) جێمبێتەوە! بەڵام دوای ئەوەی لە دەرەوە جێگیربووم، هەر زوو لە شاخ نامەکەیم دڕاند. چونکە هەر لەگەڵ جەنگ دەسپێکردنەوە، لە ئامێدەرکرد و دەسی لەگەڵ (بەعس) تێکەڵکرد. لە ئەوە دەچوو، هەر لە زووەوە، (بەعسی) بووبێ، چونکە دوای ڕێککەوتنەکەی (**11**) مارسی (**1970**)، لە خوارووی (عێراق) فەرمانبەربوو، کاتێ بە یەکجاریش گەڕاوەتەوە بۆ (سولەیمانی)، ئەو پێوەندییەی هەر هەبووە، بەهۆی (خاڵەحاجی)شەوە، پێوەندی لەگەڵ شۆڕشیش درووست کردووە، واتە دووسەرەبووە!

(ڕەزا) خۆی هەمیشە، گاڵتەی بە پارتایەتی و کوردایەتی دەهات. کاتێ جەلالیش بوو، هەر پێدەکەنی و دەیگوت: پیاو ئەوەیە لە ئەم ژیانەدا، باش بژی و دەسی خۆی

بوەشێنێ. بۆیە بە باوەڕی خۆی، گەر کورد سەرکەوێ، ئەوا لەڕێی خزمایەتی (فەتاح ئاغا) و (خالەحاجی)وە، سەرەداوێکی گرێداوە. ئەویش هەر کوردە و کارێکی دەستدەکەوێ. گەر شۆڕشیش ژێرکەوت و (بەعس) سەرکەوت، ئەوا دەیان جار بۆ ئەو باشتر، چونکە پارەیەکی زۆر، ترومبێل و کاری بە ئاسانی دەستدەکەوێ. ئەوە جگە لە ئەوەی، خۆشی تووشی گرفتی ڕاکردن و کوردایەتی ناکا. ئەوەبوو، دوای یەک ساڵ و جەنگێکی قووڕسی ماڵوێرانکەرانە، لە بەختی کەچی کورددا، (بەعس) سەرکەوت و ئێمەش، بەسەرشۆڕی گەڕاینەوە!

ئیدی ئاواتەکەی (ڕەزا) هاتەدی و دەسەکەی بۆ هەموو لایە ئاشکرابوو. چونکە نەیدەتوانی، چیدیکە خۆی بشارێتەوە. (بەعس)یش لێی قەبووڵ نەدەکرد و کاری پێی بوو. لەبەرئەوە وەک سەگی هاری لێهات. تا ساڵی **(1980–1981)**، سەرکردایەتی شۆڕشی نوێ کوشتیان. بەڵام لە دوای هەرەسی شۆڕشەوە، هیچ جۆرە پێوەندییەکی دۆستانە و هاوڕێیانەمان، لەنێوانماندا نەما. ئەگینا مەگەر بە ڕێککەوت تووشمبووایە، ئەویش گەر ئاگای لێ نەبووایە، خۆم لێ دەدزەییەوە. تەنانەت کاتێ کوشتیان، چاوم بەرایی نەهات، لە پرسەکەشیدا دانیشم!



ڕەزای بابەگوڕوون، حوسێن موحەممەد عەزیز، حەمەعەلی ئەحمەد حەمەموراد، ڕۆژی (**7. 2. 1970**) لە قوتابخانەی ئامادەیی کشتوکاڵ – بەکرەجۆ گیراوە.

لەگەڵ ئەوەشدا خوا هەڵناگرێ، هەرچەندە تووشمدەبوو، هەر وەک جاران، گاڵتە و قسەی خۆشی خۆی دەکرد، هەموو جارێکیش دەیگوت: دنیا فشەیە، ئەوەی دەسەڵاتی

هەیە، بۆ خۆی باش دەژی و ئەوەی دیکەش تێداچووە. من نامەوی، دوای خۆم منالەکانم برسیبن. هێندێ جاریش دەیگوت: چی دەڵێی، بۆت بکەم، منیش هەر هێندەم دەگوت: لە سایەی خواوە، هەموو شتێکم هەیە.

**دوادیـــــدار**

هێشتا (6)ی مانگی (3) بوو، (5) ڕۆژی مابوو، جەنگ دەسپێبکاتەوە. هەردوو ڕەوانشادی هونەرمەند (قادر مستەفا، حەمەی تیرگز) و هەردوو مامۆستا (حەمەسالح هیتلەر و حەمەڕەشید فەتاح)، لە یانەی مامۆستایان دانیشتبووین، دەمانخواردەوە و دەمەتەقێمان دەکرد. جگە لە من و مامۆستا (قادر مستەفا)، ئەو سیانەی دیکە گوتیان: ئێمە بە هیچ شێوەیە، بڕوامان بە ئەو سەرکردایەتی و شۆڕشە نییە، (بەعس) لەنێوشاردا بمانگری و پارچەپارچەمانکا، ڕاناکەین و دەمێنینەوە.
(حەمەسالح) گوتی: کورد سەرناکەوی، ئەم جارە زۆر خراپ تێکدەشکێ. هەرچەندە من و ئەو، دەنگەدەنگێکی زۆرمان بوو، بەلام لە کەلی ئەهریمەنانەی بڕوای خۆی نەهاتە خوارەوە. پاشان پێکەوە بەرەو ماڵەوە ڕۆشتینەوە و بۆ دواجار، ماڵاوایم لێ کرد.
ئەوەبوو، جەنگ دەسپێکردەوە و ئەوان ڕایان نەکرد. ئێمە ڕامانکرد و (بەعس)یش، (حەمەسالح)ی گرت و لەگەڵ مامۆستا (عیززەت ڕەشید)دا، ڕۆژی (17. 8. 1974)، لە گرتووخانەی (ئەبوغرێب) لە (بەغدا) هەڵیانواسین و بۆچوونەکەشی زۆر ڕاست دەرچوو، چونکە شۆڕشەکە زۆر خراپ تێکشکا و هەمووشمان، بە سەرشۆڕی گەڕاینەوە!
بەلام دوای ئەوەی (بەعس)، ڕۆژی (12. 5. 1974) پێنج خوێندکاری لەسێدارەدا. یەکێکیان (حەسەن)ی برای (حەمەڕەشید فەتاح) بوو، ئیدی ئەویش ڕایکرد و هاتە دەرەوە، لە (چۆمان) بینیم، سەرەخۆشیم لێ کرد و گوتی: هیچ چارنەبوو، بۆیە شارم بەجێهێشت!



(حەمەسالح فەرەج 1974.1940)



(عیززەت ڕەشید 1974.1944)

## سەردانی شارباژێڕ

هەر زوو خۆم ئامادەکرد، هەموو شتەکانم لە ماڵەوە هەڵگرت. لە سەرەتای مانگی دووەوە، دەستتی جلی کوردیی شرواڵومراخانییان بۆ درووم. هەر تەواویشبوو، هەموو ڕۆژێ لە داخی خوێندکارە عەرەبە شۆڤێنییە بەعسییەکان، بە جلی کوردییەوە دەمخوێند. تا جارێکیان دوکتۆر (جەلال شەفیق)، لە پۆلدا گوتی: ئەوە چییە، دەڵێی هەر لە ئێستەوە، بەتەواوی خۆت ئامادەکردووە؟!



ڕۆژی (3. 3. **1974**) لەگەڵ (شێخ مەنسووری شێخ کەریمی حەفید) لە زانکۆ گیراوە.

گرنگترین شت لای من، پەرتووکەکانم بوو، چونکە دەمزانی، لەنێوشاردا تێدادەچن، ئێمەش لە دەرەوە، لە کوێرە دێیەکدا گیردەخۆین، گەر کەرەسەی ڕۆشنبیریمان نەبێ، بەتەواوی ووشکدەکەین و بێ تاقەتیش دەبین. لەبەرئەوە ڕۆژی (8. 3)، من و (شێخ مەنسووری حەفید) و (شێخ ناسر)ی برای، بە جیپەکەی خۆیان، هێندێ زەخیرەمان کڕی، لەگەڵ پەرتووکەکانمدا بارمانکرد، بەرەو (شارباژێڕ) بەڕێکەوتین، نانی نیوەڕۆمان لە گوندی (هۆمەراخ) خوارد و سەرلەئێوارە گەڕاینەوە.
لەبەر چاخانەکەی (ئەزمر)، ڕەوانشاد (فەتاح ئاغا) و (خاڵە حاجی) وەستابوون. (مەنسوور) و (ناسر) دابەزین و گوتیان: با سەرێکیان لێ بدەین و هەواڵی بزانین، بەڵام تۆ دامەبەزە، با (خاڵەحاجی) نەتبینێ. منیش وەک لە شۆڕش قاچاغبم، لەنێوجیپەکەدا خۆم گرمۆلەکرد. هێندەی پێ نەچوو، جووتەبرا هاتنەوە و گوتیان: هەموو هێزی پێشمەرگە، خۆیان ئامادەکردووە و چاوەڕێی فەرماندەکەن. ئیدی من خەمی هیچم نەما.

دوو نامەکەی (شێخ رەزای گولانی) و (رەزای بابەگوڕوون)، لە تەنکەی باخەڵمدا شاردبوومنەوە. جلوبەرگی باش، پێڵاوی قایم و گەرمم کڕیبوو. هەر ئەوە مابوو، کە شەڕ دەسپێبکردەوە، سەری خۆم دەرکەم و ڕاکەم، لە شوێنێ بگیرسێمەوە. بۆیە بڕیارماندا، هەرسێکمان سەرلەئێوارەی (11)ی مانگ پێکەوە بڕۆین.

## تەقەلایەکی سەرنەکەوتوو!

ماوەی جێبەجێکردنی (4) ساڵەکەی ڕێککەوتننامەکە نزیکبووبووەوە، سەرۆک (بارزانی) ویستی، دانوستان لەگەڵ (بەعس) بکا. لەبەرئەوە شاندێکی لە هەردوو ڕەوانشاد (ئیدریس بارزانی) و (دارا توفیق) پێکهێنا. ڕۆژی (**8. 3. 1974**)، سەردانی (بەغدا)یان کرد، بۆئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ سەرانی (بەعس) بکەن.
(بارزانی) داوایکردبوو، ڕێککەوتننامەکە ساڵێکی دیکە درێژکرێتەوە، بۆئەوەی جارێکی دیکە لە ئاگردانی (کوردستان)دا، پشکۆی جەنگ نەگەشێتەوە. بەڵام ئەوان قایل نەبوون و گوتبوویان: ئێمە ئێوارەی ڕۆژی (**11/12. 3. 1974**)، یاسای ئۆتۆنۆمی بڵاودەکەینەوە، ئێوەش دەبێ، پشتگیریبکەن. ئیدی شاندەکە بێ هیچ ئەنجامێ، ڕۆژی (**13. 3. 1974**) گەڕایەوە، ئەوەش دوا گفتوگۆی شۆڕش و سەرکردایەتی (بەعس) بوو، ئەو هەوڵەش هیچی لێ سەوز نەبوو، جەنگ دەسپێبکردەوە.

## دوارۆژەکانی شار

ئەو دوو ڕۆژەی لە (سولەیمانی) بووم، دەوامی زانکۆم نەکرد. تەنیا هەر خەریکی گەڕان و دەنگوباسکۆکردنەوە بووم. شەوانیش لەگەڵ هاوڕێکانمدا یەکمانده‌گرتەوە، تا درەنگ لە یانەی مامۆستایان دادەنیشتین و باسی ڕەوشی ڕامیاری (کوردستان) و (عیراق)مان دەکرد. هەر یەکێکمان بڕیاری خۆی دابوو، شوێنێکمان بۆ خۆمان دیاریکردبوو.
(شێرکۆ بێکەس) گوتی: ئێمە کۆمەڵێ نووسەر و برادەر، بەرەو (تەوێڵە) دەڕۆین. (عەلی توفیق) و (حەمەعەلی)، هەر لە ساڵی (**1972**)وەوە، لە هێزی (خەبات) جێگیربووبوون. (برایمی حەمەعەلی، سەرووەت موحەممەد ئەمین و وریا براخاس)یش بڕیاریاندابوو، بەرەو (هەڵەبجە) و هێزی (خەبات) بڕۆن. مامۆستا (قادر)یش لەڕێی ژنوژنخوازییەوە، لەگەڵ ڕەوانشاد (جەزای عەلی کاتب) خزمایەتییان هەبوو، ئەویش لە ناچاریدا، خۆی بە ئەودا هەڵواسیبوو. ئیدی لە ئەوە دەچوو، هەمووومان لە یەکدی دابڕێین و بە ئەو زووانە یەکدی نەبینینەوە. نەشماندەزانی، چ ڕۆژێکی ڕەش چاوەڕێماندەکا!

خەلکی شاریش بەگشتی، سەریان لێ شێوابوو، دەتگوت، خۆڵی مردوویان بەسەردا کردوون! بە هەر لایەکدا دڕۆیشتم، برادەر و دۆستم دەدی، قسەماندەکرد، زۆر بێتاقەتبوون و لە شالاوی پەلاماردانی دڕندانەی تۆڵەسەندنەوەی (بەعس) دەترسان. کار و نانپەیداکردن زۆر کزبووبوو، زۆربەی دووکان و بازارەکان داخرابوون، سەرجادەکان چۆڵبووبوون. ئەوانەی لە خۆیان دەترسان، پتر سەرقاڵی خۆکۆکردنەوەی خۆیان و منداڵەکانیان بوون. بەڕێوەبەری فەرمانگەکانی میری، کە زۆربەیان لە لێپرسراوانی شۆڕش و (پارتی) بوون، سەرکردایەتی شۆڕش دایانتابوون، هەموویان شوێنەکانیان چۆڵکردبوو، وازیان لە کارەکانیان هێنابوو. هەریەکەیان لە نێوچەیەکی نزیک شار، خۆیان دامەزراندبوو، چاوەڕێی فەرمانی (بارزانی) و باروودۆخەکەیان دەکرد، تا بە تەواوی ڕوونبێتەوە و بە لایەکدا بکەوێ. ئیدی بارێکی نالەباری وا ئەفرێنرابوو، هیچ شتێ لە جێی خۆی نەمابوو، تروسکایی تێدا بەدی نەدەکرا!

## ماڵاوایی

ڕۆژی (**10. 3. 1974**)، تا تەواو تاریکبوو، من هەر لەنێوبازار بووم و دەگەڕام. ئێوارە بۆ ماڵەوە گەڕامەوە، وردەوردە، خەلکی گەڕەک چۆڵیاندەکرد. دایکم گوتی: (شێخ ناسر) تێلیفۆنیکرد. منیش بەپەلە تێلیفۆنم بۆ کردەوە. گوتی: (مەنسوور) دیار نییە، چی بکەین؟ گوتم: بەپەلە وەرە بۆ ئێرە. دوای ماوەیە هات. بڕیارماندا، هەر بە ئەو شەوە، دووقۆڵی بەرەو (ئەزمڕ) بڕۆین. کاکە (مەنسوور) وەک زۆربەی بەڵێنەکانی دیکەی خۆی، ئەمەشیانی جێبەجێ نەکرد و ئێمەی بەجێهێشتبوو. لەگەڵ کۆمەڵێکدا بە جیپەکەی خۆیان ڕۆشتبوون بۆ (گەرەدێ).
کەمێ لە شار دوورکەوتینەوە و گەیشتینە (دەباشان). ئەو کاتە دەشتێکی چۆلبوو، هیچی لێ نەبوو. کزەبایەکی زۆر ساردی دەهات، وردەوردەش باراندەباری، شەوێکی زۆر تاریک و نوتەک بوو، چاو چاوی نەدەبینی. (شێخ ناسر) گوتی: کوڕە با بگەڕێینەوە، بە ئەم شەوە تاریکە خوا گرتوویني؟! منیش گوتم: تازە تەواو، بەیانی دواڕۆژی ڕێککەوتننامەکەیە و کۆتایی بە هەموو شتێ دێ، دوور نییە، بەیانی (بەعس) وەک ساڵی (**1963**)، لەنێو شاردا هاتوچۆ قەدەغەبکا، ڕەشەکوژی دەسپێبکا و ڕێمان نەبێ، دەرچین. لەبەرئەوە هەرچی چۆنێ بێ، دەبێ، خۆمان بگەیەنینە (سیتەک).
بە جادەقیرەکەدا بێدەنگ دەڕۆیشتین، لە پردەکەی سەر ڕێی (ئەزمڕ) پەڕینەوە. هەردووکمان بیرماندەکردەوە، ئەم جارە بەرەو کوێ دەڕوا؟ لەپڕ دەنگی ڕاپچڵەکاندین و هاواری لێ کردین: کێن؟ منیش بە دەنگێکی بەرز گوتم: خۆمانین. کاتێ چووینە پێشەوە،

ڕەوانشاد (شێخ برایمە شەلەی ئامادینی) خزمی دایکم بوو. تەوقەمان لەگەڵ کرد و گوتی: هیچ مەترسی نییە، هەر چواردەوری شار، بە پێشمەرگە گیراوە. هەر ڕێک برۆن. ئیدی پشتێنی سەلامەتیمان لی کردەوە و ڕۆیشتین.
هەر هێندە دوو پێچمان بڕی، تووشی (شێخ کاوە) بووین. یەکدیمان ماچکرد و گوتی: جاری لێرە ئیشم هەیە، با جێبەکەم بتانگەیەنێ و لەماڵەوە چاوەڕێمکەن. کاری ڕاستبێ، سواری جێپ بووین، لەگوڵ ئەو هەموو سەرماوسۆڵە، باران، تاریکی، ڕێگە پێچاوپێچە دووروودرێژە و ماندووبوونەی کردینەوە!

## سیتەک

هەر چووینەژوورەوە، (ڕەسوڵ)ی گۆرانیبێژ، لەنێوچیمەنەکەدا لەسەر تەپلەکێ دانیشتبوو، خەڵکێکی زۆریش دەورەیاندابوو، هەریەکە قسەیەکی دەکرد و ئەویش گوێی لی گرتبوون، وەک ئەوەی کۆڕ بگێڕێ! ئێمەش تێکەڵاوی جمکوتەکە و دەمەتەقێکە بووین.
کوڕێکی قەڵەوی سوورکەڵەی خەڵکی (سولەیمانی) دانیشتبوو، ناوی مامۆستا (عیززەت ڕەشید) بوو. من نەمدەناسی، قسەکانی زۆر قوتوزلبوون. ڕەخنەی لە سەرکردایەتی (پارتی) و شۆڕش دەگرت، گاڵتەشی بە درووشمی ئۆتۆنۆمی دەکرد. (ڕەسوڵ)یش لێی پرسی: ئەی ئێمە داوای چی بکەین، باشە؟! (عیززەت)یش گوتی: کورد تا داوای هەر چوارپارچەکە نەکا و شۆڕشێکی چەکداری، لە هەموو (کوردستان)دا پێکەوە بەرپا نەبێ، هەرگیز ڕزگارمان نابێ. (ڕەسوڵ)یش هەستایە سەرپێ و گوتی: ئەهلەن قنگ کوولەکە، ئێمە پارچەیەکمان بۆ ڕزگارناکرێ، تۆش ئێستە ڕاتکردووە، داوای هەر چوار پارچەکەمان لی دەکەی؟! ئیدی بوو بە پێکەنین. دوایی بیستم، مامۆستا (عیززەت) هەر بۆ بەیانی گەڕابووەوە، ئەندامی (کاژیک) بوو، لەگەڵ (حەمەسالح هیتلەر)دا گیرابوون و پێکەوە لەسێدارەدرابوون!
پاشان من و (شێخ ناسر)، چووینە ژوورەکەی (کاوە). لەسەر سیسەمە دووکەسییەکەی، دووقوڵی لێی نووستین. ئەو کاتە تەنیا هەر (کاوە) لە (سیتەک) بوو، بەڵام دایکی و هاوسەرەکەی، لەنێوشار مابوونەوە. شەوێ درەنگانی (کاوە) هاتەوە، شەقێکی لە دەرگەکە هەڵدا، هاتەژوورەوە و لێفەکەی لەسەر لابردین، بە دەنگەدەنگ خەبەری کردینەوە. بە پێکەنینەوە گوتی: ئەی لە ئەم پێشمەرگانە، وا دوژمن (ئەزمڕ)ی گرت، ئێوەش لێرە نووستوون! ماوەی نیوکاژێر مایەوە و گوتی: من دەگەڕێمەوە و نان بۆ پێشمەرگەکانم دەبەم. ئێوەش خۆتان خەریککەن و مەنوون، زوو دێمەوە. هەر ئەو ڕۆی، ئێمە لێی نووستینەوە. بەڵام دەمەوبەیانی بوو، تازە هاتبووەوە و منیش لە دەنگی ئەو خەبەرمبووەوە.

نانی بەیانیمان خوارد، دووقۆڵی چووینە حەوشەکە و گوتی: نیازی چیت هەیە؟ گوتم: جاری تازە هاتووم، هیچ شتێکم لا روون نییە، چاوەڕێی دەنگوباس دەکەم، تا بزانم، لە ئەم ڕۆژانەدا چی ڕوودەدا و چی دەبیستین. بەڵکوو باروودۆخەکە بە لایەکدا بکەوێ. گوتی: بۆ لێرە نامێنیتەوە؟ گوتم: ناتوانم، چونکە من کاری تایبەتی خۆم هەیە. ئیدی بە ساردییەکەوە گوتی: دوای (ناسر) و (مەنسوور) دەکەوی؟! گوتم: کاکە گیان، ئەوان هاوڕێمن و دوای کەس ناکەوم. بڕیارمداوە، ماوەیە لەگەڵ ئەوان پێکەوەبین، دوایی نازانم، بەرەو کوێ دەڕۆم. ئیدی بە بێدەنگییەکەی و بە ڕوخساریدا دیاربوو، لێم زویر بووە، چونکە ئەو دەیویست، من لای بمێنمەوە، منیش هەرچەند سەرمدەبرد و دەهێنا، بە کەڵکی ئەو نەدەهاتم و پێکەوە هەڵمان نەدەکرد. لەبەرئەوەی لەلایەکەوە نەمدەتوانی، هەرچی ئەو بیڵێ و بیەوێ، پەسەندیکەم و جێبەجێیکەم. لە لایەکی دیکەوە، ئەو ئەزموونەی ساڵی (1968)م بیرنەچووبووەوە. کاتێ لەسەر ئەو، جەلالییەکان گرتیانم و تێریان کوتام، کەچی پێدەکەنی و بەجێشیهێشتم. لەلایەکی دیکەشەوە، شتێکی دیکە لە مێشکمدا بوو، کە بە کردەوە بەشداری لە شۆڕشەکەدا بکەم و شوێنپێی خۆم بکەمەوە!
جگە لە ئەوەی سوور دەمزانی، ئەو هەم پێوەندی بە (خاڵەحاجی)وە هەبوو، کە هیچمان چارەی یەکدیمان نەدەویست. هەم (کاژیک)یش ئاگاداریکردبوومەوە، بەهۆی (ڕەفیق پشدەری)ەوە، پێوەندی بە دەسەڵاتەوە هەیە. بۆیە زۆر سوپاسمکرد، لەگەڵ (ناسر)دا ماڵاواییمان لێ کرد و هەر ئەو ڕۆژە، بەرەو (گەڕەدێ) بەڕێ کوتامان. ئیدی (کاوە)، لەسەر ئەوە زۆر لێم زویربوو، تا مردیش، ئەوەی هەر لە دڵ دەرنەچوو، تەنانەت پێشی نەگوتین، با جێیەکە بتانگەیەنی!

**گەڕەدێ**

نزیکی نیوەڕۆ بوو، لە گوندی (گەڕەدێ) و لە ماڵی حاتەمی کورد ڕەوانشاد (شێخ دارای شێخ جەلالی حەفید) جێگیربووین. جگە لە خۆی، خوالێخۆشبوو (حاجی شێخ کەریمی حەفید، شێخ مەنسووری حەفید، بەختیاری شێخ قادری حەفید، شێخ مەحموود باراوی) و چەن پیاوێکی دیکەش، لە دیوەخانە خنجیلانەکەی دانیشتبوون و قسەیاندەکرد. بۆ ڕۆژی دواییش، (شێخ ساڵحی دارۆغا)، لەگەڵ دوو گەنجی چەکداردا پەیدابوون. ئیدی بە قسە خۆشەکانی، هێندەی دیکە کۆڕی دانیشتنی دیوەخانەکەی گەرمکرد!
ئەو ماوەیە، کۆمەڵێ یاری کاغەز و کۆمەڵێکی دیکەش کلاوکلاوێنەیان دەکرد. شەوانیش گوێمان لە ڕادیۆ دەگرت، (شێخ ساڵح) زۆر قسەی خۆشبوو، زۆر شتی خۆشی دەگێرایەوە. بە من و (مەنسوور)ی گوت: دەچم بۆ (چوارتا) و لە ئەوانەیە، هەر لە ئەوێش بمێنمەوە. گەر ڕێتان کەوتە ئەو ناوە، سەرم لێ بدەن، نێرەقەڵێکتان بۆ سەردەبڕم.

ڕۆژی (13. 3) بوو، لەپڕ پیاوێ هات و گوتی: لە دەرەوە بانگتدەکەن. منیش سەیرم لێهات، لە دڵی خۆمدا گوتم: دەبێ، کێ بزانێ، من لێرەم و بمناسێ، وا ئیشی پێم هەیە! کە چوومەدەرەوە و تەماشامکرد، (سەلاح)ی برام بوو. گوتی: باوکم منی بە شوێن تودا ناردووە و دەڵێ: رەوشەکە زۆر خۆشە و هیچ شتێ نییە، بەڵکوو بۆ چەن ڕۆژێ بێیتەوە و لەنێومانا بشوویەکێدا، پاشان بگەڕێتەوە. منیش کە ئەوەم گوێ لێ بوو، هەر هێندەی مابوو، لە داخاندا هەردوو چاوم، لە پشتی سەرمەوە دەرپەڕێ! گوتم: تۆ چۆن زانیت، من لێرەم؟ گوتی: لە (سیتەک) لامدا و (شێخ کاوە) پێی گوتم: لە (گەرمەدێ) دامەزراوە. گوتم: هەر ئێستە بگەڕێرەوە، جارێکی دیکە شتێ وا نەکەی و بیر لە هاتنەدەرەوەش نەکەیتەوە. بەتەمای منیش نەبن، بگەڕێمەوە، تا لایە بە لایەکدا نەکەوێ.

ئەو کاتە (سەلاح)، تەمەنی (18) ساڵان بوو. لە (سولەیمانی)ەوە بەپێ و بەتەنیا، بە دوای مندا هاتبوو، تا سۆراغێکم بکا. منیش هێندە بێباک و بێخەم بووم، بیرم لە ئەوە نەکردەوە، لە ئەوانەیە خۆی لە ترساندا هەڵاتبێ و هیچ شوێنێکی دیکەشی شک نەبردبێ، پەنای بۆ بەرێ، بۆیە منی دۆزیوەتەوە و پەنایهێناوە. یا بیری ئەوەم نەبوو، پێی بڵێم: جارێ وەرە تۆزێ دانیشە، تۆ ماندوو و برسیت. با کەمێ بحەوێیتەوە، یا ئەم شەو لای من بەسەربەرە و بەیانی بڕۆرەوە!

ئەویش یەکسەر لێیدا و گەڕایەوە. دواییش لەسەر دڵمدا بووبوو بە گرێ، ئاواتەخواز بووم، بە ئەو شێوەیە وەڵامم نەدایەتەوە. بەتایبەتی کاتێ ئەو پیاوە باشانە پێیانزانی، زۆر سەرزەنشتیان کردم. ئاخر خۆم میوانبووم، چۆن دەکرا، یەکێکی دیکەش دامەزرێنم؟!!



(شێخ دارای حەفید 1941 – 2012)

سێ ڕۆژ لە گوندی (گەرەدێ) بووین، کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد. پاشان (شێخ ساڵح) بەسواری، بەرەو (چوارتا) ڕۆی. ئێمەش هەموومان بە دوو جیپ، چووین بۆ (ئەزمڕ). نیوەڕۆ لە بارەگەی لقەکەی (ئەحەسوور ڕەباتی)، نان و چا و گوێزمان خوارد. ماوەیە لە ئەوێ ماینەوە، لە دوورەوە تەماشای (سولەیمانی)مان دەکرد. ئەو کاتە هێشتا دنیا بێدەنگبوو، هیچ ڕووی نەدابوو. دوایی ماڵئاواییمان لە (شێخ دارا) و ئەوان کرد، من و هەر سێ برا (مەنسوور، ناسر و بێستوون)، سواری جیپەکەیان بووین. ئیدی لە ئەوان جیابووینەوە و بەرەو گوندی (هۆمەراغ) بەرێکەوتین.

## هۆمـــەراغ

(هۆمەراغ)، گوندی (شێخ کەریمی حەفید)ی باوکی هاوڕێکانم بوو. گوندێکی چکۆلۆکەی خنجیلانە بوو. ئەو کاتە لە چەن ماڵێکی کەم پێکهاتبوو. لە سێلاوە بە گردۆلکە و چیای گەورە و گچکە دەورەدرابوو. چەمێکی چکۆلانەی تەنکی باریک، لە قەدپاڵی چیاکانەوە بەرەوخوار دەبووەوە و بە تەنیشت گوندەکەدا تێپەڕدەبوو. پاشان لەگەڵ چەمە گەورەکەی (قەلاچوالان) تێکەڵدەبوو. ئەو ناوە لە بەهاردا، دیمەنێکی کەڵی جوان و دڵفڕێنی هەبوو، گەر مرۆ دڵی خۆش بووایە و ڕەوشەکە باشبووایە، هەر جێی سەیرانبوو!
ئێوارەی ڕۆژی (**13. 3. 1974**) گەیشتین و لە ماڵی سەرکاری گوندەکە کاک (ڕەسووڵ) دابەزین. دیوەخانێکی خاوێن و ڕێکوپێکیان هەبوو. ماڵەکە لە دوو نهۆم پێکهاتبوو. بەشی خوارەوەی چەن ژوورێ بوو، خۆی و خێزانەکەی تێیدا دەژیان. ژوورێکیشیان بۆ تەویلەی ئاژەڵەکانیان تەرخانکردبوو. لەسەریشەوە، تەنیا یەک ژوور و هەیوانێ بوو. سەربانی نهۆمی یەکەمیشی بەدەمەوەبوو، زۆر جار لە ئەو سەربانە، من و (ناسر) پیاسەماندەکرد. خۆمان لەبەر تیشکی زێڕینی خۆری، ئەو بەهارە پرتەرتووشەی مانگی مارس ـ ئەپریل هەڵدەخست و بەدەم هاتوچووە، دەمەتەقێماندەکرد.
بەڕاستی تا بڵێی، کاک (ڕەسووڵ) پیاوێکی بەڕێز، ڕووخۆش و میوانپەروەر بوو. دیاربوو، خاوەنی خێزانێکی زۆر گەورەش نەبوو. بەڵام ئەو چەن ڕۆژەی لە ئەوێ بووم، لە (حەسەن)ی کوڕە چکۆلەکەی پتر، کەسی دیکەم نەبینی!



ناسر حەفید

**حەسەنی جوانەمەرگ!**

(حەسەن)ە چکۆل، تەمەنی هەر (6) ساڵان دەبوو. هەر ئێوارەمان لێدەهات و نانمان دەخوارد. هەموو لە دیوەخانەکە دادەنیشتین و گوێمان لە دەنگی وێزگەی شۆڕش دەگرت. (حەسەن)یش دەهات، سڵاوی‌دەکرد و لە تەنیشت منەوە دادەنیشت.

(حەسەن)، منداڵێکی زۆر زیکەڵە، ئیسکسووک و ڕووخۆش بوو. بە ئەو منداڵییەی خۆی، زۆر شتی دەزانی، چونکە دوا منداڵی بچووکی باوکی بوو، لەگەڵ خوشکەکانیدا گەورە ببووبوو، زۆر شت فێربووبوو. هەمیشە دەتروقایەوە و دەم بەپێکەنین بوو. لە زۆر شتدا هەڵیدەدایە و باوکیشی لێی تووڕەدەبوو، هاواری لێ دەکرد و دەیگوت: کوڕە (حەسەن) بێدەنگبە و هەستە بڕۆ. منیش ناوبژیمدەکردن و نەمدەهێشت، باوکی لێی تووڕەبێ و دەریکا، زیاتر دەمهێنایە لای خۆمەوە، دەمدواند و پرسیارم لێ دەکرد. ئەویش تەماشای باوکی دەکرد و پێدەکەنی، وەک ئەوەی بیەوێ، پێی بڵێ: بۆ وازم لێ ناهێنی، ئەوەتە منیش وەک پیاو دانیشتووم، قسەدەکەم و پیاوەکانیش، گوێم لێ دەگرن!

هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە، (حەسەن) سەرنجی ڕاکێشام و هۆگری یەکدی بووین، وەک دوو هاوڕێی خۆشەویستمان لێهاتبوو. هەر ئیشێکم هەبووایە، ڕووم نەدەهات، بە باوکی بڵێم، یەکسەر بە گوێچکە چکۆلەکانی (حەسەن)دا دەمچرپاند، ئەویش خێرا هەڵدەسا، وەک تیسکەی تفەنگ بۆی دەردەچوو، هەر زوو بۆی جێبەجێدەکردم.

شەوێکیان هەموومان پێکەوە دانیشتبووین، نازانم، چی ڕوویدابوو، (حەسەن) زۆر دڵی خۆشبوو. هەر سەیری منی دەکرد و پێدەکەنی. منیش هێنامە لای خۆمەوە، دەستێکم بە قژە کورتە ڕەشەکەیدا هێنا و گوتم: گەر ئەم جارە بەئاشتی شکایەوە و بەخۆشی گەڕاینەوە، ئەوا دەبێ، لەگەڵ باوک بێی بۆ شار و سەرم لێ بدەی. جا کە هاتی، بەڵێنت دەدەمێ، تێر بتگێرم و بە دڵی خۆشت، یەک دەست جلی کوردی جوانت بۆ بکەم. ئەویش سەیرێکی باوکی کرد و هێندەی دیکە پێکەنی، وەک ئەوەی بڵێ، ئاگات لێ هەیە، منیان چەن خۆشدەوێ!

بەیانی ڕۆژی (17. 3) بوو، هەموومان لە سەربان وەستابووین، تەماشای ئەو سروشتە جوانەی بەهاری دەوروبەری گوندەکەمان دەکرد. ئەو ڕۆژە، خۆرەتاوێکی زۆر گەرمی خۆشبوو. وەک دەڵێن: سەری کەچەڵی دەسووتاند! لە هەموو لایەکەوە، زەوی ئێقی دابووەوە و بەدەم ئاخی داخی سەرماوسۆڵەی زستانەوە، هەڵم لە قووڵای ناخییەوە بەرزدەبووەوە، دیمەنێکی هێندە جوانی هەبوو، چاو و دڵ لێی تێر نەدەبوون!

لە دوورەوە بینیم، تراکتۆرێ بەرەو گوندەکە هات و عەرەبانەیەکی درێژیشی، بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا. وردەوردە نزیکبووەوە و ویستی، بە پشتدا بگەڕێتەوە و لەبەردەمی

ماڵی کاک (ڕەسووڵ)دا بوەستێ. تراکتۆرەکە هەر دەهاتەدواوە، تا ئەو شتانەی بۆ ماڵی کاک (ڕەسووڵ)ی هێنابوو، بەئاسانی دایگرن. ئێمەش ئاگامان لێ نەبوو، لەپڕ عەرەبانەکەی بە دیواری خانووەکەوە جووتکرد و زریکەی دەنگێکی ناسکی منداڵێکی بێتاوان بەرزبووەوە. کەس ئاگای لێ نەبوو، (حەسەن)ی خێرنەدیوی نەگبەت، لە کوێوە خۆی گەیاندبووە تراکتۆرەکە و خۆی بە پشتەکەیدا هەڵواسیبوو. لەنێوان دیوارەکەی ماڵی خۆیان و پشتی تراکتۆرەکەدا هەڵواسرابوو. هاوارمان لە شۆفێرەکە کرد و کەمێ چووەپێشەوە، (حەسەن) بەربووەوە. بەڵام کاتێکمان زانی، جەستەیەکی ساردوسڕی چکۆلە، لەسەر زەوییەکە کەوتووە و بەجێماوە. بەپەلە ڕامانکرد و منیش یەک دوو جار ڕاموەشاند. ئاوم بە دەموچاویدا کرد، هاوارمان لێ کرد. بەڵام بە داخێکی گەورە و گرانەوە، تازە بێکەڵکبوو، دەنگ لە بەردەوە هات، دەنگ لە (حەسەن)ەوە نەهات! هەردوو چاوی سپیبووبوو، دەسەچکۆلەکانی و لاقەکورتەکانی شلوشێواو بووبوون، هێزیان لەبەربڕابوو. دەمێبوو، سووری خوێن لەنێو دەمارەکانیدا وەستابوو. مەلی گیانی خاوێن و شیرینی، ژوورە چکۆلە تەنیاکەی گرتووخانەی جەستە نەرمونۆڵەکەی بەجێهێشتبوو، بۆ بارەگەی ئاسمان هەڵفڕیبوو!

تازە (حەسەن)، ئەم بەهارە تەڕەی ژیانی لەدەسچوو، فریانەکەوت، بە چاوی خۆی، ئاییندەی گەلەکەی ببینێ، سەری لە (سولەیمانی) یدا، لەگەڵ مامە (حوسێن)یدا، کەمێ بگەڕێ و دەستەجلە جوانە کوردییەکەی، خەونی پێوەدەبینی، لەبەریکا و خۆی پێوەبادا! ئەی هاوار! ئەم ژیانە چەن هیچوپووچە؟! کەی (حەسەن) کاتی ئەوەی هاتبوو، بە ئەو شێوە تراژیدیایە، چاولێکنێ و ماڵاوایی لە ژیان بکا؟! بۆچی ئەو خونچە پشکووتووە چاوگەشە، پێش ئەوەی بگەشێتەوە، بەخۆڕایی هەڵوەری؟! نازانم، بڵێم چی؟! ئایا لەگەڵ دیوەزمەی مەرگدا، هیچ ناکرێ؟!

ئیدی ئەو ڕۆژە، کەسمان ئاگامان لە خۆمان نەما. من بەتەواوی کاسبووبووم. گەر بڵێم: لە دایک و باوک و خوشکەکانی، پتر خەفەتم بۆ خواردووە، زیادەڕۆییم نەکردووە. چونکە هەر خۆم دەزانم، ئەو چۆلەکە ئیسکسووکەم چەن خۆشدەویست. کۆچە ناوادەکەی، چ جۆرە داخێکی گرانی، بە دڵ و دەروونمدا کرد. چ خەمێکی گەورەی بە دیاری، بۆ بەجێهێشتم. ئاخر ڕوخساری شیرینی (حەسەن)، لە گلێنەی چاوەکانمدا ڕوابوو، هەرچیم دەکرد، جیانەدەبووەوە. مۆزیکی دەنگی بەسۆزی ئاوازی پێکەنینە نەرمەکەی، لە گوێمدا دەزرینگانەوە. قسەقووتە خۆشەکانیم بیردەکەوتەوە و خەویان لە چاوانم تەراندبوو، تا لە ئەو گوندەش بووم، شەوانە تا درەنگانێ، خەو لە چاوانم نەدەکەوت و لە خۆم دەپرسی: ئاخر گەر نەگبەتی من نەبێ، ئەو منداڵە ژیکەڵە ژیرە ڕووخۆشە ئیسکسووکە گیانشیرینە، بۆ هێندە هۆگری من بووبوو؟!!

ئیدی خۆشی لە ئەوماڵەدا باریکرد، چرای ژیان کوژایەوە، پێکەنین بوو بە گریان، شایی بوو بە شین، کەسوکارەکەی سەریان لە قوڕنا، گریان و شیوەن، لەخۆدان و باوکەڕۆ دەستپێکرد و گوێی ئاسمانی کەڕدەکرد. هەر زوو لەتێوئاوایی و گوندەکانی دەوروبەری، هەواڵەکە بڵاوبووەوە و خەڵکێکی زۆریان لێ کۆبووەوە. پاشان جەستە شلوشێواوەکەیان شت، لە پارچە خامێکیانەوە ئاڵاند، تەرمە چکۆلانەکەی (حەسەن)ی جوانەمەرگیان هەڵگرت.
باوکی بڵی بروایی نەدەهات، دواماڵاوایی لە جگەرگۆشە خۆشەویستەکەی بکا و تاوی لە خۆی دوورخاتەوە. بۆیە هەر خۆشی تەرمەکەی هەڵگرتبوو، زۆر بە پەرۆشەوە، توندتوند بە سنگ و دڵە شکاوەکەیەوە نووساندبوو. بەدەم ڕێوە و بەرەو گۆڕستان دەڕۆیشتین، کەس گوێی لە دەنگی هاوار و ناڕەزایی، ئەو پیاوە ورەقایمە نەبوو. بەڵام لە ناخدا قوڵپیدەدا و بەکوڵ بۆی دەگریا، گریانێکی بەخوڕی بێدەنگبوو، چونکە کانیاوی بەهاری گریانەکەی، لە قووڵای دڵ و دەروونە پرکەیلەکەیەوە هەڵدەقووڵا. بۆیە تەنیا بۆ ساتێکیش، دڵۆپی مرواری فرمێسکەکانی، هەردوو چاوە کزەکانی بەجێ نەدەهێشت و وەک دووجۆگەی باریکی سەر ڕووی، بەسەردەم و لێوەکانیدا بەرەوخواردەبوونەوە. بەڵام دەنگی لێوە نەدەهات، وەک کێوێکی سەخت و گەورە، بێدەنگ لە شوێنی خۆی چەقیبوو، ڕەشەبای بەڵا و نەگبەتیش نەیدەجووڵاند!
ئێمەش بەئەسپای و بێدەنگ، لە دوایەوە دەڕۆیشتین، هەر یەکێ بیری لە مەرگی ناکاوی (حەسەن)ی داماو و خۆی دەکردەوە. لە گۆڕستانی گوندەکە، تەرمە چکۆلە نازدارەکەی (حەسەن)مان، بە چاڵێکی چکۆلانە سپارد. مەلایەکیش بە عەرەبی دەستپێکرد و هێندی ئامۆژگاری ئێمەی کرد! ئیدی بە ئەو شێوەیە، (حەسەن)مان لە بەردەم سۆزی یەزدانی مەزندا بەجێهێشت و گەڕاینەوە، وەک هەر نەشبووبێ وابوو!
ئەو دوو ڕۆژە، هەرچی ترووسکایی هەیە، لەنێو ئەو ماڵ و گوندەدا نەما. پرسەیان لە ماڵەوە بۆ دانا و خەڵکێکی زۆر، لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێکردن. نیوەڕۆ و ئێوارە، خواردنیان بۆ ئامادەدەکردن و بەشێوەیەکی ڕێکوپێک، میوانی گوندەکانی دەوروبەریان بەڕێدەکرد. منیش سەرەڕای ئەو هەموو نیگەرانی و دڵەڕاوکەیەی خۆم هەمبوو، داخی گرانی (حەسەن)یش زیادیکرد و لە دڵم دەرنەدەچوو. بەڵام دەسەڵات چییە؟! گەر بیرچوونەوە نەبووایە، بڕواناکەم، کەس لە دوای مەرگی خۆشەویستێکی بیتوانایە، بژی! لەگەڵ ئەوەشدا، کەم پیاوی مەردی وەک کاک (ڕەسووڵ)م دیوە، هێندە دڵی بەهێز و قایم بێ. ئاخر جەرگی ئەو سوتابوو، کەچی هێشتا ئەو دڵنەوایی ئێمەی دەکرد و دەیگوت: ئەوە بۆ ڕادیۆکە ناکەنەوە، تا بزانین، دەنگوباسی دونیا بەچی گەیشتووە؟!

ئەورۆ ئەوا (**44**) ساڵ، بەسەر ئەو کارەساتە جەرگبڕەدا تێپەڕدەبێ، هێشتا هەر شێوەی شیرین، برپسکەی چاو، بزەی سەرلێو، تریقوهوڕی پێکەنین و قسەقووتەکانی (حەسەن)م لەیادە، هێشتا هەر دەنگی زریکەی ئەو مەرگەساتە، لە گوێمدا دەنگدەداتەوە و بیرم نەچووەتەوە!
لە ڕاستیدا، دوای مەرگی (حەسەن)، تارمایی خەم و پەژارە، باڵی ڕەشی بەسەر ئەو خێزانە هەژارەدا کێشابوو. ئیدی منیش نەمدەزانی، چی بکەم و ڕوو لە کوێ بکەم؟! هەر ڕۆژم دەبژارد، چاوەڕێی ڕەوشە نەتەوەیی و ڕامیارییەکەم دەکرد، تا کەمێ ڕوونبێتەوە و بڕیارێکی بنەبڕی بدەم.

## نەورۆزی ساڵی (1974)

هێشتا هەر لە (هومەراخ) بووم، ڕۆژی (**21. 3**) جێژنی (نەورۆز) بوو، دەشتودەر سەوز بووبوو، هەوایەکی زۆر خۆش و سازگاری هەبوو. (شێخ مەنسوور) سێ قاپ عەرەقی مەستەکی، لەگەڵ خۆی هێنابوو. هەرچەندە کردی و کۆشا بخۆینەوە، هەر دەیگوت: با زرەی لێ بێنین، بەزمێ بگێرین و کەمێ کەللەی خۆمان گەرمکەین! بەڵام من بە هیچ شێوەیە قایل نەبووم و دەمگوت: تازە تەواو، ئێمە لە شۆڕش داین، تا سەرنەکەوین، ناخۆینەوە!
ئەو کاتە هێندە ساوێلکانە بیرمدەکردەوە و دەمگوت: کوردی نیشتمانپەروەری شۆڕشگێر نابێ، بخواتەوە، وامدەزانی، کەس لە شۆڕشدا ناخواتەوە. کەچی نەمدەزانی، هەرچی کاری خراپ و ناشیرینە، لە شۆڕشی (کوردستان)دا دەکرێ. ئاخر منیش درەنگ تێگەیشتم، کە شۆڕشێکی بێسەروبەرە و کەس لە کەس ناپرسێتەوە!

## شێخ نەوزادی شێخ جەلالی حەفید

ڕۆژی (**22. 3**) بوو، (شێخ نەوزاد) و ڕەوانشاد (شێخ بەختیاری شێخ قادری حەفید) هاتن. شەو دانیشتبووین، قسەماندەکرد. (شێخ نەوزاد) ڕووی تێکردم و گوتی: بەشی (پاراستنی زانکۆی سولەیمانی)، لای من بوو. هەفتە نەبوو، ڕاپۆرت لەسەر تۆ نەنووسرێ و بە ئاژاوەچی ناوت نەبەن، بە یەکەمین کادیری چالاکی (کاژیک) تاوانباریان دەکردی.
بەڵام هەموو ئەو ڕاپۆرتانەی لەسەر تۆ دەهاتن، دەمخوێندنەوە و یەکسەر دەمدڕاندن. منیش سوپاسمکرد و گوتم: مەبەست لە ئەم قسانە چییە، وا ئێستە بۆم باسدەکەی؟! گوتی: (حەمەڕەحیم)، زۆر ڕقی لێتە و لە هەر شوێنێ تووشبیی، دوور نییە، ئازارتبدا، یا سەرت

بە گۆمدا بکا و ونتکا. با نامەیەکت بۆ بنووسم و سەرێکی لێ بدە. منیش هەردوو نامەکەی (شێخ ڕەزای گولانی) و (ڕەزای بابەگوڕوون)م پیشاندا. دوای ئەوەی هەردووکیانی خوێندەوە، پێکەنی و گوتی: لای ئەو، ئەو جۆرە نامانە ناڕۆن! من لە (چوارتا) بووم و نەمزانی، لە (قەڵادزێ) زانکۆ کراوەتەوە. دەبێ، هەموو مامۆستا و خوێندکارەکانی زانکۆ، بەزووترین کات، بچن بۆ ئەوێ و بخوێنن. جا تۆ پێویست بە نووسراوی هەیە، تا کەس ڕێت لێ نەگرێ.

دیاربوو، (ئەوزاد) هەروا لەخۆڕا، ئەم قسانەی بۆ نەدەکردم، چونکە تێکەڵبوونی ژیانی منی لا مەبەستبوو. جگە لە ئەوەی ئەو، باشتریشی لێ دەزانی. منیش ڕای (شێخ مەنسوور)م وەرگرت، ئەو پێی باشبوو. بۆیە پێشنیازەکەیم پەسەندکرد، بە مەرجێ (شێخ مەنسوور) لەگەڵم بێ و ئەویش ڕازیبوو. ئیدی هەر ئەو شەوە، نامەیەکی بۆ نووسیم و بەیانی زوو ڕۆژی (23 3) بوو، لەگەڵ (شێخ مەنسوور)دا پێکەوە، بەپێ بەرەو (چوارتا) بەڕێکەوتین.

## چوارتا

لە (چوارتا)، چووینە بارەگەی (پاراستن)، ئەو پاراستنەی (خاڵەحاجی)، لێپرسراوییبوو، من سڵم لێ دەکردەوە و بە خوێنی سەرم تینووبوو! ناوی خۆمم نووسی و ناردمە ژوورەوە. دوای ماوەیە (خاڵەحاجی) خۆی هاتەدەرەوە و زۆر بە گەرمی، تەوقەی لەگەڵ کردین، فەرمووی لێ کردین و چووینەژوورەوە. من نازانم، (شێخ ئەوزاد) لە نامەکەدا، چی نووسیبوو، چونکە دایخستبوو. دیارە بە ناوی نهێنی خۆیانەوە نووسیبووی! بەڵام لەبەرخاتری ئەو چەن دێرەی نووسیبووی، (خاڵەحاجی) خێرا، پارچە کاغەزێکی ڕەشکردەوە و ناردی، چاپیکەن. پاشان مۆریکرد و دایمێ. گوتی: دەبێ، بڕۆی بۆ (قەڵادزێ) و زۆر بەڕێزەوە بەڕێیکردین.

دوای ئەوەی ئەو نووسراوەی پاراستنم دەسکەوت، کەمێ دڵم ئارامبووەوە. هەرچەندە تا ڕۆژی کارەساتە گەورەکەی هەرەسی شۆڕشیش، ڕێزەکانی شۆڕش بەرەڵاخانەیە بوو، وێنەی نەبوو. چونکە ڕۆژانە، بە دەیان سیخوڕی (عێراق)، بە هەموو ناوچەکانی (کوردستان)دا دەخولانەوە، کەسیش لە کەسی نەدەپرسی. لەبەرئەوە نووسراوەکەی (خاڵەحاجی)م لە هیچ شوێنێ، لە گیرفان دەرنەهێنا و پێویستی نەکرد، پیشانی کەسی بدەم!

پاشان هاتینەدەرەوە و (شێخ ساڵحی داروغا)مان بینی، لە چاخانەیەک دانیشتبوو، فەرمووی لێ کردین و دانیشتین. منیش بیری ئەوەم کەوتەوە، لە (گەرەدێ) بەڵێنیدابوو،

داوەتمانکا. گوتم: یا شێخ کوا نێرەقەلەکە؟ شێخیش بە ئەو هەموو زمانپیسی و جنێوفرۆشییەی خۆیەوە، هەردوو دەسی بۆ ئاوگەڵی برد و گوتی: ئەوە نێرەقەلەکەیە، گەر دەتانەوێ، بۆتان سەردەبڕم!

دوای کەمێ، تووشی (شێخ عوسمان باراوی) زاوام بووین. یەکدیمان ماچکرد و گوتی: ئەم شەو مەڕۆنەوە، لە ماڵی (حەسەن)ی خۆمان دەبین. من نەمزانی، (حەسەن)ی براشم رایکردووە، ماڵەکەشی لە (چوارتا)یە و دووکانی داناوە. ئیدی ئەو شەوە، هەموومان لە ئەوێماینەوە، بە پێکەنین و خۆشی، شەوەکەمان بەسەربرد. بەیانیش نانمانخوارد و بەرەو (هۆمەراغ) گەڕاینەوە.

## ژێر پردەکەی قەلاچوالان

ڕۆژی (24. 3)، لە (چوارتا) دەرچووین، وردەوردە دەڕۆیشتین و بارانیش دەباری. نزیک پردەکەی (قەلاچوالان) بووینەوە. گوێم لە دەنگەدەنگی بوو. گوتم: (شێخ مەنسوور)، ئەو دەنگانە بە گوێم نامۆ نین. سەرم شۆڕکردەوە و تەماشامکرد، هاوەڵەکانی زانکۆم (شیروان نوری غەفوور، عەلی حەمەرەشید و سۆرانی عوسمانی سەعەی مەلاعەبباس) لەناو باران، لەژێرپردەکەدا دانیشتوون و قسەدەکەن. منیش گوتم: ئەوە چی دەکەن؟! ئیدی وەک خوا لە ئاسمانەوە، منی بە دیاری بۆ ناردبن، یەکدیمان ماچکرد و دانیشتین. گوتم: نیازی چیتان هەیە؟! گوتیان: دەچین بۆ (چوارتا) و بزانین، بۆ کوێمان دەنێرن. پاشان قایلمکردن، لەگەڵ من بێن و پێکەوە بڕۆین بۆ (قەلادزێ). ئەمەیە دەڵێ: ڕێوی خۆی بەکونەوە نەدەچوو، هەژگێکیشی دوای خۆی خستبوو! بەلام خوا هەڵناگرێ، (شێخ مەنسوور) زۆر پیاوانە گوتی: ڕاستەکا، فەرموون وەرن و ماڵی خۆتانە.

ئەو ڕۆژە، بارانێکی هێندە زۆر و بەخوڕ دەباری، ماوەی نەدەدا، چاو هەڵبڕین و سەیرێکی ئاسمان بکەین. ئیدی تا گەشتینەوە (هۆمەراغ)، هەموو جەستەمان بەتەواوی تەڕبووبوو، جلەکانیشمان دەتگوت، لە ئاو هەڵکێشراوە!

## دواشەوی هۆمەراغ

هەر گەیشتینەوە، خێرا کاک (ڕەسوول)، چەن برکەدارێکی لە زۆپاکە هاویشت. دوای ماوەیە پێرەزۆپا سووربووەوە و لوورەی دەهات. ئێمەش جلمانگۆڕی و خۆمان وشککردەوە. پاشان تا درەنگانێ، پێکەوە کۆنکەنمانکرد و بەقسەی خۆش ڕامانبوارد.

بەیانی زوو هەستاین و نانمانخوارد. بڕیارماندا، بڕۆین. پەرتووکەکانم دوو باوەڵی گەورەبوو، بۆیان بارکردم و ماڵاواییمان لە (شێخ مەنسوور) و خانەخوێکەمان کرد. بە

ئەو شێوەیە، دوو هەفتەی خۆشم، لەگەڵ ئەو برا خۆشەویستانەمدا، لە گوندی (هومەراخ) رابوارد و لە (25. 3)دا بەجێمهێشتن، بە کوڵی خەم و پەژارەی (حەسەن)ە چکۆلەوە، بەرەو ماڵی نەنکم لە (دۆڵبێشک)، ملی ڕێمانگرت. ماوەیە بوو، (شێخ ناسر) چووبوو بۆ بارەگەی (بارزانی)، بۆئەوەی بزانێ، دوارۆژی خۆی و براکانی، لە شۆڕشدا چۆن دەبێ و چ کارێکیان پێ دەسپێرن. بەڵام تا منیش لە ئەوێ بووم، نەگەڕابووەوە، تا ماڵاوایی لێ بکەم.

## دۆڵبێشک

ڕۆژی (25. 3)، دیسانەوە بارانێکی زۆر و سەرما، تەنگی پێ هەڵچنین. ئەو ساڵە بە جۆری باران دەباری، هەموو ئەو بەهارە بەددگمەن نەبێ، ڕۆژی خۆشی نەکردەوە. بە ترومبێل لە چەمەکەی (کونەماسی) پەڕینەوە و دوای (10) خولەک، لە دەرگەی ماڵی نەنە (پیرۆز)ی دایکی دایکمم دا. هەرچوارمان چووینەژوورەوە، خۆمان وشککردەوە و لێی دانیشتین.

خوالێخۆشبوو (شێخ بابەعەلی کاریزە) زانی، من هاتووم، هێندەی نەبرد، یەکسەر هات. کەمێ دانیشت، بەزۆر هەمووومانی بۆ دیوەخانەکەی خۆی برد، وەک ئاغا دێ هەڵسوکەوتی دەکرد! ماڵی ئەوان گەلێ گەورەتر و خۆشتر بوو. ئەو شەوەش میوانی (شێخ بابەعەلی) بووین و ڕاژەیەکی پیاوانەی کردین. زۆر لەگەڵمان خەریکبوو، بخۆیەوە، هەرچەندە هاوڕێکانم حەزیان دەکرد، بەڵام من قەبووڵم نەکرد.

بەیانی زوو، لە دەنگی ناڵەناڵی (سۆران) ڕاچڵەکیم. هەستام و گوتم: ئەوە چیتە؟ گوتی: زۆر ماندووم، بەیارمەتی خۆت، (شیروان) و (عەلی)م بۆ هەستێنە. (سۆران) برای (سیروان عوسمان) بوو. ئەویش هەم هاوڕێم بوو، هەم نزیکەی دوو ساڵ، لە (کاژیک)دا لێپرسراوی بووم. خاتوو (شەفیقە)ی دایکیان، منی خۆشدەویست. لەدەس (سیروان) هەر دادوبێدادیبوو، جگە لە ئەوەی (سیروان) خوشکەزای (نیهاد)ی هاوڕێشم بوو. لەبەرئەوە (سۆران) شەرمی لێ دەکردم و ڕووی نەدەهات، هیچم پێ بڵێ.

دوایی (شیروان) پێی گوتم: (سۆران) سکی دێشێ، چونکە چەن ڕۆژە داتەنیشتووە، دەبێ، دوکتۆرێکی بۆ بدۆزینەوە. منیش گوتم: کاکە تۆ یەکەڵکی ئەم شاخوداخە نایەی، وەرە، تا (کونەماسی)ت دەبەم، سواری ترومبێلێکت دەکەم و بگەڕێرەوە بۆ (سولەیمانی). گوتی: باشە. کردمە کۆڵم و لە ئاوەکە پەڕاندمەوە. سواری پیکابێکم کرد و خۆم گەڕامەوە. ئیدی پەرتووکەکانم لە ماڵی نەنکم دانا و لەگەڵ (شیروان) و (عەلی)دا، سواری تراکتۆر بووین و بەرەو (ماوەت) ڕۆیشتین.

## مـــاوەت

(26. 3) گەیشتینە (ماوەت) و دامەزراین. خەڵکێکی زۆر، لە ئەو شارۆکە چکۆلانەیە گیرسابوونەوە. (ی. ق. ک. – ع.)، لیژنەیەکیان دانابوو، ناوی خوێندکارەکانیان دەنووسی و ڕەوانەی مزگەوتیان دەکردن. لە ئەو ڕۆژانەدا، مزگەوت بۆ پێشمەرگە و خەڵەکە ڕاکردووەکە، وەک ئوتێل بەلاش وابوو! ئێمەش وەک ئەو دەیان خوێندکارانە، لە مزگەوتەکە جێی خۆمان کردەوە.

زۆربەی هاوڕێکانی زانکۆم لە ئەوێ بوون. لەگەڵ (سەباحی غالب)دا، دیسانەوە یەکمانگرتەوە. دووڕۆژ لە (ماوەت) ماینەوە، پاشان ڕۆژی (28. 3)، بە دوو تراکتۆر، تا سەر ڕێگەکەی گوندی (قامیش)یان بردین و لە ئەوێ هەڵیانڕشتین!

لە ئەوێوە دەبووایە، بەپێ بەرەو (قەلادزێ) بمانکوتایە. کەمێ ڕۆیشتین و تووشی کۆمەڵێ پێشمەرگە بووین. یەکێ لە دواوە، دەستیکردە ملم. ئاوڕمدایەوە، (سمەی بلەسووری عەرەبانچی) هاوڕێم بوو، لەگەڵ ڕەوانشاد (عەلی حاجی سەعەرەشی) خاڵۆزایدا بوو. یەکدیمان ماچکرد و (عەلی) گوتی: بۆ کوێ دەچی، وەرە لەگەڵ ئێمە بە؟ منیش پێم باشبوو، لە هاوڕێکانم و زانکۆ دانەبڕیم، لەبەرئەوە قایل نەبووم و ماڵاوایم لێ کردن. ئیدی ئەو هەموو خوێندکارە وەک ڕانەمەڕ و بزن ڕیزبووبووین، بەدوای ڕێپیشاندەرەکەماندا ڕێچکەمان بەستبوو!

ئەو ڕۆژە، لە گوندی (مالوومە) لاماندا و لە ماڵی جووتیارە هەژارەکان دامەزراین، زۆر ماندووبووین، کەمێ حەواینەوە، نانمانخوارد و دیسانەوە بەڕێکەوتینەوە. ئەم جارە کۆڕمانبەستەوە و تا گوندی (چالاوا) نەوەستاین. بەڵام ئەو ڕێگەیە زۆر سەخت، بەردەڵانی و هەوراز بوو، بە تایبەتی بۆ ئەو خوێندکارانەی، یەکەمین جاریانبوو، بەپێ بڕۆن و بە ئەو چیاوچۆڵەدا هەڵگەڕێن. جگە لە ئەوەی، یەکێ جانتایەکیشیان بە کۆڵەوەبوو، هەر بەتەواوی هێزیان لێ بڕابوو.

## چالاوا

ئێوارەی ڕۆژی (28. 3)، لە گوندی (چالاوا) لاماندا. جگە لە ئەوەی تا گەیشتین، ڕێگەکە تەخت نەبوو، هەوراز و نشێو، بەرز و نزمی زۆری تێدابوو، سەرەڕای ئەوەی بەپێش دەڕۆیشتین، یەکێ کۆڵێکیشمان پێبوو، جل و کەلوپەلی پێویستی خۆمانی تێدابوو. بەڕاستی زۆر ماندووبووبووین، چونکە ئێمەی شلەشاری، فێری ئەوە نەبووبووین، هێندە بەپێ بڕۆین!

بۆیە هەر گەیشتینە مزگەوتەکە، لەبەر ئازاری پێمان و ماندووبوونمان، زۆربەمان لاڵوپاڵ لێی کەوتین. دوای نوێژی ئێوارە، کوێخای گوندیان دۆزییەوە، دوودوو لە ماڵان دایانمەزراندین. ئاغای (غالبی) نوێژکەربوو، لەگەڵ مەلای گوندەکەدا ڕۆی، من و (نوری حەسەن غەفوور)یش پێکەوە، لە ماڵی دامەزراین، ماڵەکە زۆر هەژاربوون، لەبەر چرایەکی کز، لەسەر لبادێکی شڕ دانیشتین، چاوەڕێبووین، شتێکمان بۆ بێنن، بیخۆین. پێش نانخواردن بە چا دایانگرتینەوە، چا لەسەر چا بۆیان دەهێناین. تا نەمانگوت: بەزیادبێ، وازیان لێ نەهێناین!

دوایی خاوەن ماڵەکە، سینییەکی هێنا و لەبەردەمماندا داینا. (نوری) گوتی: بەخوا باش بوو، یاپراخ بوو، بەس نەبوو، ساوەر ئەبوو، چونکە زیاد لە هەموو خواردنێ، زۆر ڕقم لە ساوەرە. بەڵام هەر یەکەمین یاپراخی هەڵگرت و خواردی، هاواری لێ هەستا و گوتی: من بە ساوەری نایخۆم، جا وەرە بە یاپراخی بیخۆم، ئەمە خۆ ساوەرە و خۆی لێ گۆڕیوم! ئیدی گەلێ پێکەنین و من گوێم نەدایە، یاپراخی ساوەرەکەی خۆم خوارد، (نوری)ش نان و چای خوارد. بەڕاستی، ئەوە یەکەمین جاربوو، بیبیستم و ببینم، لەبری برنج، یاپراخ بە ساوەر لێبنێن!

پاشان پێخەفمان وەرگرت و چووینەوە بۆ مزگەوت. ئیدی تا درەنگانێ، باس هەر باسی دامەزراندن، یاپراخی ساوەر و خەڵکی ئاوایی بوو. دوایی لە ئەو ژوورە گەرمەی مزگەوت لێی نووستین. بەیانی زوو، مەلا بە بانگدان خەبەریکردینەوە. خێرا دەموچاومان شت و نوێنەکانمان بۆ خاوەن ماڵ بردەوە. هەم دیسان، سەر و دڵی خانەوادەکەمان گرتەوە، نان و چامان خوارد و ماڵاواییمانکرد. ئیدی بە ئەو شێوەیە، هەموومان کۆبووینەوە و کاروانەکەمان بەڕێکەوتەوە.

### دۆڵی سەفرە و زەروون

ڕۆژی (29. 3)، ماوەیە بەپێ ڕۆیشتین، دیسان باراندایکردەوە. بەڵام بارانی چی، هەر خۆشی نەدەکردەوە. لەبەرئەوە زۆر تەڕبووبووین، بەتەواوی ماندووبووبووین. هەرچی چۆنێ بوو، گەیشتینە دۆڵی (سەفرە و زەروون). نازانم، ئەو دۆڵە چی بوو؟ چونکە هێندە دووروودرێژبوو، هەر نەدەبڕایەوە. قەدپاڵی بەرزاییەکان، هێندە سپیبوون، دەتگوت گەچکاریکراون، تەنانەت خاکەکەشی هەر سپیبوو!

ئەو بەهارە، بارانێکی زۆر باری، کانیی و کارێزەکان بوژابوونەوە و تەقیبوونەوە، ئاو زۆرزۆر زیادیکردبوو، لە کۆتایی دۆڵەکەدا، چەمێکی گەورە هاژەیدەهات، نێوجەرگی دۆڵ و چیاکانی ئەم بەر و ئەو بەری چەمەکەی دووڵەتکردبوو. هەردوو بەری دۆڵەکە بە

قەپاغی پێکەوە بەسرابوون، قەپاغەکەش لە دار درووستکرابوو، بە چەن گوریسێکی قایم و ئەستوور، پێکەوە گرێدرابوون. ئیمەش هیچ چارمان نەبوو، دەبووایە، بیەرینەوە، چونکە تاکەڕێ بوو، هەرچی چۆنێ بوو، بە چەن جاری هەموومان پەڕینەوە و ئەو شەوە لە گوندی (نوورەدین) رۆژمانکردەوە.

بەیانی زوو هەستاین و بەڕێکەوتین. دوای ئەوەی ڕێیەکی دوورمان بڕی و زۆر ماندووبووین، ئێوارەی ڕۆژی (30. 3) گەیشتینە (قەلادزێ) و ئەو شەوە، کەسمان نەدۆزییەوە، ناچاربووین، لە مزگەوتەکە بنووین.

* * *

## قـــەڵادزێ

چەن جاری لە ئەوەوپێش، شارۆچکەی (قەڵادزێ)م دیبوو. بەڵام ئەم جارە (قەڵادزێ)، دەتگوت (بەغدا)یە و لە شەقامی (رەشید) پیاسەدەکەی، هێندە جەنجاڵبوو، رێ بەر رێبوار نەدەکەوت و وەک دەڵێن: شان شانی دەسوو!

هەر زوو (سەروەت)ی هاوڕێم دۆزییەوە و پێکشادبووینەوە. پاشان کۆمەڵێ هاوڕێی دیکەی وەک (ئازادی عەبدوڵڵا ئەفەندی، ئەحمەدی عارفی فیتک، ئەحمەد حەمەئەمین، عەلی مەحموود غەفوور، بەختیار عەبدوڵڵا، سەلاحی ئەحمەدی سەروپی، دارای حەمەرەشید ...)م بینی، هێندێکیان هاوڕێی زانکۆ و هێندێکی دیکەشیان، هاوڕێی منالی و کوڕی گەڕەک بوون.

زانکۆ لە (قەڵادزێ) کرایەوە. کۆگەکانی شوێنی پشکنین و وەرگرتنی تووتنەکە، زۆر گەورەبوو، بۆ بەشی نێوخۆیی خوێندکارانیان تەرخانکردبوو. هەر خوێندکاری، نوێنی خۆی لە (ی. ق. ک.) وەرگرتبوو، لەبری فەرەدەتووتن، ڕیزبوویبوون و لێی کەوتبوون! هەر کۆگەیەکیش نزیکەی (**50**) خوێندکاری تێدابوو. سەری عەمبارەکان جەمالۆنبوون و بە چینکۆش گیرابوون. هیچ زۆپایەکی تێدا نەبوو، زۆر ساردبوو.

(دارای حەمەرەشید)، هەم خزم و هەم کوڕی گەڕەکم بوو. لە (قەڵادزێ) مامۆستابوو. خانوویەکی گەورەی گرتبوو، هاوڕێکانم لای ئەو خۆیان داکوتابوو. منیشیان هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە دامەزران و ماڵی ئاوابێ، نووستنی ژێر جەمالۆنەکانم نەدی!

ئەو ماوەیە، بواری هیچ جۆرە کارێکی رامیاری و خوێندنەوە نەبوو، هیچ شتێکی دیکەش نەبوو، خۆمانی پێوە خەریککەین، چونکە لە ڕەگەوە هەڵکەنرابووین. لەبەرئەوە بە ڕۆژ پیاسەماندەکرد و لە چاخانەکانیش، خەریکی دۆمینەکردن بووین. ڕۆژ نەبوو، لەسەر ئەو جادانە، دە جار تووشی هاوڕێ و ناسیاوەکانمان نەبین!

ئەوەی چاوەڕێم نەدەکرد، ئەوەبوو، هەر یەکەمین ڕۆژ، (سورانی عوسمانی سەعەی مەلا عەبباس)م بینی، جامانەیەکی قوتی بەستبوو، لە چاخانەیەک دانیشتبوو، دەتگوت، هەر ئەویش نەبوو، بۆ (سولەیمانی) بەڕێمکردەوە! گوتی: دوای ئەوەی گەڕامەوە، چەن ڕۆژێ مامەوە، برێ دەرمانمخوارد و چاکبوومەوە. پاشان بە ترومبێل هاتم بۆ ئێرە. ئینجا تێگەیشتم، ئەو خەڵکە ئەو هەموو ڕێیەیان، بەخۆرایی بەپێ کوتاوە، تووشی ئەو هەموو ماندووبوون و برسێتییە بوون!

دوای ماوەیە (ئەنوەری مەلاحوسێن – تەحلان)یش هات. (ئەنوەر) هەم کوڕی گەڕەک و هەم ئەوەتەی زانکۆش دامەزرابوو، کوێسکێکی چکۆلانەی هەبوو، شتی تێدا دەفرۆشت و بە شەویش، لە یەکێ لە فەرمانگەکانی زانکۆ پاسەوانبوو. لەبەرئەوە کەس نەبوو، نەیناسێ. کوڕێکی زۆر خۆشبوو، زۆر حەزی لە گاڵتەوگەپ دەکرد، بەقسە خۆشەکانی، هەموومانی بووژاندەوە.

تا ئەو ماوەیەی لای مامۆستا (دارا) بووین، پارەمان کۆدەکردەوە، زەخیرەمان دەکڕی و زۆربەی کات، لە ماڵەوە خواردنمان دروستدەکرد. تەنیا نیوەڕوان نەبێ، هەموو ڕۆژێ لە بازاڕ کەبابمان دەخوارد و کەبابەکەی وەستا (عەلی)ش، بەناوبانگبوو. بڕواناکەم، لە (سولەیمانی)ش کەبابی وا خۆش و بەتامم خواردبێ. جا تەگبەتی ئێمەش ئەوەبوو، لە ئەو بێکاری و بێ پارەییەدا، تێرمان نەدەخوارد، ڕۆژ نەبوو، سەرو کەبابی زیادە لوول نەدەین! هەموو ئێوارەیەکیش، (دارا) برنج و شلەی لێدەنا، ئەو کاتە لە هەر هەموومان باشتری دەزانی. هەر ئێوارەیەکیش دوای نانخواردن، بە نۆرە قاپەکانمان دەشت. دوای نانخواردنیش، گوێمان لە دەنگی ڕادیۆی شۆڕش دەگرت، تا ئاگامان لە دەنگوباسەکان بێ. دوایش یاری کاغەز دادەمەزرا و ئەوان، لەسەر دەنکە فاسۆلیا پۆکەریاندەکرد. من ئەو یارییەم نەدەزانی، لەبەرئەوە هەر تەماشامدەکردن.

هەر لە ئەو ڕۆژانەدا بوو، لەگەڵ هەردوو مامۆستا (جەمالی سەیید عەلی) و (لەتیف مەولوود)، یەکدیمان ناسی و زۆرم خۆشمویستن. چونکە جگە لە ئەوەی کوڕێکی زۆر باش و ڕووخۆش بوون، هەردووکیشیان نەتەوەیی بوون و هەر زووش لە یەکدی تێگەیشتین.

ڕۆژێ زۆر بێزاربووم، لەنێوبازاڕ بەتەنیا دەگەڕام، تووشی هەردوو هاوڕێی دێرینی خۆشەویستی گۆشتفرۆشم ڕەوانشاد (ئەحەی حەپسە) و کاکە (عەبەی عەلی برزوو) بووم، زۆر گەشامەوە و گەلێ قسەی خۆشمان کرد.

## چەن ڕووداوێکی سەیر

ئێوارەی ڕۆژی (**10. 4. 1974**) بوو، هەر لە ئەو شەوانەدا بوو، وێزگەی دەنگی شۆڕش، هەواڵی هەڵاتنی هەردوو حەفیدزادە (شێخ کاوە) و (شێخ دارا)ی بڵاوکردەوە. (شێخ کاوە)ی بە (کاوە)ی (حەلاو) ناوبرد، گەلێ سووکایەتییان پێکرد و پیاوەکانیشیان، بە جاشەکانی (کاوە) نێوزەدکرد.

بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆشبوو، بەتایبەتی بۆ (شێخ دارا)، چاوەڕێی ئەوەم لێ نەدەکرد. بەڵام ئەوەی (کاوە) کردی، کارێکی چاوەڕوانکراوبوو. چونکە جگە لە ئەوەی، دایکی لەگەڵ کۆمۆنیستەکانی (عێراق) بوو، ئەویش بێ ئەو، پەنجەی بە ئاودا نەدەکرد و زۆر کاریتێکردبوو. هەروەها سلەمینەوەکەی خۆم لە جێی خۆیدا بوو، بۆچوونەکەی (کاژیک)یش ڕاست دەرچوو.

کاتێ سەرکردایەتی پارتی (بەعس)یش، ناوی ئەندامانی ئەنجوومەنی یاساداتایان خوێندەوە، (بابەکر پشدەری) بە سەرۆک دانرا، گوێم لە ناوی (کاوە)ش بوو، ئیدی

گومانم لە ئەوە نەما، (کاوە) هەر لە زووەوە و لەبنەوە، پەیوەندی بە ئەو کۆمەڵەوە هەبوو. بەداخەوە، ئەوە یەکەمین کەسبوو، لە بنەماڵەی (حەفید)، لە پشتی (شێخ مەحموود)ی پاشای خوارووی (کوردستان)، پشت لە ڕۆڵەکانی گەل و خاکی نیشتمانەکەی خۆی بکا!
بەڵام ئەوەی جێی سەرسووڕمانی من بەتایبەتی و هەموو کوردپەروەری بەگشتی بوو، هەڵوێستی دوو نووسەر و ڕووناکبیری نیشتمانپەروەری وەک (عەلادین سەجادی) و (شاکیر فەتاح) بوو. بەڕاستی ئەو کارەی ئەوان، بەتایبەتی (شاکیر فەتاح)، زۆر کاریتێکردم و بۆم دەرکەوت، هەموو ئەو قسانەی کاتی خۆی بۆی دەکردم، هەموو ئەو تیۆریانەی بۆی باس دەکردم، هەموویان درۆ دەرچوون. چونکە بەلای منەوە، ناپاکیکردن لە گەل و نیشتمان، بە هیچ بروبیانوویەک پاساونادرێ!
هەرچەندە لە ئەم سەردەمەدا خەریکە، وای لێبێ، هەموو شتەکان پێچەوانەدەبنەوە، ناپاکی لەنێو ڕیزەکانی نەتەوەی کورددا، وەک کارێکی ئاسایی لێبێ. چونکە <u>ئەوەتەی نەتەوەی کورد هەیە، نە لە ئەو دەرکەوتە گرنگانەی کۆڵیوەتەوە، نە سزای تاوانبار و ناپاکانیشی داوە، بەڵکوو تەنیا هەر بە ئەوە قایلبوون، ناویان لە لاپەڕەکانی مێژوودا، بە چاکە تۆمارنەکرێ!</u>

**خۆخواردنەوە و وەڕسبوون**

بە ئەو شێوەیە، نزیکەی ماوەی سێ هەفتەمان، بێ هیچ تروووسکاییەک، بێ هیچ گۆڕانکاری و هەواڵێکی خۆش، لە (قەڵادزێ) بەسەربرد. هیوای ئاشتی بە جارێ بڕا. هەموو ئێوارەیە وێزگەکەی شۆڕش، چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگەی (کوردستان)ی دەخوێندەوە. ئیدی وردەوردە، لە هەموو ناوچەکان، جەنگ دەستپێکردەوە. کۆمەڵانی خەڵک، ترسیان لێ نیشتبوو. بەتایبەتی خوێندکارانی زانکۆ، لە ئەوە بەترسان، دەسەڵاتدارانی (بەعس)، بۆردوومانی شارۆچکەکە بکەن. ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، مامۆستا و خوێندکارەکانی زانکۆ، لە هەموو لایەکەوە، ڕوویان لە (قەڵادزێ) دەکرد و ژمارەیان زیاتردەبوو. بەڵام هێشتا زانکۆ، هیچی دیارنەبوو!
من یەکجاری، لە ئەو بارودۆخە بێزاربووبووم، گیرفانم کزبووبوو، لە ئەویش هیچ نەبووین و دەبووایە، چاوەڕێی ئەو ئەزاتانەی لێپرسراوانی (قوتابیان) و (پارتی) بووینایە. هیچ کارێکیش نەبوو، بیکەین و خۆمانی پێوە خەریککەین. کەسیش لێی نەدەپرسینەوە و زۆر بێ سەروبەربوو، کەس بە کەس نەبوو. منیش لە هەموو هەواڵ و دەنگوباسێکی خۆمان پچڕابووم.

ئەندامانی لقی قوتابیان و هەردوو لیژنەی ناوچەی (قەلادزێ) و (سولەیمانی) پارتی، بۆخۆیان جێی باش و پارەی زۆریان هەبوو، هەر ئێوارەیان لێدەهات، خەریکی یاری و خواردنەوە بوون. ئەو خەلکەش بێ کار و بێ پارە، لە ئەو ناوەدا دەسووڕانەوە، ئیدی لە توانایاندا نەمابوو، بەتەواوی وەڕسبووبوون. منیش بڕیارمدا، سەردانێکی (ڕانیە) بکەم، سەرێ لە مالی پوورە (سەبیح)م بدەم و کەمێ بحەوێمەوە. زۆر لەگەل (سەروەت) خەریکبووم، نەهات. ئەوەبوو، ڕۆژی (20. 4)، لەگەل (ئەنوەری مەلاحوسێن) ڕۆیشتین، ئەو لای هاوڕێیەکی و منیش لە مالی پوورم دابەزین.

**ڕانیە**

بەراستی شارۆچکەی (ڕانیە)، زۆر لە (قەلادزێ) دلگیر و خاوێنتر بوو، بە ئەو شێوەیەش جمکوت نەبوو. جگە لە ئەوەی مالی پوورم، لە ئەوێ بوو، ماوەیە حەوامەوە، چەن یادگارێکی شیرینی منالیشم، لە (ڕانیە) هەبوو. (نیهاد)ی هاوسەری (لوتفی) پوورە (شەمسە)ش، لە ئەوێ مامۆستابوو، چەن هاوڕێیەکی دیکەی وەک (ئەمیری بەکری قەساب ...)یشی لێ بوو، هەر زوو یەکمانگرتەوە، زۆربەی شەو پێکەوەبووین و لایان دەمامەوە. ماوەی مانگ و نیوێ دەبوو، نەمخواردبووەوە. بەلام یەکەمین جار، (ئەمیر) تۆبەکەی پێ شکاندم، عەرەقی دەرخواردام و گوتی: لێپرسراوەکان هەر تاریکیکرد، هەموو کۆنیاک و عەرەقی مۆزی ئێرانی دەخۆنەوە، مەزەکەشیان ئاوی قەلە، ئەی تۆ بۆ وا خۆت کوشتووە؟! ڕاستیدەکرد، سەرت بە هەر مالێکدا دەکرد، دوای نانخواردن، خواردنەوەیان بۆ دادەنای. تەنانەت لە (پێنجوێن)، چەن کەسێکی خەلکی (سولەیمانی) لێ بوو، لە مالەوە عەرەقیان دەفرۆشت! ماوەی چەن ڕۆژێ لە ئەوێ بووم، کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد.

**بۆردوومانی قەلادزێ**

بەیانی زووبوو، لە دەنگی نالەنالی فڕۆکە و قیژەقیژی خەلکی گەڕەک، خەبەرمانبووەوە، هاواریاندەکرد، ڕاکەن، خۆتان بشارنەوە، (قەلادزێ) کەسی تێنانەما! بەلێ، سەرلەبەیانی ڕۆژی چوارشەممەی ڕێککەوتی (24. 4. 1974)، کاژێری (40. 9) خولەک بوو، ئەوەی لێی دەترساین، ڕوویدا. چەن فڕۆکەیەکی باجەر و سیخۆی، دانیشتووانی (قەلادزێ)یان، بە بۆمبای ناپالم ڕاچلەکان و ڕاپانپەڕاندن. هەرگیز ئەو مێژووە ڕەشەم بیرنەچووەتەوە و تا لە ژیانیشدا بم، بیریشم ناچێتەوە، هەر هەمووشی بە (4) دەسپێدەکا!

منیش یەکسەر لە مالی (ئەمیر) دەرپەڕیم و چوومەوە بۆ مالی پوورم. نان و چامان هەلگرت، بەرەو دەشتاییەکەی قەراغ (ڕانیە) ڕووەو (سولەیمانی) ڕۆیشتین. لە ئەوێ

تەنیا ماڵی (شێخ عەزیزی باسەرە)ی لێ بوو، هەموو پێکەوە لەبن پردەکەدا جێمانراخست و دانیشتین. هێشتا هەر دەنگی فڕۆکەکان، ئەو ناوەیان پڕکردبوو، بەڵام نزیک (ڕانی) نەکەوتنەوە و بۆردوومانیان نەکرد. لە ئەوە دەچوو، تەنیا بۆ بۆردوومان کردنی زانکۆ هاتبن!

لەگەڵ (شێخ عەزیز)دا یەکدیمان ناسی و ڕاژەیەکی زۆری کردین. ئەو ڕۆژەشمان بە قسەی خۆش بەسەربرد. ئێوارە تاریکبووبوو، چووینەوە بۆ ماڵەوە و لێی نووستین. ڕۆژی (**25**. **4**) نیسانەوە، سەرلەبەیانی زوو جارێکی دیکە خۆمان پێچایەوە، هەمووومان بەرەو (کێوەڕەش) ڕۆیشتین، نوێن و خواردنمان برد و شەویش هەر لە ئەوێ ماینەوە. ئەو کاتە ئەو ناوە چۆڵبوو، وەک ئێستە نەبوو، خانوو لە بناری کێوەکە دروستکرابێ.

ڕۆژی دوایی (**26**. **4**)، نێوبازاڕ جمەیدەهات. منیش لەگەڵ (دلاوەر)ی پوورم ڕۆیشتم، تا دەنگوباسی ببیستم. ئینجا زانیمان، زیانی بۆردوومانەکەی (قەڵادزێ) چەن بووە. ئیدی من لە ئەوە پتر، خۆم بۆ نەگیرا و گوتم: هەموو هاوڕێکانم لە ئەوێن و نازانم، چییان بەسەرهاتووە، هەر ئێستە دەبێ، بەپێ بڕۆمەوە. ماڵاواییم لێ کردن، من و (ئەنوەر) جادەبەجادە پیوامان و گەڕاینەوە. لە ڕێگە هەر ترومبێل بوو، بەلاماندا تێپەڕدەبوون، لە هەموو شار و نێوچەکانی (کوردستان)ەوە دەهاتن، تا هەواڵێکی کوڕ و برا و کەسەکانیان بزانن. لەناکاو قەمەرەیەک وەستا و خوالێخۆشبوو خاتوو (حەپسە)ی دایکی (سەروەت)ی هاوڕێم دابەزی. پەلاماریدام و ماچیکردم، گوتی: هەواڵی (سەروەت) نازانی؟ گوتم: بە ئەمای خوا، هیچ نییە و سەلامەتە. هێندەم زانی، قەمەرەیەکی دیکە هات و خوالێخۆشبوو (ڕەزاقی عارفی فێنک)ی تێدابوو، یەکدیمان ماچکرد و هەواڵی (ئەحمەد)ی برای لێ پرسیم. ئیدی گەلێ دڵخۆشیمدانەوە و لەگەڵ ئەواندا سەرکەوتین، گەیشتینەوە نێو (قەڵادزێ). هەر دوو ڕۆژ دوای کارەساتە جەرگبڕەکەی (قەڵادزێ)، شارۆچکەی (هەڵەبجە)شی بە بۆمبا وێرانکرد!

**قەڵادزێ دوای بۆردوومانەکە**

ڕۆژی (**26** **4**) گەیشتمەوە. لەگەڵ (ڕەزاق) و دایکی (سەروەت)، لە (قەڵادزێ) دابەزین. یەکسەر چووین، سەیری ناوی لیستی ڕەوانشادەکانمان کرد. باشبوو، ناوی ئەوانی تێدا نەبوو. پاشان هەر ئەو ڕۆژە، ئەوان گەڕانەوە بۆ (سولەیمانی).

ماوەیەکی زۆر، بەنێوبازاڕ و ماڵەکانی (قەڵادزێ)دا گەڕام، تەماشای ئەو شوێنانەم دەکرد، کە کۆترە ئاشتییەکانی قەلای گەلانی چەوساوە (یەکێتی سۆڤیێت)، بە هێلکەی زێڕینی ناپاڵمەکانیان وێرانیانکردبوو. هێندەی دیکە ڕقم لە بیری کۆمۆنیستی و (سۆڤیێت)

هەستا! دیاربوو، سەرە بێهۆشەکانی شۆڕش، هێندەیان بە رادیۆ شرەکەیان شێراندبوو: مامۆستا و خوێندکارەکانی زانکۆ، بە زووترین کات خۆیان بگەیەننە (قەلادزێ)، بەتەواوی سەرکردەکانی (بەعس)یان تووڕەکردبوو!

بۆیە یەکەمین جار، جەمالۆنە گەورە و سپییەکانی کۆگەی خوێندکارانیان بۆردوومانکرد بوو، هەموویان بە بۆمبا و شەستیر دڕیبوو. کۆمەڵی هاوڕێی خوێندکاری باش و کادیری هەڵبژاردەی قوتابییانی وەک (حەمەسالح سامسام، هیوا عەبدولغەفوور حوسێن، سەروەر عەلی قادر، بورهان عەبدوڵلا شاسوار، ئازاد حوسێن ئەحمەد، سۆران موحەممەد سەڵتە) و گەلێکی دیکەش شەهیدبووبوون. (36) دووکان، (23) خانوو و (9) فەرمانگەش ڕووخابوون، کارەباکەشی وێرانکردبوو. (300) کەس بریندار و (163) کەسیش شەهید ببووبوون. *

دووکان و بازارەکان داخرابوون، ئەو خەڵکانەی مابوون، پەنایان بۆ گوندەکانی دەوروبەر و چیاکان بردبوو. پێش هەموو کەسی، لێپرسراوانی (پارتی) و شۆڕش هەڵاتبوون. جگە لە دوکتۆر (جەلال شەفیق)، لەگەڵ خەڵکەکەدا مابووەوە، تەرمی قوربانییەکانیان، لەبن دیواری خانووە ڕووخاوەکاندا دەردەهێنا. هەموو مامۆستاکانی دیکە، تا سەرسنووری (ئێران) نەوەستابوونەوە! هێندێکیان لە (تاران)ەوە بۆ (ئەورووپا) ڕۆیشتبوون. ئیدی (قەلادزێ)، بە جاری چۆڵ و وێران بووبوو، بێناز و کشومات کەوتبوو!

جا سەیر ئەوەبوو، سەرەڕای ئەوماڵوێرانی و ئەو هەموو قوربانیانەش، شەو نەبوو، دز ماڵی یا دووکانی نەبڕێ. نازانم، هەستی مرۆیی، ئایینی و کوردایەتی ئەو جۆرە کەسە بێویژدانانە دەبێ، چۆن بێ، وا لە ئەو ڕۆژەڕەشەدا، دەستیان بۆ ماڵ و سەروەتی هەڵاتووەکان درێژدەکرد و تاڵانیانەدەکردن؟!

بەڕاستی، سەرکردایەتی (پارتی) و شۆڕش، غەدرێکی زۆر گەورەیان، لە خوێندکارانی زانکۆ و دانیشتووانی شارۆچکەی (قەلادزێ) کرد. کاتی زانکۆیان لێ کردەوە، هەڵە و تاوانێکی هێندە مەزنبوو، لێخۆشبوونی نییە و خوێنی هەموو ئەو شەهیدانەش، لە ئەستۆی وردی ئەو سەرکردە نەزانانە دایە!

---

* لە یادی بۆردوومانەکەدا، گۆتاری (یاد و بیرەوەریی 40 ساڵ لەمەوبەر)م، لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)ی ژمارە (6370)ی ڕۆژی (1. 5. 2014)، پاشان لە لاپەڕە (62–73)ی پەرتووکی (بارانی خوێن و بای مەرگ)دا جارێکی دیکە بڵاوکردەوە. لە ئەو گۆتارەدا، زۆر بە درێژی، لە هەموو لایەنەکانی ئەو مەرگەساتە دواوم.

ئاخر (پارتی) لە هەموو تەمەنی خۆیدا، تا ئەو ئەو کاتە، لە (ئۆتۆنۆمی) زیاتری داوا نەکردووە، ئیدی بۆچی ئەو بڕیارەیدا، زانکۆ لە (قەلادزێ) بکرێتەوە؟!! ڕەنگە ویستبێتی، دەوڵەتی کوردی دامەزرێنێ، لە (کاژیک) نەتەوەیی و (کاژیک)تر بووبێ، کە ئەوان پاپەدۆسیان لێکردبوو؟!

لە ئەوەش سەیرتر ئەوەبوو، پارتی کۆمۆنیستی نوێنەری کرێکار و جووتیارانی چەوساوەکانی گەلانی (عێراق)، لەگەڵ (بەعس)ی فاشیدا لەبەرەیەکدا بوون، کەچی جگە لە ئەوەی، هیچ هەڵوێستێکیان نەبوو، دژی ئەو کارە چەپەڵە دڕندانەیەی دەوڵەتی داگیرکەری (بەعس) بێدەنگبوون، ئەو بۆردوومان و کۆمەڵکوژییەی (بەعس)یش کردی، کوردەکانی دژ بەڕژێم و بەرەی نانیشتمانی، لە کوردە کۆمۆنیستەکان جیانەکردەوە، وەک یەک کوشتنی و ماڵی وێرانکردن!

هەر بۆ نموونە: ماڵە کۆمۆنیستێکی هەژاری (قەلادزێ)یی بەرکەوتبوو، کوتەکوشتنی ژنەکەی و هەموو منداڵەکانی بەسەریەکدیا کەوتبوون و تێکەڵاوبووبوون، تەنیا هەر پیاوەکە ڕزگاری بووبوو، ئەویش هێندە بێ هۆش و گۆش بوو، دەیگوت: تەرمەکانیان کۆدەکەمەوە و دەیبەم بۆ (سولەیمانی) بۆ شکات!

لە ئەو ڕۆژە ڕەشەدا، هەرایەک سازبووبوو، کەس ئاگای لە کەس نەمابوو، دوای (**2–3**) ڕۆژ، ژن و مێرد یەکدیان دەدۆزییەوە، یا باوک و دایک، منداڵەکانی خۆیان دەبینییەوە. زۆربەی خەڵکەکە، هەر لە یەکەمین بۆمبا و دەسرێژی شەستیرەوە، زراویانچووبوو، بەپێی پەتی و سەری ڕووتی ڕایانکردبوو. هێندی کەسیش، هەر لە ڕاکردنەکەدا مردبوون. پیاوی بەتەنیا ڕایکردبوو، لە ترساندا، لە دەرەوەی شار خۆی کردبوو بە کونێکدا، بۆردوومانی فڕۆکەکە نەیکوشت، کەچی لە کونەکەدا، ماری پێوەیدابوو، دوای ماوەیە گیانی دەرچووبوو!

## گربـــداغ

هەر ئەو ئێوارەیە، هەواڵی برادەرەکانم زانی، بەپەلە بەرەو گوندی (گربداغ) ڕۆیشتم. کاتێ گەیشتم، لە دوورەوە (ئەحمەدی عارفی فیتک)م بینی، لە دەوری حەوزی مزگەوتەکە وەستابوو. چاوی بە من کەوت، هەردووکمان وەک گوڵ گەشاینەوە. هەواڵی (ڕەزاق)ی برایم پێگەیاند، ئیدی کەمێ دڵیکرایەوە. دوایی چاوم بە هاوڕێیان (دارا، سەلاح و ئەنوەر)ی برای (دارا) کەوت. (دارا) مام (وسو)ی فەرماندەی باتالیۆنی دەناسی، بەهۆی ئەوەوە، لە ماڵان دامەزراین.

بەلام هاوڕێکانی دیکەم، هەریەکەیان بەلایەکدا هەڵاتبوون. هێندێکیان وەک (شیروان نوری غەفوور، عەلی حەمەرەشید، سۆران عوسمان..) تا (سولەیمانی) نەوەستابوونەوە. هێندێکی دیکەیان لە ناوچەکانی (شارباژێڕ، هەڵەبجە، پێنجوێن ...) جێگیربووبوون. هێندێکی دیکەشیان، لە دەوروبەری گوندەکانی (قەڵادزێ)، خۆیان حەشاردابوو. ئێمەش دوای دوو ڕۆژ، ئەو گوندەمان بەجێهێشت و چووین بۆ گوندی (دارشمانە). بەلام ڕەوشی ئەوێمان بە دڵ نەبوو، لەبەرئەوە بڕیارماندا، لە گوندی (هێرۆ) بگیرسێینەوە.

## هێرۆ

ڕۆژی (28. 4)، لە گوندی (هێرۆ) ژوورێکمان بەکرێگرت. سەرلەنوێ دەستمان بە چێشتلێنان و بەزمەکەی (قەڵادزێ) کردەوە. ژیانی ئەو گوندە، زۆر ناخۆشبوو. بەڕۆژ لە ترسی فڕۆکە، هەر زوو هەڵدەساین و لە گوندەکە دووردەکەوتینەوە. لەنێودارەکاندا خۆمان ونده‌کرد. جێمان دادەخست، نانی بەیانی و نیوەڕۆمان ئامادەدەکرد، تا تاریکی دەکرد، بۆ نێوئاوایی نەدەگەڕاینەوە.
بەڕاستی شوێنەکەمان هێندە خۆشبوو، نەماندەزانی، تەماشای چی بکەین. دەتگوت یەزدانی مەزن، بەهەشتەکەی خۆی، لە ئەو ناوە درووستکردووە. هێندە سەوزای، دار و دەوەنی جوانی لێ بوو، ئاوێکی زۆر لە نزیکمانەوە هاژەیدەکرد. لە هەر چوارلاشمانەوە، دەنگی جووکە وجریوەی مەل دەهات و گوێیان پڕکردبووین. ئەمانە هەموویان، دڵی ئێمەی لیقەوماویان دەکردەوە و کەمێ ئارامیان پێ دەبەخشین. بەلام چونکە دڵمان خۆش نەبوو، چارەنووسی خۆمان و شۆڕشەکە دیارنەبوو، زۆر بێ وزە و توانا بووین.
بەشەو، لەبەر ڕووناکایی چرایەکی کزدا، بە ماتی دادەنیشتین. ئیدی بەتەواوی لە جیهان دابڕابووین. جگە لە دەنگوباسی وێزگەکانی ڕادیۆ، ئاگامان لە هیچی دیکە نەبوو. بارانیش هەر تاوەناتاوی دایدەکرد، دڵۆپەش کارێکی پێ دەکردین، هەموو شەوی لەتاواندا، یەک دوو جار جێمان دەگواستەوە. ئینجا لەبەر دەنگی تەقەی دڵۆپە، لەنێو سەتڵ و مەنجەڵەکانی دەدا، هەر خەومان لێ نەدەکەوت. بۆڵەبۆڵی کاک (ئەنوەر)یش، لە ئەولاوە بوەستێ، هەموو جارێ لەسەر شتی هیچوپووچ، شەڕێکی پێ دەفرۆشتین و دەیگوت: جێگەکەی منتان گرتووە. لەنێو هەمووشماندا، (سەلاح) باری دەروونی زۆر خراپبوو، چونکە ئەو بۆمبابارانە، کارێکی خراپی تێکردبوو. ئیدی ژیانی بە شێوەیەبوو، تروسکایی لە دەموچاویدا نەدەبینرا. (دارا)ش گوێی نەدەدایە و هەر خەریکی چێشتلێنانی خۆی بوو. (ئەحمەد)یش مێش میوانی نەبوو، هەر لەسەر قسەخۆش و حیلکەحیلکی خۆی بەردەوامبوو. بەلام من ڕۆژبەڕۆژ بیرەوەریی، بەسەرهات و

ڕووداوەکانم تۆماردەکرد. بەداخەوە، پەخشانێکی درێژم بۆ (حەسەن)ە چکۆل، نامیلکەیەکم لەسەر کوردایەتی و برایەتی نووسیبوو، دوای هەرەسەکە هەموویان تێداچوون!

## دوکتۆر کەمال فوواد

ڕۆژێ لەنێوباخەکەدا دانیشتبووین، لەپڕ ڕەوانشاد دوکتۆر (کەمال فوواد)، بە خۆی و پێشمەرگەیەکەوە، بە لاماندا تێپەڕبوون. ئێمەی بینی، هات بۆ لامان. برادەرەکانم زۆر ڕوویان نەدایە. بەلام من پێشوازیم لێ کرد و لای من دانیشت. هێندێ پرسیاری لێ کردم، ناوی من و (ئەحمەد)ی نووسی، گوایە بە دوای خوێندکارانی زانکۆدا دەگەڕێ و دەیانەوێ، لە شوێنێکدا کۆیانکەنەوە و یارمەتیانبدەن، پاشان ڕۆیشت

## پێنج خونچەگوڵی نەپشکووتوو

شەوێ ڕادیۆمان کردەوە، هەواڵی دەسگیرکردنی پێنج قوتابی زانکۆ (نەریمانی فوواد مەستی، حەسەن حەمەڕەشید، ئازاد میران، جواد هەمەمەوەند و لەیلا قاسم)ی بلاوکردەوە. سەرکردایەتی شۆڕش هەڕەشەی توندی لە (بەعس) دەکرد و دەیگوت: گەر خوێن لە پەنجەی یەکێکیانەوە بێ، ئەوا دووقات تۆڵەیان دەستێنین! بەلام بەداخەوە، دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، گوێی لە ئەو هەڕەشەوگوڕەشانە نەگرت و هەر زوو دادگەیەکی کارتۆنی درۆیان بۆ سازکردن، هێندێکیان لێ بەرەڵاکردن، گوایە هیچیان لەسەر نەبووە! هەر پێنج هاوڕێ و هاوخەباتەکەی دیکەشیان ڕۆژی (**12. 5. 1974**)، لە گرتووخانەی (ئەبوغرێب) لە (بەغدا) لەسێدارەدان.



حەسەن حەمەڕەشید



لەیلا قاسم



نەریماتی فووادمەستی

ئەو هەواڵە، زۆر نیگەرانیکردم و تەمی خەمێکی زۆر گەورە، دڵ و دەروونی داپۆشیم، چرکەبەچرکەی ساتەکانی هاوڕێیەتی خۆم و (نەریمان)م، وەک شریتێکی سینەما بیرکەوتەوە! شۆڕشیش نەک هەر دووقات تۆڵەی نەسەندنەوە، بەڵکوو هیچی نەکرد، بیرچوونەوە و خوێنەکەشیان بەفیڕۆ ڕۆیشت!

(نەریمان)م لە نزیکەوە دەناسی و خۆشمدەویست. زۆر کوڕێکی بەڕێز و خۆشەویست بوو. تازە خەریکبوو، پێدەگەیشت و هەوڵیدەدا، پێشکەوی و ڕاژەی نەتەوەکەی بکا. لەنێو هاوڕێکانیدا، جێیەکی دیاری هەبوو. کوڕێکی ڕووناکبیربوو، زۆر نەتەوەییانەش بیریدەکردەوە. ئێمە هیوایەکی گەورەمان پێی بوو، لە کۆلێژی (ئاداب)ی (بەغدا)، چالاکی بنوێنێ، بەڵام بەداخەوە، چانس یار نەبوو، مەرگ مەودای نەدا، یەک هەنگاو بەرەو ئەو ئامانجە پیرۆزە بنێ! *

## سەردانی قەڵادزێ

نزیکەی ماوەی (2) هەفتە، بە ئەو شێوەیە، لە ئەو ناوە ماینەوە. ئیدی بەتەواوی وەڕسبووم. ڕۆژی (12. 5) سەرێکم لە (قەڵادزێ) دا. هێندێ برادەرم بینی و دووشەو لە مزگەوتەکە مامەوە. ڕۆژی (13. 5)، تووشی (سەلامی مەلاعەبدولڕەحمان) بووم. ئەو کاتە لێپرسراوی لقی قوتابیانی (سولەیمانی) بوو. زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ کردم. دوای ئەوەی هەواڵی یەکدی و برادەرەکانمان زانی، گوتی: ئێمە هەموومان کوردین و یەک کێشەی سەرەکیمان هەیە. بۆیە پێویستە، هاوکاری یەکدی بکەین.

پاشان داوای لێ کردم، یارمەتیانبدەم و بە هەموومان هەوڵبدەین، خوێندکارەکان کۆکەینەوە و سەرپەرشتییانبکەین. منیش بێ ئەوەی، ڕەهەندی کارەکە بزانم، یەکسەر پەسەندمکرد. دوای دووڕۆژ، نزیکەی (100) خوێندکار پەیدابوون. ئێوارەیەکی تاریک، شارەزایەک لەگەڵمان هات و هەموومان، بەرەو گوندی (شێخاودەلان) بەڕێکەوتین.

---

* تا ئێستە، دوو گوتارم لەسەر ئەو پۆلە ڕەوانشادە قارەمانانە نووسیوە. یەکەمیان بە ناوی (پێنج داربەڕووی ڕەشەستوور) لە گۆڤاری (گوڵان)ی ژمارە (976)ی مانگی گوڵانی (2014) و دووەمیشیان بەناوی (هەڵۆیەکی بەرزەفڕی ئاسمانی کوردایەتی) لە گۆڤاری (سلێمانی تازە)ی ژمارە (156)ی مانگی جۆزەردانی (2014) و جارێکی دیکەش، هەردوو گوتارەکەم، لە پەرتووکی (بارانی خوێن و بای مەرگ)دا، ساڵی (2015) بڵاوکردووەتەوە. بۆیە لێرەدا نامەوێ، لە ئەوە پتر، لە ئەو بابەتە بدوێم.

## شێخاوەلان

ئێوارەی ڕۆژی (15. 5) بوو، گەیشتینە گوندی (شێخاوەلان) و هەر زوو لە ماڵان دامەزراین. بەیانی ڕۆژبووەوە، هەموو کۆبووینەوە و بە چیاکەی پشت ئاواییدا هەڵگەڕاین. هەرچەندە گوندەکە لە تەختایدابوو، بەرەکەی ڕووەو (قەڵادزێ) بوو، لە دەشتاییەکی فراوان پێکهاتبوو. بەڵام پاڵی بە (3) چیای زۆر بەرزەوە دابوو، هەر سێ چیاکەش، لە یەکدییەوە نزیکبوون. یەکێکیان لە نێوەڕاست و دووانەکەی دیکەشیان، بەرانبەر یەکدی بوون. ئێمەش لە نێوەندی سێگۆشەی هەر سێ چیاکەدا، لەسەر کانیی و ئاوێکی زۆر ڕوون و خۆش، بارەکەی سەرەکیمان دامەزراند.

بۆ ڕۆژی دوایی (16. 5)، ڕەوانشاد (شێخ مستەفای شێخ ئیسماعیل، حەمەسابیر و ئازادی عەبدوڵلاڤەندی) هاتن، هەرسێکیان لە زانکۆ مامۆستابوون، جگە لە ئەوە، دوکتۆر (حەمەسابیر) ئەندامی لیژنەی ناوچەی (سولەیمانی)ش بوو. کۆبوونەوە دەسپێکرد، هۆردووگەیەکی خوێندکارانمان، لەسەر شێوەی ڕێکخستنی پێشمەرگە دامەزراند. هەموو خوێندکارەکان، بەسەر (3) پەلدا دابەشکران. هەر خوێندکاری بەئارەزووی خۆی، لەگەڵ کۆمەڵێ خوێندکاری دیکەدا ڕێکەکەوتن و پەلێکیان هەڵدەبژارد. هەر پەلێکیش بنکەی خۆی، لە یەکێ لە ئەو سێ لووتکە چیایە دادەنا. منیش یەکێ لە ئەو سێ سەرپەلانە بووم. زۆربەی ئەو خوێندکارانەی لە ئەم پەلەدا بوون، خەڵکی پارێزگەی (کەرکووک) و دەورووبەری بوون، لە کۆلێژی (ئاداب)ی هەردوو زانکۆی (سولەیمانی) و (بەغدا) دەیانخوێند. (ئازادی عەبدوڵلا فەندی)ش، لێپرسراوی هۆردووگەکە بوو.

هەموو خوێندکارەکان، سەرووی دووپەتۆیان وەرگرت، یەکێکیان دادەخست و ئەوی دیکەشیان بە خۆیاندا دەدا. جانتاکانیشیان لەبری سەرین دادەنا. هەرچەندە کاتەکەی مانگی (5) بوو، لە ئەو مانگەدا، (کوردستان) هەوای خۆشدەبێ، سەرما نامێنێ و بەدەگمەنیش نەبێ، باران ناباری. بەڵام هەرکەسێ لە ئەو چیا بەرزانە، پێخەفی تەواوی پێ نەبێ، هەر سەرمای دەبێ. شەو درەنگانێ کەمێ سارددیەکرد و خوێندکارەکان، لەتاو سەرما خەبەریاندەبووەوە. هێندێ جاریش لەنیوەشەودا، بارانێکی کەم دەباری، نمەنمیدەکرد و تەڕیدەکردین.

دوو چێشتکەریشیان لە گوندەکە بەکرێگرتبوو، ڕۆژانە سێژەمە خواردنیان بۆ ئامادەدەکردین. هەر پەلێکیش لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا دەهات، خوێندکارەکان ژەمەخواردنی خۆیان وەردەگرت و نانیاندەخوارد. پاشان قاپەکانیان دەشت و ئینجا پەلێکی دیکە دەهات.

زۆربەی خوێندکارەکان، سەریان پاکپاک تاشیبوو. گەرماوێکیشمان بە لقەدار و گەڵا دروستکردبوو، ئاومان گەرمدەکرد، خۆمان و جلەکانمان پێ دەشت. لەنێوگوندەکەش،

دووکانێکی چکۆلانەی لێبوو، جگەرە و هێندێ شتی پێویستی ڕۆژانەی دیکەی دەفرۆشت. خوێندکارەکان بەڕۆژ، لەنێو ئەو باخ و درەختانەدا دەسووڕانەوە، خۆیان خەریکدەکرد و کاتیان دەکوشت. چونکە نەیاندەزانی، چی بکەن و هیچ جۆرە کەرەسەیەکی ڕۆشنبیریشمان، لا چنگ نەدەکەوت، تا خۆیان بە خوێندنەوەوە سەرقاڵکەن. کەسێکیش نەبوو، کۆڕێکی ڕووناکبیری یا ڕامیاریمان بۆ بگرێ، کەمێ چالاکی لە هۆردووگەکەدا بنوێنێ. منیش دوای ئەو ڕووداوانەی نێوخۆی (کاژیک)، وازم لە ئەوە هێنابوو، قسە بۆ خوێندکارەکان بکەم و بۆ (کاژیک) گەلاڵەیان بکەم. چونکە پێم وابوو، هەموو شتێ کۆتاییهاتووە. هەرچەندە بە هیچ شێوەیە، باوەڕم بە (پارتی) نەمابوو، بەڵام بڕیارمدابوو، وەک پێشمەرگەیەک لەژێر فەرماندەی سەرۆک (بارزانی) و لە شۆڕشی (کوردستان)دا بەشداربیکەم.

لە هۆردووگەکەماندا، جۆرە دیسیپلین و ڕێزێ هەبوو. بێپرسی سەرپەل و لێپرسراوی هۆردووگە، کەس بۆی نەبوو، بە هیچ لایەکدا بڕوا، بە کارێکی تایبەتی نەبووایە. ڕێی خوێندکارەکانمان نەدەدا، بۆ نێوگوندەکە دابەزن، تا هیچ جۆرە گرفتێ درووست نەبێ. چونکە گوندەکە پڕبوو لە ئافرەت و پیاوی کەم تێدامابوو. ئێوارانیش دوای نانخواردن، هەموو خوێندکارەکان، زوو لە شوێنی خۆیان کۆدەبوونەوە و تا درەنگ، دەمەتەقێدەکرا، یا بە گۆرانی و شمشاڵێدان، یا بە نوکتە و قسەی خۆش، شەوەکەمان بەسەردەبرد. ڕۆژ بە ڕۆژ، خوێندکاری نوێمان بۆ دەهات و ژمارەی بەشداراتی هۆردووگەکە زیادیدەکرد. بەڵام لە ئەو هۆردووگە گەورەیەدا، تەنیا یەک کلاشینکۆفمان هەبوو، ئەویش هی (ئازاد عەبدوڵڵا) بوو. گەر سەربازەکانی سوپای (عێراق) بە پەرەشووت دابەزیبانایە، هەموومانیان بەدەس دەگرت!

هەرچەندە جێگەکەمان زۆر خۆشبوو، هەواکەی گەلێ سازگاربوو، میوەیەکی زۆری هەبوو، ئەو چیا و دەشتانە، دیمەنێکی دڵفڕێنیان هەبوو، لەسەر چیاکانەوە، (قەڵادزێ)مان لێ دیاربوو. لەگەڵ ئەوەشدا، خوێندکارەکان بەتەواوی وەڕسبووبوون و نەیاندەزانی، چی بکەن. بۆیە پێشنیازمکرد، لەگەڵ خوێندکارانی پەلەکەی خۆماندا، گەشتێ بە ئەو چیایانەی دەوروبەرماندا بکەین و سەرێ لە ئەو گوندانەی سەرسنووریش بدەین.

## گەشتێکی ناوازە

ئەوەبوو، ڕۆژی (20 5) دوای نانخواردنی بەیانی، هەموومان کۆبووینەوە، بەرەو چیا سەخت و سەرکەشەکەی (قەندیل) ڕۆیشتین. بە چیاکەدا هەڵگەڕاین و تا سەرلووتکە بەرزەکەی چووین. لە ئەوێ چاڵەبەفرێکی زۆرمان بینی و خوێندکارەکان بەفرێکی

زۆریان خوارد. زۆر لە ئەو ئاوە سووڕاینەوە و دوایش هەرچی چۆنی بوو، لە گوندی (گورەشێر) گیرساینەوە، دامەزراین و نانمانخوارد. پاشان دەمەوئێوارەیەکی درەنگ گەڕاینەوە. هەرچەندە کەمێ ماندووبووین، بەڵام لە ڕاستیدا، گەشتێکی زۆر خۆش و خەمرەوێن بوو، خوێندکارەکانیش زۆریان پێ باشبوو.

## هەڵشۆ

ماوەی دوو هەفتەی دیکە، لەنێو ئەو چیا و درەختانەدا، بە ئەو شێوەیە ڕامانکێشا و هەرچی چۆنێ بوو، گوزەرانمانکرد. بەڵام تا دەهات، خوێندکارەکان پتر نائومێددەبوون، وا هەستیان دەکرد، سەرکردایەتی شۆڕش پشکوێیانخستوون.
کۆبوونەوەیەکی گشتیمان کرد و داوایانکرد، بەزووترین کات، چارەسەرێکی بنەڕەتی، بۆ ئەو گرفتانە بدۆزینەوە. بۆ ئەو مەبەستەش، من و (ڕەشید) ناوێکی خەڵکی (هەولێر)یان هەڵبژارد و بڕیاردرا، لە نزیکترین هەلدا، وەک نوێنەری هۆردووگەکە، سەردانێکی مامۆستاکانی زانکۆ بکەین و گرفتەکانیان بۆ باسکەین، تا بە هەموو لایەکمان، چارەسەری بدۆزینەوە.
بەیانییەکی زووی ڕۆژی (**23. 5**)، من و (ڕەشید) بەڕێکەوتین. ماوەی دوو کاژێر، بەنێو ئەو دۆڵ و شیو، قەراغ ئاو و ڕێ بەردەلانییەدا ڕۆیشتین. هێندە چڕبوو، هەتاو لێی نەدەدایێ! ئەمبەر و ئەوبەری چەمەکە، بە دار و دەوەنی سەوز، گوڵ و گیای هەمەچەشنە ڕازابووەوە، بەهەشتێ بوو، مرۆ لە سەیرکردنی ئەو دیمەنە جوانانە، تێر نەدەبوو. مەل و باڵندەیەکی زۆریش، لەسەردرەختەکان هێلانەیان دروستکردبوو، لە هەموو لایەکەوە جریوەیاندەهات و بە ئەو دەنگە خۆشەیان، چەمەکەیان پڕکردبوو. لقی دارەبەردارە گەورەکانی سێو، قەیسی و هەڵوژە هێندەیان گرتبوو، لەتاواندا شۆڕبووبوونەوە. بە هاوڕێکەم گوت: خوالێخۆشبوو (حەسەن زیرەک) ناهەقی نەبووە، یارە جوانەکەی بە (هەڵشۆ) چواندووە. گوتی: چۆن؟ گوتم: ئەی نالێ: (جەمیلە) هێند جوانی دەڵێی (هەڵشۆ)ی، (جەمیلە) وەک قەندی کلۆکلۆی. گوتی: بە خوا ڕاستدەکەی.
لەنێو ئەو باخە چڕوپڕەدا، جارجارێ لە ئەمبەر و ئەوبەری ئاوەکەوە، تووشی تاکەماڵێ دەبووین. داپیرەیەک لەگەڵ منداڵەکانیدا، خەریکی نێشکردن بوون. سڵاومان لێ دەکردن و ئەوانیش، بەپێی دابونەریتی ڕەسەنی جوان و مەردانەی کوردەواری، فەرموویان لێ دەکردین. ئێمەش کەمێ پشوویەکماندەدا و سەرو پیاڵە چامان دەخواردەوە. پاشان بەگەڕ دەکەوتینەوە.

هەر لە قەراغ چەمەکە، گۆڕێکی گەورەمان بینی، تازە هەڵبەسرابوو، منیش حەزمکرد، بزانم، ئەم خواپێداوە کێیە، وا بەتەنیا لە ئەم بەهەشتەی چەمی (هەڵشۆ)دا نێژراوە و ئەم جێ خۆشەی، بۆ خۆی داگیرکردووە؟ چوومە پێشەوە و نووسینی سەرکێلەکەم خوێندەوە، بەداخەوە (ئەمیری ڕەووفی سەیدەلی) بوو، کە لە کاتی بۆردوومانەکەی شارۆچکەی (قەلادزێ)دا، بەرەو (هەڵشۆ) ڕایکردبوو، نەخۆشی شەکرەی هەبوو، دەرمانیشی لێ بڕابوو، هەر لە ئەو شوێنەدا، گیانی پاکی بە دایکی نیشتمان سپاردبوو. ئیدی نازانم، کێ ناشتبووی و گۆڕەکەشی بۆ هەڵبەستبوو. هەردووکمان لە هەردووسەر، (فاتیحە)مان بۆ گیانی خاوێنی خوێند. بەڕاستی ئەو مردنەی (ئەمیر)، زۆر کاریتێکردم، هەر لێکمدەدایەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئاخۆ دەبێ، لە ئەم شوێنە چۆڵەدا، بێ دایک و باوک، بێ کەسوکار و هاوڕێکانی، دوور لە پزیشک و نەخۆشخانە، چۆن بەدەم ئازار و ژانەوە، گیانی دەرچووبێ؟! ئاخۆ بە ئەو گەنجی و جوانییە، چ ئاوات و خۆزگەیەکی، لەگەڵ خۆیدا گۆڕکردبێ، لەژێر ئەو گڵە و لەنێو ئەو گۆڕە تەنگوتارەدا حەشاردابێ؟! ئاخۆ فریای ئەوە کەوتبێ، ڕاسپاردەیە بە کەسێ بڵێ؟!

دوای ماوەیە، گەیشتینە گوندی (هەڵشۆ). گوندەکە وەک هەڵۆیەکی گەورەی خاوەن دەسەڵات وابوو، بە ئەو شێوەیە، لەسەر دووندی ئەو چیا بەرزە، هێلانەیکردبوو! هەرچەندە تەماشای ئەو ناوەم دەکرد و لە ئەو چیا بەرزانەی دەورووبەری (هەڵشۆ)م دەڕوانی، بڕوام نەدەکرد، دانیشتووانی ئەم ناوە، هەرگیز تووشی نەخۆشی بێن!

زۆربەی مامۆستاکانی زانکۆ، لە ئەم شوێنە دڵڕفێنەدا هەواریان هەڵدابوو، لە چەن خانوویەکی قوڕیندا دەژیان. چاوم بە دوکتۆرە بەڕێزەکان (حوسێن بارزانی، جەلال شەفیق، نووری باڵدار، عەلی عەسکەری، دارا ئەدیب، فەرهاد ئەحمەد ئەمین ...) کەوت. هەموومان ئەو یەکدی بینین و پێکەیشتنەمان، زۆر پێخۆشبوو.

من باسەکەم لەگەڵ هەردوو دوکتۆر (حوسێن) و (دارا)دا کردەوە، چونکە هەردووکیان، لە ڕێکخراوی (پارتی) زانکۆدا کاریاندەکرد. بارودۆخی هۆردووگە و ڕەوشی خوێندکارەکانم بۆ ڕوونکردنەوە، بەڵام ئەوان لە چاوەڕێیەکەن و پەلەمەکەن پتر، هیچ پێشنیاز و چارەسەرێکی دیکەیان پێ نەبوو. من دەمویست، بە کورتی پێیان بگوتینایە، ئێمەش وەک ئێوە، ئاگامان لە هیچ نییە و چاوەڕێی بڕیاری سەرکردایەتی دەکەین. بەڵام بەداخەوە، کورد هێشتا فێری ئەوە نەبووە، ڕاستی بڵێ و درۆ لەگەڵ یەکدی نەکەن! بۆیە زۆر بەڕاشکاوی گوتم: گەر لە ماوەی یەک هەفتەدا، یەکێ لە ئەم داواکارییانەمان بۆ جێبەجێ نەکەن، هۆردووگەکە هەڵدەوەشێتەوە و هەر خوێندکاری، بەلایەکدا دەڕوا.

* چەكمان بدەنێ و خوێندكارەكان بە ئارەزووی خۆیان، هێزی هەڵبژێرن و لە ئەوێ ببن بە پێشمەرگە.
* خولێكی زۆری بێتەل، تۆپ، جفرە، برینپێچی، مامۆستایی و كادیریی كراوەتەوە، بەڵكوو بەپێی ئارەزوو، لێهاتوویی و توانا، بۆ ئەو خولانەمان بنێرن.
* گەر ئەمانەشمان بۆ ناكەن، نابێ، بەجێمانبێڵن و دەبێ، هەردوولامان پێكەوەبین، تا سەركردایەتی ناچاردەبێ، لایەكمان لێ بكاتەوە و چارەسەرێكمان بۆ دەدۆزێتەوە.

دوكتۆر (حوسێن) زۆر لەسەرخۆبوو. بەڵام دوكتۆر (عەلی عەسكەری) تورەبوو، چەن قسەیەكی هەڵەقومەڵەقی كرد، منیش زۆر بەتوندی وەڵامدایەوە و گوتم: من بەناوی خۆمەوە قسەناكەم و نوێنەری (**150**) خوێندكاری زانكۆم. ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین، تەنیا هەر گوێ لە بەڕێزتان بگرین، بەڵكوو بۆ ئەوە هاتووین، دەمەتەقێتان لەگەڵ بكەین و هاتنەكەشمان، ئەنجامێكی هەبێ. ئەگینا هەروا بەدەسی بەتاڵ بگەڕێینەوە، كەس گوێمان لێ ناگرێ. ئینجا كەمێ خاوبووەوە. دوكتۆر (حوسێن) گوتی: لە ماوەی یەك هەفتەدا، وەڵامتان لێ دەگێڕمەوە.

شوێنەكەیان هێندە خۆشبوو، هێزی ئەژنۆم نەبوو، ماڵاواییان لێ بكەم. بەڵام ئەو كادیرە ئەكادیمیكانەی لە (ئەورووپا)وە گەڕابوونەوە، چەندین ساڵ خوێندبوویان و لەنێو كۆمەڵێكی شارستانیدا ژیابوون، هێندەی كەرەجووتیارێكی لادێی نەخوێندەواریش، ڕێزیان لێ نەگرتین، داوایان لێ نەكردین، بمێنینەوە و پاروویە نانیان لەگەڵ بخۆین! تۆ بڵێی، كاتێ كورد لە نیشتمان و زێدەكەی خۆی دووردەكەوێتەوە، دابونەریتی جوان و پەسەندی میواندارێ باوباپیرانی خۆی، بیر خۆی بەرێتەوە و كاتێ گەڕانەوەش، هەر لەسەر دابونەریتی ئەو وڵاتانە لێخوڕێ؟!

ئیدی چوین و لە كوێوە هاتبووین، هەروا بەدەسی بەتاڵ، بە هەمان ڕێدا گەڕاینەوە. دەمەوئێوارە گەیشتینەوە، خێرا هەواڵەكانم پێ ڕاگەیاندن، دوای نانخواردنی بەیانی، كۆبوونەوەیەكی گشتیمان كرد. ئەوان چیان گوتبوو، من چیم وەڵامدابووەتەوە، هەموویم بەدرێژی بۆ باسكردن. ئیدی خوێندكارەكان زۆر بەگەرمی، دەستخۆشانەیان لێ كردین و گوتیان: ئێوە دەڵێن چی و ئێمە چی بكەین؟ گوتم: با ئەم هەفتەیەش چاوەڕێبكەین، گەر وەڵامیان نەدایەوە، ئەوا ئەو كاتە، جارێكی دیكە كۆدەبینەوە و بە هەمووومان، بڕیارێكی گونجاو دەدەین. هەموو بە ئەو پێشنیازە قایلبوون.

## سەباحی غالبی

ڕۆژی (**24 .5**) بوو، (سەباحی غالبی) پەیدابوو، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ، لە كوێوە هەڵقوڵی؟! جمجوولێكی سەیری، لەنێو هۆردووگەكە خست، بەتایبەتی پەلەكەی ئێمەی

بوژاندەوە و بە قسە خۆشەکانی خۆی، سی شەوی تاریکی ئەو چیاوچۆڵەی، بۆ رووناککردینەوە. چونکە زۆربەی زۆری خوێندکارەکان، هاوپۆل و هاوکۆلێژی خۆی بوون. (سەباح)یش لە هەر شوێنی بووبێ، بە گاڵتەوگەپ و قسە خۆشەکانی خۆی، هەر زوو جێی خۆی، لە دڵ و دەروونی خەڵکی ئەو شوێنەدا کردووەتەوە. جا گەربیانناسی، یا نەیانناسی، یا ئەوان بیناسن و نەیناسن، زۆر گرنگ نییە و گرفتی لەبەردەم ئاغای (سەباح)دا نائافرێنێ، خێرا بەزمی خۆی دادەمەزرێنێ و ئەو ناوە ئاوەداندەکاتەوە. هەر یەکەمین رۆژ سەری خۆی پاکپاک تاشی، ئێمەشی هاندا و زۆربەمان تاشیمان، چونکە وا خاوێنتربوو، جامانەشمان دەبەست. ماوەی دوو رۆژ لامان مایەوە، کاتێکی خۆشمان بەسەربرد و پاشان بەرەو (گەلالە) گەرایەوە!



**هیوایەکی نوێ**

هەمووی هەفتەیەکی نەبرد، نوێنەری لیژنەی ناوچەی (پارتی)، مامۆستا (حەمەسابیر) و یەکێکی دیکە، لە (قەلادزێ)وە هاتن. سەرەتا هێندێ قسەیان بۆ کردین، دوایش بەڵێنیاندا، تا (**30. 5**) هەموو داواکارییەکانمان جێبەجێکەن.

گوتیان: برادەران چوون بۆ سەرەوە، چەک بێنن و پاشان بڕیاری تەواوەتی دراوە، بەسەر هێزەکانی پێشمەرگە و خولە جیاوازەکانی ڕاهێناندا دابەشتانکەن. چونکە سەرکردایەتی شۆڕش ناتوانی، لە ئەم رەوشەی ئێستەی (کوردستان)دا، زانکۆ بکاتەوە، گەر بیشیکەنەوە، ئەوا نابێ، لە (کوردستان) بێ، بەڵکوو هەوڵدەدەن، لە دیوی (ئێران) بێ. ئیدی ئێمەش، هەرچەندە بڕوامان بە کەس نەمابوو، بەڵام لە ناچاریدا، هەر چاوەڕوانیمان بۆ مایەوە!

## دوارۆژەکانی هۆردووگە

رۆژی (5. 6)، هێندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی (ی. ق. ک.) و برادەران (سالار عەزیز) و خوالێخۆشبوو (شێخ مستەفای شێخ ئیسماعیل) گەڕانەوە، چەکێکی زۆریان هێنابوو، بەسەرماندا دابەشیانکرد. گوایە بارەگەی (بارزانی)، دیاری بۆ خوێندکارانی زانکۆ ناردووە. هەمووی برنەوی کوڵی سەرتوپ بوو. هێندە کورتبوو، لە شانماندەکرد، رەنگوڕووی نەبوو. چونکە کوری وا بەخۆ و یەکیەکی تێدابوو، کە لە شانیاندەکرد، دەتگوت، دەمانچەیان لە خۆیان داوە! لەبەرئەوە هەموو خوێندکارەکان نارازی بوون. بەڵام ئەوەی هەبوو، نوێبوون و لە گریسدا بوون. یەکی (100) فیشەکیشیان داینێ. گەر دەسمان ڕاستبووایە، بەشی نیشانەشکاندنی نەکردا ئیدی هیچ گرنگ نەبوو، چونکە هەرچی چۆنێ بێ، ئێمە دەمانویست، چەک وەرگرین و بۆ شوێنێکی دیکەمان بنێرن، تا لەدەس ئەو گومان و پشگوێخستنە رزگارمانبێ!

پاشان کرفتی دابەشکردنی خوێندکاران دەسپێکرد. هەرچی ئەندامەکانی خۆیان بوو، ناوی هەموویان نووسین و بۆ خولی لاسلکی، جفرە، توپ و برێنپێچی ... دایانتان. بە ئێمەشیان گوت: بۆ چ هێزی دەتانەوێ، وەک پێشمەرگە دەتاننێرین. من و (ئەحمەدی عارفی فیتک)، هێزی (خەبات)مان هەڵبژارد. ئیدی بە ئەو شێوەیە، هەر بۆ بەیانی، هەر خوێندکاربوو، ماڵاوایی لە یەکدی دەکرد، بەرەو شوێن و هێزی دیاریکراو دەڕۆیشت، هۆردووگەکەش کۆتاییهات!

## دواماڵاوایی لە قەڵادزێ

ئێوارەی رۆژی (6. 6)، لەگەڵ برادەراندا بۆ  (قەڵادزێ) گەڕاینەوە. پاک خۆمان شت و یەکسەر، خۆمان گەیاندە کەبابەکەی وەستا (عەلی). پاشان کەمێ بەنێو شارۆچکەکەدا گەڕاین، بەڵام هێشتا بەتەواوی، ئاوەدان نەبووبووەوە، خەڵک هەر دەترسان و لە ئەو گوندانەی دەوروبەر دەیانگوزەران.

ئەوەبوو، دوو رۆژ لە ئەو ناوە سووڕاینەوە، فیشەکلەغ و هێندێ شتی پێویستمان کڕی. پاشان ناچاربووین، چاوەڕێی کاروانی (شاربازێر) بکەین، تا لەگەڵیان بڕۆین. من و (ئەحمەد) و (ئەنوەری مەلاحوسێن)، یەستریکمان بەکرێگرت و جانتاکانمان لێ بارکرد. دیسانەوە بەرەو (شاربازێر)، بەڕێ بەڕێکەوتینەوە، بە هەمان ڕێی دووروودرێژدا گەڕاینەوە. خوداپیاوانیش بە (ئێران)دا، بە جادەی قیر و بە ترومبێل، بە ئەملا و ئەولادا ڕەوانەکران. هەڵبەتە لە هەموو شوێنێ، جیاوازی و خاتروخۆتر هەر هەیە!

## جارێکی دیکە دۆڵبێشک

ڕۆژی (8. 6)، بێ هیچ گرفتێ گەیشتینەوە گوندی (دۆڵبێشک). هەرسێکمان چووینە ماڵی ئەنکم. ئەو ناوە زۆر خۆشبوو، لەبن دارتوویەکی گەورەدا، جێیان بۆ ڕاخستین و حەساینەوە.

ئێوارە خوالێخۆشبوو شێخ (بابەعەلی) هات بۆ لامان و زۆر ڕێزی گرتین. ڕۆژی دوایی لای ئەو میوان بووین. لەپڕ فڕۆکەکانی (بەعس)، بە گرمەگرم هاتن، هێندێ بۆمبیان لە دوور ئاوایی هەڵدا، ماوەیە بە ئاسماندا گەڕان و پاشان ونبوون. منداڵەوردکەی گوندیش لە ترساندا، هاواریان لێ هەستابوو، دەگریان. (شێخ)یش لەبن دارێکدا، خۆی ماتدابوو، هاواریدەکرد: مەترسن، هیچ نییە، باڵندەیە بە حەواوە! (ئەنوەر)یش سەری هێنابووە لای منەوە و گوتی: خۆی لە ترساندا، خەریکە زراوی دەچێ، بە منداڵەکانیش دەڵێ: هیچ نییە، باڵندەیە! من و (ئەحمەد)یش، لەبەر پێکەنین خۆمان بۆ نەدەگیرا!

دوایی شێخ (بابەعەلی)، بۆی باسکردین و گوتی: هەموو ڕۆژێ ئەم فڕۆکانە، ئەم بەزمەمان پێ دەکەن. هەواڵی (شێخ مەنسوور) و ئەوانم پرسی. گوتی: لە (هۆمەراخ) ئەماون، لە (دووچەمان) کەپریان دروستکردووە و جاری وا لە ئەوێن. (2) ڕۆژ لە (دۆڵبێشک) ماینەوە. ڕۆژی (10. 6) بەیانی زووبوو، ماڵاواییمان لە ماڵی خاڵوان و ئەنە (پیرۆز) و خەڵکی ئاوایی کرد.

## دووچەمـــان

هەمووی نیوکاژێری نەبرد، (شێخ مەنسوور) و ئەوانم دۆزییەوە. بەڕاستی زۆرم بیرەکردن، حەزمدەکرد، پێش ئەوەی بەرەو (پێنجوێن) بڕۆین، چاوم پێیان بکەوێ و بزانم، نیازی چییان هەیە و لە کوێ دەگیرسێنەوە؟!

لە چەمەکە پەڕینەوە، لە دوورەوە بینیمن، کەپرێکیان لەسەر گردێ دروستکردبوو، دۆشەکیان بە چواردەوردا ڕاخستبوو، هەر لە دیوەخانی هاوینە دەچوو، بۆخۆیان دانیشتبوون، گوێیان لە ڕادیۆ دەگرت. شوێنەکەیان ناخۆش نەبوو، کەپرەکەشیان کراوەبوو، لە هەرچوارلاوە با دەیگرتەوە و بەردەمیشیان، چەمەکەی (قەلاچوالان) بوو. هەر لە دوورەوە دەرکەوتین، (شێخ مەنسوور) گوتی: ئەوە هێشتا نەکوژراوی؟! گوتم: کاتێ لێتان جیابوومەوە، پەیمانمدانێ، بەساغی بگەڕێمەوە، چۆن بەڵێنی خۆم دەشکێنم!

هەردوو شێخی برای (ناسر) و (بێستوون)یش لە ئەوێ بوون. ئیدی یەکدیمان ماچکرد و دانیشتین. گوتم: قاپە عەرەقەکان ماون؟ گوتی: هەر دوای تۆ، زەڕەمان لێ هەستان و تەواومانکرد. بۆ دەخوێنەوە؟! گوتم: ئەم شۆڕشە هێندە دووروودرێژە، هێندە گرفتی هەیە، منیشیان فێرکردەوە و گەر نەخۆمەوە، دڵم دەتەقێ. گوتی: ئێستە تێگەیشتی، شۆڕش چییە؟! گوتم: زۆر باش تێگەیشتم. بەڵام چارمان چییە؟!

دوای ماوەیە، خوالێخۆشبوو (عەلی حاجی سەعەرەش) و (سمەی بلەسوور)ی هاوڕێم هاتن، ئیدی زۆرم پێ خۆشبوو، کوڕانی گەرمکم بینییەوە. ئەو شەوە لە ئەوێ ماینەوە و هێندێ قسەمانکرد. من داوام لێ کردن، لەگەڵ ئێمە بێن بۆ (پێنجوێن) و وەک برا پێکەوە بژین. گوتیان: جارێ لە ئەم ناوە دەبین، پاشان دێین. بۆ بەیانی دەمەوئێوارە، بەرەو چاخانەکەی (کونەماسی) ڕۆیشتین. لە ئەوێ سواری ترومبێل بووین و چووین بۆ (چوارتا)، چونکە ئەو کاتە لەبەر فڕۆکە، تراکتۆر و ترومبێل، تەنیا هەر بە شەو هاتوچۆیاندەکرد. بەڕۆژ کەس نەیدەوێرا، بەڕێدا بڕوا!!

## جارێکی دیکە چوارتا

تاریکیکردبوو، ئێوارەی ڕۆژی (**11. 6**)، سواری پیکابێ بووین و لەنێو بازاڕەکەی (چوارتا) دابەزین. یەکسەر تووشی (سلێمانی قەساب) بووین. ئەو کاتە لە هێزی (خەبات)، لێپرسراوی سەربازی لقی بوو. زۆر ڕێزی گرتین و خانوویەکی گەورەی هەبوو، شەو لای ئەو ماینەوە.
لە شیرین خەودا بووین، دیسانەوە بەیانی زوو، دەنگی فڕۆکەکان خەبەریانکردینەوە. ئیدی بەپەلە هەستاین و بەرەو گردە بەرزەکەی نێو (چوارتا) ڕۆیشتین. کوڕە ئازاکانی (سولەیمانی)، ڕەوانیان شادبێ (عەبباسی مچەی ڕەعنا، ئەنوەری عەلی نەجار، سەلاحی قالەی حەمامچی و عەبباسی تەنەکەچی)، لە ئەوێ بوون. ماوەیەکی زۆر پێکەوەبووین، جگەرخانەیەکی باشی لێبوو، تێرمانخوارد و تا ئێوارە، لە ئەو ناوەبووین. ئێوارەش (سلێمان) سواری جیبێکی کردین و بەرێ ناخۆشەکەی (تالێر)دا، بەرەو (پێنجوێن) بەڕێکەوتین.

## جەنگی دەروونیی و شەڕەورە

لە (چوارتا) بیستمان، سوپای داگیرکەری (عێراق) دەیەوێ، هێرش بۆ سەر چیای (ئەزمڕ) بکا و نێوچەی (شاربازێڕ) داگیرکا، چونکە تا ئەو کاتە، لە هەموو مێژووی دەوڵەتی (عێراق)دا نەیانتوانیبوو، ئەو نێوچەیە داگیرکەن. لەبەرئەوە هێزێکی زۆری پێشمەرگە، بەدرێژای هەردوو ڕیزە چیای (ئەزمڕ) و (گوێژە) بڵاوبووبوونەوە.
(چوارتا)ش لە ترسی فڕۆکە جەنگییەکانی (بەعس)، وەک هەموو شوێنەکانی دیکەی، نێوچە جیاجیاکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش چۆڵبووبوو. زۆربەی زۆری دووکانەکان داخرابوون. تەنیا بە شەو هێندێکیان دەکرانەوە. خەڵکەکە ئامەقیان نەبوو، بترسن، چونکە کەس لەگەڵ هێزی ئاسمانیدا، هیچی پێ نەدەکرا. بۆردوومانی هەردوو

شارۆچکەی (قەڵادزێ) و (هەڵەبجە)شیان بیستبوو، چی بەسەر ئەو دوو شارۆچکەیە هاتبوو! ئاخر پێشمەرگە ئازا و نەبەردەکانی کورد دەیانتوانی، هێزەکانی دوژمن ڕاوتێن و هێرشەکانیان تێکبشکێنن، تەنانەت سڵیان لە تانک و تۆپەقورسەکانیشیان نەدەکردەوە، بەڵام جگە لە چەن نێوچەیەکی تەسک و دیاریکراوی ڕزگارکراو، شۆڕش چەکی دژەئاسمانی لە هەموو (کوردستان)دا نەبوو. ئاخر هێزی پێشمەرگە بەتفەنگی ڕووتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو فڕۆکە جەنگیانەدا، چییان پێدەکرێ، بەتایبەتی بۆمبی ناپاڵم و فۆسفۆری دەباران؟!

گریمان کورد توانیشی، سەرزەمینی چەن نێوچەیەک ڕزگارکا، ئەدی ئاسمانەکەی چۆن پێ ڕزگاردەکرێ؟! گەرچی هێندێ جار فڕۆکەکان، بۆمبارانیان نەدەکرد، بەڵام هەموو ڕۆژێ فڕۆکە، بە ئاسمانی (کوردستان)دا، هەر فرکەیدەهات!

دیارە (بەعس) وەک پارتێکی بەهێز و دەوڵەتێکی بەتوانا، بە سەدان شارەزای جەنگ، ڕاوێژکاری سەربازی و پسپۆڕی دەروونیان هەبوو، بەپێی بەرنامەیەکی ڕێکوپێک و زانستانەی نەخشەبۆکێشراو، فڕۆکەکانیان هەڵدەستان، پتر بۆئەوەی ورەی جەماوەری گەلەکەمان بڕوخێنن، سەر هیچ شتێکیان نەپەرژێ، توانای کارکردن و نانپەیداکردنیان نەمێنێ، خەو و خۆراکیان لێ گلاوکەن، هێز و وزە و توانایان لێ ببڕن، فریای هیچ جۆرە شتێ نەکەون، وایان لێ بکەن، لە ژیانی خۆیان بێزارین، شۆڕش و گەلەکەشیان لەبەرچاوکەوێ، تا وایان لێدێ، شوێنەکانی خۆیان بەجێبێلن و هانا بۆ (بەعس) بەرنەوە، یا (کوردستان) چۆڵکەن و پەنا بۆ (ئێران) بەرن، تا بە هەر شێوەیەبێ، لە هێزی پێشمەرگەی (کوردستان)یان دابڕن. گوندێ نەبێ، پشوویەکی تێدابدەن و کەمێ بحەوێنەوە، کەسێ نەبێ، پارچەیە نان و کەوچکێ دۆیان بداتێ.

ئەز پێم وایە، ئەو هەموو جارە لە ڕۆژێکدا، ئەو هەموو فڕۆکەیە، لەنێوچە جیاجیاکانی نیشتمانەکەماندا هەڵدەستان، هەر گرمەیاندەهات و بۆمبیان بەرنەدەدایەوە، تەنیا وەک شێوەیە لە شێوەکانی جەنگی دەروونی و شەڕەورە وابوو، دژی ویست و ئارەزووی گەلەکەمان دەیانکرد!

* * *

## پێنجوێن

ڕۆژی (11. 6. 1974) بوو، کاژێری (4)ی سەرلەبەیانی، گەیشتینە شارۆچکەی (پێنجوێن)، شۆفێرەکە لە بارەگەی هێزی (خەبات)، لە هاوینەهەواری (چوارباخ) دایبەزاندین. کەرەڤانەیەکی گەورە وەستابوو، لە دەرگەمدا و دەرگەیان لێ کردینەوە، (جەمالی کاک حوسێن) و (حەمەعەلی هەڵەبجەیی) تێدا نووستبوون. واقیانوڕما و سەریانسووڕما، دیارە گوتوویانە، بە ئەم بەیانییە زووە، لە کوێوە پەیدابوون! ئیدی تێرتێر، یەکدیمان رامووسی و خۆشهاتنێکی گەرمیان لێ کردین. پاشان چووینەژوورەوە و کەمێ قسەمان کرد، بەڵام هێندە ماندووبووین، یەکسەر خەومان لێ کەوت.

کاژێری (9)ی سەرلەبەیانی بوو، برایان (عەلی توفیق، برایمی حەمەعەلی، سەروەت موحەممەد ئەمین، کەریم ڕۆژ و ڕەفیقی حەڵواچی) پەیدابوون و خەبەریانکردینەوە. هەمووومان پێکشادبووینەوە. ئای چەندم پێخۆشبوو، هەموو برادەر و هاوبیرە کۆنەکانی خۆمم، بە زیندوویی ببینییەوە و وەک گوڵ گەشامەوە. ئیدی هەر دۆست و ئاسیا بوو، دەهاتن و خۆشهاتنیان لێ دەکردین. هێندەم پێخۆشبوو، وامدەزانی، لەنێو کەسوکارەکانی خۆمدا دانیشتووم!

درەنگانێ فەرماندەی هێز ڕەوانشاد (فەتاح موحەممەد ئەمین) هات، کە بە (فەتاح ئاغا) ناسرابوو. (عەلی توفیق) ئێمەی پێ ناساند. ئەویش زۆر ڕێزی لێ گرتین و گوتی: جارێ لە ئەم ناوەبن و لای برادەرەکانتان دانیشن، تا کارێکتان بۆ دیاریدەکەم!

ئەو کاتە (عەلی توفیق)، لێپرساوی دارایی هێزبوو. (برایم) و (سەروەت)یش، یاریدەدەری بوون. چادرێکیان هەڵدابوو، لێیان نووسیبوو: بەشی دارایی. دوو مێز، چەن کورسییەک و قاسەیەکیشیان دانابوو. ئیدی بەشەکانی دیکەی هێز، هیچیان دیارنەبوون!

(ڕەفیقی حەڵواچی)، لە هێزی ئاسمانی لەسەر دۆشکە بوو. چادرەکەی کاک (فەتاح) و جێگرەکەی ڕەوانشاد (تایەری عەلی والی بەگ) جیابوو. لە سوچێکیشەوە، یەک دوو مەنجەڵی گەورە دانرابوون و چێشتیان تەنیا بۆ نیوەڕوان لێدەنا.

من وەک هێندێ برادەر، ئەوە یەکەمین جارم نەبوو، (پێنجوێن) و دەوروبەرەکەی ببینم. بەڵکوو جگە لە ئەوەی زێدی خۆم بوو، کونوقوژبنی ئەو باخانەش شارەزابووم. شوێنێکی تا بڵێی، خۆش و دڵگیربوو. ئاو و هەوایەکی زۆر سارد و سازگاری هەبوو. کوێستانێکی تەڕبوو. درەختەکان لە هەموو جۆرە میوەیەکی هاوینەیان دەگرت. بۆیە خەڵک لە خوارووی (عێراق)ەوە، بۆ گەشت و سەیران دەهاتن. وەک چەن جارێکیش، لە خەڵکی (پێنجوێن)م بیستووە، کاتی خۆی شا (فەیسەڵ) ویستبووی، هەردوو هاوینەهەواری (چوارباخ) و (بلکیان) بکڕێ، بەڵام خاوەنەکانیان پێیان نەفرۆشتبوو. خۆ گەر

دیکتاتۆریکی دڕندەی وەک (سەددام حوسێن) بووایە، نەک هەر پرسی پێ نەدەکردن و بەزۆر لێی دەکڕین، بەڵکوو بەزۆر داگیریدەکرد و خاوەنەکانیشی سەرەونگوومدەکرد!
ئیدی من و (ئەحمەد) و (ئەنوەر)، لە یەکدی جیابووینەوە، هەریەکێکمان لەگەڵ هاوڕێ سەرەکییەکانی خۆماندا یەکمانگرتەوە. ئێوارە لەگەڵ هاوڕێکانمدا، چووینەوە بۆ نێو (پێنجوێن). هەر سێ هاوڕێ (برایم، سەروەت و کەریم)، پێکەوە خانوویەکی دوو نهۆمیان، لە گەڕەکی (جوولەکان) بەکرێگرتبوو. خۆیان لەسەرەوە دەژیان و خوارەوەش چۆڵبوو. (سەروەت) فێربووبوو، چێشتی لێدەنا. ئەو شەوە درێژە، بەدەم باسی ڕوداو و کارەساتەکانی شۆڕشەوە، ڕۆژمانکردەوە.
(پێنجوێن)، هەر وەک خۆی وابوو. هێشتا دەسی داگیرکەر وێرانی نەکردبوو. بازاڕێکی جەنجاڵی هەبوو. هەموو شتێکی تێدا دەسدەکەوت. ئاو و کارەبا، تەنانەت تێلیفۆنیشی تێدابوو. زۆربەی زۆری خەڵکی (سولەیمانی) و ئەوانەی لە بەشە کارگێڕییەکانی شۆڕشدا کاریاندەکرد، لە (پێنجوێن) کۆبووبوونەوە. جگە لە بارەگەی لقەکانی (قوتابیان، لاوان، مامۆستایان و ئافرەتان)، هۆردووگەی قوتابییە هەڵاتووەکان، هەموو بارەگەی ناوچە و لقەکانی (پارتی) و (پاراستن)ی هەردوو پارێزگەی (سولەیمانی) و (کەرکووک)یش، هەر لە (پێنجوێن) بوون. گەرماوێکی باشیشی لێبوو، ناوی گەرماوی (پێنجوێن) بوو، ئەوە کۆنترین گەرماوبوو، لە سەردەمی بەگزادەکانی (هەڵەبجە)دا درووستکرابوو، ئێستەش هەر ماوە!



(پێنجوێن)، مانگی (7)ی ساڵی (1974) گیراوە

ماوەی دوو ڕۆژبوو، لە (پێنجوێن) بووم، خۆم پۆشتەکردەوە، سەرم لە ماڵی (عەلی عەبەوەنەوش) و پورە (ڕەحمە)ی دایکی دا. پورە (ڕەحمە) ئامۆزای باپیرم بوو، لە (پێنجوێن) شوویکردبوو، هەر لە ئەویش دەژیا. ئاسیاوە کۆنەکانی شارۆچکەکەشم بەسەرکردەوە. ئیدی بەتەواوی حەسامەوە.

زۆری پێ نەچوو، هەواڵی گەڕانەوەی (شێخ مەنسووری حەفید) و براکانیم پێگەیشت. بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆشبوو، بەڵام ئەوان هەر هێندە بوو، بڕوایان بە ئەو سەرکردایەتییە نەبوو، ئەگینا لە ماڵی خۆیان دانیشتبوون و لە هیچدا نەبوون!

باشبوو، هەر زوو (سەلاح)ی برامم دۆزییەوە. ئەو کاتە لە هاوینەهەواری (بلکیان)، لە هۆردووگەی قوتابیان بوو. پارەم دایە و ناردم بۆ (دۆلبیشک)، پەرتووکەکانم لە ماڵی ئەنکم بۆ بێنێ. لە ماوەی (3) ڕۆژدا گەڕایەوە و هەموو پەرتووکەکانی بۆ هێنام، ئیدی بوژامەوە. پەرتووکێکی زۆرمان لەبەردەستدابوو، دۆست و هاوبیرەکانم، وەریاندەگرت و دەیانخوێندەوە.

### دوادیداری خاڵەحاجی!

پێش ئەوەی ئێمە بگەینە (پێنجوێن)، مامۆستایان (حەمەسابیر) و (ئازادی عەبدوڵلا فەندی) و ئەوانی دیکەش، لە (قەڵادزێ)وە بەرێی (ئێران)دا هاتبوون. هەر لە (قەڵادزێ)وە لەگەڵ (حەمەسابیر)دا، دۆستایەتی نێوانمان خۆشبوو. لە (پێنجوێن) بینیم و گوتی: دایکی (حەمەڕەحیم) مردووە، حەزدەکەم، پێکەوە سەرێکی لێ بدەین، هەم سەرەخۆشی لێ بکەین و هەم با ئەو ساردییەی نێوانتان نەمێنێ. هەرچەندە حەزم نەدەکرد و گوتم: پێویست ناکا، تازە من پێشمەرگەم و هیچ شتێکیشم لەگەڵیدا نییە. گوتی: بە قسەمبکە، تۆ کوڕێکی کوردپەروەر و چالاکی، با هیچ شتێ لەنێوانتاندا نەمێنێ. منیش قسەکەیم نەشکاند.

ئێوارە لە ماڵەوە بوو، پێکەوە چووین بۆ لای. وەک هەموو کاتێکی دیکەی لە بارەگەی ناوچەی (سولەیمانی) بینیبووم، زۆر سەریقاڵبوو. ماڵەکەی لەبەر پێشمەرگە و خەڵک بەرنەدەکەوت. هەر بەچکەپاراستێ بوو، ئاو و چایان دەگێڕا. ماوەیە بێدەنگ دانیشتین، تا بەتەواوی چۆڵبوو. پاشان دوکتور (حەمەسابیر)، باسی ڕۆڵی منی بۆ کرد، چۆن لە بۆردوومانەکەی (قەڵادزێ)دا ماومەتەوە، لە هۆردووگەی قوتابیان، چ ڕۆڵێکم هەبووە و چۆن یارمەتیمداون. بە پێکەنینیشەوە گوتی: یا شێخ ئێستە گۆڕاوە و وەک جاران نەماوە!

منیش ئەو قسەیەم زۆر پێ ناخۆشبوو، بۆیە یەکسەر قسەکەیم قۆستەوە و گوتم: بۆ من جاران چی بووم؟! من ئێستەش هەر ئەو کوردەی جارانم و هیچ نەگۆڕاوم، بەڵام ئێوە بە هەڵە لە من تێگەیشتبوون!

ئیدی (خاڵەحاجی) بە ساردییەکەوە لێی پرسیم: ئێستە خەریکی چیت؟ من دەمزانی، کوێی دێشێ و عەودالی چییە، بۆیە ئەو پرسیارەم لێ دەکا. گوتم: لە کاک (حەمەسابیر) بپرسە. ئەوان لە (قەڵادزێ)وە، منیان بۆ هێزی (خەبات) ناردووە، بەڵام جارێ هیچ دیار نییە، چ کارێکم پێ دەسپێرن. ئیدی گوتی: هەر کارێکت هەبوو، بەسەرچاو ئامادەم، یارمەتیتبدەم. بەڵام تا ئەو ڕۆژەی شۆڕش تێکچوو و نەما، تەنیا یەک جار لە دوورەوە، لەسەر مەرزەکە بینیم. ئەگینا تا دوای ڕاپەڕینیش کوشتیان، نە لەنزیک و نە لە دووریشەوە نەمبینییەوە! چونکە لە ژیانمدا، ئەوە دواجاربوو، ببینم و قسەی لەگەڵ بکەم. پاشان ڕۆیشتین. (حەمەسابیر) گوتی: ماڵ بە قوڕ نەگیری، تۆ بۆ دەمی خۆت ناگری، نەدەبووایە، ئەو قسانەت بکردایە. منیش گوتم: ئاخر بۆئەوەی بزانێ، تەنیا بۆ پرسەی دایکی چووم، ئەگینا هیچ کارێکم پێی نییە و با واش تێ نەگا، مەرایی بۆ دەکەم!

## شێخ کاوە و پلانی پاراستن

هێندەی پێ نەچوو، تیپەکانی پێشمەرگەی (پاراستن)، دەستیکی باشیان لە بارەگەکەی (کاوە) وەشاند. هەرچی چەک و دیکۆمێنتێکی هەبوو، هەموویان لەگەڵ خۆیان هێنا. ئەو کارەش پلانی (خاڵەحاجی) بوو، ویستی، تۆڵە لە (کاوە) بکاتەوە، چونکە پێش ئەوەی شەرییتەوە، نێوانیان زۆر باشبوو، پێوەندی بە ئەوەوە هەبوو.

پلانەکەش وەک هاوڕێی خۆشەویستم ڕەوانشاد (یاسین حەسەن ـ یاسینەرەش)، مانگی **(11)** لە هۆردووگەی (سەولاوا) بۆی گێرامەوە، بە ئەم شێوەیە بوو. گوتی: کاتێ شەر دەسپێکردەوە، دەزگەی (پاراستن)، گومانیان لە (کاوە) هەبوو. لەبەرئەوە (پاراستن) بەنهێنی، منیان لە ڕیزی چەکدارەکانی (کاوە)دا چاند. (حەمەڕەحیم) بانگیکردم و پێی گوتم: خۆت لە (کاوە) نزیککەرەوە و چاودێرییکە، ئاگات لە هەموو کۆبوونەوە، پێوەندی و جووڵەیەکی بێ، ڕۆژبەڕۆژیش، لە هەموو شتێ ئاگادارمکەرەوە.

دوای ئەوەی هەردوو باڵەکەی جەلالی و مەلایی، ساڵی **(1970)** یەکیانگرتەوە، (یاسین) سەر بە جەلالییەکان بوو، لە جووتیاران دایانتا و منیش، هەر لە ئەوێ ناسیم. کوڕێکی زۆر زیرەک، بەتوانا و چاونەترس بوو. ئەو کارانەی لێ دەوەشایەوە. (کاوە)ش لەبەرئەوەی لە پیاوەکانی خۆی پتر، کەسی دیکەی خەڵکی شار و خوێندەواری لە دەور نەبوو، بڕوایەکی زۆری پێی هەبوو.

کاتێ (پاراستن)یش زانیان، چی دیکە لە ئەوە پتر نابێ، ئەو کارە دواخرێ، پۆلێ پێشمەرگەی (پاراستن)یان نارد و فەرمانیان بە (یاسین) کرد، بارەگەکەی تاڵانکا و بگەڕێتەوە. ئیدی بە ئەو شێوەیە، (خاڵەحاجی) دەستی خۆی وەشاند و تۆڵەی بەرودوای، لە (کاوە) کردەوە، چەکدارەکانیشی هەڵوەشاندەوە و نەمان!

## شەڕی ئەزمڕ

ڕۆژی (15. 6. 1974)، دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، سەرباز و جاشێکی زۆری کۆکردەوە، بە پشتیوانی تانک و تۆپە قورسەکانی، لە دوو قۆڵەوە، هێرشێکی گەورەی فراوانی بەربڵاویان کرد، پەلاماری هەردوو چیای (ئەزمڕ) و (گۆیژە)یان دا. لە ئاسمانیشەوە، فڕۆکەکانیان بە شێوەیەکی بەردەوام، بۆمبارانیاندەکرد. فەرماندەی هێزی خەبات (فەتاح ئاغا) لە (ئەزمڕ) و فەرماندەی بەتالیۆنی چوار ڕەوانشاد (نوری حەمەعەلی)ش لە گۆیژە، سەرپەرشتی بەرەی جەنگەکەیان دەکرد. پێشمەرگە قارەمانەکانی (کوردستان)، لە ئەو دوو چیا ڕووتە بەرزەدا، بەرگرییەکی مەردانەیان کرد، ماوەی دوو ڕۆژ جەنگان و زیانێکی زۆریان، بە هێزی دوژمنی داگیرکەر گەیاند. بەڵام بەداخەوە، لە ئەنجامدا سوپای داگیرکەر، ئەو دوو زنجیرە چیا بەرزەیان داگیرکرد و هێزەکانی پێشمەرگەش، پاشەکشەیانکرد. لە ئەو نەبەردییەدا، چەن پێشمەرگەیەک شەهید و بریندارکران. یەکێ لە ئەوانە (ئەنوەری حەمەی مجە) بوو.

(ئەنوەر)، لاوێکی ئازا و جوان بوو، ڕۆژی (18. 6. 1974)، لە چیای (گۆیژە) شەهیدکرا. هەر زووش (جەلال)ی برای، بە ئەو منالییە، چەکەکەی لە شانکرد و شوێنەکەی پڕکردەوە. (نوری حەمەعەلی)یش بریندار بوو، بەڵام برینەکەی سووکبوو. (جەزاکەلە) تفەنگێکی قەناسی گرتبوو، هەمیشە لە (پێنجوێن) بە شانییەوە بوو، پێشانی خەڵکی دەدا و شانازی پێوەدەکرد.

منیش تازە پێوەندیم بە کاک (نوری)یەوە کردبوو، بەپێویستم زانی، بەپەلە سەری لێ بدەم. ئەو کاتە لە نەخۆشخانەی (مەریوان) خستبوویان، (جەمال)ی برای و (تایەری عەبەپشی) بەدیارییەوە بوون.

## سنوورە دەسکردەکان

هەر ئەو ڕۆژە، یەکسەر سواربووم و چووم بۆ (بایاوە). ئەو گوندە لەسەر سنووری بەشەکەی خۆرهەڵات بوو. لە (بناوەسووتە)وە بەپێ، هەر چەن خولەکێ لە یەکدییەوە دووربوون و چەمێکی زۆر باریک، تەنک و چکۆلەیان نێوان بوو، بە ئەو چەمەش، دوو پارچەی (کوردستان)یان، لە یەکدی دابڕیبوو. هێڵی سنوورێکی دەسکردیان، لەنێوان هەردوو دەوڵەتە داگیرکەرەکەی نیشتمانەکەماندا کێشابوو!

هەرچەندە (بایاوە) لە خۆرهەڵات و (بناوەسووتە)ش، لە باشووری (کوردستان) بوون، هەردوو دەوڵەتی دوژمنی داگیرکەری (ئێران) و (عێراق)یش، ئەو بستۆکەیان بە سنووری خۆیان دەزانی. بەڵام ئەو سنوورە دەسکردە، لەنێو دڵ و دەروون و باوەڕی

دانیشتووانی ئەو دوو گوندەدا، هیچ بایەخێکی نەبوو، ڕیزیان لێ نەدەگرت، نە خاکەکە و نە خەڵکەکەشی، لە یەکدی جیانەکردبووەوە، بەڵکوو تەنیا دوو ڕژێمی داگیرکەری نیشتمانەکەیانی جیاکردبووەوە، کە هەردووکیان وەک یەک، دوو دەوڵەتی داگیرکەری (کوردستان) بوون.
بە فارسی بە سەر چەمەکەیان دەگوت: (مەرز) واتە سنوور. سەر مەرزەکە هەمیشە جمەیدەهات و خەڵکێکی زۆری لێ بوو. هەرماڵبوو، کەپریان دروستکردبوو، لە نێوان (عێراق) و (ئێران)دا دەژیان! هێندێ بەڕێوەبەرایەتی شۆڕشیش، هەر لە ئەو ناوە بوون. چاخانە و جگەرخانەیان لێ دانابوو. بەڕۆژ خەڵکی ئەو ناوە کۆدەبوونەوە، دۆمینەیان دەکرد و ڕۆژیان بەسەردەبرد.
هەر ئەو ڕۆژە لە ئەوێ، مامۆستا (حەسەن گەرمیانی)م بینی، تازە ڕایکردبوو، کەمێ پێکەوە بووین، باسی شۆڕشی کورد و (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)مان کرد. گوتی: من ئێستەش هەر کۆمۆنیستم، بەڵام دەزانم، پارتی کۆمۆنیست ئەم هەنگاوەی هەڵەیە، لەگەڵ (بەعس)دا دژی گەلەکەم دەجەنگن. بۆیە وازم لێ هێناون و لەگەڵ گەلی خۆم دام. ئیدی من زۆرم پێخۆشبوو، ئەو هەڵوێستە کوردانە و مەردانەیەی نواندووە. ماوەیە پێکەوە بووین، پاشان جیابووینەوە. من بەپێ سنووری دەسکردەکەی (ئێران)م بڕی و بەرەو (بایاوە) ڕۆیشتم. سواری پاس بووم و بەرەو (مەریوان) بەڕێکەوتم. ئەویش لە ئەو دیو سنووری دەسکردەکەی (عێراق) مایەوە!

## مەریـــوان

ڕەوانشاد (نووری حەمەعەلی)، برینەکەی سووکبوو، لە نەخۆشخانە دەرچووبوو، لە ئوتێل بوو. سەرم لێدا و کەمێ قسەمانکرد. پاشان لە یەکدی جیابووینەوە، ئەو لەگەڵ (جەمال)ی برای و (تایەری عەبەپشی)، بە (ئێران)دا چوون بۆ (تەوێڵە). ماوەیە مۆڵەتی وەرگرتبوو، سەردانی ماڵی باوکی بکا و کەمێ بحەوێتەوە. دوو ڕۆژ لە (مەریوان) لە ئوتێل مامەوە. ئەوە یەکەمین جاربوو لە ژیانمدا، شارۆچکەیەکی پارچەیەکی دیکەی نیشتمانە پارچەپارچەکراوە داگیراوەکەم ببینم!
(مەریوان)، شارۆچکەیەکی چکۆلانەی جوان بوو، لە سێڵاوە بە بەرزای و گردۆڵکە، زنجیرە چیای گەورە و گچکە دەورەدرابوو. نزیک زەریاچەی (زرێبار) بوو، هێندەی دیکە شارۆچکەکەی ڕازاندبووەوە. دووکان و بازاڕێکی خۆشی هەبوو. گوندەکانی دەوروبەری، سەوزە و میوەیەکی زۆریان هەبوو، هەموو پێداویستییەکانی ژیانیشی تێدابوو. ئافرەت و پیاو، ئازادییەکی تەواویان هەبوو. بەڵام لە ڕووی نەتەوەیی و چالاکی ڕامیارییەوە، هیچ مافێکیان نەبوو!

لە (مەریوان) کوردێکی زۆری هەڵاتووی خەڵکی پارێزگەی (سولەیمانی) لێ بوو، لەدەس ڕژێمی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) ڕایانکردبوو، لە ئەوێ دەژیان. هێندێکیان لە قوتابخانە کوردییەکانی شۆڕش و هێندێکی دیکەشیان، لە نەخۆشخانەکانی (ئێران) کاریاندەکرد. منداڵەکانیشیان لە قوتابخانەکاندا دەیانخوێند. بەشی زۆریشیان، هەر بێ کاربوون و دانیشتبوون. ڕۆژ تا ئێوارە، بە ئەو چادانەی شارەکەدا، حەتاڵ و بەتاڵ دەسووڕانەوە، لە چاخانەکان دانیشتبوون و دۆمینەیاندەکرد، دیژلەمەیان دەخواردەوە و شۆڕش بەخێوێدەکردن. بە ڕاستی، وەک سپلی لاورگ وابوون!

هەموو لێپرسراوەکانی شۆڕشیش، خانوویان گرتبوو، خێزانەکانیان لە ئەوێ دەژیان. بەیانیان زوو کاژێری نۆ، دەچوون بۆ کارکردن و ئێوارانیش بە ترومبێلە تایبەتەکانیان، بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە. ڕۆژانی پێنجشەمەش، هەر زوو دەسیان لە کار هەڵدەگرت و ڕۆژانی هەینیش، پشوویانبوو. شەوانیش مێزی خواردن و خواردنەوە دەڕازێنرایەوە، تا درەنگانی دەیانخواردەوە، باسی ئایندەی شۆڕش و کوردیان دەکرد!

**سەوڵاوا**

ماڵی خزمەکانم، پورە (مەلیح)، مامە (بەکر)، مامە (عومەر) و (حەسەن)ی برام لە (سەولاوا) بوون، بە گردێکی قەراغ جادەی گوندەکەوە، لەژێر چادردا دەژیان. بڕیارمدا، سەرێکیان لێ بدەم.

(سەولاوا)، گوندێکی چکۆلانە بوو، لە نێوان (مەریوان) و شاری (سنە)دا بوو. کەمێ دوور لە ئاوایییەکەوە، بە قەدپاڵی کێوێکی گەورەوە، ئۆردووگەیەکیان بۆ کوردە پەنابەرەکان کردبووەوە. هەر خێزانێ چادرێکیان دابوونێ، جا خێزانەکە گەورە یا کچکە بووایە، هیچ جیاوازی نەبوو.

ئۆردووگەکە گەورەبوو، زۆربەی خێزانەکان، لە ئافرەت و منداڵ و پیاوی پیر پێکهاتبوون. گەلێ خێزانی پێشمەرگەشی لێ بوو. ئاو و کارەبایان بۆ ڕاکێشابوون، ئاوەدسیان بۆ دروستکردبوون، چاخانەیەکیشیان لێ دانابوو. بەڕۆژ پیاوەکان، لە ئەوێ کۆدەبوونەوە و کاتیان بەسەردەبرد. هەموو جۆرە زەخیرەیەکیشیان دەدانێ. هەفتەی چەن جارێ، مەڕیان سەردەبڕی و بەپێی ژمارەی خێزانەکان، گۆشتیان بەسەردا دابەشدەکردن. بڕواناکەم، لە هیچیان کەمبووبێ. بەڵام ئایا مرۆڤ، کاتێ لە ماڵی خۆی هەڵکەنرا، ئاوی دڵی ئۆقرەدەگرێ و دەحەوێتەوە؟! سەرەڕای هەموو ناخۆشی و بێکارییەکیش، هێشتا ئۆردووگە، دەس هەموو کەس نەدەکەوت. ڕەوانشاد (شێخ عوسمانی باراوی) مێردی پورە (مەلیح)م، لەبری (سەولاوا)، ناوی نابوو (سواڵکەراوا).

کاتەکەی زۆر خۆشبوو، بەفر و باران نەبوو، هێشتا ساردی نەکردبوو. سێ ڕۆژ لەنێو خزماندا مامەوە، گەلێ خزم و ناسیاوی وەک (شێخ جەعفەری گولانی، جەمالی خەلفەفەرەجی کەبابچی، عەزۆلەی تەپڵیدەر، عارفەکوێر و مامۆستا دارای حاجی ڕەشید)ی گەرەکی خۆمان و هاوڕێی منداڵیم بینی. پاشان لەگەڵ مامە (بەکر)مدا، بۆ (پێنجوێن) گەڕاینەوە.

## پێنجوێن

(وریا براخاس)ی هاوڕێم، لە شەڕەکەی (ئەزمڕ) گەڕایەوە و پێکشادبووینەوە. هەر زوو بڕیارماندا، پێکەوە خانوویەک بگرین. نزیک ماڵی (برایمی حەمەعەلی) و هاوڕێکانی دیکەم، (عەلی عەبەوەنەوش)ی خزمم، لە شێوی (جوولەکان) بەرانبەر ماڵی خۆیان، خانوویەکی بۆ پەیداکردم. خانووەکە تەنیا ژوورە و هەیوانێکی چکۆلانە بوو، بەڵام زۆر پیسبووو، ماوەیەکی زۆر چۆڵبوو، تەویلەی ئەسپ بوو!
هەرچی چۆنێ بوو، خاوێنمانکردەوە، هێندێ کەلوپەلمان کڕی و بووین بە ماڵ. ئیدی ماڵی ئێمە و ماڵی (برایم) و هاوڕێکانی دیکەم، وەک بارەگەی (کاژیک)ی لێهاتبوو! زۆری پێ نەچوو، (شەمسە)ی خوشکی (وریا)ش، لە (سولەیمانی)ەوە ڕایکرد و هاتە لای ئێمە. هەرچەندە ماوەیەکی کەم ماینەوە، بەڵام لە خواردن پەکمان نەکەوت.
لە ئەو ماوەیەدا، چەن جاری دوو فڕۆکە، بەشەو و بەڕۆژ، بە ئاسمانی (پێنجوێن)دا دەسووڕانەوە و هەر گرمەیاندەهات. ترس و لەرزێکی زۆریان، لە دڵ و دەروونی دانیشتووانەکەیدا چاندبوو، چونکە هێشتا هەواڵەکانی بۆردومانی هەردوو شارۆچکەی (قەڵادزێ) و (هەڵەبجە)، هەر لە گوێیاندا دەزرینگایەوە! بەڵام پێشمەرگەکانی بارەگەی هێزی (خەبات) بەشی دژەئاسمانی و سەربازەکانی (ئێران)، لە هەردوو گوندی (بناوەسووتە) و (بایاوە)وە، هێندەیان فیشەک پێوەنان، نەک هەر نەیاندەتوانی، بۆردوومانیکەن، بەڵکوو نەشیاندەوێرا، نزمبنەوە، هەڵهاتن و لە کۆڵمانبوونەوە!

## ئازاد مستەفا و یەکەمین بینین

(موحەممەد مستەفا)، دوای ساڵی (**1980**) و لە شۆڕشی نوێماندا، بە (ئازاد مستەفا) ناسرا. ساڵی (**1971**)، بەهۆی کۆڕەکانی یەکێتی نووسەرانەوە ناسیم. لە هەفتەنامەی (برایەتی)دا، بە ناوی (چاوێک) و (ناسیۆنالیست)یکەوە، چەن گوتارێکی بڵاوکردەوە و زۆرم بە دڵبوو. هێندێ جاریش لە مانگی ڕەمەزان و لە نوێژی بەکۆمەڵی ڕۆژی هەینیدا دەمبینی. گەلێ جاریش لە یانەی مامۆستایان تووشیدەبووم، کەمی دەخواردەوە، بەڵام

یاری کاغەزی دەکرد. پتر لەگەڵ هێندێ برادەری مارکسی وەک (عومەری سەیید عەلی، سەلامی مەلاعەبدوڵلا ...) دادەنیشت و دەمەتەقێیاندەکرد. زۆربەی ڕۆژیش ئێواران، لە چاخانەی (جمهوری) قوماریدەکرد. ئێمەش لە ساڵی (**1968**)ەوە، لە ئەو ناوە دەوەستاین و جارجاریش، لە چاخانەکە دادەنیشتین.

من هەر هێندەم دەزانی، پێش ڕێککەوتنەکەی (**11. 3. 1970**)، لەگەڵ جەلالییەکاندا کاریدەکرد و کادێرێکی پێشکەوتووشیان بوو. بەڵام دوای ئەو مێژووە، وازی لێ هێنان و زۆر ڕقیشی لێیان بوو. پاشان دوای ساڵی (**1970**)، لە (یەکێتی لاوانی نەتەوەیی کورد)دا کاریکردووە و ڕۆژی (**25. 7. 1972**)ش، نامەی بۆ سەرکردایەتی (کاژیک) نووسیوە، تا لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی (کاژیک)دا وەرگیرێ. دووربەدوور سڵاومان هەبوو. بەڵام تا ئەو کاتە، لە نزیکەوە و لە ڕێکخستنی (کاژیک)دا، یەکدیمان نەدەناسی.

ماوەی پتر لە هەفتەیەک بوو، لە (پێنجوێن) بووم. ڕۆژی (**20. 6. 1974**)، لە بارەگەی هێزی (خەبات) دانیشتبووم. (ئازاد) هات و خۆشهاتنێکی گەرمی لێ کردم. پاشان لەگەڵ (برایم) و (سەروەت)ی هاوڕێمدا، زۆر بەگەرمی گفتوگۆیەکرد. منیش یەکسەر تێگەیشتم و هەموو شتەکانم بردەوە سەر یەک. چونکە دەمزانی، ئەو دوو هاوڕێیەم، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەویان نەناسیوە، گەر پێوەندی (کاژیک) نەبێ، کەی ئەمان هێندە برادەری یەکدی بوون؟!

پاشان ڕوویکردە من و گوتی: سبەی ئێوارە، لەسەر شێوەی (سولەیمانی)، سەروپێ لێدەنێین، حەزدەکەم گەورەمانکەی. منیش گوتم: بۆ ئێوە لە کوێ دەژین؟ گوتی: لە (بناوەسووتە). گوتم: جا کاکە، من لێرەوە بۆ گێپەیەک، بەپێ بگەمە ئەوێ؟! گوتی: قازانج دەکەی و هەرگیز گێپەی وا خۆشت نەخواردووە. (برایم)یش گوتی: نا نا دێ. ئیدی بەتەواوی تێگەیشتم، بانگهێشتنەکە هەر گێپەخواردن نییە، بەڵکوو کارێکی تایبەتی هەیە و داواکەیم پەسەندکرد.



**(1948 – 1990)**

## بناوەسووتە

دوای نیوەڕۆی ڕۆژی (21. 6. 1974) بوو، ڕێی (بناوەسووتە)یان پیشاندام و بەتەنیا، ملی ڕێگە خۆڵاوی و بەردەڵانییەکەیم گرت. لە ڕێ تووشی مامۆستا (جەمال عەبدول) بووم، بەرەو (پێنجوێن) دەگەڕایەوە. کەمێ وەستاین و هێندێ گفتوگۆمانکرد. تێگەیشتم، لای ئەوان بووە، پاشان جیابووینەوە. نزیکی ئێوارەبوو، گەیشتمە بەر مزگەوتەکەی دێ. لە دوورەوە (عوسمان ڕەشید)م بینی، ڕووی وەرگێڕا و سڵاو لێ نەکردم. ئیدی بەتەواوی هەموو شتێکم بۆ ڕوونبووەوە. بۆم دەرکەوت، ئەم کۆمەڵە کادیرە کودەتاچییە، ڕێکخستنێکی نوێیان دروستکردووە. بۆ نەیکەن؟ گەر ئەوانی دیکە هەموو ترسنۆک، بوودەڵە و هیچ لەبارانەبوو بن، کلکیکان بە دەزگەی (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی)ەوە گرێدابێ، ئەی نابێ، چەن کادیرێکی دیکە، ئەو ئەرکە پیرۆزە، لە ئەستۆی خۆیان بگرن؟!

زۆری پێ نەچوو، (ئازاد) هات، زۆر بەگەرمی پیشوازی لێ کردم و پێکەوە ڕۆیشتین. بۆ یەکەمین جاربوو، خوشکە (لەعلی) خێزانیم بینی، تا بڵێی ژنێکی بەڕێز و زبانشیرین بوو، کچی خاڵی خۆشی بوو. گەر بیرمبێ، یەک دوو منداڵی چکۆلانەش، لە حەوشەکەدا هاتوچۆیاندەکرد. خانووەکەیان زۆر کۆن و پەڕپووت بوو، هەر لە تەویلەی وڵاخ دەچوو! کەمێ دانیشتین، (عوسمان) هات و سڵاویکرد، من نە لەبەری هەستام و نە وەڵامی سڵاوەکەشیم دایەوە. بەڵام (ئازاد) زۆر دیپلۆماسییانە، هەر زوو فریای هەڵوێستی هەردووکمان کەوت و بە یەکدی ناساندین، وەک ئەوەی یەکدی نەناسین! ئیدی خوان ڕازایەوە و نانمانخوارد، بەڵام لە ئەو گوندە چکۆلانەیە و لەنێو شۆڕشدا، هەر گییەی وات بۆ دانێن، هەموو دەردێک بیردەباتەوە!

ئەوان پێکەوە قسەیاندەکرد. منیش بێدەنگبووم و هەر گوێم لێ گرتبوون. ئینجا هەموو شت ئاشکرابوو، زانیم، هەروا بەخۆڕای، منیان بۆ سەرڕوی خواردن بانگ نەکردووە، بەڵکوو مەبەستە سەرەکییەکە، دوای نانخواردن دەردەکەوێ. سەرەتا (عوسمان)، هێندێ پلاری تێگرتم و گوتی: کوردپەروەری ڕاستەقینە ئەوەیە، لەپێناوی بیروباوەڕدا، سەری خۆی دانێ! منیش گوتم: جا (جیڤارا)ی کورد، کێ ڕێی لێ گرتووی، ئەوا ئێستە لە شۆڕش داین، فەرموو ئەوە ئەرز و ئەوە گەز، لە ئەوە پتر قسەی زل مەکە و ئازایەتی خۆت ناقیکەرەوە. بشمزانیایە تۆ لێرەی، نەدەهاتم. هەستام بڕۆم، (ئازاد) نەیهێشت و گوتی: کاکە وا نابێ، با لە یەکدی تێبگەین. تکایە دانیشە، با من هێندێ قسەبکەم، پاشان گلەی لە یەکدی بکەن. ئیدی هەردووکمان بێ دەنگبووین.

(ئازاد) دەستییکرد، لە ئەو ڕۆژەوە، لە ڕیزەکانی (کاژیک)دا دەستی بە کارکردن کردبوو، تا ئەو کاتەی پێکەوە دانیشتبووین، سەبارەت بە جەلالی، مەلایی، کاری خۆی و ڕێکخستنەکانی (کاژیک)، ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان ڕیزەکانی کورد، باسێکی درێژی

بۆ کردین، پاشان ڕۆڵی هەر یەکێکمانی هەڵسەنگاند. ئینجا دەمەتەقێیەکی گەرم، لە نێوان هەرسێکماندا دەسپێیکرد. ئیدی بەتەواوی، لە یەکدی گەیشتین. من و (عوسمان)یش تەوقەمانکرد و هیچ لە دڵماندا نەما.

## پرینسیپەکانی ڕێکخستنی نوێ

پاشان (ئازاد) گوتی: ئێستە، با باسی ئەوە بکەین، چی بکەین؟ هەرسێکمان لەسەر ئەوە ڕێککەوتین و گوتمان: نابێ، چی دیکە لە ئەوە پتر، هەل لەدەستبدەین و دەبێ، قوڵی کوردایەتی و مەردایەتی لێ هەڵماڵین، ڕێکخستنەکە زیندووکەینەوە. ئینجا (ئازاد) لە پێنی کوولەکەکی دا و گوتی: ئێمە ڕێکخستنمان هەیە، تۆش کارمان لەگەڵ بکە. منیش ڕەتم کردەوە و گوتم: من تەنیا هەر، کار بۆ کۆکردنەوەی هاوبیران دەکەم و دەبێ، بە زووترین کات، کۆنفرانسێ بگرین، ئەگینا هەروا بەخۆڕای کارناکەم. دوایی هێندێ بڕیارماندا و لەسەر پێنج خاڵی گرنگ ڕێککەوتین:

1. بە زووترین کات دەبێ، کۆنفرانسێ بگیرێ، هەموو ئەو هاوبیرانەی، لەگەڵ پرۆسەی گۆڕانکارییەکەدا دێن، بەشداری تێدا بکەن. بەڵام دەبێ، کۆنفرانسەکە بە چەن دانیشتنێکی جیاجیا بکرێ، تا زۆربەی هاوبیران، لە یەکدی ئاشکرانەبن و خۆمان لە مەترسی (پاراستن) بپارێزین.
2. تا ئەو کاتەی دەتوانین، کۆنفرانس بگرین، ئەو چەن هاوبیرەی ڕێکخستنەکەیان دامەزراندووەتەوە و هێندێ هاوبیریان، لە دەوری (کاژیک) کۆکردووەتەوە، با بە ناوی سەرکردایەتی کاتییەوە، سەرپەرشتی ڕێکخستنەکە بکەن، لە ئەوە پتر هیچ خەسڵەت و دەسەڵاتێکی دیکەیان نابێ.
3. هیچ جۆرە بڵاوکراوەیەک بە ناوی (کاژیک) و لەسەر کەس دەرناکرێ.
4. هەموو لایەکمان هەوڵدەدەین، پێوەندی بە زۆرترین هاوبیرانەوە بکەین، ڕاستییان بۆ ڕوونکەینەوە و ڕێکیانخەینەوە.
5. دۆستی نوێش بۆ ڕێکخستنەکەمان پەیدادەکەین و ڕێکیاندەخەین.

پاشان نامەیەکی مۆرکراوم، لە (ئازاد) وەرگرت، تێیدا نووسرابوو، هاوبیری هەڵگری نامە، نوێنەری (کاژیک)ە و بۆ کاری ڕێکخستن دێتەلاتان، تکایە هەموو براویەکی خۆتانی بدەنێ و هاوکاری لەگەڵ بکەن.

ئەرکی سەرشانی من ئەوەبوو، لە هەر شوێنێ هاوبیری ببینم، پێوەندی پێوەبکەم، چونکە ژمارەیەکی زۆرم دەناسی. ئیدی بڕیاری تەواومان دا. هەرسێکمان دەسی هاوبیری و هاوکاری، بۆ یەکدی درێژکەین، تا کارەکانمان بە سەرکەوتوویی جێبەجێکەین. ئەو

شەوە تا نزیکەی بەرەبەیان دانیشتین و بۆ بەیانی گەڕامەوە، تێر نووستم. دوای ئەوە، زۆری پێ نەچوو، (شێرکۆی هەژار)یش، لە ناوچەی (گەلاڵە)وە گەیشتە (پێنجوێن)، ئیدی کارەکەمان هێندەی دیکە گەورەبوو!

## کۆبوونەوەکانی کاژێک

دوای ئەوەی (شێرکۆ) گەیشت، هەروەک لەگەڵ (ئازاد) و (عوسمان) ڕێککەوتبووین، ئێوارەی ڕۆژی (**5. 7. 1974**)، لە (بناوەسووتە) لە ماڵی (ئازاد)، کۆبوونەوەکان دەستپێکرد. هەر جارەی چەن کادیرێکی پێشکەوتووی (کاژێک)، پێکەوە دادەنیشتن. ژمارەی ئەندامانی هەر دانیشتنێ، لە (7) کەس تێپەڕی نەدەکرد. لە دانیشتنەکەی ئەو شەوەی ئێمەدا، جگە لە من، هەردوو هاوبیری مامۆستای ڕەوانشاد (غەفوور ژاژڵەیی، شەریف مەولوود، برایمی حەمەعەلی، شێرکۆی هەژار، ئازاد مستەفا و عوسمان ڕەشید) ئامادەبووین. هاوبیر (وریا براخاس)یش لە دەرەوە، بە کلاشینکۆفێکەوە پاسەوانبوو.

پێش ئەوەی دەستپێبکەین، (وریا) بانگکرا و سوێندرا، گەر پێشمەرگەکانی (پاراستن) پەلاماریاندایین، تا دوافیشەک بەرگریبکا! پاشان ڕۆی و لە سەریان ئێشکی خۆی گرت.

سەرەتا (شێرکۆ)، خۆی پێ ناساندین. دوایی هەر هاوبیرێ، باسێکی کورتی ژیان، خەباتی ڕامیاری و ڕێکخستنی (کاژێک)ی کرد. ئینجا (ئازاد) ڕاپۆرتی سەرکردایەتی کاتیی هەرێمی باشووری خوێندەوە و هەر خۆشی نووسیبووی. پاشان (شێرکۆ) دەستپێکرد و زۆری لەسەر ڕۆی. هەر لە سەرەتاوە بە قسەکانیدا دیاربوو، زۆر مرۆڤێکی ڕەقە، ڕێزی بۆ ئەو کەسانە دانەدەنا، کە ناوی دەبردن. مێژووی تێکۆشانی خۆی و (کاژێک)ی بۆ باسکردین. زۆر دژی سەرکردایەتی (کاژێک) دوا و سووکایەتی پێ کردن. هەروەها باسی سەردانەکەی ڕۆژی (**3. 5. 1973**)ی خۆی، بۆ (ئەڵمان) کرد، زۆر بە توندی لەسەر (جەمال نەبەز) دابەزی و بە ترسنۆک، درۆزن و دەستبڕ تاوانباریکرد.



شێرکۆی هەژار

دوای ئەوەش، نۆرەی دەمەتەقێ و پرسیارکردن هات. دەمەتەقێیەکی زۆرمان، لەسەر باری شۆڕش و ڕەوشی رامیاری (کوردستان) بە گشتی و (کاژیک) بە تایبەتی کرد. هەرچەندە ڕێکۆردەریشیان دانابوو، بەلام (برایم) هەموو شتەکانی دەنووسی، ئەم جولانەوەیە، بە (هێلی راستکەرەوە) ناونرا. لە کۆتایی دانیشتنەکەشماندا، لەسەر چەن خالێکی گرنگ ڕێککەوتین، هەرە گرنگەکانیان ئەمانە بوون:

**1.** ئەم سەرکردایەتییەی دروستبووە، سەرکردایەتییەکی کاتییە. ئەرکی سەرەکی سەرشانی ئەندامەکانی ئەوەیە، پێوەندی بە هەموو هاوبیرانەوە بکەن، کۆیانکەنەوە و ریزەکانی ڕێکخستن ڕێکخەنەوە.

**2** بە هیچ شێوەیە سەرکردایەتی دەسەلاتی دەرکردنی، هیچ هاوبیرێکیان لە (کاژیک) نییە.

**3.** هیچ جۆرە بلاوکراوەیەک، لەسەر هیچ کەسێ دەرناکەن.

**4.** سەرکردایەتی هەولدەدا، بە زووترین کات، کۆنگرە بگیرێ.

**5.** کۆنگرە تاکە دەسەلاتە و هەموو گرفتەکانی نێوخۆی (کاژیک) بەلایەکدادەخا.

**6.** ئەو هاوبیرانەی لە دانیشتنەکاندا بەشدارییانکردووە، لە کۆنگرەکەدا ئامادەدەبن.

**7.** نامە بۆ هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی (کاژیک) دەنێررێ، تا لە کۆنگرەکەدا ئامادەبن.

**8.** ئەندامانی سەرکردایەتی کۆنی (کاژیک)، لەبەردەم کۆنگرەدا بەرپرسیارن و دەبێ، داکۆکی لە خۆیان بکەن. گەر بەلگەی بەهێز و سەلمێنەریان هەبوو، پاساوی ئەو هەموو کەموکووری و کەمتەرخەمییەیان بدا، ئەوا وەک هەموو ئەندامانی دیکەی کۆنگرە، بۆیان هەیە، بەشداری لە هەموو دەزگەکانی کۆنگرەدا بکەن و خۆشیان بۆ سەرکردایەتی هەلبژێرن. بەلام گەر هیچ بەلگەیەکی ڕاستینەیان بەدەسەوە نەبوو، ئەوا دەبێ، لە (کاژیک) دەرکرێن، بە بلاوکراوەیەکی فەرمیش ڕاگەیەنرێ، سزابدرێن و سزاکەش کۆنگرە دیاریکا.

**9** گەر هەر گۆرانێکی کتوپڕی، لە (کوردستان) ڕوویدا، توانا نەبوو، کۆنگرە بگیرێ، ئەوا پێویستە، بۆ هەر ڕووداو و بڕیارێکی گرنگ، پرس بە هەموو کادیرە سەرەکی و پێشکەوتووەکانی (کاژیک) بکرێ.

**10.** ئەم کۆمەلە دانیشتنە، بە یەکەمین کۆنفرانسی هاوبیرانی هێلی راسکەرەوە دادەنرێ.

ئەمانە چەن خالێکی سەرەکی بوون، کە هەموومان لەسەری ڕێککەوتین. بەلام پێش ئەوەی کۆبوونەوەکە تەواوبێ، مامۆستا (غەفوور)، لەسەر پارچە کاغەزێکی پچووک، شتێکی نووسیبوو، دای بە (شێرکۆ). دوایی زانیم، داوایکردبوو، بیکەن بە ئەندامی سەرکردایەتی، ئەگینا بەردەوام نابێ. هەروەها مامۆستا (شەریف)یش، لە دانیشتنێکی دیکەی تایبەتدا، هەمان داوای کردبوو. بەلام (شێرکۆ) ڕەتیکردبووەوە. لەبەرئەوە هەردووکیان وازیانهێنا.

ئاخر تا ئەندازەیەکی زۆر، هەڵسوکەوتی (شێرکۆ) بەتایبەتی و توندی سەرکردایەتی کاتی بەگشتی، لەگەڵ گرفتی بوون بە ئەندام لە (کاژیک)دا، ڕۆڵێکی گەلێ گرنگی، لە دوورکەوتنەوەی گەلێ هاوبیری (کاژیک)دا بینی. لەبەرئەوە ئەو دوو هاوبیرە، لەلایەکەوە مافی خۆیان بوو، چونکە دەبووایە، لە ئەو دانیشتنانەی کۆنفرانسەکەدا، هێندێ ئەندامی دیکە، بۆ سەرکردایەتی کاتی زیادکرایە، لەگەڵ ئەو هاوبیرانەدا تێکەڵکرانایە و پێکەوە تا کۆنگرە، کاریانبکردایە. لەلایەکی دیکەشەوە بۆیان هەبوو، لێیان بپرسن، کێ ئەو مافەی داونەتی، خۆیان بە ئەندامی سەرکردایەتی کاتی دانێن، لەبەرچی و هۆکان چی بوون، وا داواکاری ئەو دوو هاوبیرەیان ڕەتکردەوە؟!



شەریف مەولوود (1944–1981)



غەفوور سالح ژاژڵەیی ( 1947–1978)

هەر لە ئەو سەردەمەشدا، ڕەوانشاد مامۆستا (ئەحمەد سەلام) و (فەرهاد عەبدولقادر کەرکووکی)یش، نامەیاننارد و نووسیبوویان: ئێمە پیاوی ئەوە نین، سەرکردایەتی ڕێکخراوێکی نەتەوەیی بکەین و ناتوانین، کاربکەین. بەڵام ئەوە تەنیا بیانووبوو، ئەگینا لە ترسی شەقی (پاراستن)، کونەمشکیان لێ بووبوو بە قەیسەری! بەتایبەتی (فەرهاد)، لە کوێ بای بهاتایە، تەنیا هەر لە ئەوێ، شەن و کەوی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی دەکرد! بۆیە هەر زوو لەسەرەوە، خۆی لە بارەگەی (بارزانی) نزیککردەوە، شوێنپێی خۆی کردەوە و دەسی دەڕۆیی، ئیدی چ پێویستی بە بیروباوەڕ و کارکردن لە (کاژیک)دا هەبوو؟! (ئەحمەد سەلام)یش خۆی و خێزانەکەی، لە (مەریوان) دەژیان و دەسی بە کڵاوەکەی خۆیەوە گرتبوو، با نەیبا!

## سەردانی هاوبیران

لەگەڵ هاوبیر (ئازاد) ڕیککەوتین، من بەرەو (شارباژێڕ، شارەزوور و تەوێڵە) بڕۆم، پێوەندی بە ئەو هاوبیرانەی ئەو ناوچانەوە بکەم و ڕێکیانخەمەوە. لەبەرئەوە ڕۆژی (15. 7. 1974)، سەرم لە گوندی (سەرکان) دا، چاوم بە هاوبیری ئەفسەری پۆلیس (عەلی عسامەدین) کەوت. ئەو کاتە لە هێزی (ئەزمڕ) سەرلق بوو، زۆر سڵی لە (پاراستن) دەکردەوە، چونکە ڕەوانشاد (جەمالی حەمەنوقڵە)، لە ئەوی دەژیا و لێپرسراوی پاراستنی ئەو ناوچەیە بوو. هەرچی چۆنی بوو، شەوی لای مامەوە و ئەوەی پێویستبوو، پێم گەیاند و پەسەندیکرد.

بەیانی زوو، بە دزی (جەمالی حەمەنوقڵە)وە دەرچووم و بەپێ، بەرەو جادەکەی (ناوپارێز) بەڕێکەوتم. ترومبیلێ هات و بۆم وەستا. بە ڕێککەوت معاون (عەبدولمەلیک)ی تێدابوو. ڕاوەستا و سواربووم. (عەبدولمەلیک)م لە ساڵی (1964)وە دەناسی، بەتایبەتی لەگەڵ ڕەوانشاد (سەلاح)ی برایدا، زۆر هاوڕێبووین و لە ناوەندیی (شۆڕش)یش پێکەوە دەمانخوێند. ئەویش بۆ (تەوێڵە) دەچوو، منیشی لەگەڵ خۆی سوارکرد. لە (دوڵەسوور) دابەزین و نانیشی بۆ کڕیم.

بەدەم نانخواردنەوە، زۆر باسی (کاژیک)مان کرد. باوکی بە (کاژیک) ناوی ڕۆیشتبوو. خۆشی (کاژیک)ی خۆشدەویست. بەڵام ئەو جۆرە کەسانە، لە شۆڕشدا چەقیبوون، فێری هەموو فڕوفێڵی بووبوون، تازە بە کەڵکی بیروباوەڕ و دیسیپلینی پارتایەتی نەدەهاتن! بۆیە پێی گوتم: بیستوومە (کاژیک)ی، ئاگات لە خۆت بێ، (پاراستن) بە دواتاندا دەگەڕێ. منیش گوتم: من هەمووی هەفتەیەکە، لە (قەلادزێ)وە هاتووم، ئیدی (کاژیک)ی چی؟! پێکەنی و قسەی نەکرد.

## هەڵەبجە

بەدەمەونێوارەبوو، گەیشتینە (هەڵەبجە) و ویستم، (عوسمان ڕەشید) ببینم. ئەو کاتە لە ناوچەی (هەڵەبجە) دەژیا و لێپرسراوی ڕێکخستنی ئەو ناوە بوو. بەڵام بۆم نەدۆزرایەوە. کەمێ بەنێو بازارەکەدا سووڕاینەوە، تەماشایەکی ئەو شوێنانەمان کرد، کە فڕۆکەکانی (بەعس) بۆردوومانیانکردبوون. هێندێ شوێنی هەر وەک کەلاوە لێ کردبوو. (هەڵەبجە) بە دەم ئازاری کاولکارییەوە، لە تاریکیدا دەژیا و (باخی میر)یش، لەتاو سوێی ڕەوانشادەکانی، ماتومەلوول و کۆستکەوتوو لێی کەوتبوو! نێوشارەکە تازە خەریکبوو، ئاوەدانبێتەوە. جوڵەیەکی تێکەوتبوو. پاشان سواربووین و نیوەشەو لە (تەوێڵە) دابەزین.

## تەویلە

کاتێ گەیشتین، زۆر چۆڵبوو، جگە لە چەن سەگێ، کەس بەسەر جادەوە نەبوو. هیچ ناونیشانێکیشم پێ نەبوو، تا پەنایان بۆ بەرم. (عەبدولمەلیک)، شەقێکی لە دەرگەی چاخانەیەک هەڵدا، خێرا کردیانەوە. هەردووکمان لەسەر دوو کورسی لێی پاڵکەوتین. بەڵام مام کێچ کارێکی پێ کردین، تا بەیانی خەو لە چاوانمان نەکەوت!

(عەبدولمەلیک) هاواری لێ هەستا و بە خاوەن چاخانەکەی گوت: دە پێیان بڵێ، وازمان لێ بێنن، با کەمێ بنوین! منیش گوتم: سەری خۆت مەیەشێنە، ئەمانە هێشتا ساوان، لە شێوە زمانی هەورامی پتر، هیچ جۆرە دیالێکتێکی دیکەی کوردی نازانن!

بەیانی ڕۆژبووەوە، نان و چا و ماستمان خوارد. ئیدی هەر خەڵکی (سولەیمانی) بوو، پۆلپۆل بەرەو کارەکانیان دەڕۆیشتن. هەر زوو (ئازادی کاک مستەفا، کاوسی عەزیز بەگ، ملازم کەریمی شێخ سەلام و موحەممەد غەفوور)م دۆزییەوە و ئەوانیش، هەموویان هاوبیری خۆمان بوون. لە پەناوە تێم گەیاندن، بۆچی هاتووم. ئیدی تا دەهات، دۆست و ئاسیاوی دیکەم دەبینی.

بەڕاستی، ئەوە دووەمین جاربوو، لە ژیانمدا (تەوێڵە) ببینم. زۆر خۆش و جوان بوو، هەرچەندە بیرمدەکردەوە، ئەو خەڵکەی هەورامان، زۆر ئازا و کۆڵنەدەرانە، لەبنار و لووتکەی ئەو چیابەرزانە و لەسەر ئەو تاشەبەردانە، ئەو خانووە ڕێکوپێک، جوان و خاوێنانەیان، چۆن دروووستکردووە، سەرمسووڕدەما و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: گەر کورد هەمووی هەورامی بووایە، ئێستە دەمێبوو، ڕزگاربیووبوو. کەچی خەڵکی (سولەیمانی)، هەمیشە گاڵتەیان پێ دەکردن!

زۆر بەپەلە، هەموو کارەکانم لە ماوەیەکی کورتدا جێبەجێکرد. یەکەمین کۆبوونەوەم، لەگەڵ هەردوو هاوبیر (ئازاد) و (کاوس)دا بوو. لەسەر هەموو شتەکان ڕێککەوتین و شانەیەکی سەرەکیمان، لە ئەو دوو هاوبیرە درووستکرد. چاوم بە هەردوو ڕەوانشاد (جەلالی حاجی حوسێن) و (کەریم سەلام)یش کەوت. ئەو کاتە هەردووکیان سەرلق بوون، بەجیا ڕێکخرانەوە، هێڵێکی سەربازیمان لێ درووستکردن و بە ڕێکخستنی ئەو نیوچەیەوە بەسرانەوە.

ئیدی چەن ڕۆژێ مامەوە، هەر هاوبیرێکم دیبێ، پەرلەم داونەتێ و ناونیشانم لێ وەرگرتوون. بە ئەو شێوەیە، لیژنەی نیوچەی (هەڵەبجە)مان، بە چەن هاوبیرێکی دیکە موتووربەکردەوە. بەڵام ئەو ماوەیەی لە ئەوێ بووم، هەوڵم نەدا، (نوری حەمەعەلی) ببینم، چونکە ئەو خۆی لە (پێنجوێن) دەژیا و لەبەردەسدا بوو. دوایی کەمێ لەنێو هاوڕێکانی زانکۆمدا مامەوە، کاتێکی خۆشمان بەسەربرد و گەڕامەوە.

## پێنجوێن

دوای هەفتەیە گەیشتمەوە و یەکسەر چوم بۆ بارەگەی هێز. (برایم) گوتی: خانووەکەتان گیراوە. منیش زۆر سەیرم لێهات و گوتم: چۆن و کێ گرتوویەتی؟! گوتی: ماڵی کاک (ئازاد)، لە (بناوەسووتە)وە هاتوون، خانووی دەس نەکەوتووە و (وریا) خانووەکەی داونەتێ. لە ئەو ماوەیەدا، ماڵی (وریا) هەموویان لە شارەوە راپانکردبوو، خانوویەکی گەورەیان دەسکەوتبوو. منیش ناچاربووم، کەلوپەلەکانم بپێچمەوە، لەگەڵ هاورێکانم (برایم، سەروەت و کەریم رۆژ)دا بژیم.

لە نێوەراستی مانگی (7)دا بوو، هەواڵی بریندارپوونی هاوبیر ملازم (مەنسووری شێخ کەریمی حەفید)م پێگەیشت. ئەو کاتە سەرلق بوو، لە چیای (کۆرەک) بریندارببووبوو. ئەو هەواڵە زۆر نیگەرانی کردم. نەمدەزانی، چۆن خۆمی بگەیەنمێ. کەچی زۆری پێ نەچوو، بە شەلەشەل و بە گۆچانێکەوە پەیدابوو. بەراستی زۆرم پێخۆشبوو، بینیمەوە. تا لە ئەوێ بوو، بە دوای دایک و خوشەکەکانیدا نارد و ئەوانیش هاتن، ماوەی دوو هەفتە لامان بوو، پاشان گەرایەوە.

## بەتالیۆنی چواری هێزی خەبات

پڕ بەدڵ حەزمدەکرد، لە بەتالیۆنی چوار کاربکەم. چونکە لەلایەکەوە (نوری حەمەعەلی)، فەرماندەی بەتالیۆن بوو، کوڕی گەرەکی خۆمان بوو، تێکەڵاویمان هەبوو. لەلایەکی دیکەشەوە، زۆربەی لێپرسراوەکانی ئەو بەتالیۆنە، گەر (کاژیک) نەبووبن، نەتەوەیی بوون! جگە لە ئەوەی، زۆربەی هاورێکانیشم، هەر لە ئەوێ پێشمەرگە بوون. بارەگەی بەتالیۆنیش، لە (بووبان) بوو. لە (پێنجوێن)ەوە زۆر نزیکبوو.

هەرچی چۆنێ بوو، لێپرسراوانی هێز قایلبوون و ناردیانم بۆ ئەوێ. بەڵام کاک (نوری) لە (مەریوان) پێی گوتم: تا خۆم دێمەوە، دەوام مەکە. ئەفسەرێکی سوپاشی لێ بوو، ناوی (شاخەوان) بوو، خەڵکی گوندی (خەراجیان) بوو. جێگری فەرماندەی بەتالیۆنەکە بوو. تا ئەو رۆژەی شۆرشیش تێکچوو، یەک جارم بینێ، ئیدی نەمبینییەوە، نازانم، خەریکی چی بوو!

## نوری حەمەعەلی

لە ئەو ماوەیەدا لە (پێنجوێن) توانیمان، زۆربەی هاوبیرە کۆنەکانی (کاژیک) رێکخەینەوە. هێندێ دۆستی نوێش، بۆ (کاژیک) پەیداکەین. کاک (نوری) یەکێ لە ئەو هاوبیرە کۆنانە بوو، رێکمانخستەوە و من لێپرسراوی بووم. هەرچەندە ئەو لە ساڵی

(**1962**)ەوە پێشمەرگە بوو، فەرماندەی بەتالیۆنیشم بوو، لە هەموو (کوردستان)دا، بە ئازایی و نیشتمانپەروەری، ناوی دەرکردبوو، منیش خوێندکارێکی پۆلی سێی کۆلێژی کشتوکاڵ بووم، تازە (**20**) ساڵی بەهاری ژیانم تەواوکردبوو، بۆ یەکێکی وەک من، کارێکی سەختبوو، لە ئەو پیسەرویەرییەی شۆڕشدا، پیوەندی پێوە بکەم و لە شانەیەکدا رێکیخەم!

بەڵام لە ئەوە پتر، چارنەبوو، ئیمە دەمانویست، ڕێکخستنێکی نەتەوەیی پتەو، لەنێو هێزی پێشمەرگەدا درووستکەین و ئەو هێزە چەکدارەی (کاژیک)، خەونی پێوە دەبینی، ڕۆژێ لە ڕۆژان دایمەزرێنی و لەژێر کۆنترۆڵی سەرکردایەتی (کاژیک)دا بووایە.



( **1981 – 1941** )

دوای ئەوەی کاک (نووری)، لە (تەرێلە) گەڕایەوە، نامەی پێوەندیکردنم بۆ برد و لە ماڵی خۆمان کۆبوونەوەیەکمانکرد، من قسەم بۆ دەکرد، بەڵام ئەو دەمێبوو، پرخەیدەهات! جارێکم خەبەرکردەوە، کەڵکی نەبوو. گوتی: وازم لێ بێنە، زۆر ماندووم، با کەمێ بنووم. ئیدی من بۆ ڕێکخستنی (کاژیک)، هیچ جۆرە هیوایەکم پێی نەما. دەرگەم لەسەر داخست و ڕۆیشتم.

دوای دوو کاژێر گەڕامەوە و خەبەرمکردەوە، نە ئەو هیچی گوت و نە منیش سەرزەنشتمکرد، بەڵام یەکسەر، نامەیەکم بۆ سەرکردایەتی کاتی نووسی و تێمگەیاندن، ئەم پیاوە تێکۆشەرە، بۆ پێشمەرگایەتی باشە و بە کەڵکی ڕێکخستنی ئیمە نایە!

**برایمی حەمەعەلی**

هێندەم زانی، ڕۆژێ (برایم) هات و گوتی: لەمەودوا، تۆ پێوەندیت بە منەوە دەبێ. منیش یەکسەر وەڵاممدایەوە و ڕەتمکردەوە. چونکە ساڵی (**1971**)، من (برایم)م بە (کاژیک) ئاساندبوو، ماوەیەکی زۆریش، هەر پێوەندی بە منەوە بوو.

پاشان هاوبیر (ئازاد) گوتی: لیژنەی نیوچەی (شەهید عومەر)مان پێکهێناوە، تۆش ئەندامی ئەو لیژنەیەی. دەبێ، یارمەتیمابدەی. منیش هەرچەند نارازیبووم، بەڵام ویستم، لە نزیکەوە بزانم، ئەندامەکانیان کێن و ئاگاداری کارەکانیان بم!



**برایمی حەمەعەلی**

ئەوەبوو، یەکەمین کۆبوونەوەمانکرد، مامۆستا (ئەحمەد)ی زاوای (ئازاد)، لێپرسراوی ناوچە بوو. مامۆستا (سەدیق)ی کۆنە هاوڕێی (سەرچنار)م، لەگەڵ یەکێکی دیکەدا، ئەندامی ناوچە بوون. لە دانیشتنەکەدا مامۆستا (ئەحمەد)م، هەروەک مەلایەکی مزگەوت هاتە پێش چاو. چونکە هەر قسەیەکی دەکرد، زووزوو دەیگوت: وەک لە (کاژێکنامە)ی پیرۆزدا هاتووە. سەیرمکرد، گەر ئەمە لیژنەی ناوچە بێ، ئەو هاوبیرە لێپرسراو و ئەندامی لقی (سولەیمانی) بێ، ئاخۆ دەبێ، کادیرەکانی دیکەمان چۆن بن؟!!
لەبەرئەوە هەر زوو، نامەیەکی درێژم بۆ سەرکردایەتی کاتی نووسی، سەبارەت بە هەڵویستی خۆم، ڕێکخستن و کادیرە بەرپرسەکانی، بۆچوونی تایبەتی خۆم، زۆر بە ڕاشکاوی دەربڕی، هەموو کەموکورییەکانم دەستنیشانکرد و هێندێ پێشنیازیشم کرد. لە ئەوانە: ناوچە و لقەکان هەڵوەشێنرێنەوە، تا لە ئەوە پتر، هاوبیران لە یەکدی ئاشکرا نەبن و لە مەترسی دەزگەی (پاراستن) دووریانخەینەوە. هەروەها داوامکردبوو، بەشی ڕامیاری و سەربازی جیاکەنەوە. ماوە بە کادیرە کۆن و شارەزاکان، خاوەن باوەڕ و بە تواناکان، خوێندەوار و ڕووناکبیرەکان بدەن، کاریان پێ بسپێرن و بایەخیان پێ بدەن، ئەگینا بە ئەوە شێوەیە بڕوا، هیچ بە هیچ ناکەین!

## گەرمەی جەنگ

لە سەرەتای مانگی (6)ەوە، دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، سوپایەکی زۆر گەورەی کۆکربووەوە و بۆ جەنگ ئامادەیکردبوو. وردەوردە، بەرەو نێوچە ڕزگارکراوەکانی (کوردستان) دەکشان. لە مانگی (7)یشەوە، هێرشێکی زۆر گەورە و بەرفراوانیان دەسپێکرد. ئەم لەشکرە گەورە پرچەکە، بە یارمەتی جاشە چلکاوخۆرە زۆڵەکوردەکان و چەکدارەکانی (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)، پەلاماری شۆڕشی گەلەکەمانیان دا. لە هەموو باشووری وڵاتدا، جەنگ بەتەواوی گەرمبوو. سەرکردایەتی (بەعس) دەیویست، لە هەموو لایەکەوە، نێوچەی سەرکردایەتی شۆڕش گەمارۆبدا. یا لە خاکی (کوردستان) دووریانخەنەوە و ئاودیوی (ئێران)یان کەن. یا ورەیان بڕوخێنن، کۆڵیان پێ بدەن، دەسی خۆبەدەسەوەدان بەرزکەنەوە و مەرجەکانی (بەعس) پەسەندکەن. لەلایەکی دیکەشەوە، پێشمەرگەکانی ئەو نێوچانە، بەدڵ و بەگیان نەدەجەنگان، لەبەردەم شاڵاوی هێرشی دوژمنی داگیرکەردا، خۆیان بۆ نەدەگیرا و هەر زوو هەڵدەهاتن!

لە ئەنجامدا سوپای (عێراق)، لە ماوەیەکی کەمدا، سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەسهێنا. سەرەتا هەموو دەشتی (هەولێر)یان گرت. هێزەکەی (فارس باوە) بەرگرییان نەکرد و رایانکرد. پاشان بەرەو (کۆیە) هاتن و چیای (هەیبەسوڵتان)یان داگیرکرد. ئیدی بەکاوەخۆ و بێبەرگری، شارۆچکەی (رانی)شیان گرت و پاشان (شێخ دارای حەفید)یان، لە ئەوێ کرد بە قایمقام!

زۆر بەداخەوە، هێزی پێشمەرگە خۆی بۆ ڕانەدەگیرا و هەڵادەهاتن. سوپای (عێراق)یش، هەموو نێوچە دەشتاییەکانی داگیرکردەوە. لە قۆڵی (ڕەواندز)یشەوە، هێرشێکی گەلی گەورەیان دەسپێکرد، ئەو شارۆچکەیەیان گرت. سەرباز و جاشێکی یەکجار زۆریان، لە نێوچەکەدا خڕکردەوە. تۆپ و تانکێکی زۆریان هێنا، بەشێوەیەکی بەردەوام، شەو و ڕۆژ فڕۆکەکانیان بۆمبارانی نێوچە ڕزگارکراوەکانیان دەکرد.

لەبەر ئەم هەموو هۆیانە، سەرکردایەتی شۆڕش، داوای لە هێزی (خەبات) کرد، هێزێکی چەکداری پێشمەرگە، بۆ پشتیوانی پێشمەرگەکانی ئەو نێوچانە بنێرن، لەنێو هەموو بەتالیۆنەکانیشدا، (فەتاح ئاغا) بەتالیۆنی چواری هەڵبژارد.

ئەو کاتە، من لە بەتالیۆنی چوار پێشمەرگە بووم و موچەم لە ئەوێ وەردەگرت. بەڵام هێشتا هیچ کارێکیان پێ نەسپاردبووم. هەر ئەو دەنگوباسەم بیست، یەکسەر چووم بۆ بارەگەی بەتالیۆن و داوام لە کاک (نوری) کرد، کارێکم پێ بسپێرێ و لەگەڵیان لە نێوچەی سەرکردایەتی، بەشداری بەرەکانی جەنگ بکەم. بەڵام ئەو زۆر دژبوو، حەزی نەدەکرد، من لێی نزیککەومەوە، لەبەرئەوەی لەلایەکەوە، لە (کاژێک)دا لێپرسراوی بووم

و نەیدەویست، ئاگام لە هەڵسوکەوتەکانی بێ. لەلایەکی دیکەشەوە، بارەگەی (بارزانی) زۆر ڕێزیان لێ دەگرت و خۆشیاندەویست، حەزی نەدەکرد، لە (کاژیک) نزیکبێتەوە و بە (کاژیک)ی بزانن. لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچی چۆنێ بوو، جێی خۆم کردەوە و بۆ ئەو کارە پیرۆزە، وەک لێپرسراوی کارگێری بەتالیۆنەکە، دەسبەکاربووم و لەگەڵیان، بەرەو سەرەوە ڕۆیشتین.

## پێکهاتەی بەتالیۆنەکەمان

ئەم بەتالیونە، بە یەکێ لە بەتالیونە چاک و ئازاکانی هێزی خەبات و (کوردستان)یش ناسرابوو. نزیکەی (**250**) پێشمەرگەیەکی هەبوو. کاک (نوری) فەرماندەی بەتالیۆن و ئەفسەرێکی سوپاش (شاخەوان) جێگرییبوو. لە چوار لقی گەورە پێکهاتبوو. سەرلقەکانی (حەمەئەمین گوڵچین، شێخ برایمە شەلەی ئامادینی، نوورەدی مام برایم و شەریفی خاڵە) بوون. هەریەکێ لە ئەوانە، هێندە ئازابوون، کون لە جەرگیاندا نەبوو. هەروەها بە دەیان کوڕی بوێری وەک (خەسرەوی حەمەی محە، ئەنوەری توفیق هەورامی، عەلی فەیمە، وریا براخاس، تایەری حەمەمراد، عوسمان حەمەسالح کانیساردی، ئەنوەری سەعید بەگ – هەڤاڵ دڕندە، سولەیمانی قەساب) و گەلێکی دیکەشی تێدابوو.

من لێپرسراوی کارگێری بووم. (فوواد یاسین) لێپرسراوی دارایی بوو. (قادری حاجی عەلی بەگ)یش یاریدەدەری بوو. سێ برینپێچی وەک (برایمی توفیقی حەسەنەقووچ، برایم حەمەئەمین و نامیق توفیق)مان لەگەڵ بوون. (نیزاری عەقید ئەمین)یش، لەگەڵ چەن پێشمەرگەیەک هاتبوو. چەن هاوڕێیەکی نزیکی خۆشمان لەگەڵ بوو، وەک (وریا براخاس، شوانی عوسمان فایەق، عەبباس ئەبوشواربی کەبابچی، نیهاد مەحموود – نیهادە کوێر، جەزای ئەحەشانە)، لە بارەگەی بەتالیۆن پێشمەرگە بوون. کۆمەڵێکی زۆر سەیر و خۆش تێکەڵاوبووبووین. زۆربەی زۆرمان، خەڵکی (سولەیمانی) بووین. هەرگیز پێکەوە تاقەتمان نەدەچوو، وامان دەزانی، بۆ سەیران هاتووین!

## کۆبوونەوە

دوای ئەوەی هەموو لقەکانی بەتالیونەکەمان، لە بەرەکانی خوارەوە گەڕانەوە و لە بارەگەی بەتالیون کۆبوونەوە، ڕۆژی (**12. 8. 1974**) بوو، (فەتاح ئاغا) لە بارەگەی هێز، کۆبوونەوەیەکی گشتی پێ کردین، هەموو لێپرسراو و پێشمەرگەکان ئامادەبوون. پێشەکی تەماشایەکی چەکەکانی کرد، پاشان سەبارەت بە پێویستی لقەکان، یەکەیەکە قسەی لەگەڵ سەرلقەکان کرد. دواییش گوتارێکی جوانی دا، کە تا ماوەیەکی زۆریش،

ئەو قسانە لە گوێمدا هەر دەزرنگانەوە. بەتایبەتی کاتی گوتی: ئێوە هەموو پێشمەرگەی کورد و ڕۆڵەی ئەم خاکەن. گەر ئێوە داکۆکی لە نیشتمانی خۆتان نەکەن، کێ لەبری ئێوە، دژی داگیرکەرانی (کوردستان) دەجەنگێ؟! هیوادارم، بە سەرکەوتوویی بگەڕێنەوە. گەر هەر پێشمەرگەیەکیش، لەپێناوی وڵاتەکەیدا، گیانی خۆی بەختکرد، ئەوا دەبێ، شانازی بە ئەوەوە بکا، کە (شەهادەی شەهیدی) وەرگرتووە! ئیدی هەر ئەو ڕۆژە، پێیان ڕاگەیاندین، بەیانی زوو ئامادەبین و بەڕێکەوین.

## ئازاد مستەفا و دووەمین بینین

کاتی کۆبوونەوە تەواوبوو، گەڕامەوە و سەرێکی هاوبیر (ئازاد)م دا. گەلێکی پێ خۆشبوو، کە لەگەڵ بەتالیۆنەکەدا، من و (وریا براخاس)، بۆ بەرەکانی جەنگی سەرەوە دەچین. بەڵام زۆر پارایەوە و گوتی: ئاگاتان لە خۆتان بێ و گیانی خۆتان، بەخۆڕای دامەنێن. چونکە (کاژیک) تازە خەریکە، سەرپێی خۆی دەکەوێ و شۆڕشێکی نەتەوەیی لە (کوردستان)، چاوەڕێی دەسی ئێمە دەکا. هەروەها سەبارەت بە ئەو ڕاپۆرتەی نووسیبووم، هێندێ دەمەتەقێمانکرد. بەڵام بە هیچ ئەنجامی نەگەیشتین و بڕیارماندا، کاتی گەڕامەوە، بەدرێژیی قسەی لەسەر بکەین و چارەسەری، بۆ هەموو گرفتەکان بدۆزینەوە.

(ئازاد) پێی گوتم: هاوبیران بڕیاریانداوە، چاپ و ڕۆنۆییەک بۆ (کاژیک) بکڕین. لەبەرئەوە دەبێ، هەر هاوبیرێ بە گوێرەی توانای خۆی، بڕێ پارە پێشکەشکا. من ئەو کاتە، مانگی (10) دینارم هەبوو. مووچەی مانگێکم دانێ. (ئازاد) زێڕی خێزانەکەی و (شێرکۆ)ش دەمانچەکەی قەدی خۆیان فرۆشت، کە لە بارەگەی (بارزانی)، بە دیاری وەریگرتبوو. ئیدی هەر یەکە بەپێی توانای خۆی چی لەدەسهات، پێشکەش بە (کاژیک)ی کرد. دواجاریش ماڵاواییمان لە یەکدی کرد.

## سەرمەرزەکە

سەرلەبەیانی زووی ڕۆژی (**13. 8**)، هەموو پێشمەرگەکان لەسەر مەرزەکە ئامادەبوون. دۆست و ئاسیاوێکی زۆر، بۆ ماڵاواییکردنمان هاتبوون. چەن ڕۆژێ بوو، لەگەڵ (حەمەعەلی) هاوڕێمدا زویربووبووین. بەڵام کاتی گەڕابووەوە و زانیبووی، دەچین بۆ سەرەوە، چوونەکەش ڕێی هات و نەهاتبوو، خۆی بۆ نەگیرابوو، یەکسەر هات، منی دۆزییەوە و باوەشییداکردم.

دوای ماوەیە، ترومبێلێکی زۆری فرۆشگەکانمان بۆ هات و سواربووین. لە مەرزەکە پەڕینەوە، لەنێو خاکی (ئێران) دایانبەزاندین. ئیدی لە ئەوێشەوە، بە زیلی سەربازی

سوپای (ئێران) و بەڕێی تایبەتی سەربازیدا، بەرەو (بانە) ڕۆیشتین. لێپرسراوێکی گەورەی (ئێران)یشمان لەگەڵ بوو. کاک (نوری) گوتی: لە دەزگەی (ساواک) کاردەکا. لێپرسراوەکە و خۆی، پێکەوە لە جیپێکی تایبەتدا سواربووبوون.

## بانــە

ئەو ڕێگەیە، زۆر دووروودرێژبوو. زیلەکانیش زۆر لەسەرخۆ دەڕۆیشتن. هەر تەواو نەدەبوو. هەمووومان بەتەواوی ماندوو، خەواڵوو، برسی و وەڕز بووبووین. جگە لە ئەوەی ڕێگەکە خۆڵ بوو، تۆزێکی زۆری دەکرد. هەر لقەی چەن زیلێکی بۆ خۆی داگیرکردبوو. ئێمەش بارەگەی بەتالیۆن، دوو زیلمان پێ بوو، کەرەسە و تەقەمەنی تێدا بوو. ئەو شەوە بەڕێوەبووین و بۆ بەیانی نزیک نیوەڕۆ، گەیشتینە (بانە).
لە (بانە) هەرچیمان کرد، لێپرسراوەکەی (ساواک) نەیهێشت، پێشمەرگەکان دابەزن و سەرێکی شارەکە بدەن. بەڵام دوای ماوەیە، نان و چاو و پەنیریان بۆ هێناین. نانمان خوارد و کەمێ بوژاینەوە. دوایی بە قەراغ شارەکەدا تێپەڕبووین. چاوم لێبوو، لە دوورەوە کوردەکان وەستابوون و چەپڵەیان بۆ لێدەداین، دەسیان بۆ ڕادەوەشاندین! دڵم پڕبووبوو، بەزەیم بە خۆم و ئەوانیشدا دەهاتەوە. چونکە ئێمە لە نێوان دوو دەوڵەتی داگیرکەری (کوردستان)دا گیرمانخواردووە، تووشی ئەو هەموو چەوساندنەوە و چەرمەسەرییە بووین، کەچی هێشتا نایەڵن، لە نزیکەوە، لەگەڵ هاوزمانەکانی خۆماندا بدوێین!
لە (بانە) دوورکەوتینەوە. دیسانەوە شەو پەردەی تاریکایی خۆی، بەسەرماندا دادایەوە. ئەو شەوەش هەر بەڕێوەبووین. بۆ بەیانی پاشنیوەڕۆیەکی درەنگبوو، لە نزیک هۆردووگەی کوردەکانی لای خۆمان ڕاوەستاین. باشبوو، لە ئەو ناوە ئاو هەبوو، پێشمەرگەکان کەمێ پشوویاندا. کاک (نوری) بانگیکردم و گوتی: (سەردەشت) لێرەوە نزیکە، جیپەکەی من بەرە و لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا بچن، فەردەیە شەکر، بیست کیلۆ چا و هێندێ نان بکڕن.

## سەردەشت

زۆرم پێخۆشبوو، (سەردەشت) ببینم. یەکسەر لەگەڵ (نیهاد)ی هاوڕێم و پێشمەرگەیەکی دیکە سواربووین و ڕۆیشتین. بێگومان، هیچمان شارەزا نەبووین. بەڵام شۆفێرە ئێرانییەکە، لە نێوەڕاستی بازارەکەدا، جیپەکەی ڕاگرت و بە فارسی گوتی: خێرا شتەکان بکڕن، چونکە دووکانەکان دادەخرێن. تاریکیکردبوو، زۆربەی دووکانەکان داخرابوون.

ئێمەش هەرسێکمان، جلی پێشمەرگەمان لەبەردابوو. دابەزین و لەنێو ئاپوورەی خەڵکەکەدا راوەستابووین و لەنێوان خۆماندا قسەماندەکرد. تا بزانین، بەرەو کوێ بڕۆین و شتەکان بکڕین. بەڵام هەر هێندەم زانی، هەرچواردەورمان بە خەڵکی (سەردەشت) تەنرا، بە ڕوویەکی خۆشەوە، بەخێرهاتنیانکردین. هەر لێمان وردەبوونەوە و وایاندەزانی، فریشتەین و لە ئاسمانەوە یاریوین! منیش بە یەکێکیانم گوت: دەمانەوێ، هێندێ شەکر و چا بکڕین، لە کوێ دەستماندەکەوێ؟ خێرا دوو کەسیان هاتنەپێشەوە و گوتیان: هەموو دووکانەکان داخراون، ئێوە لەگەڵ ئەم ئاغایەدا، لێرە بووەستن، ئێمە بۆتان پەیدادەکەین و لە جیپەکەی دەهاوین. ئیدی خێرا، یەکێ سەروو ساردێ و بابۆڵەیە نانیان بۆ هێنایین. پاشان گەلێ پرسیاریان لێ کردین و منیش، بە ئارەزووی دڵی خۆم و زۆر (کاژێکانە) وەڵامدمدانەوە!

هێندەم لە یادە، یەکێکیان گوتی: ئێمە لە ئێوە خراپترین، بەڵام جاری چارمان نییە و بێدەنگین. منیش گوتم: ئێمە و ئێوە، هەموومان کوردین و برای یەکدین، هیچ سنووری لە یەکدیمان ناکا، با ئێمە بە شتێ بگەین، ڕۆژی دەبێ، ئێوەش داوای مافە ڕەواکانی خۆتان بکەن. هەرچەندە ئەوان، زۆر بەچاوی ڕێز و خۆشەویستییەوە، تەماشایاندەکردین، بەڵام لە ئەوە نەدەچوو، زۆر باوەڕیان بە پشگیری (ئێران) و سەرکەوتنی ئێمە هەبێ!

ئیدی هەر هێندەم زانی، دووبرادەرەکە هاتنەوە و گوتیان: هەموو شتەکان ئامادەن و لەنێو جیپەکەدان. زۆر خەریکبووین، پارەیانبدەینێ، بەڵام بە هیچ شێوەیە، قایل نەبوون، وەریگرن.

بەڕاستی دڵم پڕبووبوو، توند دەستی هەردووکیانم گوشی و ماڵاوایم لێ کردن. تا لە چاویش ونبووین، ئەوان هەر لە ئەو سەرجادەیە کۆبووبوونەوە و تەماشایاندەکردین. (نیهاد)یش بە دەنگێکی نزم پێی گوتم: دوور نییە، دوایی (ساواک) هەموویان بە شەق نەپچرینێ. منیش گوتم: ئەوان خۆیان پێشەکێ، ئەوە باش دەزانن، بەڵام هەستی نەتەوەییان هێندە بەهێزە، خۆیان بۆ نەگیرا، گوێش بە سووکایەتی و لێدان نادەن!

ئەو شەوە پێشمەرگەکان، لە ئەو ناوە چایان لێنا و کەمێ حەوانەوە. پاشان بەرەو (خانە) سواربووینەوە و لامان نەدا. بە کێوەکانی پشتی (خانە)دا سەرکەوتین، تا گەیشتینە سەرەوە. تەماشامکرد، ئەو ناوە هەمووی بە سەربازی (ئێران) گیراوە و هەر لەنێوان چەن سەد مەترێکدا، قوولەیەکی سەربازییان قوونکردووەتەوە. کاتێ خۆرهەڵاتی (کوردستان)مان بەجێهێشت و بەدیوی باشووردا شۆڕبووینەوە، بە دەستووری (عێراق)، زاڵگەیەک لەسەر جادەکە بوو، داریان بۆ لادایین و بەرەوخواربووینەوە. دوای ماوەیە، لە (حاجی هۆمەران) تێپەڕین و گەیشتینە (ئازادی).

## ئازادیی

دەمی ئێوارەی ڕۆژی (14. 8) بوو، زیلەکان لە (ئازادی) دایانبەزاندین و هەر لقێ لە بن دارێکدا، بارەگەی خۆی دامەزراند. ئەو ناوە زۆر جەنجاڵبوو. کانیی و ئاوێکی زۆر سارد و خۆشی لێبوو. هەر زوو پێشمەرگەکان، ئاگریانکردەوە و دووکەڵ بەرزبووەوە، خێرا چایان لێنا.
کاک (نوری) بە خۆی و دەستەکەیەوە ڕۆیشتن و ئیشەکان هەمووی بە سەر منداکەوت. دوای کەمی حەوانەوە، خێرا بەسەر لقەکاندا گەڕام، ناو و پلەی لێپرسراوی هەموو پێشمەرگەکانم تۆمارکرد. شەکر و چامان بەسەردا دابەشکردن. ئەو پێشمەرگانەی ناسیاو و خزمیان لە ئەو ناوە هەبوو، مۆڵەتیان وەرگرت و ڕۆیشتن، ئەو شەوە لە ئەوێ نووستین.

## فەرهاد عەبدولحەمید

بۆ بەیانی، (فەرهاد عەبدولحەمید) هات بۆ لام. بەپێی ڕێکخستن بێ، تا ئەو کاتە هەر لێپرسراوم بوو. دوای هەواڵپرسین ویستی، باسی (کاژیک)م لەگەڵ بکا. سەرەتا گوێم بۆ شلکرد، تا بزانم، دەڵێ چی. ئینجا تێگەیشتم، هەر وەک جاران منجەمنجدەکا و هیچی دیکەی پێ نییە، منیش یەکەوڕاست پێم گوت: لە ئەم کاتەوە، پێوەندی هاوڕییەتی نەبێ، نامەوێ، هیچ جۆرە پێوەندییەکی (کاژیک)م بە تووە هەبێ. چونکە هەرچی (عوسمان ڕەشید) لە (سولەیمانی) بۆی باسکردم، هەمووی ڕاستبوو.
ئینجا بایدایەوە و چەندین سوێندی بە گۆڕی شەهید (عومەری ساڵح مەنسوور) خوارد، کە ئەویش وەک من، ئاگای لە ڕێکخستنەکە هەبووە و دەسی ئەویشیان کردووە بە زاخا! پاشان کاتێ پێی زانیوە، لەگەڵ (عەبدوڵلائاگرین) زۆر خەریکبووە، سەرلەنوێ دەسپێکەنەوە و ڕێکخستن دامەزرێننەوە. پێشنیازیشیکردووە، لیژنەیەکی نیوچەی خوێندکارانی (سولەیمانی) درووستکرێ، من و (فەرهاد) و هاوبیرێکی دیکە، کاری تێدا بکەین. بەڵام (ئاگرین) قایل نەبووە.
ئیدی من بەتەواوی بۆم ساغبووەوە، کە (کاژیک) هەرگیز ڕێکخستنێکی ڕێکوپێکی نەبووە، هەموو لیژنەی نیوچە، لق و سەرکردایەتی (کاژیک)، بە تەنیا هەر (عەبدوڵلا ئاگرین) خۆی بووە و بەڕێوەیبردووە. جا ئیدی ئەو خۆی لە ئەو کاتەدا، پێوەندی بە کێوە بووە، ئەو مەتەڵەم بۆ هەڵ نەدەهات!
پاشان لەگەڵ (فەرهاد) چووین بۆ لای ڕەوانشاد (عومەر شەمەیی)، ئەو کاتە ئەو، لەسەرەوە کاریدەکرد و لە (ئازادی)، خانوویەکیان دابوویە. ژوورێکی گەورەی هەبوو،

پڕبوو لە خەڵک. کە چووم، کاک (نوری) لە ئەوێ دانیشتبوو. منیش کەمێ دانیشتم و هێندێ دەمەتەقێکرا. یەکسەر تێگەیشتم، ئەو شەوە تا بەیانی، (عومەر) و (فەرهاد) لەگەڵ (نوری)دا، باسی جوڵانەوەکەی (پێنجوێن)یان کردووە. هەرچەندە (نوری)، زۆر بڕوای بە بیروباوەڕ و کارکردن نەبوو، ئەوانیش هێندەی دیکە، پەشیمانیانکردبووەوە. ئەو شەوەمان بەبێ دەمەتەقێوە درەنگکرد. بەڵام پتر باسی پەیوەندی نێوان شۆڕش و (ئێران)مان دەکرد. پاشان لە ئەوێ نووستین و بۆ بەیانی وەڵاممان بۆ هات، گوتیان: ئێوارە چەن لێپرسراوێکی گەورە دێن و قسەتان لەگەڵ دەکەن. ئێمەش تا ئەو کاتە، هەموو پێشمەرگەکانمان کۆکردەوە.

## کوڕانی بارزانیی

ئێوارەی ڕۆژی (15. 8)، تاریکیکردبوو، پێشمەرگەکان هەموویان کۆببووبوونەوە و چاوەڕێیانەکرد. لەپڕ لەسەر جادەکە، چەن ترومبێلێ وەستان. هێندێ پێشمەرگەی جامانە سوور، هەر زوو دابەزین و خێرا چواردەوری ئەو ناوەیان گرت. پاشان جووتە برای بارزانی (ئیدریس) و (مەسعوود) دابەزین و ڕووەو ئاپوورەکە هاتن. سڵاویانکرد و زۆر بەگەرمی، بەخێرهاتنیانکردین. بەتانییەکمان ڕاخستبوو، (ئیدریس بارزانی) دانیشت و (مەسعوود)ی برا پچووکیشی، لە دوایەوە بێدەنگ، بەپێوە وەستابوو.
ئینجا کاک (ئیدریس)، هێندێ قسەی بۆ کردین و گوتی: ئەی کوڕە ئازاکانی شاری هەڵەبجە و قووربانی! بیرتان نەچێ، ساڵی (1963)، لیوای (20)ی سوپای (عێراق)، چی پێ کردن. ئەوا ئەوڕۆ لە ئەم ناوەن و ئێوەمان بۆیە هێناوە، تۆڵەی خۆتانیان لێ بکەنەوە. ئیدی هەروا گەلێ قسەی دیکەی کرد و ماوەی چارەکێکی خایاند. پاشان گوتی: گەر پرسیارێکتان هەیە، فەرموون. ئینجا گوتی: چیتان پێویستە؟ بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. کاک (مەسعوود)یش، هیچ قسەی نەکرد. ئیدی ماڵئاواییانکرد و چۆن هاتبوون، هەرواش گەڕانەوە. کاک (نوری)ش بەڕێیکردن.
لە ڕاستیدا، قسەکانی (ئیدریس) زۆر ساکاربوون. هەر نەیدەزانی، پێشمەرگەکان چۆن هانبدا، تا شەڕیان بۆ بکەن. کاتێ گوێم لە ئەو قسانە بوو، لە دڵی خۆمدا پێکەنیم دەهات. چونکە قسەکانی ئەوەی پیشاندەدا، ئەو کوشتارەی لیوای (20) ساڵی (1963)، لە دانیشتووانی (سولەیمانی) کردبوو، ئیدی ئەو کارەساتە تەنیا هەر پەیوەندی بە خەڵکی ئەو شارەوە هەیە، هیچ پەیوەندییەکی بە هەموو گەلی کوردەوە نییە. تا لە هەر کونییەکی (کوردستان)، لیوای (20) و هێزەکانی دوژمنیان دەسکەوت، تۆڵەی خۆیانیان لێ بکەنەوە. بەڵکوو دەبێ، هەر خەڵکی (سولەیمانی)، بە دەستی خۆیان، تۆڵەی ڕەشە کوژییەکەی ڕۆژی (9. 6. 1963) بکەنەوە!

ئینجا پێشمەرگەکانیش لەنێوخۆیاندا، باسی قسەکانی (ئیدریس بارزانی)یان دەکرد، هەر کۆمەڵێ بە شێوەیە لێکیاندەدایەوە و زەردەخەنەیان بوو. من و (وریا، ئیهاد، شوان و تەها)، لە سووچێکەوە دانیشتبووین، گاڵتەمان بە ئەو قسانە دەهات. پاشان (نوری) گەڕایەوە، بانگیکردم و گوتی: قسەکانی کاک (ئیدریس) چۆن بوو؟ منیش پرسیارەکەم بە خۆی فرۆشتەوە و گوتم: ئەی تۆ دەڵێی چی؟ ئیدی هەردووکمان پێکەنین و هیچ قسەمان نەکرد. ئینجا گوتی: سەرلقەکانم بۆ کۆکەرەوە. منیش خێرا هەرچوار سەرلقەکەم بانگکرد و دانیشتین. (نوری) گوتی: ئەم شەو کاژێری (12)، ترومبێلمان بۆ دێ و بەرەو بەرەکانی جەنگ دەڕۆین. بەڵام نەیگوت، بۆ کوێ دەچین.

ئەو شەوە، هەر لە کاژێری (9)وە، پێشمەرگەکان لێی نووستن. جگە لە من و (نوری) و چوار سەرلقەکە، کەسی دیکە نەیدەزانی، کەی دەڕۆین. خەومان لێ کەوتبوو، لە دەنگی هارەهاری ترومبێلەکان خەبەرمانبووەوە. هەر زوو هەموو پێشمەرگەکان هەستان، خۆیان کۆکردەوە و سواربوون. کاژێری یەکی شەو بەڕێکەوتین. (فوواد یاسین) و (قادری حاجی عەلی) و چەن پێشمەرگەیەکیش، لە بارەگەی بەتالیۆن لە (ئازادی) مانەوە.

## هاودیـــان

دەمەوبەیانی ڕۆژی (16. 8)، هێشتا تاریکولێلبوو، لە گوندی (هاودیان) دابەزین. (هاودیان) گوندێکی چکۆلانەی جوانبوو، هەرچواردەوری داروودرەخت بوو. نزیک جادەی ڤیربوو. بەرەکەی دەشتێکی فراوانبوو. بەڵام پاڵی بە زنجیرە چیایەکی سەخت و گەورەوە دابوو. گوندەکە لە چەن پیرەمێردێ پتر، کەسی دیکەی تێدا نەمابوو.

پێشمەرگەکان دابەزین و یەکسەر بەرەو مزگەوت ڕۆیشتن. مزگەوتەکە دیواری نەبوو، کراوەبوو. حەوزێکی گەورە و خاوێنی پڕ لە ئاو، لە دامێنی مزگەوتەکەدا هەبوو. خەریکی دەموچاوشتن بووین، لەپڕ دوو فڕۆکەمان لێ پەیدابوو. گوندەکەیان بە بۆمبا و شەستیر داگرتەوە. چەن فەرەیەکیانکرد و پاشان دەنگیان نەما. کەس فریای ڕاکردن نەکەوت، لە تاواندا هەر پێشمەرگە بوو، خۆی بەزەویدا دابوو. هێندێکی دیکەش دوای یەکەمین دەسڕێژ، ڕایانکرد و دوور لە ئاوایی، لە پەنا بەردەکاندا خۆیان شاردەوە.

من و (نوری) لە پەنا دیوارێکدا، خۆمان ماتدابوو. ئیدی کە فڕۆکەکان ڕۆیشتن، یەکسەر هاتینەدەرەوە. گوێمان لە ناڵە و هاواری پێشمەرگە بریندارەکان بوو. بەپەلە بەدەنگ هاواری بریندارەکانەوە چووین و برینپێچەکانیش، برینەکانیان بۆ تیمارکردن. تەرمی شەهیدەکانیشمان کۆکردەوە. هێشتا پێشمەرگە، نانی بەیانی نەخواردبوو، تەقەی نەکردبوو، (7) بریندار و (3) شەهیدمان هەبوو. لەنێو بریندارەکاندا، (شوان)ی هاوڕێمی تێدابوو، فیشەکێ بەر ڕانی کەوتبوو. کە چوومە سەری، یەکسەر گوتی: جگەرەیەکم بۆ داگیرسێنە. منیش ماچمکرد و گوتم: بە هەرزان ڕزگارتبوو!

ئێمە هەڵەیەکی گەورەمان کرد، چونکە ئەوە بەرەی پێشەوەی جەنگبوو، دەبووایە، کاتێ پێشمەرگەکان دابەزین، (نوری) ڕێی هیچ کەسێکی نەدایە، ملی ڕێی نێو ئاوایی بگرێ، بەڵکوو هەر یەکسەر، لە بناری شاخەکە کۆببووینایەتەوە!
پاشان (نوری) زۆر تووڕەبوو، هاواریدەکرد و لەبەرچاوی ئەو هەموو پێشمەرگانە، گەلێ قسەی ناشیرینی، بە ڕەوانشاد (حەمەئەمین گوڵچین) گوت، ئەویش گوتی: با وابێ، ئێستە وەڵامت نادەمەوە، بەلام با من و تۆ بمانمێنێ، گەر ماین، چارتدەکەم! بەداخەوە، لە ئەو جەنگە دەسەویەخەیەدا نەگەڕایەوە و زۆر مەردانە شەهیدبوو!
دوایی بریندارەکانمان کۆکردەوە، هەموویانم بە ئەو ترومبیلانەی پێی هاتبووین، ڕەوانەی (گەلاڵە) کرد، (نوری)ش فرمانیدا، هەر (3) پێشمەرگە شەهیدەکە بنێژن، منیش چووم و بە هێواشی پێم گوت: گەر ئێستە، لەبەرچاوی ئەم پێشمەرگانە، تەرمی ئەم شەهیدانە، هەروا بە جلەکانیانەوە بنێژین، کارێکی خراپ لە وره و باری دەروونیان دەکا، هێشتا ترومبیلەکان نەگەڕاونەتەوە، با تەرمەکانی ئەوانیش، بۆ سەرکردایەتی بنێرینەوە، لە ئەوێ بیاننێژن باشترە، گوتی: ئەمە بەرەی جەنگە و شۆڕشە، تۆ سەر لە کاری سەربازی دەرناکەی و نابێ، هەست و سۆز کارتێبکا، ئێمە پێمان ناکرێ، لە هەر شوێنێ یەکێ شەهیدبوو، بۆ شوێنی خۆی بینێرینەوە و ڕادەسی کەسوکارەکەی بکەینەوە، بەڵکوو گەر تەرمەکانیانمان دەسکەوتەوە، دەبێ، هەر لە ئەو شوێنەدا بیاننێژین.
من تێگەیشتم، قسەکانی زۆر ڕاستن و لە مێژە پێشمەرگەیە، بە چەندین ڕۆژی وا سەخت و پڕمەینەتدا تێپەڕبووە، ئەزموونێکی زۆریشی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر گوتم: ڕاستدەکەی، بەلام خۆ هێشتا کاتمان هەیە، دەسمان بەتاڵە، ترومبیلەکانیش بە چۆڵی دەگەڕێنەوە، تکایە ئەم کارە بە من بسپێرە، با بیاننێرینەوە، کەی تووشی بارێکی وابووین، ئەو کاتە هەر لە ئەو شوێنەدا، تەرمی پێشمەرگەکان دەشارینەوە، باشبوو، گوتی: با قسەی تۆ بێ، لە بەتانییەکانی خۆیانیانەوەیان بپێچن، ناوەکانیان لێ بنووسن و ڕەوانەی دەزگەی (مەکتەبی عەسکەری)یان کەن، ئیدی ئەوەبوو، لەگەڵ بریندارەکاندا، (تەها)ی هاوڕێم نارد و تا ئاوڕیشم دایەوە، هەر سێ برییچەکەش، هەر زوو لەنێو خۆیاندا ڕێککەوتبوون و لە ترساندا دیارنەمان!
دوایی لە ماڵێکی چۆڵکراوی گوندەکە، بارەگەی بەتالیۆنمان دانا، (نوری) و هەرچوار سەرلقەکە، کۆبوونەوەیەکی داخراویان کرد، بڕیاریاندا، بەزووترین کات، بەچیاکەدا هەڵگەڕێن، شارەزایەکیان پێشکەوت و وردەوردە، لقەکان بەدوای یەکدیدا ڕۆیشتن، من و ڕەوانشاد (ئەنوەری توفیق هەورامی)، لە بارەگەی بەتالیۆن ماینەوە، هەرچەندە

داوامان لە (نوری) کرد، ئێمەش لەگەڵیان بچین، بەڵام قایل نەبوو، گوتی: ئێوە دەبێ، پێشوازی لە تەرمی شەهیدەکان بکەن، یارمەتی برینەدارەکان بدەن، نان و ئاومان بۆ بنێرن.

هەر ئەوان ڕۆیشتن، هێندەی نەبرد، دوو فڕۆکەکە هاتنەوە، جارێکی دیکە، گوندەکەیان داگرتەوە. بەڵام جگە لە ئێمە، کەسی دیکەی تێدا نەمابوو. من و (ئەنوەر)یش، هەر یەکە لە پەنا تاشەبەردێکدا، خۆمان ماتدابوو. فڕۆکەکان تا تاریکبوو، بواریان نەدەدا، هەر دەسووڕانەوە و جارجارێکیش، دەسرێژێکیان دەکرد. ئیدی تا ئێوارە نەمانتوانی، بۆ نێو گوندەکە بگەڕێینەوە، بێ نان و ئاو ماینەوە. من تفەنگە سەرتۆپەکەی خۆمم پێبوو، دەردی (نیهاد)ی هاوڕێم دەیگوت: <u>گوچانێکت پێ بوایە، گەلێ لە ئەم تفەنگە باشتربوو!</u>

(ئەنوەر)یش تازە لە سوپای (عێراق) هەڵاتبوو، زۆر شتی دەزانی، بەڵام هێشتا بە فەرمی پێشمەرگە نەبوو، بەزۆری خۆی لەگەڵمان هاتبوو، چەکیشی پێ نەبوو! بەڕاستی کوڕی بوو، لە مردن نەدەگەڕایەوە، زۆر وورەی بەرز و ئازا بوو. زۆر دڵنەوای منی دەکرد. چونکە من کەمێ دەترسام، ئاخر ئەوە یەکەمین جارمبوو، بە ئەو شێوەیە و ڕاستەوخۆ، بەشداری لە بەرەی جەنگدا بکەم، فڕۆکەکانیش ماوەیان نەدەدا، سەربدەربێنین. لەبەر خۆشمەوە دەمگوت: باشە، ئەمانە خۆیان کورد نین؟ هێزی پێشمەرگەیان نییە؟ بۆ وا ئێمەیان، لە ئەو پەڕی (کوردستان)ەوە هێناوە و لێرە بەرەڵایانکردووین؟ ئاخر ئێمە شارەزای جوگرافیا و تۆپۆگرافیای نێوچەکە نین!

لە ئەو ناوەشدا، هێندێ جار پێشمەرگەکانی هێزی (باڵەک) دەبینران و هاتوچۆیاندەکرد، نازانم، خەریکی چی بوون؟! هەموو خۆیان زۆر جوان گوریبوو، هەر دەسووڕانەوە. بەڵام فڕۆکەکان تا درەنگانێ، هەر بەردەوامبوون، بە نزمی بەسەر گوندەکەدا دەفڕین و بۆمبارانی بەرەی جەنگەکەیان دەکرد. ئەو بۆمبانەی بەسەر ئەو چیا بەرز و سەختانەدا بەریاندەدایەوە، بەر هەر شوێنێ دەکەوتن، پارچەپارچەیدەکرد و هەر تەلیزمەبەرد بوو، بە ئاسماندا دەچوو، پاشان بە ئەملا و ئەولادا بڵاودەبوونەوە، زۆر ترسناکبوو.

سەرەتا وڕبووبووم، بەڵام دوای ماوەیە هێوربوومەوە. هەردووکمان لەپەنا بەردەزلەکان هاتینەدەرەوە و بۆ بارەگەی بەتالیۆن گەڕاینەوە. هێندێ پێشمەرگەی هێزی (باڵەک)، لە ئەشکەوتێکی سەروو گوندەکە بوون، خێرا چووم و ڕەوشی خۆمانم بۆ باسکردن، ئەوانیش دوو یەستریان دامێ، نان و ئاومان بارکرد و دوو پێشمەرگەیان لەگەڵ نارد، تا فریای پێشمەرگەکانی بخەن. (ئەنوەر) گوتی: من لە ئەوە زیاتر ناتوانم، لێرە بمێنمەوە. ئیدی منی بەتەنیا بەجێهێشت، لەگەڵ یەسترەکاندا ڕۆیشت و نەگەڕایەوە!

**ئەبەردییەکی قارەمانانەی کەم وێنە!**

زنجیرە چیای (گۆرەز)، چەن چیایەکی زۆر بەرز و سەختن. لووتکەی چیاکان، بەسەر هەموو ئەو ناوچەیەدا دەڕوانن. هەموویان بە ڕەبایەی سەربازی توندوتۆڵ تەنرابوون. سەربازەکانیش، ئاگایان لە هەموو جوولەیەکی گوند و جادەکان بوو. هەمیشە لە ئەوێوە، ئەو ناوەیان بە هاوەن دادەبێژا. ڕەبایەکانیش زۆر قایمبوون، هەرچواردەوریشیان، بە مین چێنرابوون. تەنیا هەر بە فڕۆکەی هالیکۆپتەر، خواردن و تەقەمەنییان بۆ دەچوو. بە کورتی، ئەوان شوێنەکەیان زۆر باشبوو. بەسەر شوێنی هێزەکانی پێشمەرگەدا، زۆر زاڵبوون و بەتەواوی، کۆنترۆڵی ناوچەکەیان کردبوو.

ئێوارەی ڕۆژی (16. 8. 1974) بوو، بەبۆنەی یادی دامەزراندنی (28) ساڵەی (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە، پێشمەرگە قارەمانەکان، پەلاماری ڕەبایەکانی چیاکەیان دا و تەقە گەرمبوو. کوڕە ئازاکانی پارێزگەی (سولەیمانی)، هەڵمەتێکی شێرانەیان برد و هەر یەکەمین ڕۆژ، هێندێکیان لێ تەفروتوناکردن. یەکەمین بریندار، (عەریف عەلی) ناوێکی خەڵکی (بەغدا) بوو، بەکۆڵ هێنایانەخوارەوە. هەر زوو ناو و ناونیشانی خۆی، لەسەر سەرەپاکەتێ بۆ نووسیم و گوتی: تۆ خوا گەر مردم، ئەمە ناونیشانی کەسوکارمە لە (بەغدا)، ئاگاداریانکەنەوە. ئیدی دوای ئەوە، یەک لە دوای یەک، برینداریان بەکۆڵ بۆ دەهێناین. منیش هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو، هەر سێ برینپێچەکە هەڵاتبوون، دەرمانیشمان لانەبوو، تا هێندێ تیماریانکەین. گەر شۆڕشێکی ڕێکوپێکبووایە، دیسیپلینی سەربازی هەبووایە، ئەو برینپێچانەیان دادگایی دەکرد و بە سزای خۆیان دەگەیاندن! بەڵام شۆڕشەکە، هیچی بەسەر هیچەوە نەمابوو. بۆیە ئەنجامەکەی، بە هەرەس وماڵوێرانی گەلەکەمان کۆتاییهات!

دوایی ناچاربووم، ئەم جارەش پەنا بۆ بنکەکەی هێزی (باڵەک) بەرمەوە. خێرا ڕامکرد و لە ئەشکەوتەکە، برینپێچێکی لێ بوو، هەرچی چۆنێ بوو، قایلمکرد و لەگەڵم هات. ئیدی یەکەیەکە، بریندارەکانی تیمارکرد و بە جیپەکان بەڕێمکردن. دوای ئەوان، ڕەوانشاد (تایەری حەمەمراد) برینداربوو، بەڵام برینەکەی ئاسانبوو. هەر بەپێی خۆی لە چیاکە دابەزی. ئینجا (ئیهاد)ی هاوڕێم هات و گولەیەک لە شلکەی ڕانی دابوو. بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو، کاتێ پێشمەرگەیەک لە دوورەوە، هاواری دەکرد، جنێوی بە برینپێچەکان دەدا و دەیگوت: (بلە) شێتی گەواد، لە کوێ خۆتان شاردووەتەوە؟ فریامکەون و وەرن، تیمارمکەن، هەر زوو زانیم، ئەو دەنگە، دەنگی (سلەیمان)ی قەسابە. گولەیە لە قوڕگی دابوو، خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو، هەموو ڕوخسار و ملی، بە خوێن داپۆشرابوو. بە کۆڵی (وریا براخاس)ەوە بوو، هێشتا هەر دەیقیڕاند. ئیدی بەپەلە تیماریانکرد و ڕەوانەمانکرد، چەن ڕۆژێ دواتر، شۆڕش ڕەوانەی (تاران)ی کردبوو.



نیهاد مەحموود ئەمین ( **1944 – 2008** )

دوای دووشەو، هەموو رەبایەکان گیران. وەک پێشمەرگەکان بۆیان گێرامەوە، زۆربەی سەربازەکان، لە شەرەکەدا کوژران. هێندێکیشیان تا دوافیشەک جەنگابوون و خۆیان بەدەستەوە نەدابوو. پاشان لە ئەو چیا سەختە بەرزانەوە، بەدەم (هەلهولە للبعث الصامد)ەوە، خۆیان هەلدابووەخوارەوە! تەنیا یەک سەربازی ڕیوەڵەی رەشکەلەی چکۆلانە، بە دیل گیرا بوو، ئەویش دوای ملازم (نیزاری عەقید ئەمین) کەتبوو، دەیگوت: گەورەم تۆ لە هەر کوێ بی، لەگەلتدەبم. زۆر دلی بە ئەوە خۆشبوو، کە ڕزگاربووبوو. پێشمەرگەکانیش شۆخییان لەگەل دەکرد. دوایی ناردمان بۆ سەرکردایەتی.

هەرچەندە لە ئەو نەبەردییەدا، سەرکەوتنێکی گەورەمان بەدەسهێنا، چەکێکی زۆرمان دەسکەوت. بەلام بەداخەوە، سەربازەکان بە تفەنگە قەناسەکانیان، گەلێکیان لێ بریندار و شەهید کردین. لەلایەکی دیکەشەوە، لە کاتی چەک کۆکردنەوەدا، هێندێ پێشمەرگە، مینیان پێدا تەقیبووەوە و گیانیان لەدەسدابوو. تەنیا لە ئەو دوو نیوارەیەدا، (**43**) بریندار و (**17**) شەهیدمان هەبوو. لەنێو شەهیدەکاندا، (حەمەئەمین گولچین)ی سەرلق بوو، کە لە سەرەتای شۆرشەوە، پێشمەرگە بوو. پیاوێکی زۆر ئازا و بەرێز، کوردێکی نەتەوەیی و دلسۆز بوو. هەروەها (حەسەنە رەش)ی پوورزای ملازم (نیزار)یش شەهیدبوو، کاتی خۆی جەلالی بوو، بەمناسی، کورێکی ئازابوو، زووزوو سەردانی (ئەحەی دادی) دەکرد و سەری لە (یەکێتی جووتیاران) دەدا. دۆستایەتیمان زۆر خۆشبوو.



حەمەئەمین گولچین ( **1939 – 1974**)

زۆری پێ نەچوو، (ئەنوەری تۆفیق هەورامی)، بە ئاربیجییەکەوە پەیدابووەوە، زۆرم پێخۆشبوو، بەساغی بینیمەوە. وەک باسیاندەکرد، یەکێ لە هەرە کورە ئازاکان بوو، هەموو ئاربیجییەکان، ئەو بە رەبایەکانییەوە نابوو. ئیدی لەبری چەکێ، کلاشینکۆفێک و ئاربیجییەکی پێبوو. (نوری)ش لە گەڕانەوەماندا، بردی بۆ (مەکتەبی عەسکەری) و بە فەرمی کردی بە پێشمەرگە!

دوای ئەوەی دووشەو و دووڕۆژ شەڕبوو، هێزی پێشمەرگە زۆر بەباشی جەنگابوون و توانیان، لووتکەی هەموو زنجیرە چیاکان بگرن و لە هێزەکانی دوژمن پاکیانکەنەوە، خواردن و خەویان لێ حەرامبووبوو، بەتەواوی ماندووبووبوون. بەڵام هێشتا هەر ورەیان بەرزبوو.

ئێوارەی ڕۆژی سێیەم، بەتالیۆنێکی هێزی (زمناکۆ) هاتن و بەتالیۆنەکەی ئێمەیان گۆڕی. فەرماندەی بەتالیۆنەکە، ناوی (هاواری نوری حەلاو) بوو. بەداخەوە هەر ئەو ئێوارەیەی سەرکەوتبوون، مینێ لەژێر پێیدا تەقیبووەوە و یەکسەر شەهیدبووبوو. ئیدی ئێمە، بەرەو (ئازادی) گەڕاینەوە. پاشان سوپای (عێراق) بەکۆپتەرەکانیان، هێزێکی دیکەیان، لە چیاکە دابەزاندەوە، سەرلەنوێ چیاکەیان داگیرکردەوە و بەتالیۆنەکەی (زمناکۆ)ش، دوای تێکرژانێکی دەسەویەخە، کشابوونەوە! *

سەرلەئێوارەی ڕۆژی (18. 8) بوو، لە گوندی (هاودیان) گەڕاینەوە. ڕۆژی (19)ی مانگ، بەیانی زوو لەنێوچەی (ئازادی) دامەزراینەوە. ئەو چەن ڕۆژەی لە ئەوێ بووین، زۆربەی کات لای (عومەر شەمەیی) بووم.

## سەردانێکی کتوپڕ

ئێوارەی ڕۆژی (20. 8) بوو، جووتە برا (فەرەیدوون عەبدولقادر) و (فەرهاد)، سەریان لێ دام. (فەرەیدوون) لە مێژبوو، پێوەندی بە شۆڕشەوە کردبوو. لە نێوچەی سەرکردایەتی جێگیربووبوو، بەڵام پێشمەرگە نەبوو، سکرتێری (نووری شاوەیس) بوو. قەمرەیەکی سپی نوێی پێبوو. گوتی: لای لێپرسراوێکی کوردەکانی ئەو دیو بانگکراوین، تۆش لەگەڵمان وەرە، بەڵام نابێ، بە هیچ شێوەیە، دەمەتەقێ لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا بکەی. منیش ئەو ئێوارەیە، هیچ کارێکم نەبوو، حەزمدەکرد، بزانم، ئەو شوێنە کوێیە و خاوەن ماڵەکەش کێیە؟!

---

* کاتی خۆی لە ژمارە (794)ی ڕۆژی (16. 8. 2010)ی لاپەرە (18–25)ی گۆڤاری (گوڵان)دا، لە گوتاری (داستانی قارەمانانەی شێرەکورانی کورد لە چیای گورەز)، بیرەوەری ئەو ڕۆژانەم، بە درێژی بڵاوکردووەتەوە. هەروەها لە پەرتووکی (بارانی خوێن و بای مەرگ) و لە لاپەرە (98–115)شدا، بۆ دووەمین جار بڵاومکردەوە.

ماوەیە بەرەو سنووری نێوان، هەردوو بەشەکەی باشوور و خۆرهەڵاتی (کوردستان) ڕۆیشتین، پاشان گەیشتینە هۆردووگەیەک، زۆربەیان ڕەشماڵیان هەڵدابوو، هێندێکیشیان کەپریانکردبوو، لە ماڵی پیاوێکی چوارشانەی بەخۆی ڕێکوپێک دابەزین و منیان پێ ناساند، وا بزانم، ناوی (ڕەسوول) بوو، گەر ناوی ڕاستەقینەی خۆی بووبێ! برنج و گۆشتاوێکی زۆر بەتامیان لێنابوو، دوای ئەوەی نانمانخوارد، لەبەر تیشکی زیوینی ئەو مانگەشەوە جوانەدا دانیشتبووین، بەدەم چاخواردنەوەوە، قسەماندەکرد.

کاک (ڕەسوول) بە قسەکانیدا دیاربوو، پیاوێکی زۆر ئازابوو، گەلێ قسەی ڕێکوپێکی بۆ کردین، بەڵام هەر تاوەناتاوێ، هەناسەیەکی هەڵدەکێشا و دەیگوت: چاری دەسمان بەسراوە و ناتوانین، هیچ بکەین. ماوەیە لە ئەوێ دانیشتین و پاشان گەڕاینەوە. لە ڕێگە (فەرەیدوون) گوتی: دانیشتنەکەت پێ چۆن بوو؟ گوتم: گەلێ خۆشبوو، بەڵام ئەو پیاوە کێ بوو؟ گوتی: یەکێ لە ناودارەکانی (حیزبی دیمۆکراتی ئێران)ە و لە ئەوێ دەژی!

## پەتایەکی ناوەخت

ماوەی **(3)** ڕۆژ پشوویەکماندا، پاشان سەرلەئێوارەی (**21** **8**)، ڕەوانەی (گەرووی مێگر)یان کردین. ئەو کاتە زۆر بێهێز و لاواز بووم. بەتەواوی جەستەم تێکچووبوو، هەستمدەکرد، وردەوردە بەرگریم کەمبووە و توانام نەماوە . بەڵام نەمهێشت، بە هیچ شێوەیە (نووری) بزانێ. لە دڵی خۆمدا گوتم: ئێستە وا دەزانێ، لە ترساندا خۆم نەخۆشخستووە. چونکە لەسەر نووێبوونەوە و کارکردنی (کاژیک)، ساردییەک لە نێوانماندا درووستبووبوو، وردەوردەش، ئاکۆکییەکەی نێوانمان ئاوێدەسەند. ئەو لە ئەوەدابوو، وازبێنێ و بەرەو دەستەی (کاژیک)ە کۆنە کیسەڵڕەوەکان بڕوا. لەبەرئەوە گوێم نەدایە و ئێوارە تاریکبوو، لەگەڵ بەتالیۆنەکەمان بەڕێکەوتم. لە پێشی لۆرییەکدا سواربووم، شۆفێرەکە خەڵکی (سولەیمانی) بوو، زۆر کوڕێکی باش و قسەخۆشبوو، ناوی (موحەممەد) بوو. جاروبار دەنگی لێ بەرزدەکردەوە و گۆرانی دەگوت. هاواریدەکرد: کوڕە کاکە (شێخ) ئەوە چیتە؟ بۆ وا بێ هەست و بێزاری، ژیان ئەوە ناهێنێ. کێ دەڵێ، ئەم جارە دەگەڕێینەوە! با تۆزێ گۆرانی بڵێین و کەمێ پێبکەنین. منیش ئاوێ وەنەوز دەیبردمەوە و ورببووبووم، ئاوێکیش لە دەنگی ئەو ڕادەپەڕیم و بەئاگادەهاتمەوە.

لۆرییەکە، دواکەی پڕبوو لە خواردەمەنی و تەقەمەنی. چەن پێشمەرگەیەکیش لە دواوە سواربووبوون و بەشێوەیەکی بەردەوام، هەر دەنگەدەنگیانبوو. تا بە گەرووێشکەخەو و بەدەم نرکاندنەوە، شەومان ڕۆژکردەوە و بەرەبەیان گەیشتینە (پردی حاقز). لە ئەوێ چاومان بە (عەبدوڵڵائاغا)ی فەرماندەی هێزی (باڵەک) کەوت، یەکێ لە خۆشەویست و نزیکەکانی سەرۆک (بارزانی) بوو. هێندێ بەرچاوڕوونی دایێ.

بەڕاستی من خەریکبوو، لە هۆش خۆم دەچووم. ئاگام لێ نەبوو، (حەمە)ی شۆفێر بە (نوری) گوتبوو: باوەڕناکەم، ئەو پیاوە لە ئەوە پتر بڕیکا، چونکە تا ئێرە، هەر بەدەم خەوەوە نالاندوویەتی و زۆر نەخۆشە، با لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە. خوا هەڵناگری، (نوری) هات، بەدەم پێکەنینەوە، پلارێکی تێ گرتم و گوتی: هێشتا بستێکمان ڕزگار نەکردووە، ئەوا تۆ نەخۆشکەوتی! منیش پێکەنیم و گوتم: سەری تۆ خۆشبێ، هەر ڕزگاردەبێ! پاشان مەچەکی گرتم و گوتی: پلەی گەرمیت زۆر بەرزە و بە (حەمە)ی گوت: هەر ئێستە لەگەڵ خۆت بیبەرەوە و با لە نەخۆشخانە بکەوێ. هەرچی چۆنێ بوو، ماڵاوایمان لە یەکدی کرد و گەڕامەوە.

کاکە (حەمە)ی چی، دەتگوت بەرازە، ئەو شەو و ڕۆژە، لۆری لێ دەخوڕی و بەڕێوەبوو، خەو لە چاوانی نەکەوت، زۆر زیت و وریا بوو، هەر لە دەنگەدەنگ و بەزموڕەزمی خۆی نەدەکەوت. بەڵام بۆ نەگبەتی من، لە ئەو سەرەوە هاتین، لۆرییەکەمان باریشی قورسبوو، زۆر ئاسای دەڕۆی و هیچی نەبوو. خۆ گەر پەکیشمانبکەوتایە، خەممان نەبوو، چونکە زۆر بووین و دەمانتوانی، پاڵی پێوە نێین. کەچی کاتێ گەڕاینەوە، (2–3) جار کوژایەوە. ئەویش منی ڕادەچڵەکاند و هاواریدەکرد: هەستە هەستە، وا دیارە لێرە دەچەقین، فڕۆکەکان فریاماندەکەون و بۆمبارانماندەکەن. منیش ناچاربووم، بە ئەو ماندوویی و نەخۆشییە دابەزم، هێندێ پاڵنێم. لەپڕ دەکەوتەنێش و ئەویش پێیپێدادەنا، (200) مەتری دەڕۆی و لێم دووردەکەوتەوە. ئینجا سەرێدەردەهێنا و دەیقیژاند: ڕاکە ڕاکە یا فریاکەوین، ڕاکردن بۆ نەخۆشییەکەت باشە و قاقای پێکەنینیشی، ئەو ناوەی پڕکردبوو. منیش ناچاربووم، خێرا بڕۆم و خۆم بگەیەنمەوە پێشی لۆرییەکە.

هەرچەندە ئەو بەیانییە، هەوا خۆشبوو، بەڵام من سەرمامبوو، پەتۆیەکم لە خۆمەوە پێچابوو، چۆقەی ددانم دەهات. خێراخێراش دەکۆکیم. ماڵی (حەمە) ئاوابێ، هەرچی چۆنێ بوو، گەیاندمیە نەخۆشخانە و دایبەزاندم، پەلیگرتم و بردمیە ژوورەوە. دوای ئەوەی دوکتۆرەکە سەیریکردم، گوێی لە دەنگی سنگ و هەناسەم گرت، گوتی: نەخۆشی گرانەتات هەیە و دەبێ، لێرە بکەوی، تا چاکدەبیتەوە. دەرزییەکی لێدام، چەن گولاجێکی سەوز و سووریشی دامێ. بە دوکتۆرەکەم گوت: گەر ڕێمبدەی، لێرە ناکەوم و لە (ئازادی) برادەرێکم هەیە، لای ئەو دەمێنمەوە و ئاگای لێم دەبێ، گوتی باشە، بەڵام هەموو ڕۆژێ دەبێ، بێی بۆ ئێرە. هەر هێندە گوتم، باشە، ئیدی بەتەواوی، ئاگام لە خۆم نەما. (حەمە) یارمەتیدام و سواریکردم، لەبەر ماڵی (عومەر شەمەیی)دا دایبەزاندم. هەر چوومەژوورەوە، یەکسەر پاڵکەوتم و نووستم. بۆ ڕۆژی دوایی، (سیروانی عوسمانی سەعەی مەلاعەبباس) خەبەریکردمەوە و گوتی: کاکە گیان هەستە، ئەوە ماوێ، ئەو

هەموو ناڵەناڵ و ترکەترکەت لە چییە، ئێمە وامانزانی، دەمری! هەستە شتێ بخۆ. چاوم هەڵبڕی، (سیروان)م بینی، هەستام و یەکدیمان ماچکرد. خێرا دەموچاوم شت، هەوایەکی سازگارم وەرگرت. کەمێ هەستم بە حەواندنەوە کرد و ماندوویی بەریدابووم. (عومەر)یش خواردنی نیوەڕۆی ئامادەکردبوو، برنج و شلە، زەڵاتە و ماستاوی دانابوو، هەرسێکمان پێکەوە دانیشتین و یەک لە یەکدی پرسیاربووین، تا تێرمان نەخوارد، دەسمان هەڵنەگرت. بەڕاستی نازانم، بڵێم: باشی لێنابوو، یا خراپبوو، بەڵام هێندە دەزانم، لە ژیانمدا خواردنی هێندە بەتامم نەخواردبوو!
دوای ئەوە (سیروان)، قەمەرەیەکی ڕاگرت و بردمی بۆ خەستەخانە. دوکتۆرەکە سەیریکردم و گوتی: ئەوڕۆ باشتری، بەڵام بۆئەوەی لێت ئازمنەکاتەوە، دەبێ، ماوەی (3) ڕۆژی دیکەش بکەوی و هەموو ڕۆژێکیش، دەرزی لە خۆت بدەی. ئیدی ئەو ماوەیە، هەموو ڕۆژێ لەگەڵ (سیروان) یا (عومەر)دا، سەردانی نەخۆشخانەم دەکرد و دەرزیم لە خۆم دەدا. تا هەستمکرد، چاکبوومەوە و دەتوانم، بۆ لای بەتەلیۆنەکەمان بگەڕێمەوە.
ڕۆژێ لە ئەو هاتوچۆیەدا بووم، دوکتۆر (موحسین)ی هاوڕێم لە (گەلالە) دی، ئەو هاوڕێیەی ساڵی (1972)، ڕاپۆرتی لەسەر نووسیبووم و لە (پارتی) بەدەرکردنیدام! ڕووی نەدەهات، بەتەواوی تەماشامکا و زۆر شەرمەزاربوو. داوای لێبووردنی لێ کردم و گەلێ لەگەڵم خەریکبوو، بچمە ماڵیان. بەڵام من کاتی ئەوەم نەبوو، نە وەڵامی بدەمەوە و نە بانگهێشتنەکەشی قەبوڵکەم!

## گەرووی مێگر

ڕۆژی (24. 8)، لەگەڵ چەن پێشمەرگەیەکی خۆماندا گەڕاینەوە، کە هێندێکیان کاری تایبەتیان هەبوو، هێندێکی دیکەشیان بەهۆی نەخۆشییەوە هاتبوون. یەکێ لە ئەوانە (جەزای ئەحەشانە – جەزاشەل) بوو.
کاکە (حەمە)، تا سەر (پردەکەی حافز)ی بردین و خۆی گەڕایەوە. ئێمەش بەپێ، بەرەو گوندی (دەرگەڵە) بەڕێکەوتین. دانیشتووانی ئەو گوندە، زۆر نێوانیان لەگەڵ پێشمەرگەدا باش نەبوو، وەک بیستم، زۆربەیان سەر بە (پارتی کۆمۆنیستی عێراق) بوون. گوندەکە تا بڵێی، دڵگیر و خۆش و خاوێن بوو. لە مزگەوتەکە کەمێ دانیشتین و پشوویەکماندا. خۆمان فێنککردەوە و پاشان، بە چیای (کاروخ)دا هەڵگەڕاین.
ئێوارە گەیشتینە گوندی (سەران) و ئەو شەوە لە ئەوێ ماینەوە. بۆ نانی ئێوارە، لە ماڵان دامەزراین و دواییش، لە مزگەوتەکە نووستین. بەیانی زوو، پێشمەرگەکانم

خەبەرکردەوە، نان و چامان خوارد و بەرەو (گەرەوەتان) ڕۆیشتین. لە ئەوێ چوومە لای چەن پێشمەرگەیەک، نانەوخانەیان دانابوو. هێندێ نان و نۆمان لێ وەرگرتن. گوتیان: بۆ کوێ دەڕۆن؟ گوتم: بۆ (گەرووی مێگر). گوتیان: تا تاریک نەکا، نابێ بڕۆن، چونکە لە ڕەبایەکانەوە دەبینرێن و تەقەتان لێ دەکەن. ناچاربووین، بە قسەیان بکەین و بمێنینەوە. کاتێ تاریکبوو، ئینجا بەڕێکەوتین. دوای دوو کاژێر گەیشتین. هەر لەگەڵ (نوری) چاوی بە من کەوت، زۆری پێ ناخۆشبوو، گوتی: بۆ گەڕایتەوە؟! گوتم: چاکبوومەتەوە، بیرمدەکردن و هاتوومەتەوە.

(گەرووی مێگر)، لە نێوچەیەکی زۆر بەرزدا هەڵکەوتووە و بەسەر (ڕەواندوز)دا دەڕوانێ. بەردەمەکەی هەمووی ڕەز و سەوزای بوو. گەرووەکە لە ئەوێوە، زۆر قووڵ و بەرز بوو. هەردووبەری لووتکەی شاخەکە، وەک جووتێ ماری عاشقەوماشقە، سەریان لە یەکدی نزیک کردبووەوە. بە شێوەیە ئاسمانی شین و بێگەردی سەر گەرووەکە، بە ئاستەم دیاربوو. ئاوێکی ڕوون، خاوێن و سازگاریش، بەنێوەڕاستی گەرووەکەدا دەڕۆی و ڕێگەی نێو ئەشکەوتەکەی دوولەتکردبوو. ئەستێرەکان لەگەڵ مرواری زیخی نێو ئاوەکەدا، سەرەتاتکێیاندەکرد! پردێکی تەختەی پچووکیش، هەردووبەری گەرووەکەی پێکەوە بەستبوو. لە ئەمبەر و ئەوبەری گەرووەکەشدا، پێشمەرگەکان بنکەکانی خۆیان لێ دامەزراندبوو. بەڕاستی گەر ئەو ڕۆژە نەبووایە، جەنگی (کوردستان) لە ئارادا نەبووایە، ئەو شوێنە هەر بۆ ئەوە باشبوو، لەگەڵ کۆمەڵێ برادەری خۆشەویستدا، چەن ڕۆژێ لەگەڵ هەوای سازگار و ئاوە خاوێنەکەی گەرووکە، لە ئەو ئاوە بەسەربەری و سەیرانی لێ بکەی. بەلام دەڵێی چی؟! ماڵ لە خانەخوێ حەرامکراوە و ئایەڵن، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، لە نیشتمانە ویرانەکەی خۆشیدا، کەمی بحەوێتەوە! هەرچەندە گەر بەهۆی شۆڕشەوە نەبووایە، بڕواناکەم، ئێمەش ئەو جێ خۆشە دڵفرێنەمان، بە چاوی خۆمان بدیایە!

گەرووەکە لە (ڕەواندوز)ەوە زۆر نزیکبوو. وەک پێشمەرگەکان باسیاندەکرد، بەڕۆژ بەئاشکرا سەربازەکان دەبینران. لەبەرئەوە (نوری) نەیدەهێشت، لە پاسەوانەکانی سەر گەرووەکە پتر، کەسی دیکە خۆی دەرخا. ئەوە جگە لە ئەوەی، هەموو ڕۆژێ بێ هۆ، هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە، لە (ڕەواندوز)ەوە بەبەردەوامی، ئەو ئاوەی بە تۆپ دادەگرتەوە.

لە ئەوێ چاوم بە هەردوو ڕەوانشاد (شێخ برایمە شەلە) و (نورەی مام برایم) کەوت، کە هەردووکیان دوو سەرلقی ئازابوون. زۆر سکالایان لە دەس (نوری) دەکرد و بەڕاشکاوی پێیان گوتم: ورەمان زۆر نزمە و پێشمەرگەکانمان زۆر ماندوون. قسە

لەگەڵ (نوری) بکە، بەڵکوو لەگەڵ هێزێکی دیکەدا بمانگۆڕن و لێرە بڕۆین. منیش زۆریان لەگەڵ خەریکبووم، واز لە ئەو بیرۆکەیە بێنن و ئەو بەزمەش تووشی من نەکەن. بەڵام کەڵکی نەبوو. تەنانەت ئەو دووانە، گوێیان لە (نوری)ش نەدەگرت و بە قسەیان نەدەکرد!

(نوری)ش لە ئەولاوە، هەر خەریکی سمێڵی بوو، بە چاویش چاودێری منی دەکرد، تا بزانێ، لەگەڵ کێدا قسەدەکەم. دوایی چووم بۆ لای و پێمگوت: حەزدەکەم، پێکەوە هێندێ قسەبکەین. پێشمەرگەکانی دەوروپشتی دوورخستەوە و گوتی: فەرموو. گوتم: بەتالیۆنەکەمان لە چی دایە و نیازی چیتان هەیە؟! گوتی: هەموویان باشن. بەڵام ئێمە لێرە بێکار دانیشتووین و چاوەڕێی فرمانی سەرکردایەتی دەکەین، چونکە ئێمە لێرە، تەنیا وەک پاسەوان واین و گەرووەکە دەپارێزین. ئیدی تێگەیشتم، ئەم جارە هێزەکەمان، بۆ پەلاماردان و هێرشکردن ڕەوانەنەکراوە. گوتم: پێشمەرگەکان ماندوون، لە ئەوە دەچێ، بێ شەڕ و پێکدادان، لێرە بێ تاقەتبن، کار لە ورەیان بکا. یەکسەر لێم تووڕەبوو، گوتی: ئەوە قسەی (شێخ برایم) و (نورەی مام برایم)ە، ئەوان پێیانگوتووی. منیش هیچ قسەم نەکرد. دوایی خۆی هەڵیدایە و گوتی: چارمان چییە؟! هەر دەبێ، چاوەڕێکەین. منیش گوتم: خۆت باشتری لێ دەزانی، ئیدی بێدەنگبووم. بەڵام ماندوویی، بێوزەیی و بێتوانایییەکی زۆریش، بە ڕوخساری (نوری) خۆشیەوە، بەئاشکرا دیاربوو. چونکە کەس لەنێو ئەو گەرووەدا، تا سەر هەڵی نەدەکرد، پێشمەرگەکان بێزاربووبوون و تاقەتیان نەبوو. جگە لە ئەوەی، جێگەکەیان تا بڵێی، پڕ مەترسی بوو!

دوای ماوەیە، (نوری) بانگیکردم و گوتی: چەن پێشمەرگەیەک لەگەڵ خۆت بەرە و بچن، بارەگەیەک لە (گەرەوانان)، لەسەر ڕێگەی (ناکۆیان) دانێن. لە ئەوێوە نان و خواردنمان بۆ بنێرن. گوتم: باشە. بەڵام با یەک دوو شەو، لەنێونتاندا بم. گوتی: نابێ، نەبێ، هەر ئێستە بڕۆن. (جەزای ئەحەشانە)ش لەگەڵ خۆت بەرە. (جەزا) کوڕی پووری بوو.

من بە هیچ شێوەیە نەمدەویست، هیچ جۆرە بەڵگەیەک، بەدەس (نوری)یەوە بدەم. حەزم دەکرد، خۆی لە کوێ بێ، منیش لە ئەوێ بم، چونکە وەک پێشتر ئاماژەمپێکرد، من لە ڕێکخستنی (کاژیک)دا لێپرسراوبیبووم، بۆئەوەی وا بیرنەکاتەوە، لەگەڵ خوێندکارێکی زانکۆدا کاردەکا! بەڵام چی بکەم، ئەوە پێشمەرگایەتییە و ئەو فەرماندەی بەتالیۆنم بوو، ناچاربووم، فرمانەکانی جێبەجێکەم.

منیش بە مامە (جەزا)م گوت: کێی دیکە لەگەڵ خۆمان بەرین؟ گوتی: هەقت نەبێ، دوو لادێیت بۆ هەڵدەبژێرم، هەر نان و چامان بۆ لێنێن! بەڕاستی، جگە لە هاورێکانی خۆم و لێپرسراوەکان، کەسی دیکەم لەنێو پێشمەرگەکاندا نەدەناسی. بۆیە گوتم: خۆت سەرپشکیە.

هەر ئەو شەوە، بەناچاری گەراینەوە و کاژێری (12)ی شەو گەیشتینەوە نانەوخانەکە. پێشمەرگەکان بەدەم گۆرانیگوتنەوە، هەر خەریکی نانکردن بوون. ئەو شەوە لە نانەوخانەکە ماینەوە.

## گەرەوانـــــــان

کاتێ بەیانی رووناکبووەوە، من و مامە (جەزا) رۆیشتین، ئەو ناوە گەراین، تا شوێنێکی باش، بۆ بارەگەی بەتالیۆن بدۆزینەوە. ئەوەبوو، بەرای هەردووکمان، شوێنێکی چەپەکمان هەڵبژارد و بنکەکەمان لێ دامەزراند. پاشان دوو پێشمەرگەکە هاتن، هێندێ داروبەروون و گەڵای درەختیان بری، جێیەکی باشیان بۆ ئامادەکردین، ئەو گەروو و چەم و دارستانە، تا دڵ پێی خۆشبێ، دیمەنێکی هێندە جوان و دڵفرێنی هەبوو.

بەرامبەرمان، خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر بوون، ئەوانیش لە ترسی تۆپ و فرۆکە رایانکردبوو، لەنێو گەرووەکەدا، لە بنتاشەبەرد و نێودارەکاندا، جێگەیان بۆ خۆیان سازکردبوو. بەزۆری منال، ئافرەت، پیر و پەککەوتە بوون. پیاوەکانیشیان پێشمەرگە بوون. بەلام دەتگوت، یەزدانی مەزن بۆ خۆی دانیشتووە و قۆلی لێ هەڵماڵیوە، بەدەس و پەنجەی پیرۆزی خۆی، تابلۆی روخساری شیرین و خەتوخاڵی، ئەو منال و کیژە جوانانەی کێشاوە و نەخشاندووە! منالەکانیان لە گەورەکانیان، کورەکانیان لە کیژەکانیان، ژنەکانیان لە پیاوەکانیان، یەک لە یەکی جوانتربوون. زۆربەیان قژیان کاڵ، موویان زەرد، چاویان شین و سەوز بوو، زۆر روویان خۆشبوو، هەمیشە دەم بەپێکەنین بوون، زۆر حەزیان بە تێکەلاوبوونمان دەکرد، سەرەرای ئەو دەربەدەری، لێقەوماوی و نەبوونییەش، هێشتا ئەوان دڵنەوایی ئێمەیان دەکرد و کاسەدراوسییەتیان لەگەڵ دەکردین. ئای چەن رۆژانێکی خۆشبوو، هەرگیز لە یادم ناچێ، هەمیشە بیرم لە ئەوە دەکردەوە، گوناحی ئەو هەموو زەرد و سوورە چییە، وا بە ئەو شێوەیە دەربەدەربوون و لە کەندری دامێنی چیاکان و بن پەلکی دارەکاندا دەژین؟! ئەو تاوانە گەورەیە، لە ملی کێیە؟! ئایا ئەوانیش حەزناکەن، لەنێو مالی خۆیان و لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا، بێترس و ناخۆشی، دوور لە سەرما و نەخۆشی، وەک مرۆ بژین؟!

ماوەیە لە (گەرەوانان) لێی کەوتین. هەر پێشمەرگەیە پەتوپەکی پێ بوو. لایەکی رادەخست و لاکەی دیکەی، بە خۆیدا دەدا. واتە، زەویمان رادەخست، ئاسمانمان بە خۆماندا دەدا و سەرینیشمان بەردبوو! هەموو رۆژێ سێژەمە. نان و چامان دەخوارد. هێندێ جاریش گوێزمان دەسدەکەوت. چونکە لە ئەو ناوە خواردن دەس نەدەکەوت. تەنیا یەک چاخانەی لێبوو، جاروبار تەماتە و ماستی دەفرۆشت.

هەموو رۆژێ پێشمەرگە، لە گەرووی (مێگر)ەوە دەهاتن و نانیان دەبرد. هەر کارێکی پێویستیش هەبووایە، (نوری) بە نامە ئاگاداریدەکردم. دوای چەن رۆژێ، نامەیەکی بۆ ناردم، داوای لێ کردبووم، سەردانێکی (ئاکۆیان) بکەم و چاوم بە فەرماندەی بەتالیۆن (مەلائەمین بارزانی) بکەوێ، سەبارەت بە ناوچەکە و هێزی پێشمەرگە، هێندێ زانیاری لێ وەرگرم، تا پتر شارەزای ناوچەکە بین.

## ئاکۆیـــان

بەیانی زوو، لەگەڵ مامە (جەزا) بەرێکەوتین. بارەگەکەی (مەلائەمین) زۆر لە ئێمەوە دوورنەبوو. هەر لە دوورەوە، دەنگی قووقەی کەڵەشێر، گارەگاری مریشک و قیرەقیری قەل دەهات. مامە (جەزا) گوتی: دیارە سەردانەکەمان چەورە، زوو هەڵمەسنە، با ئەم ئێوارەیە، لە نان و چا رزگارمانبێ!

کاتێ گەیشتین، (مەلائەمین) لەژێر کەپرێکی گەورەی خۆشدا دانیشتبوو، جگەرەی دەکێشا. خۆم پێ ناساند و دانیشتین. جگە لە ئەوەی، ئەو ناوە بەهەشتێ بوو، پەزدان لەسەر زەوی درووستیکردبوو، (مەلا)ش هێندەی دیکە خۆشیکردبوو! لە هەموو جۆرە گوڵێکی رواندبوو، دوو کەپری گەورەشی کردبوو، بە سونده ئاوی بۆ راکێشابوون. بە هەرچواردەوری کەپرەکەشدا، دۆشەکی داخستبوو. چەن سەرینێکی پەری گەورەی باگردین ئاساشی دانابوو، هەر لە دیوەخان دەچوو. خۆشی بە ئارەزووی دڵی خۆی، پاڵی لێدابووەوە، رادیۆیەکی گەورەشی لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو. چەن پێشمەرگەیەکیش، وەک خزمەتکار بەپێوە وەستابوون و چاوەروانی فرمانی، ئاغای فەرماندەی بەتالیۆنیان دەکرد!

بەلام خوا هەڵ ناگرێ، زۆر رێزی لێ گرتین، فەرمووی لێ کردین و دانیشتین. گەلێ قسەمانکرد و هێندێ زانیاری بەکەڵکم لێ وەرگرت. لەگەڵ ئەوەشدا، لە سەرجەمی قسەکانیدا وا تێگەیشتم، سەرکردایەتی شۆرشی کورد لە ئەو ناوە، هیچ جۆرە پلانێکی بۆ پەلاماردان، دەسوەشاندن و هێرشکردنە سەر هێزەکانی دوژمن نییە. بەلکوو تەنیا وەک هێڵێکی بەرگری وایە و داکوکی، لە ناوچە رزگارکراوەکان دەکەن و دەیپارێزن. چونکە لە ناوچەی سەرکردایەتی (پارتی) و شۆرشەوە نزیکبوو، تا سوپای داگیرکەری دوژمن، لە ئەوە زیاتر پێش نەکەوێ.

ئەز ئەو کاتە، ئەو تاکتیک و ستراتیژەی شۆرشم، بە مەرگی شۆرشەکە دەزانی. چونکە لەلایەکەوە، هێزەکانی پێشمەرگە، لە ئەو ناوە بێکار دەسوورانەوە و تاقەتیان چووبوو. لەلایەکی دیکەشەوە، هێزەکانی دوژمن، وەک لە سەیران بن، وابوو، چونکە هیچ جۆرە

ترسیکیان نەبوو. جگە لە ئەوەی، بە شێوەیەکی بەردەوامیش، تۆپبارانی ئەو نێوچانەیان دەکرد، ڕۆژبەڕۆژیش پتر، خۆیان ئامادەدەکرد، تا هێرشبکەن و زیاتر بێنەپێشەوە. گەر سەرکردایەتی شۆڕش، بە ئەوە ڕازیبوو، هەر لایەک لە شوێنی خۆی بچەقێ و نەجوولێ، ئەوا سوپای (عیراق)، بە ئەو پلانە قایل نەبوو، بەڵکوو پلانی تایبەتی خۆیان هەبوو!

ئاواتەکەی مامە (جەزا) هاتەدی. نیوەڕۆ، بە سینی برنج و تەماتە و مریشکی سوورەوەکراویان بۆ هێناین. دوو کاسە ماستاوی کولکنیشیان بۆ داناین. پاشان بە چای دیژلەمەی خەستوخۆلیش دایانگرتینەوە. دوای نانخواردنیش، میوەیان بۆ هێناین. بەکورتی، ئەوەتەی لە (سولەیمانی)ەوە ڕامکردبوو، سەڵتەنەتی وام بە خۆمەوە نەدیبوو! (مەلائەمین)، پیاوێکی ڕووخۆش، بەڕێز و باش بوو. قسەکانی خۆشبوون. ماوەیەکی دیکە ماینەوە، پاشان گەڕاینەوە. لە گەڕانەوەشماندا، گلۆزی جگەرەی گرێفتی، بە دیاری دامێ و نیوەیم بۆ مامە (جەزا) دانا.

ئەو زانیارییانەی وەرمگرتبوو، هەموویم بەدرێژی، بۆ (نوری) نووسی. بەوردی تێمگەیاند، بەرنامەی شۆڕش لە ئەو ناوە چییە. پێشنیازمکرد، گرووپی چەکدار بۆ خوارەوە نەنێرێ، هێزی دوژمن نەوروژێنرێ و پێشمەرگە بەخۆڕای نەکوژرێ، مەگەر فرمانی دەسوەشان و هێرشکردنە سەر هێزەکانی دوژمن، لە سەرکردایەتییەوە بێ!

دوای ماوەیە، (فوواد یاسین، قادری حاجی عەلی بەگ و عەبباس ئەبوشوارب) هاتن. سەریان لە (نوری) دا و گەڕانەوە. بەڵام (قادر) لای ئێمە مایەوە. دەڵێن: ماڵ خۆی لە خۆیدا نەبوو، میوانیش ڕوویتێکرد! چونکە نە پەتۆ هەبوو، نە خواردنی تەواو و باشیشمان لا دەسدەکەوت. ناچاربووین، من و (قادر)، یەکی لەسەر لەتەپەتۆکەی خۆم بنووین. ڕەوانشاد (عەبباس) زۆر خۆشبوو، کە گوێی لە دەنگی گرمەی تۆپەکان دەبوو، ڕادەچڵەکی و بستێ بە حەوادا دەچوو، کەچی خێراخێراش دەیگوت: مەترسن، هیچ نییە، بەتانی دەتەکێنن!

ڕۆژێ ملازم (هەژار) ناوی هات بۆ لامان و هێندێ قسەی بۆ کردین. پێشتر، هێندێ جار لە دوورەوە بینیبووم، دوو پێشمەرگەی بەدواوەبوو، لە ئەو ناوە دەسوڕایەوە. بە قسەکانیدا لە پاراستن دەچوو. بەیانییەک ملازم (عومەری حاجی عەبدوڵڵا)، بە سواری یەسترێکەوە بوو، بە لاماندا تێپەڕبوو، بۆ شوێنەکەی خۆی دەگەڕایەوە. بەهۆی ئەوەوە، هەواڵی ملازم (مەنسوور)م زانی. هێندێ جاریش دەچووینە چاخانەکە دادەنیشتین. خەڵکی ئەو نێوچەیە، وەک خەڵکی (سولەیمانی)، زۆرزان و چوختێ نەبوون. مامە (جەزا)ش بە دەستووری شارەکەی لەمەڕ خۆمان دەیویست، لە بێ ئیشیدا بە خەڵک

رابویری. جاری لای پیاویکەوە دانیشتبوو، پێی گوت: کوێ بابم؟ ئەویش گوتی: وەکی فیلیم. (جەزا)ش لێی پرسیبوو: ئەی خەرتوومەکانت کوان؟! کابراش تێ نەگەیشتبوو!

زۆربەی خەڵکی ئەو ناوە، کڵاوی گوڵنگەداریان لەسەردابوو. ڕۆژێ (جەزا)، لە چاخانەکە لە یەکێکی دیکەی پرسیبوو: ئەو کڵاوە زۆر جوانە، لە کوێ کڕیوتە؟ ئەویش گوتبووی: داکم بۆی چنیوم. (جەزا)ش دەستی بۆ گوڵنگەکان درێژکردبوو، گوتبووی: منیش کڵاوێکم هەیە، بەڵام گڵونکەی پێوە نییە، ئەو دوو گڵونکەیەم پێ نافرۆشی؟! کوڕەکەش گوتبووی: ئەوەڵڵا!

ڕۆژێکی دیکە، ملازم (تیزار) و کاک (ئەنوەری عوسمان بەگ) میوانم بوون. بە پێشمەرگەیەکم گوت: هەرچی چۆنی بێ، لە ئەو ماڵانەی ئەوبەر، مەنجەڵێ پەیاکە و دوو کیلۆ تەماتەش بکڕە، با ئەم نیوەڕۆیە، تەماتاوی بخۆین و تۆزێ نێوسکمان بخوسێنەوە. باشبوو، ئەو پێشمەرگەیەمان دۆستایەتی لەگەڵ ماڵەکانی ئەوبەرماندا پەیداکردبوو، زووزوو خۆی پێدادەکرد. ئیدی ئەو ڕۆژە نان و تەماتەیەکی خۆشمان خوارد.

(مەجید) ناوێکی شێتۆکەشمان لەگەڵ بوو، سڵی لە هیچ نەدەکردەوە. هەمیشە لە ئەو شاخانە بوو، نێوکلۆرەدار و تاشەبەردەکان، بەدوای هەنگوینی کێویی (شەمەتلینکە)دا دەگەڕا. ماڵی ئاوابێ، ڕۆژێ لای ئێمە بوو، دوای ماوەیەکی کەم، بڕێ هەنگوینی بۆ پەیداکردین. هەر ئەو (مەجیە شێتە) قارەمانە بوو، لە شۆڕشی نوێدا دەستگیرکرا و وا بزانم، ساڵی (1977) لە (موسڵ) لەسێدارەدرا!

### نامەگۆڕینەوە

لە ئەو ئامانەی، لەگەڵ (نوری)دا ئاڵوگۆڕماندەکرد، ڕۆژێ هەر لە خۆیەوە، بێ ئەوەی هیچ پێویستکا، سەبارەت بە بیروباوەڕ و شۆڕشبەرپاکردن، سەرەداوی دەمەتەقێیەکی دامەزراند. هێرشێکی زۆری بۆ سەر ئایدۆلۆژی و خاوەن ئایدۆلۆژییەکان کردبوو، گاڵتەی بە (کوردستان)ی گەورە دەکرد و پلاریدەهاویشت. منیش زۆر باش لە مەبەستەکەی تێگەیشتبووم، دەمزانی، لە کوێوە قسەدەکا. لەبەرئەوە دیربەدێر، وەڵامی نامەکانیم دەدایەوە و شتم بۆ ڕووندەکردەوە. وای لێهاتبوو، ڕۆژ نەبوو، نامەیە بە پێشمەرگەیەکدا نەنێرێ و منیش، لە هەمان کاتدا وەڵامی نەدەمەوە!

من دەمزانی، ئەوە سەرەتایەک بوو، بۆئەوەی واز لە ڕێکخستنی (کاژیک) بێنێ، چونکە بەرژەوەندی لە ئەوەدا نەبوو، وەک بەرپرسێکی گەورە و دیاری شۆڕش، کار لە پارتێکی دیکەی نەتەوەییدا بکا، کە لای (پارتی) بقەبوو! بەڵام جگە لە ئەوەی، دڵی زۆر خاوێن و ساف بوو، هێندەش داڵغەچی بوو، هەر زوو هەموو شتێکی بیردەچووەوە!

ماوەی دوو هەفتە، لە ئەو ناوە بووین، بێ ئەوەی پێشمەرگەکانمان تەقەبکەن و زیانی بە دوژمن بگەیەنن، یا هیچ جۆرە زیانێکمان لێ بکەوێ! هەمووومان لە بێکاریدا نەماندەزانی، چی بکەین، خۆمان هەر بە ئەو جۆرە شتانەوە خەریککردبوو، تا جەنگ لە بەرەکانی گەرووی (هۆمەراغا) و زنجیرە چیاکانی (زوزک) دەسپێکرد و بەتەواوی گەرمبوو، ئیدی لە سەرکردایەتییەوە وەلاممان بۆ هات، بە زووترین کات بگەڕێینەوە.

## جارێکی دیکە ئازادیی

ڕۆژی (15. 9) گەڕاینەوە. باشبوو، گیانێکمان بە ئەوەبوو، زۆر لە شوێنی نەدەماینەوە، وەک یاری بووژانەوەی لێهاتبوو، زووزوو شارمان گۆڕدەدایەوە و کاتێ بۆ (ئازادی) دەگەڕاینەوە، خۆمان پۆشتەدەکردەوە!

لە (چۆمان) سەرتاشخانە و گەرماوی لێبوو. ئەوەتەی لە (پێنجوێن) دەرچووبووین، ڕیشم نەتاشیبوو، واتە مانگێکی ڕێکبوو. هەر زوو لەگەڵ (نوری)دا، ڕیشمان تاشی و سەرمان چاککرد. لە گەرماوەکەش، پاکپاک خۆمان شت و سەرو کراسی نوێشمان کڕی، پاشان لە کەبابخانەیەک دانیشتین، گۆشت و کەبابێکی باشمان خوارد! کاتێ چووینەوە بۆ (ئازادی)، کاک (فەتاح) و هێزێکی دیکەی پێشمەرگە هاتبوون.

لە ئەو ماوەیەی ئێمە لە سەرەوە بووین، (فەرهاد عەبدولحەمید)، خۆی بۆ هێزی (خەبات) گواستبووەوە. (فەرهاد) و (ئەحمەدی عارفی فیتک)یش، لەگەڵ هێزەکەدا هاتبوون. ئەو ناوە لەبەر پێشمەرگەی هێزەکانی (خەبات، زمناکۆ، ئەزمڕ، ڕزگاری و قەرەداغ) بەرنەدەکەوت. جەنگ لە دەورووبەی نێوچەکانی بارەگەی سەرکردایەتی شۆڕش، زۆر گەرمبووبوو. بۆیە بەپەلە بەتالیۆنەکەی ئێمەیان بۆ گەرووی (هۆمەراغا) ڕەوانەکرد. من ئێستەش تێ ناگەیشتم، بۆچی ئەو هەموو هێزەیان، لە نێوچەی سەرکردایەتی کۆکردبووەوە، لە کاتێکدا چەندین هێزی پێشمەرگە، لە ئەو ناوە لەبەر هەتاو، خۆیان دەدۆزی!

## یادی شۆڕشی ( 11. 9. 1961 )

ڕۆژێ لە ماڵی (عومەر شەمەیی) دانیشتبووین، لە پەنجەرە گەورەکەی ژوورەکەیەوە، (جەلالی حاجی حوسێن)م بینی، لەگەڵ (ئازاد مستەفا) پیاسەیاندەکرد. ئیدی من خۆم لە برادەران دزییەوە و چووم بۆ لایان. بەخێرهاتنمکردن و کەمێ قسەمانکرد. پاشان (جەلال) ڕۆیشت.

(ئازاد) بە کاری (کاژیک) هاتبوو. بەبۆنەی یادی (13) ساڵەی شۆڕشی گەلەکەمانەوە، بڵاوکراوەیەکیان دەرکردبوو. چەن ژمارەیەکی دامێ و گوتی: هەوڵبدە، لە ڕیزەکانی

پێشمەرگەدا بڵاویکەیتەوە. منیش لێم وەرگرت، بەڵام ناوەڕۆکەکەیم زۆر بە دڵ نەبوو! لەگەڵ ئەوەشدا، هەر لەنێو ئەوانەی خۆم مەبەستمبوو، بڵاومکردەوە و دەنگێکی زۆر باشی دایەوە.

نێوەڕۆکی بڵاوکراوەکە ئەوەبوو، پێشمەرگەی کوردی هاندەدا، دژی دوژمنی داگیرکەری (بەعس)، بە هەموو توانایانەوە بەرگرییەکەن و تێکیانبشکێنن. هەرگیز سەنگەرەکانی کوردایەتی، چۆڵ نەکەن و هاوکاری برا پێشمەرگەکانی، نێوچەی سەرکردایەتی بکەن. چاویان لە تاڵان و شرەخۆری نەبێ، لەپێناوی چەن پارچە چەکێکدا، گیانی خۆیان بەهەرزان نەفرۆشن!

لە ڕاستیدا، پێشمەرگەکان ئەو نووسینەیان زۆر پێخۆشبوو، وەک خۆراکێکی نەتەوەیی و گیانیی، کارتێکردنی خۆی هەبوو. چونکە (پارتی)، نەک هەر تەنیا لێپرسراوەکانیان، لە بەرەکانی جەنگەوە دووربوون، بەڵکوو هیچ جۆرە کەرەسەیەکی ڕووناکبیرییشیان نەبوو، هانیشیان نەدەدان، بۆئەوەی ورەیان بەرزتربێ و باشتر بجەنگن!

### گەرووی هۆمـــەراغا

ڕۆژی (20. 9) بوو، بەتالیۆنەکەمان بەرەو بەرەی نوێی جەنگ جوڵا. دیسانەوە، باروبارخانەمان پێچایەوە، بە چەن لۆری و جیپێک بەڕێکەوتین. ڕێگەکەی زۆر پانوپۆڕ بوو، بەڵام زۆر خوڵاوی بوو. کەس لەبەر تەپوتۆز، بەتەواوی چاوی بۆ هەڵ نەدەهات. بەنێو گوندی (گەلالە)دا ڕەتبووین، دوای ماوەیە لە دۆڵێکدا دایانبەزاندین. کاتێ چووین، هێزی (ئەزمڕ)ی لێ بوو، ملازم (باپیز، جەمالی عەلی باپیر، نەجاتی عومەرە گۆج ...)م بینی، خەریکبوون، خۆیان کۆدەکردەوە و بگەڕینەوە. هەروەها بەتالیۆنەکەی (سوارە ئاغا)ی برای کاک (فەتاح)یش، لە ئەوێ بوو. ڕەوانشاد (چەژای عەلی کاتب) جێگرییبوو.

### ملازم حەمەشەوقی

بیستم، (نوری) لای ملازم (موحەممەد) ناوی، بۆ نانی نیوەڕۆ بانگکراوە. منیش کارم پێی بوو، لەگەڵ (وریا براخاس)دا چووین و هەرچی چۆنی بوو، دۆزیمەوە. تەماشامکرد، (حەمەشەوقی) برا خۆشەویستەکەی خۆمانە، تێر یەکتریمان ماچکرد. (سوارەئاغا) و ملازم (نیزار)یش، هەر لە ئەوێ بوون، ئێمەش بەسەر خێری خۆماندا کەوتین!

ڕەوانشاد (حەمەشەوقی)، کوڕێکی زیرەک و ئازابوو، لە ئەو ناوە، تا ڕۆژی هەرەسەکەش، لێپرسراوی هێزەکانی دژەئاسمانی و ئەو جێیانە بوو، کە چەکی دژە تانکی (B10)ی لەسەربوو، زۆری پێخۆشبوو، ئێمەی بینی و ڕاژەیەکی زۆری کردین.



ڕۆژی دوای ئەوە، بە جێیە سەرکراوەکەی، هەموو بەرەکانی پێشەوەی جەنگی گیراین، دوایی تا سەر لووتکەی چیاکە، بەپێ سەرکەوتین، سەنگەرێکی زۆریان لێدابوو، پێشمەرگەیەکی یەکجار زۆری لێبوو، کەلی تۆپ و چەکی قورسیش دانرابوون، هەموویان بەرانبەر سەربازگەکانی (ڕەواندوز) دامەزرابوون. شارۆچکەکە لە بەرەکانی جەنگەوە نزیکبوو، تەنانەت لەسەر لووتکەی چیاکەوە، سەربازگەکە بەئاسانی دەبینرا. بە دووربین تەماشاماندەکرد، سەربازەکان لەنێو سەربەزگەکەیاندا، هاتوچۆیاندەکرد.

کاتێ ئێمە چووین، ئەو ناوە بێدەنگبوو. (حەمەشەوقی) گوتی: حەزدەکەن، توپێکیان پێوەنێین و بیانوروژێنین، هێندێ گولەتوپیشیان لەکیسبدەین؟ئێمەش گوتمان: باشە. هەموومان لەنێو سەنگەرەکاندا وەستابووین، توپێکی پێوەنا و تۆزێ لە ئەو ناوە بەرزکردەوە. بەلام لە ئەوەدەچوو، گوێیان لە قسەکانی ئێمە بووبێ، بە یەک گولەتوپیش، وەلامیان نەدایەوە!

### بلاوکراوەکان

دوای ئەوەی دامەزراین، هەرزوو بەئاشکرا، بلاوکراوەکەم لە بەتالیۆنەکەی خۆمان و بەتالیۆنەکەی (سوارئاغانا)، بەسەر چەن کەسێکی خوێندەوار و بەرپرسی پێشمەرگەدا دابەشکرد، وەک ڕەوانشادان (جەزای عەلی کاتب، نورەی مام برایم، عوسمان حەمەسالح، شەریف کانیساردی) و بە هێندێ پێشمەرگەی دیکەشم دا. پێشمەرگەکان زۆریان پێ خۆشبوو.

لە ئەو ماوەیەی لەسەرەوە بووین، توانیمان، چەن کەسێکی کوردپەروەر، لە ڕیزەکانی (کاژیک)دا ڕێکخەین. قسەمان لەگەل (ملازم حەمەشەوقی، جەزای عەلی کاتب، فوواد یاسین) و چەن پێشمەرگەیەکی دیکەدا کرد و ڕێکمانخستن. بە شێوەیەکی بەردەوامیش،

قسەم بۆ پێشمەرگەکان نەکرد، دوور نەبوو، گەر ماوەیەکی دیکە لە ئەو ناوە بمابینایەتەوە، بەشی زۆری کادیرە سەربازییەکانمان، بە لای خۆماندا ڕاکێشایە. چونکە ئەو جۆرە کەسانە، بەڕاستی کوردایەتییان دەکرد، هیچیان لە کێشە و باسی ئایدۆلۆژیا و فەلسەفەی نەتەوەیی نەدەزانی، کات و شوێنەکەشی زۆر لەباربوو. چونکە لەلایەکەوە، دوژمنی داگیرکەر زۆر دڕندانەتر، تەڕ و وشکی نیشتمانەکەمانی پێکەوە دەسووتاند. لەلایەکی دیکەشەوە، کۆمۆنیستەکان لەگەڵ (بەعس)دا، لە بەرەیەکدا دژی کورد دەجەنگان. جگە لە ئەوەی کەم کەس هەبوو، باوەڕی بە (پارتی) هەبووبێ و لە ڕیزی ڕێکخستنەکانیدا کاربکا. کادیرەکان و سەرکردایەتی (پارتی)ش، لەنێو پێشمەرگەدا نەدەژیان و لێیانەوە دووربوون. زۆر هەستیان بە ژان و ئازارەکانیان نەدەکرد. گوێیان لە داخوازییەکانیان نەدەگرت. بیروباوەڕ و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەشیان، لەگەڵ ویست و ئارەزووەکانی هێزی پێشمەرگەدا، یەکی نەدەگرتەوە. لەبەر هەموو ئەو هۆیانە، ئێمە کاتێ لە نزیکەوە و لە سەنگەرەکانی پێشەوەی خەباتدا، قسەمان بۆ پێشمەرگە دەکرد، داوامان لێ دەکردن، هاوکاریمان لەگەڵ بکەن، بە پەرۆشەوە، بەدەم بانگەوازەکەمانەوە دەهاتن!

### نوورەی مام برایم

لە ئەو برایانەی، زۆر لێیانەوە نزیکبووم، ڕەوانشاد (نوری کەریم موحەممەد)، ناسراو بە (نوورەی مام برایم) بوو. ئەو کوڕە کوردە مەردە، هێشتا بە تەواوی، (21) بەهاری تەمەنی پڕ نەکردبووەوە، هەر لە سەرەتای شۆڕشی (1961)ەوە پێشمەرگە بوو. جگە لە ئەوەی پێشمەرگەیەکی کۆنی بوێر و دەسوەشێن بوو، چ لەنێو شار و چ لە شاخ، بەشداری لە گەلێ نەبەردی گرنگی شۆڕشدا کردبوو. هەر بۆیە لە ژیانی پێشمەرگەیەتیدا، (3) جار برینداركرابوو، (3) جاریش لەسەر کوردایەتی گیرابوو. لەبەرئەوە جێی ڕێزی هەموو لایەک بوو. تەنانەت کاتێ کۆچیدواییکرد، (مەکتەبی پاریەدەری سکرتێری گشتی ی. ن. ک.)، بە شێوەیەکی فەرمی، پرسەنامەیان بۆ بنەماڵەکەی نارد، بە مەرجێ هەرگیز لەگەڵ ئەواندا نەبووە! بەڵگەنامەی ژمارە (3) ل (419)

کاکە (نورە)، کوڕێکی گەلێ ئازا و چالاک، زیرەک و شارەزا، بەڕێز و باش بوو، زۆر لەشی سوکبوو، قسەی خۆش و زمانیشی شیرین بوو، لە هەمان کاتیشدا، دەنگێکی خۆشی هەبوو، هونەرمەندێکی وێنەکێشی باشیش بوو، یەکێ لە ئەو پێشمەرگانە بوو، شتێ زۆر لابوو. مرۆ لەگەڵیدا بێ تاقەت نەدەبوو. سەبارەت بە بیری نەتەوەیی و شۆڕش، قسەم زۆر بۆ دەکرد و ئەویش، بڕوای پێ دەکردم و قسەکانمی پێ خۆشبوو، سەری لێ دەخورا، بەڵام ئەو هەلەمان بۆ هەڵ نەکەوت، تا بە ڕاشکاوی قسەی لەگەڵ بکەم!



( 2008 – 1940 )

ڕۆژێکیان بێ ئەوەی لێی بپرسم، باسی ڕەوانشاد (فاخیر میرگەسووری) بۆ کردم و گوتی: شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام لەنێو خۆماندا دەرنەچێ. ساڵی (1972) بوو، کاک (ئیدریس) بانگیکردم و پێی گوتم: کارێ هەیە، دەبێ، بۆمان بکەی، چیت دەوێ، بۆت دەکەین. منیش گوتم: چییە؟ گوتی: تۆ زۆر لە (فاخیر)ەوە نزیکی، تاوانێکت بۆ دروستدەکەین و دەتگرین، لەگەڵ (فاخیر)دا، لە یەک ژووردا داتاندەنێین. پاشان (فاخیر)مان بۆ بکوژە و بڵێ: شەڕمانبووە و ویستوویەتی، بمکوژێ، منیش داکۆکیم لە خۆم کردووە.

گوتم: تۆ هەرچی بڵێی، بۆتان دەکەم، بەڵام ئەو کارە بە من ناکرێ. چونکە ماوەیەکی زۆر، پێکەوە پێشمەرگە بووین و یەکدیمان زۆر خۆشدەوێ. جگە لە ئەوەی (فاخیر)، کەسی خۆتانە و من دەس لە بنەماڵەی (بارزانی) ناوەشێنم. خۆتان دەتوانن، لەنێویبەرن. ئیدی کە زانی، کەڵکی نییە، گوتی: لای کەس باسی ئەم قسەیە مەکە. منیش لێم پرسی: باشە، بۆ بە قسەت نەکرد؟! ئەی نالێن، (فاخیر) دەسی لەگەڵ (بەعس)دا تێکەڵاوکردبوو؟! ئەویش بە پێکەنینەوە گوتی: نازانم، گەر ناپاکی لە شۆڕش و ماڵی (بارزانی) کردبوو، ئەی خۆیان بۆ نەیاندەکوشت؟! ئاخر هەر بمکوشتایە، یەکسەر لە تۆڵەی خوێنی (فاخیر)دا دەیانکوشتمەوە و دەیانگوت: دوژمنایەتی نێوان خۆیان بووە!

## چالاکیی بەرەکانی جەنگمان

لە ئەو کات و ڕۆژەدا، بە هیچ شێوەیە سڵمان لە (پارتی) و (پاراستن) نەدەکردەوە. چونکە نێوشار نەبوو، (خاڵەحاجی) بانگمانکا و سووکایەتیمانپێبکا، بەڵکوو ئەو کاتە،

بەکردەوە پێشمەرگەبووین، لە بەرەکانی جەنگ خوێنمان پێدەدا، زۆربەی هاوبیرەکانی ئێمەش، لە ئەو نەبەردانەدا بەشداربوون، هێندێکیشیان هەر بریندار و شەهید بوون، وەک خەڵکی دیکە نەبووین، چاخانە و بارەکانی (ئێران) بگەڕێین و هەر قسەی ڕووت بکەین!
بەڵام (نوری)، لە ئەو چالاکی و جوڵانەوە گەورەیەی، ئێمە لە بەتالیۆنەکەدا دەسمان دابوویە، زۆر دەترسا. حەزیدەکرد، بەزووترین کات، لەدەس ئێمە ڕزگاربێ. هەر لەگەڵ هەستیدەکرد، لەگەڵ کۆمەڵێ پێشمەرگە دانیشتووم و قسەیان بۆ دەکەم، ئەوانیش گوێیم لێ دەگرن، یەکسەر دەهات و دادەنیشت، باسەکەی پێ دەگۆڕین و هەر یەکەی بە لایەکدا ڕەوانەدەکرد.
ڕۆژێ لێم تووڕەبوو، گوتی: تۆ وادەزانی، لە زانکۆی (سولەیمانی) دەخوێنی، وا بە ئارەزووی خۆت قسەدەکەی؟ نازانی، ئەم ناوە هەمووی بە (پاراستن) تەنراوە؟! بۆ واز لە ئەم کەلەڕەقییەی خۆت ناهێنی؟ منیش گوتم: دیارە، لای تۆ کارێکی خراپ دەکەم، گەر ئێمە لێرە هەوڵبدەین، وورەی پێشمەرگە بەرزکەینەوە، زیاتر بۆ کوردایەتی و نەبەردی هانیانبدەین، لە ئەو ڕێیانەشەوە، دۆست و هاوبیری پتر، بۆ (کاژیک) پەیداکەین، بۆچی کارێکی خراپە؟ خۆ من لێرە دژی (پارتی) و شۆڕش قسەناکەم. بەڵکوو باسی مێژووی کورد و شۆڕشەکانی، کوردایەتی و دیسیپلینیان بۆ دەکەم. ئایا ئەو شتانە بەخراپ دەزانی؟ گوتی: ئەوە ئیشی تۆ نییە. تۆ تەنیا پێشمەرگەی، ئەوە ئیشی کادیرەکانی (پارتی)ە. منیش گوتم: ڕاستدەکەی. بەڵام لە ئەم ناوە، هەزار پێشمەرگە زیاتری لێ هەیە، فەرموو کادیرێکی (پارتی)م بۆ بانگە، با هێندێ باسی شۆڕش و کوردمان بۆ بکا!
هەرچەندە لە ئەوە زیاتر، هیچی دیکەی پێ نەبوو، بەڵام بە تووڕەییەوە گوتی: لە ئەم کاتەوە، من کار لەگەڵ ئێوە ناکەم. منیش دەمزانی، کاکە (نوری) بەتەواوی گۆڕاوە، (عومەر شەمەیی) و (فەرهاد عەبدولحەمید) کاریانتێکردووە. بۆیە پێم گوت: تۆ ئازادی. بەڵام یا بگەڕێینەوە، لەگەڵ هاوبیرانی سەرکردایەتیدا، لە ئەو بارەیەوە قسەبکە!

## ئاگربـــاران

لە گەرووی (هۆمەرئاغا)، بەقەدپاڵی چیایەکی بەرز، سەخت و چڕوپڕەوە بووین. هەمووی بە دارودەوەن داپۆشرابوو. دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو. بارەگەی بەتالیۆنەکەمان، لە دامێنی چیاکە و نزیک سەرچاوەی ئاوەکەوە دامەزراندبوو. لەسەر لووتکەی چیاکەش، بەڕیز سەنگەری قووڵ هەڵکەنرابوو.
ئێمە هەرگیز، مەترسی ئەوەمان نەبوو، سوپای داگیرکەر هێرشباکا. بەڵام پتر لە بۆردومانی فڕۆکەکان دەترساین، چونکە بەڕۆژ مۆڵەتی کەسی نەدەدا، بەئازادیی بجوڵێ.

هەموو رۆژێ بە دەیان بۆمبی ناپاڵم، فۆسفۆری و هێشووی دەتەقاند. جگە لە ئەو تۆپبارانە خەستەی، بەبەردەوامی دەیانکرد. مەگەر لە فیلمی (درێژترین رۆژ لە مێژوو)ەکەی (جۆن واین)دا بیتبیتم! باوەرناکەم، ماوەی کەسی دابێ، بێخەم دانیشێ و چاوبتووقێنێ. چونکە لە ماوەی پێنج خولەکدا، چەندین گولەتوپ، لە دەورووپشتمان دەکەوتەوە. هەر پێشمەرگەی کوردیوو، ددانی بە خۆیدا دەگرت و بەرەنگاریدەکرد! ئەگینا گەر سەربازی هەر لەشکرێکی دیکە بووایە، زۆر لە ئەو ناوە هەڵیان نەدەکرد. پێشمەرگەکانی سەر تۆپەکانی شۆرشیش، بە شێوەیەکی بەردەوام، تۆپیان دەتەقاند. سەربازەگە و رەبایەکانی دوژمنیان تۆپباراندەکرد. جگە لە ئەوەی دوو جاریش، بە دوشکە و چەکی دژەئاسمانی، فرۆکەیان خستەخوارەوە. هەروەها تیپەکانی (ئێران)یش، بەیانیان زوو خۆیان و تۆپە قوورسەکانیان دەهاتن، ئەو ناوەیان تۆپباراندەکرد و سەرلەئێوارە دەگەرانەوە. وەک دەڵێن: رۆژی حەشر چۆن بوو، ئەو ناوەش وابوو، شەو و رۆژ ئاگرباران بوو. لە ئەنجامیشدا هێندێ پێشمەرگە، بە بۆمبی فرۆکە و گولەتوپ، بریندار و شەهید بوون.

لەسەر لووتکەی چیاکە، چەن پێشمەرگەیەکی لێبوو، بە دووربین، تەماشای شوێنەکانی سوپای دوژمنیان دەکرد و بە بێتەل، قسەیان لەگەل پێشمەرگەکانی بنکەی تۆپەکاندا دەکرد. هەر زووزوو دەیانگوت: شەمال دوو شووتی بۆ لای راست. شەمال ناوی نهێنی ئەو بنکەیە بوو، شووتیش گولەتوپ بوو! کە شەمال دوو شووتی نوێی دەهاویشت، بە جارێ زەویەکەی دەورووبەرمان دەلەرییەوە. (ئەحمەدی عارفی فیتک)یش دەیگوت: من دیومە، شەمال دوو گەلای داری هەڵدەوەرێنێ، هەرگیز نەمدیوە، زەوی بلەرزێنێ!

لە ئەو دواییانەدا، بەئاشکرا هەستمدەکرد، زۆربەی فەرماندەی بەتالیۆن و جێگرەکانیان، لەگەل هێندێ سەرلق، خۆیان لە زۆر شت دەپاراست و نەیاندەویست، بەخۆرای تێدابچن. هەر لە بەیانییەوە، خۆیان لە کوتێ دەخزان و بۆ کارێکی پێویست نەبووایە، سەریان دەرنەدەهێنا. بە تایبەتی (نوری)، لە دوارۆژەکانی بەرەی گەرووی (هۆمەرئاغا)، زۆر وەرزبووبوو، تووشی گومان، دڵەراوکە و رەشبینی بووبوو.

(سەلامی حەمەرەشی ئەحەشانە)، کە خزمیبوو، هەمیشەش بەدوایەوەبوو، شێتوکەیەکی زۆر خۆش و ئازا بوو، دەسی بە دەمی سەگدا دەکرد! کاتێ تۆپباران دەسپێدەکرد، دەچووە سەر بارێکی بەرز، گۆرانی دەگوت و چەقەنەی لێدەدا. (نوری)ش توورەدەبوو، دەیقیژان، جنێوبارانیدەکرد و دەیگوت: سەگباب وەرەخوارەوە، ئەڵێی سیخوری و نیشانە بۆ فرۆکەکان دادەنێی! ئەویش پێدەکەنی و دەیگوت: مەترسە، لێرە فرۆکە ئێمە نادۆزێتەوە.

ئەو ماوەیەی لە گەرووی (هومەرئاغا) بووین، تەنیا پاسی ئەو کێو و چیایانەمان دەکرد. نە دوژمن هێرشیکرد و نە سەرکردایەتی شۆڕشیش، فرمانی پەلاماردانی بۆ دەرکردین. شۆڕشەکە وەک یاری مووشێنی لێهاتبوو، سەرکردایەتی شۆڕش، لە شوێنی خۆی چەقیبوو، وەک بە دوژمن بڵێ: بابە ئێوە تۆپ مەتەقێنن و فڕۆکە هەڵمەستێنن، ئێمەش هێرش ناکەین، کوێستانە، هەر کەس بە مووشەی خۆی هەستێ و بەگیمان ناوێ!

## هەڵسوکەوتی سەرکردایەتی و ڕەوشی پێشمەرگە

بەڕاستی، هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە، گەلێ کوڕی ئازامان هەبووە، هەرگیز سڵیان لە مردن نەکردووەتەوە، لەپێناوی کورد و (کوردستان)دا، بە شانازییەوە، گیانی خۆیان بەختکردووە. بەڵام هێندەیان ناهەقی و دزی، لە کادیرەکان و لێپرسراوانی (پارتی) و شۆڕش دیوە، گەر ئەمانیش لە ئەوانەوە، فێری ئەو ڕەوشتە دزێوانە نەبووبن، ئەوا بەتەواوی وەرزبوون. <u>هەر شۆڕشێکیش، ماوەیەکی زۆری خایاند، پێشمەرگە و گەلەکەش، ماندوو و بێزاردەبن، وزەیان لێ دەبڕێ و ورەیان لاوازدەبێ!</u>

ئەو کاتە، شۆڕشی (11)ی سێپتێمبەر، تەمەنی (14) بەهاربوو، هێشتا تازە جەنگ لە نێوان کورد و داگیرکەردا گەرمدەبوو. جگە لە ئەوەی هیچ ترووسکاییەک بەدی نەدەکرا، هێشتا ئەو سەرێشی دیار نەبوو، شۆڕشەکە بە چی کۆتاییدێ! لەبەرئەوە زۆربەی لێپرسراوانی پێشمەرگە، تەنانەت نەتەوەییەکانیش، لە فڕوفێڵی شۆڕشەکە تێگەیشتبوون، زۆر خۆیان پێوە ماندوو نەدەکرد و وەک جاران خۆیان بەکوشت نەدەدا!

چونکە لەلایەکەوە دەوڵەمەندبووبوون. لەلایەکی دیکەشەوە هەڵسوکەوتی لێپرساوە گەورەکانی شۆڕشیان دەبینی، خۆیان و خێزانەکانیان، لەسەر سنوور یا لەنێوشارەکانی (ئێران) چۆن دەژیان. پارەیەکی زۆریان هەبوو، خانووی باشیان بەکرێگرتبوو، ترومبێلی نوێیان لەبەردەستدا بوو. لە بەرەکانی جەنگەوە دووربوون و ترسی بۆردوومانی فڕۆکەشیان نەبوو. پێیەکیان لەنێو شۆڕش و پێکەی دیکەیان لە (ئێران) بوو. شەویان لێدەهات، لەماڵی کۆدەبوونەوە و تا درەنگانی، دەیانخواردەوە و قوماریاندەکرد. پێشمەرگەش، ئەو لەشکرە بێکارە بێهونەرە مشەخۆرەی کوردیان، بە ئەو شێوەیە دەبینی، دەسووڕانەوە و ڕاپاندەبووارد، بەناو هەردوولاشیان هەر کوردن، ئیدی بەتەواوی سارددەبوونەوە!

ئەز پێموایە، هەموو ئەو هۆیانە، وای لە کادیرە کۆنەکانی شۆڕش کردبوو، پتر خەمی ورگی خۆیان و گیرفانپڕکردنیان بێ، وەک لە ئەوەی خەمی شۆڕشەکە بخۆن. شۆڕشەکە هێندە تێکەڵوپێکەڵبووبوو، پاشەڵی هەموو ئەوانیشی پیسکردبوو، تادەهات،

زیاتریش گلاوێیدەکردن. تەنیاترووسکاییەک هەبووبێ، هەر پێشمەرگە لاوەکان و ئەفسەرە تازەپێگەیشتووەکان بوون، جێی هیوای کۆمەلانی خەڵک بوون، چونکە هێشتا خراپ نەبووبوون، بەڕاستی کوردایەتییان دەکرد، زۆر ئازایانە و مەردانە، دژی سوپای داگیرکەر دەجەنگان. لەبەرئەوە سەیرم لێ نەدەهات، هەموو ئەو کۆنە (کاژیک) و نەتەوەییانەی، لەنێو شۆڕشەکەدا بوون، لەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیاندا، شەقیکیان لە ئایدۆلۆژیا، ستراتیژ و (کاژیک) هەڵدابوو، بەهیچ جۆری باوەڕیان بە کاری پارتایەتی نەمابوو، هەموو هیوایەکیان بە (مەلامستەفا) بوو، تەنانەت دەیانگوت: گەر تەنیا سەرۆک (بارزانی)، چادرەکەی و دوو تووتییەکەی بمێنن، کورد نافەوتی و سەردەکەوێ! چادرەکە بارەگەی (بارزانی) و دوو تووتییەکەش جووتە برا (ئیدریس) و (مەسعوود) بوون! ئەوانیش ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەیان، گەلێ لا پەسەندبوو، هەر خۆشیان وایان لە ئەو خەڵکە کردبوو، بە ئەو جۆرە بیربکەنەوە و ئەنجامەکەشیمان، بە چاوی خۆمان بینی!

### بۆ دواجار ئازادیی

دەورووبەری دوو هەفتە، لە ئەو ناوە ماینەوە، پاشان ڕۆژی (**5. 10**)، ئەوێشمان چۆلکرد و بەرەو (ئازادی) گەڕاینەوە! سەرەتا بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، لقەکان گەڕانەوە. ڕۆژی دوایی بارەگەی بەتالیۆنیش، لەگەڵ (نوری)دا، بە دوو پیکاپ گەڕاینەوە. (جەمال)ی برای (نوری) و (تایەری عەبەپشی) دووڕۆژبوو، بە سەردان بۆ لای (نوری) هاتبوون و لەگەڵ ئێمە گەڕانەوە.
کاتی نیوەڕۆبوو، تازە لە پێچەکانی دەورووبەری (گەلالە) بووین، دوو فڕۆکەمان لێ پەیدا بوو. لە دوور ئێمەوە، لووتکەی کێوەکانی بەرانبەرمانی بۆمبارانکرد، دووکەڵ و تۆز تێکەڵبوون و بە ئاسماندا چوون. ئەو ناوە هێندەی دیکە خۆڵاوییبوو، سەر و چاومان دەتگوت، بە مشت خۆڵت پێداکردووە!
ئەوانەی لەگەڵمان بوون، هەر گوێیان لە دەنگی فڕۆکەکە بوو، دابەزین و بە ئەو کێوە بەرزدا، سەربەرەوخوار ڕایانکرد. (نوری) شلەژابوو، نەجولا و کەمێ خۆی ئەویکردبوو، بەپێوە ڕاوەستابوو، هەر تەماشای فڕۆکەکانی دەکرد. ئێمەش دوو کەس لەگەڵ ئەو مابووینەوە، خۆمان لە قەراغ جادەکە ماتکردبوو. کاتێ دەنگی فڕۆکە نەما، (نوری) هەستا و تەماشایەکی دەورووبەری خۆی کرد، تەنیا ئێمەی لە دەوریبووین و ئەوانی دیکە دیارنەبوون، بەتەواوی کەللەییبوو. منیش گوتم: بەرەوخوار هەلاتن. ئەویش لەبەرچاوی ئەو هەموو پێشمەرگەیە، پڕ بە گەرووی دەیقیراند، بانگیدەکردن و جنێوی ناشیرینی پێ

دەدان. ئەوانیش ورتەیان لە خۆیان بڕیبوو. دوای ماوەیە سەرکەوتنەوە، لە ترساندا ڕەنگیان زەردهەڵگەڕابوو. ناهەقیشیان نەبوو، چونکە بۆردوومانی فڕۆکەکان زۆر کتوپڕی بوو، هێندێکیان هەر گوێیان لە دەنگی گرمەی تۆپ نەبووبوو، بەڵکوو ئەوەتەی شاریان بەجێهێشتبوو، بێ قرەوبرە، لە شوێنی دانیشتبوون!

لە (ئازادی) بۆ دواجار ماڵئاواییمان کرد و لە پارەگەی (بارزانی)ەوە، خەڵات و بەراتێکی زۆرمان بۆ هات، وەک بەکرێگیرابین، کارەکەمان تەواوکردبێ و هەقدەسمان بدەنێ! (نوری) جگە لە پارە، جێبێکی نوێی بە دیاری وەرگرت. هەموو پێشمەرگەیەک (20) دینار، هەموو لێپرسراوێکی سەربازی (30) دینار و هەموو سەرلقێکیش (100) دیناریان وەرگرت.

ئەو چەن ڕۆژە تا لۆریمان بۆ هات و ڕەزامەندی (ئێران) وەرگیرا، بە خاکەکەیاندا بگەڕێینەوە، ماوەیە لە (ئازادی) و (چۆمان) ڕامانبوارد، گەلێ برادەری خۆشەویستمان بینی. پاشان ماڵئاوایمان لە ناوچەی سەرکردایەتی کرد و بە (ئێران)دا گەڕاینەوە. بەڵام لە گەڕانەوەماندا، ئەم جارەیان کەس نەهات، دەسخۆشانەمان لێ بکا، هێندێ قسەمان بۆ بکا و ماڵئاوایمان لێ بکا، وەک لە کاتی هاتنماندا، جووتە برا (ئیدریس) و (مەسعوود) هاتن، بەخێرهاتنیانکردین و بۆ جەنگەکە هانیاندەداین! (نوری) هەر زوو، بەتالیۆنەکەی بەسەر ئێمەدا بەجێهێشت و بە جێبە تازەکەی، خۆی و (جەمال)ی برای و کاک (تایەر)، بە (ئێران)دا بەرەو (تەوێلە) گەڕانەوە.

## ئەزموونێکی نوێ

وەک دەڵێن، ئەو چوونەمان خێری پێوەبوو. ئەزموونێکی نوێم پەیداکرد و لە نزیکەوە، هەموو شتێکم بۆ ڕوونبووەوە. تێگەیشتم، شتێ نەبوو، ناوی (پارتی) بێ، بەرەڵاییەکی زۆر، لە ڕیزەکانی شۆڕشدا دەبینرا. یەکەمین دەزگەی باڵادەستی ئاشکرای شۆڕش، تەنیا هەر بارەگەی (بارزانی) بوو. هەروەها، یەکەمین دەزگەی نهێنی شۆڕشیش لە هەموو (کوردستان)دا، هەر دەزگەی (پاراستن) بوو. ئەم دوو دەزگەیە، هەموو کارەکانی شۆڕشیان بەڕێوەدەبرد و هەردووکیشیان، لە یەک سەرچاوەوە، ئاویان دەخواردەوە! هەر کوڕەکانی سەرۆک (بارزانی)، بەڕێوەیاندەبرد و لە ڕاژەی یەک شوێنی دیاریکراویشدا بوون. ئیدی ناوی سەرکردایەتی (پارتی)، دەسەڵاتی پەلیبیرۆ، کۆمیتەی سەربازی و شالیارگەکان، دیوی دەرەوەی ئەو دوو دەسەڵاتەیان ڕازاندبووەوە. بۆیان نەبوو، هیچ بڕیاربیدەن، جگە لە پارەبەخشینەوەیەکی کەم نەبێ، هیچ جۆرە توانا و دەسەڵاتێکیشیان نەبوو. ئاپوورەیەکی زۆر لە ئەو ناوە، بەخۆڕای کۆببووبوونەوە، مشەخۆرێکی زۆری

وەک سپلی لاورگ، لەسەر ڕەنج و خەباتی پێشمەرگەی داماو، بێکار دەسووڕانەوە و دەژیان، دەلەوەڕان و قسەی زلزلیان دەکرد. کەچی هەر ئەوانیش بۆ هەموو شتێ، هەمیشە لە پێش هەموو کەسێکەوە بوون و لە پەنا حەجەکەدا خۆیان ماتدابوو، چاوەڕێی گفتوگۆ و ڕێککەوتنێکی دیکەیان دەکرد، تا بەساغی بگەڕێنەوە و سەرکردایەتی شۆڕش لە شارەکاندا، پلەوپایەی بەرزیان بەسەردا دابەشکا!

ئاخر ئەم هەموو هێزە زۆرەی پێشمەرگەی نێوچەی (بادینان)، بەڕۆژ هەموویان ڕیشیاندەتاشی، جلی جوانیان لەبەردەکرد، خۆیان خاوێندەکردەوە، کلاشینکۆفێکیان لە شاندەکرد و بەنێو ئەو خەلکەدا پیاسەیاندەکرد. پارەیەکی زۆریشیان لە گیرفاندابوو، لە جگەرەی ڕۆسمان، دیمۆری و گرێڤن کەمتریان نەدەکێشا. جگە لە ئەوەی، هەمووشیان مووچەی پێشمەرگایەتیان وەردەگرت، بەدەمیشیەوە وردەوردە کاریاندەکرد، پارەیەکی زۆریان دەستدەکەوت. هەر تاریکیشیدەکرد، هەر شەوەی لە مالی، مێزیان دەڕازاندەوە و ڕایاندەبوارد. کەچی یەکێکیان شەڕیان نەدەکرد. هەرچەندە توانای هێزەکان و باری پێشمەرگەی نێوچەی خۆمانم، لەگەل نێوچەی سەرکردایەتیدا بەراوردەدەکرد، جیاوازییەکی زۆرم دەبینی و سەرمسووردەما!

بەئاشکرا زۆربەی کادێر و لێپرسراوەکانی شۆڕش، دزییاندەکرد و گیرفانیان پڕدەکرد، مالی سپییان کۆدەکردەوە و بۆ ڕۆژی ڕەشیان پاشەکەوتدەکرد! کەس نەبوو، لێیان بپرسێتەوە. سیخوڕی دەیتوانی، لە ئەم پەڕەوە بۆ ئەو پەڕی (کوردستان)، بێ نامە و بەئازادی بسووڕێتەوە. خەلک لە مالان دادەنیشتن و بەئاشکرا، جنێویان بە سەرانی شۆڕش دەدا. (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی)ش، هەر کەسێ قسەی بە ئەوان نەگووتایە، لێیان نەدەپرسییەوە و دەسکاریان نەدەکرد. بەلام هەر کەسێ لە ئەو دوو دەزگەیەیان بخوێندایە و لێیان بکەوتایە، ئەوا گەر سەرەونگومیان نەکردایە، لەبەرچاوی لێپرسراوان، ئێسکی خۆی تالدەکرد. یەک ئەندامی لیژنەی ناوچە، لق و کۆمیتەی ناوەندی نەبوو، بوێری و دەمبکاتەوە، زمان هەلهێنێتەوە و باسی کەموکوورییەکانی شۆڕش بکا، یا ڕەخنە لە بارەگەی (بارزانی) و دەزگەی (پاراستن) بگری، چونکە هیچ جۆرە ئازادییەک نەبوو!

هەر بۆ نموونە: (ڕەووف بێگەرد) چیرۆکی (هەنگاوێک لە ڕێگای دووردا)ی نووسیبوو، لە ژمارە یەکی گۆڤاری نووسەری کوردی چیادا، سالی (**1975**) بلاوکرایەوە. چیرۆکەکە باسی گەندەلی ناو شۆڕشی سالی (**1974**)ی دەکرد، کە چۆن پیاوخراپ، دز و درۆزنی زۆر بووە، ڕێز لە پێشمەرگە و نیشتمانپەروەر نەگیراوە. لەسەر ئەوە (**21**) ڕۆژ لە گرتوخانەی (چۆمان) گیرا. گەر هێندێ ناوی گەورەی وەک (سالح یوسفی) و (دارا توفیق) نەبوونایە، لەوانەبوو، لەناوییەرن!

نازانم، ئەو کادیرە شۆڕشگێڕانە، ئەوانەی لە ڕۆژانی خۆشی و لەسەرشەقامە تەختەکانی شارەکانی باشووری (کوردستان)، خۆیان بەسەر خەڵکی دڵسۆز و ڕەشوڕووتی گەلەکەماندا بادەدا، لافوگەزافی نیشتمانپەروەری و کوردایەتیان لێدەدا، بۆچی ئەو کاتە، دەمیان بە دەرزی و دەزوو دروورابوو؟! لە کوێ بوون، ئەو پیاوە ئازایانەی، شەوانە لە یانەی فەرمانبەرانی شارەکان، تا درەنگانی دەمانەوە، باشترین خواردنەوەیان هەڵدەقوڕاند، لە چاوی دۆست و یارە جوانەکانیان، کاغەزی قوماریان ڕادەکێشا؟! لە کوێن، ئەو نامەردانەی ناوی خەڵکی کوردپەروەری مەردیان پیسدەکرد، دژایەتیاندەکردن، ژنانیان بەناوی سۆزانی و سەر بە (بەعس)وە دەکوشت؟! کوان ئەو دەنگە دلێرانە، بۆ دەنگیان نایە؟!

بڕواناکەم، گەر پێناسەیەکی تایبەتی شۆڕش هەبێ، هەموو مەرجەکانی لەگەڵ، شۆڕشی ئەو ساڵەی (کوردستان)دا بگونجایە. بەلام تەنیاوتەنیا هەر، یەک شت ئەو خەڵکەی کۆکردبووەوە، ئەویش ناوی (بارزانی) بوو! ئەگینا هەر باشیشبوو، ئەو ساڵە لەگەڵ داگیرکەر و دوژمنێکی سەرسەختی درندەی شۆڤێنی وەک (بەعس)، لەگەڵ دەوڵەتێکی گەورەی بەتوانا و دەسەلات، دەوڵەمەند و فرەدۆست، خاوەن سوپایەکی گەورە و زۆر، هاوچەرخ و بەدیسپلین، پرچەکی هەمەجۆرەی مرۆڤرکەر توانیمان، بجەنگین و خۆمان ڕاگرین!

من ئێستە دەڵێم: ئەوە ئازایەتی و ژیری، کەسی تێدا نەبوو، بەلکوو بە (قوودرەتی قادر) مابوو! بۆیە هەر پێش گەڕانەوەم، دووتامەم بۆ هەردوو هاوبیری ئەفسەر (مەنسوور) و (حەمەشەوقی) نووسی: تکاتان لێ دەکەم، تا دەتوانن، دڵسۆزی خاک و نەتەوەکەی خۆتان بن، بەلام بەخۆڕای، خۆتان بۆ کەس بە کوشت مەدەن، ئاگاتان لە خۆتان بێ، چونکە لە پاشەڕۆژدا، کورد و (کاژیک) زۆر لە ئێستە، پێویستیان پێتان دەبێ!

**بەدەم گەڕانەوەوە ...**

ڕەوانشاد (برایم نووری ئەحمەد)، کە بە (شێخ برایمە شەلە) ناسرابوو، لە دایکەوە خزمم بوو، لە شێخەکانی (ئامادین) بوو، بۆ یەکەمین جار ساڵی (**1963**)، لە شۆڕشی (**11**)ی سێپتێمبەردا بووە بە پێشمەرگە و چەندین جار بریندارکراوە.

داوای لێ کردم، لە گەڕانەوەدا پێکەوەبین. منیش دوای ئەوەی پێشمەرگەکان پارەیان وەرگرت و گەڕانەوە، لەگەڵ ئەودا و لە پێشی دەبلکابینەیەکدا، تا (خانە) لەگەڵی سواربووم. لەڕێ بۆی گێڕامەوە، چۆن کاتی خۆی ساڵی (**1972**)، لە (خانە) ژیاوە، ڕایبواردووە و کونیەکونی شارۆچکەکە شارەزایە. منیش سەیرم لێدەهات، بیری هیچم نەبوو، ئەوەتەی (شێخ برایم)م دەناسی، هەر لە (سولەیمانی) دیومە، لە کوێوە پەڕیوەتە ئەو ناوە؟! کەی و بۆچی لە ئەوێ ژیاوە؟!

گوتی: دوای ئەوەی (حەمەی حاجی برایمی چەرمەگا) و کۆمەڵەکەیمان لە (خەلەکان) کوشت، یەکسەر رامانکرد بۆ بارەگەی (بارزانی) و ئەوانیش، ناردیانین بۆ (خانە). (ئیدریس) پێی گوتین: جارێ لە ئەوێ دانیشن، تا شتەکە کۆندەبێ، هەموو مانگێکیش بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، پارەیەکی باشیان بۆ دەناردین.

منیش بەڕاستی سەیرم لێهات، ئەو کاتەی ئەوە ڕوویدا، لەنێوخەڵکدا وابلاوبوو، ئەم کارە بێ ئاگاداری، بارەگەی (بارزانی) نەکراوە. بەڵام باوەڕم نەدەکرد، بە ئەو وردی و پلاندانانە کرابێ، داوی ئەو پیلانەش، لە بارەگەی (بارزانی) چێترابێ! داوام لێ کرد، لە نووکەوە بۆم بگێڕێتەوە. ئەویش پێکەنی و گوتی: بۆ چییتە؟ بۆ (کاژیک)ی دەنێری؟! گوتم: (کاژیک)ی چی؟ گوتی: بۆ تۆ وادەزانی، ئێمە لە کوێی گادا نووستووین، بۆ کەس هەیە، نەزانێ، تۆ لەگەڵ ئەواندا کاردەکەی؟ گەر بۆ ئەوانیشی دەنووسی، ئەوا پێویست ناکا، چونکە (شێخ موحەممەدی هەرسین) و (حەمەی عەزیز) خۆیان (کاژیک)ن، لە بارەگەی (بارزانی) کاردەکەن و ئاگایان لە ئەو جۆرە شتانە هەیە. گوتم: کاکە شێخ، تۆ بۆ منی دەگێڕیتەوە، هەقی (کاژیک)ت چییە؟!

ئیدی گوتی: باشە، گرنگ نییە. دوایی دەسپێکرد و گوتی: دوای ڕێککەوتنەکەی (**11**) مارسی (**1970**)، سەرۆک (بارزانی) لە هەموو لایەکمان خۆشبوو، سەرمان لە سەرکردایەتی دا و بەڵێنماندا، بۆ هەموو فەرمانێکی بارەگەی (بارزانی)، گوێڕایەڵ و دڵسۆز بین، هەر کارێکمان پێ بسپێرن، جێبەجێیکەین.

پاشان (چەرمەگایی)ەکان، ڕۆژی (**25. 9. 1971**)، لەپڕ (شێخ موحەممەدی سەییدعلی)یان لە (سولەیمانی) کوشت. ئێمەش هەموو (کاریزەیی)ەکان و شێخان کۆبووینەوە، لە ئەو بڕوایەدا بووین، دەستی (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی) تێدا هەیە. نوێنەرێکمان بۆ سەرەوە نارد و داوامان لێ کردن، ڕێمانبدەن، تۆڵەی خۆمان بکەینەوە. ئەوەبوو، لەگەڵ (ئیدریس)دا ڕێککەوتین، ئێمە بگەڕێینەوە و لە نێوچەی (خەلەکان)، خۆمان قایمکەین. ئەوانیش برووسکەیەک بۆ (حەمە) بنێرن و داوای لێ بکەن، سەردانی بارەگەی (بارزانی) بکا. لە هەمان کاتدا، ئێمەش لە ڕۆژی دەرچوونیان ئاگادارکەنەوە. پاشان ئەو ڕۆژە هات و ئێمەش لای (خەلەکان)ەوە، بۆسەیەکمان بۆ دانان. زاڵگەیەکمان دانا و چەن پێشمەرگەیەکی نەناسراومان، لەسەر جادەکە دانا، تا کە هاتن، ڕایانگرن و داوای نووسراویان لێ بکەن. پاشان دایانبەزێنن و بیانهێنن بۆ لای ئێمە.

کاتێ گەیشتن، داوای مۆڵەتی ڕۆشتنیان لێ کردبوون، چونکە چەکداربوون و پێشمەرگەش نەبوون. ئەوانیش نووسراوەکەی بارەگەی (بارزانی)یان پیشاندابوون. پێشمەرگەکانیش گوتبوویان: فەرموون دابەزن، با بچین بۆ لای لێپرسراوەکەمان. کە هێنایان بۆ لای ئێمە و ئێمەیان دی، ئینجا تێگەیشتن، ئەمە چاڵە و بۆیان هەڵکەنراوە، تازە هیچیان بۆ ناکرێ

و چەکیشیان پێ نەبوو، لە ترومبێلەکاندا بەجێیانهێشتبوو. ئێمەش هەموویانمان ڕیزکرد، یەکسەر دەسڕێژمان لێ کردن و هەموویانمان کوشت، هەر بە جێیەکانی ئەوانیش، خۆمان گەیاندەوە نێوچەی سەرکردایەتی. بارەگەی (بارزانی)ش، بە تیری دوو نیشانیانشکاند: لە کۆڵ هەردوو دوژمنە دێرینەکەیان بوونەوە و تۆڵەی خۆیان لە هەردوولامان کردەوە!

لە ڕاستیدا ئەو کاتە، ئەو هەنگاوەی بارەگەی (بارزانی)م بە ڕاست دەزانی، چونکە هەردوولایان، زیانێکی زۆریان لە شۆڕشی کورد دابوو، بەلام ئێستە بیری لێ دەکەمەوە و دەڵێم: گەر سەرکردایەتی شۆڕش، لە چەن کەسی خۆشبووبێ، ئیدی چ پێویستەکا، هێمنیناکاتەوە و دوایی، تۆڵەیان لێ بسەنێتەوە؟! چونکە جارێکی دیکە، کەس بڕوای بە ئەو جۆرە لێبووردنانە نامێنێ، ڕیزەکانی گەل پتر، ناکۆکی و دووبەرەکی تێدەکەوێ!

هەر بۆ نموونە: (شێخ موحەممەد)، لە سەرەتای لاوێتییەوە، پێشمەرگەبووە و سەرکردایەتی شۆڕش، کارێکی گرنگیان پێ سپاردووە، زۆر سەرکەوتووانەش جێبەجێیکردووە. (بەدرەدین عەلی) پارێزگاری شاری (هەولێر) بوو، وەک چۆن (زەعیم سەدیق) لە شاری (سولەیمانی)، وەک سەگێکی هار، لە گیانی خەڵکی شار بەربووبوو، بە تایبەتی ڕۆژی (19. 6. 1963)، بە دەیان خەڵکی نیشتمانپەروەری بێتاوانی کوشت، ئەویش بە هەمان شێوە دڕندەیەکی شۆڤێنی عەرەب بوو، یەکێکی دیکەی لە ئەو سەگە هار و کێویلانە بوو، خراپەیەکی زۆری، بەرانبەر دانیشتوانی شاری (هەولێر) کردبوو. بۆیە سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاریاندا، بیتۆپێنن. ئەوە بوو، ساڵی (1965) دوو پێشمەرگەی ئازا و گیان لەسەر دەستی کوردیان بۆ نارد، (شێخ موحەممەد) لەگەڵ پێشمەرگەیەکی دیکە لە شاری (بەغدا) بوو، پارێزگاری تاوتبار (بەدرەدین عەلی)یان کوشت، تۆڵەی بەرودوای هەموو تاوانەکانیان لێ کردەوە و بە سزای مەرگیان گەیاند. ئاخر تاوان نییە، پێشمەرگەیەکی ئازای وەک (شێخ موحەممەد)، لە تەمەنی (30) ساڵیدا، قوربانی دەستی جەنگی نێوخۆ و دوژمنایەتی خێڵەکی بێ، لە کاتێکدا هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە، لەپێناوی نەتەوە و نیشتمانەکەیدا، ژیانی خۆی بۆ خەباتکردن تەرخانکردبوو؟!!



( 1971 – 1941 )

دوایی (شێخ برایم) لە (خانە) مایەوە و منیش لەگەڵ ڕەوانشاد (ئەنوەری سەعید بەگ)دا سواربووم و بەرەو (مهاباد) ڕۆیشتین. ئەوە دواجاربوو، (شێخ برایم) ببینم، کاتێ لە دەرەوە گەڕامەوە، گوتیان کوژراوە. ڕۆژی (**29. 5. 2017**) حەزمکرد، سەرێ لە منداڵەکانی بدەم، کوڕە گەورەکەی (فەرەیدوون) و دایکی خاتوو (فاتمە)م بینی، ماوەیە پێکەوە دانیشتین و لە ئەو بارەیەوە هێندێ قسەمانکرد.

ڕەوانشاد (شێخ برایم)، پێشمەرگەیەکی زۆر ئازابوو، لە هیچ شتێ سڵی نەدەکردەوە. هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە، تێکەڵی شێخانی (کاریزە) بووبوو، بەهۆی ئەوانەوە، تووشی دوژمنایەتییەکی زۆر گەورە بووبوو. لە ئەنجامیشدا، دوژمنەکانی تۆڵەیان لێ کردەوە و ڕۆژی (**12. 10. 1983**) لە تەمەنی (**38**) ساڵیدا کوشتیانەوە. لە دوای خۆشی (**2**) کوڕ و (**4**) کچی بەجێهێشتووە. ئەوا (**34**) ساڵ بەسەر تیرۆرکردنیدا تێپەردەبێ، خاتوو (فاتمە) بە دیار منداڵەکانییەوە دانیشتووە، بە شێوەیەکی زۆر جوان و ڕێزەوە، گەورە و پەروەردەی کردوون!



( **1983 – 1945** )

**مهابـــاد**

یەکێ ڕەوانشاد (ئەنوەری سەعیدی عەلی والی بەگ)ی نەناسیایە، وای دەزانی، پیاوێکی زۆر تووڕەوتڕۆ، دڕندە و نەزانە، هەر بۆیە لەبەر کورتی باڵا، تێکسمراوی و شێوەی ڕوخساری، لە دوورەوە خەڵکی (سولەیمانی)، ناویانتابوو (هەڤاڵ دڕندە). بەڵام کاتێ لێی نزیکدەبوویتەوە و تێکەڵیدەبووی، ئینجا بۆت دەردەکەوت، چەن پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ، قسەخۆش و ڕووناکبیر بوو. وەک پێشمەرگەیەکیش هەمیشە، لە سەنگەرەکانی پێشەوەی خەباتدا دەجەنگا.

ئەو ماوەیەی لە (خانە)وە تا (پێنجوێن) پێکەوەبووین، باسی گەلێ بابەتی مێژوویی و ویژەیی بۆ کردم، دەمەتەقییەکی باشمان، لەسەر بیری نەتەوەیی و ڕەوشی شۆڕشی کورد کرد. زۆر خۆی بە نەتەوەیی دەزانی.

لە (مهاباد) دابەزین. دوای ئەوەی نانمانخوارد و کەمێ پشووماندا، کاک (ئەنوەر) زانی، ئەوە یەکەمین جارە، ئەو شارە خۆشەویستە دەبینم، تەکسییەکی بانگکرد و گوتی: بەنێوشار و شوێنە خۆشەکانی دەوروبەریدا بمانگێڕە. ئیدی هەموو جێگە گرنگەکان گەڕاین و کاتێکی خۆشمان بەسەربرد. شوفێرەکەش مێژووی شارەکەی بۆ باسدەکردین و بەناوەکانیان ئاشنایدەکردین. پاشان لە کاک (ئەنوەر)ی پرسی: خانمبازی ناکەن؟! ئەویش لە پێشەوە دانیشتبوو، لێی تووڕەبوو، گوتی: ئێمە پێشمەرگەین، بۆ ئەو جۆرە شتە خراپانە نەهاتووین، پێشمەرگە چۆن شتی وا دەکا؟! ئیدی کابرای شوفێر، لە ترساندا بێ دەنگبوو.

دوایی دابەزین، گوتی: ئەو پیاوە ناهەقی نەبوو، ئەو پرسیارەی لێ کردم، چونکە دەزانم، کورد بەگشتی و پێشمەرگە بەتایبەتی دێن بۆ (ئێران)، بە دوای خانمبازیدا دەگەڕێن، بەڵام گەر بۆ جارێکیش بێ، با ئەو کوردە بزانێ، پێشمەرگەی خاوەن ڕەوشتیش هەیە!

ئەو ڕۆژە، هەتاوێکی زۆر خۆشبوو، کەمێ بەپێش بەنێوشاردا گەڕاین. بەڕاستی (مهاباد)، هێندە دڵگیربوو، دڵم نەدەهات، بەجێیبێڵم. شارێکی زۆر جوان و خنجیلانە، خۆشەویست و مەڵبەندی کوردایەتی بوو. کاک (ئەنوەر)، گۆڕەپانی (چوارچرا)ی پیشاندام، ئەو گۆڕەپانەی دەسەڵاتدارانی داگیرکەری دەوڵەتی (ئێران)، پێشەوا (قازیی موحەممەد) و هاوەڵەکانیان لێ هەڵواسیبوو. چونکە وێنەی ئەو ڕەوانشاداتەم بە هەڵواسراوی دیبوو، مەلارەکەی (قازی) و لاقە شۆڕبووەکانیم، هەر لەبەرچاوبوو، وامدەزانی، تازە لەداردراوە و هێشتا ملی، هەر بەپەتی سێدارەکەوە دەجوڵێتەوە!

ئیدی لەگەڵ کاک (ئەنوەر)دا، کوڵی خەفەتمانخوارد. گوتم: کێ دەڵێ، گەر کۆماری (کوردستان) نەڕوخایە، ئێستە بارودۆخی ئێمەش، باشتر نەدەبوو؟! گوتی: گەر هەردوو پارچەکەی باشوور و خۆرهەڵات یەکیبوونایە، یەک سەرۆکیان هەبووایە و ڕابەری بکردایە، ئینجا باشتردەبوو. ئەگینا لێرە (قازی) و لە ئەوێ (بارزانی) هەبووایە، ڕێک نەدەکوتن.

بنەماڵەی کاک (ئەنوەر)، بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەری تێکۆشەربوون، جگە لە خۆی لە شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا، مانگی (7)ی ساڵی (**1982**)، لەنێوچەی (شارەزوور) شەهیدکرا، (**3**) برای دیکەشی بە ناوەکانی (عوسمان، کامەران و بەختیار) شەهیدکراون. سڵاو لە گیانی پاکیان بێ!



( **1982 – 1947** )

## پێنجوێن

ڕۆژی (9. 10)، گەیشتینەوە (پێنجوێن). کاتێ گەڕاینەوە، بارەگەی هێزیان بۆ نێو (پێنجوێن) گواستبووەوە. لە ئەو قوتابخانەیە هەواریانهەڵدابوو، کە بە منداڵی لێم خوێند بوو! (فەتاح ئاغا) ناردی بە دوامدا، لە حەوشەکە ڕاوەستابوو، بانگیکردم و گوتی: لەگەڵ (عەلی تۆفیق) بڕیارماندا‌وە، بچی بۆ بەتالیۆنەکەی (شێخ موحەممەد پاساکی) و کاروباری دارایی وەرگری. منیش یەکسەر ڕەتمکردەوە. زۆری ڕاگرتم و گەلێ قسەی بۆ کردم، بەلام کاری تێ نەکردم و گوتم: بڕیارێکە و داومە، تا لە شۆڕشدابم، نزیکی پارە ناکەومەوە. دەمەوێ، لە بەتالیۆنی (4) کاربکەم. ئینجا بۆ سەر بیروباوەڕ و بیری نەتەوەیی بایداپەوە. لە ئەو بارەیەوە، هێندێ قسەی بۆ کردم. پاشان گوتی: با (نوری) لە (تەویلە) بێتەوە، قسەیەکی لێ دەکەین.

ماڵی (ئازاد مستەفا) گواستبوویانەوە بۆ (مەریوان). بەلام (شێرکۆی هەژار)، بەزۆری هەر لای ئێمە دەژیا. (مامەبەکر)م وازی لە (سەولاوا) هێنابوو، لەگەڵ (ئەحمەی دەرویش حەسەن)ی هاوڕێی منداڵیدا، لە (پێنجوێن) دووکانێکیان دانابوو، هەر لە ئەوێش دەژیان و دەنووستن. زۆر هەوڵم لەگەڵ دان، بێنە لای ئێمە، یا خانوویەکیان بۆ پەیداکەم، هیچ کەلکی نەبوو. هەردووکیان دەرویشانە دەیانگوزەراند!

هاوڕێکانم گوتیان: لە سەرەوە (حوسێن موحەممەد سەعید) ناوێ شەهیدبووە، دەنگوباسەکە بە هەڵە، بە ماڵی باوکت گەیشتووە، دایکت بە قورپێوان هاتبوو بۆ ئێرە، ئێمەش دڵنیامانکردەوە و گەڕایەوە. ئیدی زۆرم پێ ناخۆشبوو، بۆ ئەوەی دڵیان هیچ نەکا، لە تاواندا نامەیەکم بۆ ناردن. کاتێکم زانی، دایکم و باوکم پەیدابوون. شەوێ لە ماڵی (عەلی عەبەوەنەوش) بووین، بەیانی بردمن بۆ (مەریوان).

## دووەمین سەردانی سەولاوا

ئەوە جاری دووەمبوو، سەردانی (سەولاوا) بکەم. ئەم جارەیان، بەتەواوی گەورە بووبوو. هێندێ ماڵ لە (پێنجوێن)ەوە گواستبوویانەوە و لە ئەوێ دەژیان. کاتەکەی پاییزبوو، شەو ساردیکردبوو. دانیشتووانی هۆردووگەکە، خەمیان لێ هاتبوو. چونکە بەفردەباری، ئەو ناوەی هەموو دادەپۆشی. کاربەدەستانی (ئێران)یش بەڵێنیاندابوو، لە وەرزی زستاندا بیانگوێزنەوە. ئەو کاتە، (سەلاح)ی براشم، لە ماڵی پورە (مەلیح)م دەژیا. چەن ڕۆژێ لەنێو خزم و دۆستەکانماندا ماینەوە، بە خۆشی ڕامانبوارد.

ڕۆژێ سەردانێکی (دووڕووە)مان کرد و چاومان بە (شێخ عوسمانی سیراجەددین) کەوت. من پشتم زۆر دیشا، بۆ شێخم باسکرد و ئەویش، هێندێ شلەمەنی وەک (سۆربۆزاک و

نەکمیوە)ی بۆ نووسیم، کە ناوەکانیانم هەرگیز بیرناچی، چونکە لەگەڵ (شێخ عوسمان)ی زاوامدا، بە ئەو ناوانە زۆر پێکەنین و دەیگوت: لە ناوی دەرمان ناچن و خۆی دروستیکردووە! بەڵام دوایی، لە دەرمانگەکانی (مەریوان) کڕیم و دوای ماوەیە، نەخۆشییەکەشم نەما!
لە گەڕانەوەمدا، (سەلاح)ی برامم لەگەڵ خۆم برد. لە (مەریوان) لە خوێندنگەی ئامادەیی شۆڕش وەرگیرا. ئەو کاتە لەگەڵ (حەسەن) ناوێکی کوردی خۆرهەلاتدا، لە ماڵی (ئازاد) دەنووستن. (ئازاد) دەیویست، هەردووکیان بۆ پاشەڕۆژی (کاژیک) پەروەردەکا!

**بەسەرهاتی گەشتێ**

دوای ئەوەی دایکم و باوکم گەڕانەوە، پارەیەکی باشیان دامێ. خۆشم ئەو دوو مانگەی لە سەرەوەبووم، مووچەم وەرگرتبوو. جگە لە ئەوەی، لە بارەگەی (بارزانی)شەوە، پارەیان دابوویێ، گیرفانم پڕبووبوو.
لە (پێنجوێن)، تووشی (سلەیمانی قەساب) بووم. قوڕگ و دەمی بە سارغی بەسرابوو. کونێکیان لە ئاستی دەمیدا هێشتبووەوە، تا بتوانێ، قسەبکا و نان بخوا. هەرچەندە نەیدەتوانی، وەک جاران بە ئارەزووی خۆی پاروونگلێنێ، بەڵکوو هەر شۆربا و شلەمەنی دەخوارد. گۆشت و کەبابی ورددەکرد و پارچەپارچە دەیخوارد. لەگەڵ خواردندا، ڕەوشی زۆر خراپبوو، بەڵام لە دەم نەکەوتبوو، گوێی نەدەدایە و لە جاران پتر قسەیدەکرد!
ئەو کاتە لە (تاران)، لە نەخۆشخانەیەک کەوتبوو، بۆ چەن ڕۆژی بە مۆڵەت هاتبووەوە. کارتی ئوتێلێکی دامێ و گوتی: لەگەڵ (برایم) و (سەرورەت) وەرن، ئوتێل و خواردنی بەیانیانتان لەسەر من. ئیدی منیش قایلبووم و زۆرم پێ خۆشبوو، (تاران) ببینم، بەتایبەتی ئەو کاتەش، (نوری) لە ماڵی باوکی لە (تەویلە) دایکوتابوو، ئەو ناوەش بێ دەنگبوو، هیچ دەنگی هێرشکردن و جەنگ نەبوو. جگە لە ئەوەی (ئازاد)یش بە هەلی زانی و گوتی: بەڵکوو لە (تاران)، بەهۆی (سیروان عوسمان)ەوە، هێندێ مۆری نوێ، بۆ (کاژیک) دروستکەی.
دەوروبەری ڕۆژی (**20 10**) بوو، هەرسێکمان چووین بۆ (مەریوان). ئەو شەوە لە ماڵی بەهەشتی (مەلانەجیب) ڕۆژمانکردەوە. ئەو کاتە مەلا، لێپرسراوی (مەکتەبی سەفەر) بوو. بۆ بەیانی، سەرێکمان لە (مستەفای حاجی تۆفیقی دەلاک) دا، ئەویش لای کوردێکی خەڵکی (مەریوان)، لە سەرتاشخانە کاریدەکرد، ناوی (عەلی زەریفی) بوو. (برایم)یش لە ڕێی (مستەفا)وە ناسیبووی. لە ئەو ڕۆژانەدا، کەم کەس دەیوێرا، بێ پرسی دەزگەی سیخوڕی (ساواک)، بچێ بۆ (تاران). چونکە یەکێ کەسێکی لە ئەوێ نەبووایە و جێی نووستنی دابین نەکردایە، بێ نامەی (ساواک)، هیچ ئوتێلێ جێی نەدەکردەوە.

(برایم) گوتی: من قسەم لەگەڵ کاک (عەلی) کردووە، پێکەوە دەچین بۆ (تاران) و یارمەتیماندەدا، بەمەرجێ خەرجی ئەمسەر و ئەوسەری، لەسەر ئێمە بێ. هەرچەندە پێم گوت: (سلەیمان) لە ئەوێیە و جێماندەکاتەوە، کەڵکی نەبوو.
ڕۆژی دوایی، سەری (عەلی زەریفی)مان دا و (برایم) پێی ناساندین. ئاغای (زەریفی)، دەستێ جلی ڕەشی زۆر سپۆرتی لەبەردابوو، وەک ئەکتەرەکانی سینەما، بۆینباخێکی قردیلەی بەستبوو. ڕیزی پێشەوەی ددانەکانی، هەمووی زێڕ و زیو بوو. لە قسەکردندا، زۆر ئەتەکێتی بەکاردێنا. هەر کە سەیری سەروقەسالیم کرد و ئەو هەڵسوکەوتەم لێ بینی، یەکسەر بە ساختەچی هاتە بەرچاوم. زوو بە (برایم) و (سەروەت)م گوت: با واز لە ئەم برادەرە بێنین، بە باشی نابینم، بەڵام گوێیان لێ نەگرتم. ڕەنگە ئێنکاری وەک (برایم)، لەنێوکورددا زۆر کەمبێ، بۆیە لەنێوخۆماندا، هەر لە زووەوە ناومانابوو: (ئێنکارۆقراتی). وایدەزانی، گەر ئاغای (زەریفی)مان لەگەڵ نەبێ، گوورگ دەمانخوا!
چی بکەین؟ چارنەبوو، بڕیارماندا، یەکێکمان پارەی هەرچوارمان خەرجکا و دوایی، بەسەر (3) دابەشیکەین. بلیتی پاسمان بڕی و لە (مەریوان) دەرچووین. من و (سەروەت) پێکەوە دانیشتبووین. جووتەبراش (برایم) و (زەریفی)، لە تەنیشتمانەوەبوون.
ئاغای (زەریفی) هەر لە سەرەتاوە، چارەی منی نەدەویست. دیارە دڵ ئاوێنەی دڵ بوو! چونکە من هەر گاڵتەم پێدەکرد و ساختەچییەکی تەواوبوو. هەستپێیکردبوو، من باشی دەناسم. لەبەرئەوە زۆر خۆی لە ئێمە نەدەگەیاند. بەڵام لەگەڵ (برایم)دا دەتگوت، بە سکێ لەدایکبوون! هەر قسەی بۆ دەکرد و ئەویش سەری بۆ دەلەقان. جا من پتر لە ئەوە دەترسام، (برایم) نیازی وابێ، بیکا بە (کاژیک) و بە سەرکردایەتی ئاغای (زەریفی)، سەرکردایەتی هەرێمی خۆرهەڵاتیش دامەزرێنن!
هەر لە یەکەمین چاخانە دابەزین و ویستمان، نانی بەیانی بخۆین، هێندەی دیکە بۆم دەرکەوت، کاکە (عەلی) هاوڕێ دڵسۆزەکەی (برایم)ی ساویلکە، چەن پیاوێکی ساختەچییە، چونکە ئێمە داوای هێلکە و ماست و چامان کرد، ئەو بە هەڵی زانی و بە ئەو بەیانییە زووە، یەکسەر داوای مریشک و کۆنیاکی کرد، لەگەڵ ئێمەش خەریکبوو، بخۆینەوە، بەڵام سەری نەگرت!

## کرماشان

گەیشتینە (کرماشان) و لە ئوتێل دابەزین. ئێمەی نەشارەزای دوای خۆی خست، لە ئوتێلێکی زۆر خۆش و گران جێیکردینەوە. نەیدەهێشت، ئێمە بچینەپێشەوە و قسەبکەین. هەر زوو هەموو شتێکی لەگەڵ ئۆفیسی ئوتێلەکەدا دەبڕییەوە. گەر بە ساختەچێتی نەبێ، ڕەنگە هەرگیز لە هەموو ژیانیدا، لە ئەو جۆرە ئوتێلانە دانەبەزیبێ! دیسانەوە،

بردینی بۆ ریستورانتێکی خۆش و گران، داوای خواردن و خواردنەوەی کرد. ئاغا پشتی پێوە نەدەیەشا و بە ئارەزووی دڵی خۆی دەلەوەڕی، دەتگوت، خەنجەر لە کا دەدا! (برایم)یش هەر فەرمووی لەسەربوو، منیش لە داخاندا خەریکبوو، دەئاوسام و هەر دەمگوت: ئاخری خێربێ!

دوایی پێشنیازمکرد، بەشەو بڕۆین و چی دیکە لە ئەوە پتر، لە (کرماشان) نەمێنینەوە، بۆئەوەی دوانەکەوین، زوو بڕۆین و زوو بگەڕێینەوە. برادەرانیش پێشنیازەکەیان پێ باشبوو. بەڵام (زەریفی) کەمێ منجەمنجێکرد و دەیویست، گەشتەکەی دووروودرێژبێ و لەسەر گیرفانی ئێمە بژی!

هەرچی چۆنێ بوو، مارسیدیسێکمان گرت و نزیکەی نیوەشەو بوو، بەڕێکەوتین. لە ڕێ زۆری چەنەدا، مێشکی سەری بردبووین، شتی زۆر قۆڕی بۆ باسدەکردین، وایدەزانی، ئێمە لە هاوڕێیانی ئەشکەوت بەجێماوین، گیامان بە کێوەوە خواردووە و لە وڵاتی ئێمە، ئەو شتانە نییە. بۆیە ناومنا (ئاغای چەنگەبووزی) واتە چەنەباز!

بۆ نموونە، باسی یاسای هاتوچۆی بۆ کردین و گوتی: گەر ترۆمبێلەکان خێرا بڕۆن و سەرپێچیبکەن، پۆلیسەکان ژمارەکانیان دەگرن و دوایی سزایاندەدەن. منیش پێم رادەبوارد، سەرم کردبووە سەری و دەمگوت بەڵکوو غیرەت بیگرێ و لە کۆڵمانبێتەوە، لێم پرسی: ژمارەکانیان بە چی دەنووسن، بە قەڵەم یا بە پاندان؟! (سەروەت) لەبەر پێکەنین کولابوو، بەڵام (برایم) خۆی گێفکردبووەوە و دەیگوت: (شێخ) عەیبە، وازی لێ بێنە!

## تـــاران

دەمەوبەیانی بوو، لە (تاران) لە نێوچەیەکی دواکەوتووی کۆن، لەبەردەم چاخانەیەک دابەزین. برسیمانبوو، هەر بەجانتاکانەوە لە چاخانەکە دانیشتین و نانمانخوارد. لە ئەوە دەچوو، ئەوە ئێشی بێ، هەموو جارێ بێ، هەر لە ئەو چاخانەیە نانبخوا و لە ئەو ئوتێلەش دابەزێ. بۆیە هەموو خەڵکەکە دەیانناسی و تەماشای ئێمەشیان دەکرد.

ئیدی من بەتەواوی، گومانم لێ پەیداکرد و بە هاوڕێکانم گوت: هەرچی چۆنێ بێ، دەبێ، خۆمان لەدەس ئەم ئاغا (نازەریفە!) رزگارکەین. بەڵام کاکە (بلە)، هێشتا بڕوای نەدەکرد. پاشان ناچاربووین، دوایکەوین و چووین بۆ ئوتێلەکە. دوو ژوورمان گرت. من ئوتێلەکەم بە دڵ نەبوو، لەگەڵ ئوتێلچییەکەشدا، هەر چرپەچرپیبوو. داواشیکرد، پارەی ئوتێلەکە پێشەکی بدەین. من گوتم: نایدەم. ئەویش لەگەڵ منیدا تێکیدا و کردی بە هەرا. هەستام، پەلامارییەم و تییەڵدەم. هاوڕێکانم نەیانهێشت. باشبوو، ئوتێلچیەکە دەریکردین و چووینە خوارەوە. (زەریفی)ش بە دواماندا هات. پێم گوت: تۆ چیت لە ئێمە دەوێ؟ بۆ وازمان لێ ناهێنی؟ بڕۆ، تومان ناوێ. ئەویش گوتی: ئێوە بە قاچاغ هاتوون، یا دەبێ، لەگەڵ من بێن، یا دەبێ، چەن هەزار تمەنێکم بدەنێ، ئینجا دەڕۆم، ئەگینا هەر ئێستە، (ساواک) ئاگاداردەکەم.

ئیدی وا تووشیووبووین، بە هیچ شێوەیە، لە کۆڵمان نەدەبووەوە. (برایم)یش واقی ورمابوو. بێدەنگ وەستابوو. دواجار من تەکسییەکم گرت، کارتی ئۆتێلەکەی (سلەیمانی قەساب)م پیشاندا، بەپەلە سواربووین و ڕۆیشتین. ئاغای چەنگەبوزیش، بە تەکسییەک دوامانکەوت و گرتینیەوە. ئێمە دابەزین و خۆمان کرد بە ئۆتێلەکەدا. (سلەیمان)یان بۆ بانگکردین و هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. گوتم: بەڵکوو لە کۆڵمانکەیتەوە. هەرچەندە (سلەیمان) قسەی بۆ کرد، هیچ کەڵکی نەبوو. ئینجا خەریکبوو، لێی توورەبێ. ئەویش هاتەپێشەوە و دەستی بۆ دەمی برد، ددانەکانی سەر و خواری دەرهێنا و بێ کەڵبە مایەوە، گوتی: ئێوە قێڵ لە من دەکەن، من زۆربەی ژیانم لە زینداندا بەسەربردووە، هەر لە زیندانیشدا، ددانەکانیان دەرهێناوم. یا دەبێ، پارەم بدەنێ، یا شکاتتان لێ دەکەم. ئیدی (سلەیمان) گوتی: ئەم سەگبابە زۆر پیاوێکی خوێڕی و خراپە، با تووشی بەلایەکمان نەکا، شتێکی بدەنێ و با بڕوا. بەڕاستی بیرم نەماوە، چەندمان دایە، بەڵام پارەی خۆی وەرگرت و ملی شکاند. منیش سەیرێکی کاکە (بلە)م کرد و گوتم: باشە؟! ئەویش گوتی: بە شەرەفم، بچینەوە بۆ (مەریوان) دەبێ، بیکوژم! ئێمەش لە ئەو ڕۆژەوە تا ئەوڕۆ، ئەوا (44) ساڵ تێپەڕیوو، هەر گوێقولاغین و بە تەماین، کاکە (بلە) مژدەی مەرگی (زەریفی)مان پێ بگەیەنێ!

سەیر ئەوەبوو، ڕۆژێ لە (مەریوان) بووم، بەبۆنەی دامەزراندنی پارتی (ڕیستاخیز)ەوە، خۆپیشاندان بوو. ئاغای (زەریفی)، لە پێشی پێشەوەبوو، ئاڵایەکی بەدەستەوەبوو، چاوی بە من کەوت، بە هەموو هێزی خۆی قیراندی، (جاوید شا) واتە بژی شا!

## تارانم چۆن دی؟!

دوای ئەوەی لە ئاغای (زەریفی) ڕزگارمانبوو، (سلەیمان) جێیکردینەوە، من و (سەروەت) پێکەوە لە ژوورێکی گەورە، ئەو و (برایم)یش لە ژوورێکی دیکەدا بووین. بەڕاستی، (تاران)ی ئەو سەردەمە، هەر لە (ئەورووپا)ی ئێستە دەچوو! دووکان و بازارەکانی، هەمووی بە گازینۆی جوان و ڕێکوپێک ڕازابوونەوە، سەرجادە و شەقامەکانی، زۆر خاوێن و خۆش بوون، هەمیشە جمەیاندەهات. گەلێ شوێنی جوان و خۆشی وەک (باخی وەحش، دەربەندشەمیران، بوورجەکەی ئێران) چووین. چاومان بە هێندێ هاوڕێی وەک (عومەری حاجی دەروێشی بەقاڵ، سیروانی عوسمانی سەعەی مەلاعەبباس) کەوت. (سیروان) بەڵێنی دامێ، مۆرەکانمان بۆ دروستکا، کەچی وەک پیشەی هەمیشەی خۆی، بەڵینەکەی خۆی بەجێ نەهێنا! ڕۆژێ بە ڕێککەوت، تووشی (مەلافەتاح عەبدولڕەزاق، جەلالی بلەی سنگەر، جەلالی مینا و ئەمیری حاکم شێت) بووین و هەموومان پێکەوە، چووین بۆ دەربەند (شەمیران) و تا ئێوارە لە ئەوێ بووین.



لە ڕاستەوە (جەلالی بلەی سینگەر، عومەر سالح، حوسێن موحەممەد عەزیز، جەلالی مینا، سلێمانی قەساب، برایمی حەمەعەلی، مالافەتاح عەبدولرەزاق، سەروەت موحەممەد ئەمین و ئەمیری حاکم شێت) ڕۆژی (27. 10. 1974) گیراوە.

لە (تاران) پیاسەمانەکرد، هەر بە ڕێککەوت، ڕەوانشاد دوکتۆر (هەلکەوت)ی سەرۆکی بەشی بەروبوومی کێلگەم بینی، زۆر بێتاقەتبوو، گوتی: لە ئەوانەیە بۆ خوێندن ڕەوانەی دەرەوەتان کەن. منیش گوتم: تازە ئێمە فێری ژیانی پێشمەرگایەتی بووین، دەرەوەمان ناوێ، کەچی نەمدەزانی، هەمووی چەن مانگێکی دیکەی پێ ناچێ، شۆڕش تێکدەشکێ و بەسەرشۆڕی دەگەڕێینەوە! ماوەی هەفتەیە لە (تاران) ماینەوە. لە ئەو ماوەیەدا، بازارە گەورەکانی (پلاسکۆ) و (کورش) گەڕاین، هێندێ کەلوپەل و دیاریمان کڕی.



لە ڕاستەوە (سەروەت موحەممەد ئەمین، برایمی حەمەعەلی، حوسێن موحەممەد عەزیز و سیروانی عوسمانی مەعەی مەلاعەباس) ڕۆژی (29. 10. 1974) لە فرۆشگەی (پلاسکۆ) گیراوە.

پاشان بە پاسە گەورەکانی (TBT)، تا (کرماشان) هاتینەوە. ڕۆژێکیش لە ئەوێ ماینەوە و دوایی بە تەکسی هاتینە (سنە). شەوێ لە ئەویش ماینەوە و لە ئوتێل (ئابیدەر) بووین. پاشان بەرەو (مەریوان) گەڕاینەوە. من و (برایم) لە هۆردووگەی (سەولاوا) لاماندا. مالی (سابیر)ی برای، تازە گەیشتبوونە ئەوێ و سەری لی دان. دوو ڕۆژیش لە ئەوێ بووین، پاشان گەڕاینەوە بۆ (پێنجوێن). هەر زوو هەواڵی بریندابوونی هەردوو هاوبیری ئەفسەر (کەریمی شێخ سەلام) و (شوان)مان پێگەیشت، کە لە بەرەکانی جەنگ، لە سەرەوە بەشداریانکردبوو.
هەر لە ئەو ماوەیەشدا بوو، دوو هاوبیری ئازا و دڵسۆزی دیکەمان، لە سەرەوە شەهید بوون. لێپرسراوی سەربازی (جەمالی وەستا موحەممەد)، خەڵکی (هەڵەبجە) بوو. ئەوی دیکەشیان ملازم (موحەممەدی حاجی ئەحمەدی سەرۆپی) بوو، هەردووکیشیان لە هێزی (زمناکۆ) بوون.

## شێوازێکی نوێی ڕێکخستن

لەگەڵ (ئازاد)دا دانیشتین و لەسەر ڕاپۆرتەکەی خۆم، دەمەتەقێیەکی دوورودرێژمان کرد. هێندێ لە پێشنیازەکانیان پێ باشبوو. ئەوەبوو، ڕێکخستنی سەربازیمان، لە ڕێکخستنی ڕامیاری جیاکردەوە. (کۆمیتەی سوپایی)مان دروستکرد و لە (4) هاوبیر پێکهاتبوو. کارەکانیشمان، بە ئەم شێوەیە دابەشکردبوو: (ئازاد) لێپرسراوی کۆمیتە و منیش کارگێری کۆمیتەکە بووین، ناوی هەموو ڕێکخستنەکە و مۆری کۆمیتە لای من بوو. هەردوو ئەفسەر (مەنسوور) و (کەریم)یش، ئەندامبوون.
(مەنسوور) لێپرسراوی هێڵی ڕێکخستنی تیۆچەی سەرکردایەتی و (کەریم)یش لێپرسراوی هێڵی ڕێکخستنی هێزی (زمناکۆ) بوون. بە ئەو شێوەیە، ئەفسەرەکان (مەنسوور، شوان و حەمەشەوقی)، لە سەرەوە کاریاندەکرد.
پاشان لە ماوەیەکی کەمدا توانیمان، پێشمەرگەیەکی زۆر، لە دەوری (کاژێک) کۆکەینەوە. لە هێزی (زمناکۆ)، هەردوو هاوبیر (کەریم) و (جەلالی حاجی حوسێن)، چالاکییەکی زۆریان نواند. جگە لە ئەوەی ئێمە، لە هەردوو هێزی (خەبات) و (ئەزمر)، قسەمان لەگەڵ زۆربەی کادیرە سەربازییەکانی وەک (تایەری عەلی والی بەگ، شێخ موحەممەدی سەیید عەلی حافز، بەختیار بابان، نزاری عەقید ئەمین، ئەنوەری مەجید سوڵتان، جەمالی خولەسنەیی) و چەندین سەرلق و لێپرسراوی سەربازی دیکەی وەک (مەهدی مەلاعەلی، ئەنوەری عەلی نەجار، جەزای عەلی کاتب، سلێمانی قەساب ...) کرد و ڕێکمانخستن.
مامۆستا (عوسمان) لە شاری (سنە)، چاپ و ڕۆنیۆیەکی نوێی کڕیبوو، هەموو نووسین و کارەکانی (کاژێک)مان، پێ ڕادەپەڕاند. ڕێکخستنێکی هاوچەرخمان دروستکرد، ئیدی

ڕۆژبەڕۆژ قەبارەمان زیادیدەکرد. لەبری ناوی نهێنی، هەر هاوبیری ژمارەی نهێنی تایبەتی خۆی هەبوو. دۆسییەکمان درووستکردبوو، هەر هاوبیری سێ لاپەڕەمان بۆ تەرخانکردبوو، هەر چالاکییەکی بنواندایە، یا شتێکی لێ ڕوویدایە، لە لاپەڕەکەیدا دەمانووسی. ئیدی وردەوردە، چالاکیمان دەنواند، خەریکبووین، لە قۆناغی گاگۆلکێ دەرچین وسەرپێی خۆمان بکەوین.

(ئەییلی نووری مەتی)، هاوڕێیەکی دێرینی خۆم بوو. لە شۆڕشدا، لە پەیمانگەی کادیرانی (پارتی) دەیخوێند. بەلام هەمیشە، بیری لە بیری ئێمەوە نزیکبوو. لە مانگی (11)دا، خوێندنەکەی تەواوکرد و هات بۆ (پێنجوێن)، لە بارەگەی لقی (4)ی (پارتی)، سکرتێری کارگێڕیی بوو. هەر زۆر پێوەندیم پێوەکرد و کاری لەگەل دەکردین. ئیدی بەهۆی ئەوەوە، ئاگامان لە هەموو دەنگوباس و هەواڵێکی لیژنەی ناوچە و لقی چواری (سولەیمانی) بوو.

یەکەمین بلاوکراوەم، بۆ هێزەکانی پێشمەرگە نووسی، لەگەل (شێرکۆی هەژار)دا، بە ڕۆنیۆ ڕامانکێشا، لە هەموو هێزەکانی دەورووبەری (سولەیمانی) و نێوچەی سەرکردایەتی، ژمارەیەکی زۆرمان لێ بلاوکردەوە. لەبەرئەوە دەزگەی (پاراستن)، شێت و هاربوون، هەموویان بە ئیشی من دەزانی و زۆربەی خەلکیش پێیان وابوو، من سەری مارەکەم!

## چەن هەلسووکەوتێکی سەیر!

لە ئەو ماوەیەدا، زۆر بە کوڵوڵەوە کارمدەکرد. لە بەریشەوە هێندێ گوتارم ئامادەدەکرد. لە ئەنجامی ئەوەی ڕۆژبەڕۆژ، ڕیزەکانی ڕیکخستنی (کاژیک) فراوانتردەبوو، وردەوردە، باری ئابوورییمان ڕووی لە گەشەکردن دەکرد. چەک و تەقەمەنیمان دەسدەکەوت. ئێمەش ڕیزێکی بێسنوورمان، لە هاوبیران (شێرکۆ، ئازاد و عوسمان) دەگرت. بەلام ئەو برادەرانە، کەمێ لە خۆیان بایبووبوون و لە قاوغەکەی خۆیان دەرچووبوون! بەتایبەتی (شێرکۆ)، هەر زۆر سەیر بوو، پیاوێکی زۆر تووڕە و کەلەڕەق بوو، قسەی وەرنەدەگرت. بۆ نموونە: (کاوس)ی هاوڕێم، لای ئێمە میوانبوو. ئێوارەیە چووینەوە بۆ مالەوە، (شێرکۆ) لە ئەوێ بوو. (کاوس) سلاویکرد، وەلامی نەدایەوە و خۆشهاتنیشی لێ نەکرد. ئینجا ئەو ڕوویتێکرد و سلاوی لێ کرد. کەچی دیسانەوە وەلامی نەدایەوە. بەلکوو دوای ماوەیە هەستا و ڕۆی. ئەمە تەنیا هەر لەبەرئەوە بوو، کاتیان بۆ (کاوس) دانابوو، بیبینن، لە (تەویلە)وە بەتایبەتی بۆ ئەوە هاتبوو، بەلام هەلەیە ڕوویدابوو، هۆکەشی هەر لە خۆیانەوە بوو، نەیانتوانیبوو، بیبینن. ئیدی لەبری ئەوەی هۆکەی بزانن و ڕەخنەی لێ بگرن، بە ئەو شێوەیە هەلسوکەوتی لەگەل کرد، کە ئەوە نیشانەی کالوکرچی بیر و ڕەوشتی ئەو پیاوە بوو!

هەروەها (فوئاد موحەمەد ئەمین سەراج)، هاوبیریکی خۆمان بوو، هێندێ ڕەخنەی لە هەڵسوکەوتی هاوبیرانی (کاژیک) گرتبوو. شەوێکیان بە ئێمەیان گوت: ماڵەکەمان بۆ چۆڵکەن، هێندێ کاری تایبەتیمان هەیە. (فوئاد)یان بانگکردبوو، تا (شێرکۆ) قسەی لەگەڵ بکا و لێی بپرسێتەوە. (برایم)یش وەک دەرویشی لێپرسراوەکەی ئامادەبووبوو. هەر لە ڕێوە، کترەییەک ئاویان گەرم کردبوو، بۆکسی ئاسن و چەقۆیان دانابوو، گوایە گەر (فوئاد) دانی بە هەڵەکانیدا نەنا و ڕاستی نەگوت، وای لێ بکەن، بەزۆر دان بە تاوانەکانیدا بنێ، کە ئەو کارە لە ڕەفتار و کردەوەی پیاوە دیکتاتۆر و فاشیستە دڕندەکان دەچێ! جا ئەو کاتە، خۆی و پارتەکەی هێشتا هیچ نەبوون، لەگەڵ هاوبیریکی خۆیدا، بە ئەو شێوەیە هەڵسوکەوتیدەکرد، ئاخۆ گەر دەسەڵاتی تەواوی هەبووایە و دەسی بڕۆشتایە، چی لە نەیار و دوژمنەکانی خۆی بکردایە؟!!

جگە لە ئەوەی، ئەم کەلە سەرکردەیە، بەتەواوی بۆنی دەمی گۆڕابوو، کە تازە هاتبوو، شێوازی قسەکردن و هەڵسوکەتی جۆرێ بوو، بەڵام دوای ئەو ماوەیە، بە جۆرێکی دیکە بوو، کەمتر خۆی پیشاندەدا، ڕەنگوڕووی دیکتاتۆری پێوە دیاربوو. لە هەموو جۆرە باسێ، خۆی لادەدا و دەیویست، ئێمە وا تێبگەیەنێ، تەنیا هەر بۆ (کاژیک) دەژی و هیچ جۆرە ژیانێکی دیکەی، لا مەبەست نییە! بە کوردییەکەی، زۆر وشکبوو، ڕووی نێو کۆمەڵی نەبوو، لەگەڵ کەسدا هەڵی نەدەکرد! لە ئەم دواییانەشدا هەستمکرد، ناکۆکییەک لە نێوان (عوسمان) و (شێرکۆ)دا هەیە، بەڵام نەمدەزانی، لەسەر چییە و بە کوێ گەیشتووە؟!

(ئازاد)یش هێندێ جار گوڕجوگۆڵ، وریەبەزن، بەهێز و چستوچالاک بوو. هێندێ جاریش بێورە، بێتوانا و سستوسۆڵ بوو. گەلێ جار دووقۆلی دادەنیشتین، هەموو کەموکووڕی و گرفتەکانمان دەستنیشاندەکرد، ڕەخنەم لێ دەگرتن، خۆشی بڕوای بە هەموو قسەکانم دەکرد. هەرچەندە دەیویست، گەلێ شت بدرکێنێ، بەڵام نازانم، بۆچی هیچی نەدەگوت، لەنێو سنگ و سکی خۆیدا، لوولیدەدا و پۆنگیدەخواردەوە؟! دیارە پێی ڕاست نەبوو، لە پشت سەری هاوبیرەکانییەوە قسەبکا. هەموو جارێ دەیگوت: با کۆنگرە بگرین، بزانە، چی دەکەم و چی دەڵێم! بەڵام زۆر گلەیی لە (برایم) دەکرد، هەمیشە دەیگوت: شیاوی ئەو شوێنە نییە، کە کاری تێدا دەکا! ئەو کاتە، من لە ئەو گلەییانە تێ نەدەگەیشتم، بەڵام دوایی زانیم، هەموو قسەکانی ڕاستبوون، چونکە دوای هەرەسەکە، هەمووی بەرەوڕوو پێ گوت.

ئەو خۆی وەک (ئازاد) بەتایبەتی و سەرکردایەتی کاتی بەگشتی، بڕوا و هیوایەکی گەورەیان بە من هەبوو، پێیان دەگوتم (صەمامی ئەمانی حیزب) و (ئازاد)یش، چەن جارێ، ئەوەی بە گوێی خۆمدا داوە. هەر بۆیە، هەموو کارەکانی بە من سپاردبوو، هەرچەندە خۆی لێپرسراوی یەکەمی کۆمیتەی سوپایش بوو!

## ڕووداوێکی خەمگین

ماڵی (سلەیمانی قەساب)، دوو نهۆمبوو، خۆی لە سەرەوە و خواڵێخۆشبوو مامۆستا (حەمەسالحی عەبەپشی)ش، لە خوارەوە دەژیان. شەوێ (حەمەسالح)، داوەتی من و ملازم (مەنسوور)ی کرد. (سلەیمان) لە سەرەوە، کۆڕی دانیشتنی گەرمبوو. ئێمەش چەن کەسێ بووین، دانیشتبووین و لە گەرمەی قسەکردندا بووین. (قەهمی عەلی قنگە)، دەرگەی کردەوە و گوتی: (حەمەعەلی حەمەمراد) لە حەوشە کەوتووە و دەناڵێنێ. یەکسەر هەموو چووینەدەرەوە و بینیمان، زۆر ئازاری هەبوو، بە ئاستەم هەناسەیدەدا. (سلەیمان) گوتی: دانیشتبووین و دەمانخواردەوە، هاتەدەرەوە، دەسیەئاوبگەیەنێ، لە هەیوانەکەوە بەسەردا کەوتووەتەخوارەوە. حەوشەکەیان کۆنکرێتبوو، لەنێوەراستی حەوشەکەشدا، حەوز و فوارەیەکی تێدابوو. ملی بەر قەراغی حەوزەکە کەوتبوو، بە هیچ شێوەیە نەیدەتوانی، بجوڵێ و قاچی نەبوو، هەستێ. لەبەرئەوە بڕیارماندا، بە ئەو نیوەشەوە بیبەین بۆ (مەریوان). من بەپەلە چووم بۆ لای (نوری)، خەبەرمکردەوە و ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە. پاشان داوای جیبەکەم لێ کرد. ئەویش زۆر بەساردییەوە گوتی: با ڕۆژبێتەوە، بزانین، چی بەسەردێ. گوتم: تا ڕۆژدەبێتەوە، دەمرێ. بەڵام هیچ گوێی نەدایە!

کاتێ گەڕامەوە، (سلەیمان) جیپێکی پەیداکردبوو. لەسەر داوای (حەمەعەلی)، من و (سلەیمان) لەگەڵی سواربووین. (فەرهاد عەبدولحەمید)یش لەگەڵمان هات. کاژێری یەکی شەو گەیشتین. باشبوو، ئەو شەوە (بلە گوێ سووتاو)، ئێشکچیبوو، زۆر یارمەتیداین. هەر دەسبەجێ، (فەرهاد) تێلیفۆنی بۆ کاک (فەتاح) کرد و بە ئەو شەوە هات. (مەلانەجیب) و (دارای حەسەن یارە)شی لەگەڵ بوو.

(حەمەعەلی)، خوێنێکی زۆری لەبەرڕۆیشتبوو. پێویستی بە خوێن بوو. سەیر ئەوەبوو، نەخۆشخانەکە پڕبووبوو لە کورد. جگە لە خوێنی من، خوێنی کەسی دیکەی بۆ نەبوو. من خوێنم دایە، دەرزیان لێدا و خۆشی سەرخۆشبوو، هەر زوو خەوی لێکەوت. دوکتۆرەکان گوتیان: بەیانی زوو دەبێ، ڕەوانەی (سنە)ی کەین. چونکە (دڕکەپەتکە)ی ئازاری پێ گەیشتووە. (فەتاح ئاغا) بە (فەرهاد)ی گوت: ئەم شەو لای دەمێنێتەوە و بەیانی لەگەڵی بچۆ بۆ (سنە). پاشان بڵاوەمان لێ کرد.

(حەمەعەلی) تا (مەریوان)، هەر لە باوەشی مندا بوو. هەموو جلەکانم خوێناوی ببووبوو. جامانەکەم لە سەرییەوە ئاڵاندبوو، بە سەری ڕووتی گەڕامەوە. ئەو شەوە من و (سلەیمان)، لە ماڵی (مەلانەجیب) کاژێری (**4**)ی بەیانی نووستین، بەیانیش گەڕاینەوە بۆ (پێنجوێن)، ئەمە ڕامانبوارد!

ئەوا ئەورۆ (**44**) ساڵە، (حەمەعەلی) هاوڕێم، لەسەر گازی پشت کەوتووە و ناتوانێ، هەستێ، هێندە ئازا و خۆراگرە، ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمبینی، گوێم لێ نەبوو، ئاخ و ئۆفی لە دەمی بێتەدەرەوە، یا سکاڵایەکبکا، یا بگری، هەرچەندە بە هیچ شێوەیە، چاری نییە و تا ماوە، هەر دەبێ، لەنێوجێدا بکەوێ!



ئەم وێنەیە، مانگی (**8**)ی ساڵی (**2017**)، لە ماڵی (حەمەعەلی) گیراوە.

## پارتیی و هاوبیرانی کاژێک

لە سەرەتای ساڵەکانی حەفتای سەدەی پێشووەوە، (پارتی) هەر بەناو هەبوو، وەک لاشەیەکی بێگیان وابوو. چونکە دەزگەی (پاراستن)، بەتەواوی جێیگرتبووەوە. بەتایبەتی لە ساڵی (**1973**)وە، تا دوارۆژەکانی گیانەڵای شۆڕشی (**11**)ی سێپتێمبەر و کارەساتی هەرەس، دەسەڵاتێکی گەورە و توانایەکی بێسنووری هەبوو. کام ئەندامەی لە (پارتی)دا، زۆر بە تەمەن و دەسەڵات بوو، لەگەڵ لێپرسراوێکی (پاراستن)، هیچی پێ نەدەکرا. جگە لە لیژنەی ناوچە و لقەکان، (پارتی) لە هەموو (کوردستان)دا، ڕێکخستنی نەبوو. ئەو دوو دەزگەیەش، وەک فەرمانگەی لێهاتبوو، گەر یەکێ پێویستی بە نووسراوێ یا پشگیری هەبووایە، سەردانیدەکردن!

ئەندامانی لقی (سولەیمانی)، دوواتیان (عەبدولی سوران) و (سدیقە فەندی)، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیش بوون، بەڵام هێندەی (خاڵەحاجی)، لە شۆڕشدا ناوبانگ و دەنگیان نەبوو! بارەگەی لق لە گوندی (هەرگێنە) بوو، هەمیشە چۆڵبوو. لە خۆیان پتر بەدەگمەن خەڵک هاتوچۆیدەکردن. ڕۆژانە نیوەڕوان، خواردنی باشیان ئامادەدەکرد، ئەگینا هیچ کارێکی دیکەیان نەبوو. وەک تەمبەڵخانەی لێهاتبوو، هەرچی بە ئەوێدا بڕۆشتایە، لایەدا و پشوویەکیدەدا، یا نانیدەخوارد و دەڕۆی! (خاڵەحاجی) هەموویانی لە دەسەڵات ڕووت کردبووەوە، کەس نەبوو، بەرانبەری بکۆکێ!

مانگی (**11. 1974**) بوو، ڕەوانشادان (عەبدولی سوران) و (کەمال خۆشناو)، سەردانێکی کاک (فەتاح)یان کرد. داوایان لێ کرد، لە ڕیزەکانی پێشمەرگەی هێزی (خەبات)دا، بایەخ بە ڕێکخستنی (پارتی) بدەن، لە هەموو بەتالیۆن و لقەکاندا، ڕێکخستنەکە زیندووکەنەوە و بیبووژێننەوە. ئەویش زۆر بە گەرمی، پێشوازی لێ کردن و ئەو بیرۆکەیەی بەباش زانی. سەیر ئەوەبوو، زۆربەی پێشمەرگەکان بەگشتی و خوێندەوارەکان بەتایبەتی، ڕازی نەبوون، کار لەگەڵ (پارتی) بکەن و دەیانگوت: ئێمە پێشمەرگەین و تەنیا هەر (بارزانی) دەناسین، (پارتی) چی و کێ تاقەتی کۆبوونەوەی هەیە؟! ئەو جۆرە شتانە بۆ کاتی باشە، کە شۆڕش لە گفتوگۆدا بێ، جادەکەی پانبێ، خەڵکی شارەکان بالفشکەن و خۆیان بەسەر خەڵکدا بادەن!

لە ئەنجامدا، لە هەموو هێزی (خەبات)، چەن کەسێکیان بۆ کۆنەکرایەوە، لیژنەی ناوچەی لێ دروستکەن. لەبەرئەوە هانایان بۆ ئێمە هێنا، زۆربەی کادیرەکانی (کاژیک)، لە لیژنەی ناوچەی (پارتی) و ڕێکخراوی بەتالیۆنەکاندا دانران. (نوری، عەلی تۆفیق و برایم) بە منیان گوت: تۆمان بۆ لێپرسراوی ڕێکخراوی بەتالیۆنی (**4**) و ئەندامی لیژنەی ناوچەی هێز داناوە. بەڵام یەکسەر ڕەتمکردەوە و کارم لەگەڵ نەکردن. ئەوانیش خۆیان پێکەنیان دەهات و دەیانگوت: خۆ ئێمەش (پارتی) نین، ئەمە تەنیا شتێکی ڕووکەشە و کاک (فەتاح) داوای لێ کردووین! چونکە هەرگیز لە ئەو بڕوایەدا نەبووم. جارێکی دیکە، خۆم بە شتی لاوەکییەوە خەریککەم و سەری خۆم بەخۆرای قالکەم. لەبەرئەوەی هەموو کاتی خۆم، بۆ باوەڕ و پارتەکەی خۆم تەرخانکردبوو. بەدەس من بووایە، یەکسەر (پارتی)م لە (کوردستان)، بەیەکجاری هەڵدەوەشاندەوە، لە جێی ئەو (کاژیک)م جێگیر و بەهێز دەکرد.

بۆیە وەک (خاڵەحاجی)، ساڵی (**1972**) پێی گوتم: شەرەفی ئەندامێتیمان لێ سەندیتەوە، منیش هەرگیز حەزم نەدەکرد، جارێکی دیکە ئەو شەرەفە بەرزەی (پارتی)م پێ ببەخشرێتەوە! چونکە خەڵکی کوردایەتی دەکرد و دوای سەرۆک (بارزانی) کەوتبوو، نەک لە خۆشی (پارتی)، چەکی پێشمەرگایەتی هەڵگرتبێ. جا گەر بە پێوانەی شەرەفی ئەندامێتی (پارتی) بووایە، لە (**90%**)ی خەڵکی (کوردستان)، بێئابڕوو دەمانەوە!

### دوو سەردانی کتوپڕ

ڕۆژی لەپڕ، ملازم (حەمەشەوقی) پەیدابوو. هێندە دۆست و ئاسیاوی زۆربوو، هەر شەوەی لە ماڵی بانگەکرا و تەنیا هەر یەک شەو، بەر ئێمە کەوت. زۆر شتمان باسکرد و شەوێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد. پاشان بەرەو (هەڵەبجە) ڕۆی و بڕیاربوو، بگەڕێتەوە. بەڵام لە ئەوی خاتوو (ڕووناک)ی کچەکەی (شێخ حەمەئەمین)ی خواست و هەر بە (ئێران)یشدا گەڕابووەوە.

بەڵێنی دابووینێ، لە (ورمێ) مۆرەکان درووستکا. لەبەرئەوە بڕیاربوو، من و (برایم)یش بچین و مۆرەکان بێنینەوە. مامۆستا (قادر)یش تازە، لە بەرەکانی جەنگی ناوچەی سەرکردایەتی گەڕابووەوە. گوتی: منیش دێم و حەزدەکەم، ماوەیە پشووبدەم. ئیدی هەرسێکمان پێکەوە ڕێککەوتین و بەرەو (ورمێ) سواربووین.

## سنە

هەر ئەو ڕۆژە لە (پێنجوێن)ەوە، خۆمان گەیاندە (سنە). هێشتا سەرلەئێوارەبوو، چووین بۆ نەخۆشخانە و سەرمان لە (حەمەعەلی) دا. باری تەندروستی زۆر خراپبوو. لە سینەنگەیەوە تا نووکی پێی هەردوو قاچی نەدەجوڵا. (فەرهاد)ی لابوو، بینیمان. ئێوارە پێکەوەبووین و زۆری لێ کردین، لە ئوتێلەکە دانیشین. ئەو شەوە، دەمەتەقێیەکی دوور و درێژمان، لەسەر (کاژیک) کرد. هێندێ شتی باسکرد، گومانم لە ئەوە نەبوو، کە قسەکانی ڕاستبوون. چونکە (فەرهاد) ئەوانی لە ئێمە، باشتر دەناسی و لە (کاژیک)دا، لە ئێمەش کۆنتربوو. بەڵام (برایم) بێ ئەوەی زۆر ئاگای لە ڕووداوەکان بێ، کوێرانە داکۆکی لە (شێرکۆ) و (عوسمان) دەکرد، چونکە پێکەوە ئەندامی سەرکردایەتی کاتی بوون! تەنانەت ئەو دووانە، پروپاگەندەیان بۆ (فەرهاد) دەکرد و دەیانگوت: کورد نییە و دەبێ، لە (کاژیک) دەرکرێ!

## جارێکی دیکەش مهاباد

ڕۆژی دوایی، گەیشتینە (مهاباد). ئێوارەیەکی درەنگبوو، لە ئوتێلەکە چووینەدەرەوە. زۆرمان برسیبوو. هەموو خواردنگەکان داخرابوون. لە گۆڕەپانی (چوارچرا)، تەنیا خواردنگەیە، لە دوورەوە گلۆپەکەی دەسووتا. بەڵام دەرگەکەی داخرابوو. لە دەرگەم دا و کوڕێکی گەنج، لێی کردینەوە. بە قسەکانمدا تێگەیشت، لە باشووری (کوردستان)ەوە هاتووین. یەکسەر فەرمووی لێ کردین و دەرگەکەی داخستەوە. پیاوێکی دیکەشی لێ بوو. خۆیان بە ئێمە ناساند و دانیشتین. گوتیان: ئەم شەو میوانی ئێمەن و دەبێ، دڵمان نەشکێنن. ئیدی خواردن و خواردنەوەیەکی زۆریان هێنا، تا درەنگانێ، باسی کێشەی کوردمان بۆ کردن و بیروڕامان گۆڕییەوە. سەبارەت بە بارودۆخی کوردی هەردوو بەشەکەی (کوردستان)، هێندێ پرسیارمان لە یەکدی کرد.
دوایی لێیان پرسین: حەزتان لە گۆرانی هەیە؟! ئێمەش گوتمان: زۆر حەزمان لە (حەسەن زیرەک) و (حەمەی ماملێ) هەیە. ئیدی ئەو شەوە تا نیوەشەو دانیشتین. ئەو دوو برادەرە، یەکێکیان بە مێزەکە تەپڵی لێدەدا، ئەوی دیکەشیان، گۆرانی بۆ دەگوتین.

بە جووتە ئاهەنگێکیان بۆ گێڕاین، مەگەر هەر لە دیوەخانە گەورەکاندا، ئاهەنگی وا ساز کرابێ! زۆر دەنگیان خۆش بوو، دەتگوت، (زیرەک) و (ماملێ) بۆ خۆیان دانیشتوون و گۆرانیمان بۆ دەچڕن. (برایم)یش بە دەنگە بەسۆزەکەی خۆی، بۆی دەسەندنەوە، هێندەی دیکە ئاهەنگەکەی ڕازاندبووەوە. تا نیوەشەو پێکەوەبووین و ڕێزێکی زۆریان لێ گرتین، پاشان تا بەردەگەی ئوتێلەکەش، لەگەڵمان هاتن.

ئاخر نازانم، گەر ئەوە نیشانەی بەهێزی هەستی نەتەوەیی کوردەکانی خۆرهەڵات نەبێ، خۆیان بە کورد نەزانن، لەپێناوی چیدا، سێ پیاوی نەناسیاو بانگدەکەن، کاتی خۆیان دەکوژن و ڕاژەیاندەکەن؟! ماوەی ئەو ساڵەی شۆڕش، هاتوچۆی (ئێران)م کردووە، ئەو پیاوەتی و مەردایەتییەی، لە کوردەکانی ئەو بەشەی (کوردستان)م دیوە، لە (سولەیمانی) لە براوسێ و کەسەکانی خۆشمانم نەدیوە!

**ورمێ**

بەیانی ڕۆژبووەوە، سواربووین و چووین بۆ شاری (ورمێ). ئەوە یەکەمین جاربوو، ئەو شارە ببینم، زۆر گوێم لە ناوی ئەو شارە بووبوو، دەشمزانی، لەسەر ئەو شارە گەورەیە، لەنێوان کورد و ئازەرەکاندا، چەن گرفتی گەورە ڕوویداوە.

(ورمێ) لەسەردەمی شادا، ناوی (رەزائیە) بوو. لە تەنیشت زەریاچەیەکی گەورەوە دروستکرابوو. بە یەکێ لە شارە گەورەکانی (کوردستان) دەژمێررێ. دانیشتووانەکەی بەزۆری، لە کورد و ئازەر پێکهاتووە. بەڵام فارس و ئەرمەنیشی زۆر لێ دەژین. سەرەڕای ئەوەش، ژمارەیەکی زۆر لە ئەو کوردە فەیلییانەی، (بەعس) دەریکردبوون، لە (ورمێ) نیشتەجێکرابوون و کاریاندەکرد.

شارەکە بەئاشکرا، ڕوخساری پێشکەوتنی پێوە دیاربوو. دووکان و بازاڕ، گازینۆ و ئوتێلەکانی، زۆر جوان ڕازابوونەوە. جادە و شەقامەکانیشی، سەوزاییەکی زۆریان لێ چێنرابوو. بەڕۆژ سەرجادەکان، لەبەر خەڵک جمەیدەهات. شارەکە شارێکی گەلێ جوان و دلگیر بوو.

ناونیشانی ئوتێلێکمان پێبوو. لە ئەوێ دابەزین. بە ڕێککەوت (فەرەیدوون عەبدولقادر) و (ڕاستی نوری شاوەیس)یش لە ئەوێ بوون. هەر ئەو ڕۆژە ئەوان گەڕانەوە و فریانەکەوتین، ماوەیە پێکەوەبین. دووکانی مۆرهەڵکەنەکەمان دۆزییەوە. خاوەنەکەی تەنیا هەر زمانی فارسی و ئازەری دەزانی. ئێمەش عەرەبی و کوردییمان دەزانی، هیچیشیان ئینگلیزییان نەدەزانی! بۆیە ناچاربووین، بگەڕێینەوە بۆ ئوتێلەکە، تا تەگبیرێبکەین و یەکێکی باش بدۆزینەوە، یارمەتیماندا و تێیانبگەیەنێ.

(حەمەشەوقی) ناوی خۆی نەهێنابوو. مۆرەکانی بە ناوی (کاژێک)ەوە، بەدرووستکردن دابوو. لە ئوتێلەکە دانیشتبووین، خەڵکێکی زۆری لێبوو، زۆربەیان بە کوردی قسەیان دەکرد. بەڵام باشبوو، کەسیانمان نەدەناسی. لەپڕ پیاوی هات و بە ئوتێلچییەکەی گوت: هاتووم، (کاژێک) ببینم، لە ژووری (412)یە. هەر یەکسەر مامۆستا (قادر) هەستا، بەرەورووی ڕۆیشت و قۆڵی گرت، بە کوردی پێی گوت: کوری حیز، نیازت نییە، بە کوشتمان بدەی؟! بلێ، کاک (ژیر) و (کاژێک)ی چی؟! هەرچی چۆنی بوو، تێیگەیاندین، کە هێشتا درووستیان نەکردووە و سەرەی زۆر لە پێشەوەیە. ئیدی نائومێدبووین.

دوای نیوەڕۆ، تەکسییەکمان گرت و چووین بۆ سەر زەریاچەی (ورمێ). ئەو کاتە وەرزی زستان بوو. ڕۆژێکی سارد و سەرما بوو. تا چاوبرکا، زەریاچەکە هەر شینی دەکردەوە. لەنێو بازارەکەیدا، کەمێ گەڕاین و دووکانێکی کوردی فەیلیم دۆزییەوە. سەرو کڵاوی ڕووسی خووری گەرممان لێ کڕی.

دوا ئێوارەمان بوو، چووین بۆ (ئێران کلوب) دانیشتین. ڕەوانشاد (دارا تۆفیق)ی ئەندامی سەرکردایەتی (پارتی)ش، لەگەڵ چەن میوانێکی بیانیدا، لە ئەوی بوون، بەرانبەرمان دانیشتبوون و بە ئینگلیزی دەدوان. بەڵام نەیدەزانی، ئێمە کوردین، هەر تەماشاشی دەکردین. تا درەنگانی دانیشتین و پاشان هەستاین، شەوێکی زۆر خۆشبوو، ڕێستورانتێکی زۆر نایاببوو، بە گۆرانی و مۆزیکێکی زۆر خۆش، هێندەی دیکە شەوەکەیان خۆشکردین. بەیانی زوو هەستاین و هەروا بە دەسی بەتاڵ، بەرەو (پێنجوێن) گەڕاینەوە.

## مامۆستا کەریم بە حەواوە گیرا!

دایک و خوشکەکەی (خالید زامدار)، لە (سولەیمانی)ەوە ڕایانکردبوو، خانوویان دەس نەدەکەوت. برادەرانیش، نهۆمی خوارەوەیان بەخۆڕای دابوونێ و ماوەیە بوو، لە ئەوێ دەژیان. (خالید) هەمیشە سەرخۆشبوو. هەر خەریکی خوێندنەوە و نووسین بوو. هەموو ژمارەکانی گۆڤاری (ڕزگاری)م کۆکردبووە و بەرگم تێگرتبوو، لێی وەرگرتم و نەیهێنایەوە، دوای هەرەسی شۆڕش، لای ڕەوانشاد (شێخ ئەنوەری بەرزە) بینیم، بۆ فرۆشتن دایناببوو، گوتی: لە (زامدار)م کڕیوە! برایەکی پێشمەرگەی هەبوو، زۆر کوڕێکی باشبوو، جاروبار بەسەردان دەهاتەوە. بەڵام دایکیان زۆر دەنگی زل و ناخۆش بوو، زۆر بە قسەشبوو، لووتێکی زلی پێوەبوو، چرووچاوپووشاوییەک بوو، زۆر ناشیرن و قەبە بوو. (کەریم ڕۆژ) زۆر هاوڕێی (خالید) بوو، زۆربەی کات لایانبوو، دایکی ناوناببوو (پاپای). ئێمەش لە نهۆمی دووەم دەژیاین. هەمیشە میوانمان هەبوو، ماڵەکەمان جمەیدەهات. هەر بە ئاستەم بجوڵاینایەتەوە، لە خوارەوە گوێیان لێ بوو، دایکی (خالید) هاواری لێ

هەڵدەسا، سەرەڕای ئەوەی کرێی خانووشیان نەدەدا، هەمیشەش بۆڵەبۆڵییبوو. لەبەرئەوە لە خوامان دەویست، چۆڵیکەن و بڕۆن. چەن جاری پیمانگوتن: خۆمان ئەو ژێرزەمینەمان دەوێ، بەڵکوو بۆمان چۆڵکەن. دایکیشی دەیگوت: خانوو لە ئەمە، باشترم دەس ناکەوێ و ناڕۆم!
ئیدی ئیمە چارمان نەما، بڕیارماندا، بەشێوەیەکی دیکە دەریانپەڕێنین. شەوانە تەپەتەپێکی زۆرمان دەکرد و بە دەنگی بەرزیش قسەماندەکرد. شەوێکیان دانیشتبووین، (برایم) ویستی، تەپەتەپێکا و خەویان لێ بزڕێنێ. چەن جاری لەسەر قەرەوێڵەکەوە، بەجووتەپێ خۆی هەڵدا و بازبازێنێیەکرد. هیچ دەنگ نەبوو. پاشان (کەریم) گوتی: تۆ لاچۆ، وا نابێ، با من خۆم هەڵدەم. لە ئەو کاتەدا (کەریم) خەریکبوو، خۆی هەڵدا، هەر بە حەواوەبوو، پێی بەر زەوی ژوورەکە نەکەوتبوو، (پاپای) بێ ئەوەی لە دەرگە بدا، دەرگەی ژوورەکەی کردەوە و گوتی: ئەمە تۆی؟! توخوا شەرم ناکەی، بە ئەم نیوەشەوە بازبازێندەکەی، هەراسانتکردووین و نایەڵی، بنووین؟!
(کەریم)یش هیچی بۆ نەمایەوە، لەتاواندا گوتی: بە خوا من نیم، کاک (برایم) بوو. (پاپای)ش گوتی: کوڕە بۆ درۆدەکەی، کاک (برایم)ی چی، ئەوەتە دانیشتووە، من بە چاوی خۆم تۆم دی، بازتدا. بە خوا لە ئەوە خراپتریش بکەن، ناڕۆم و چۆڵی ناکەم. ئیدی ئەو شەوە، تا درەنگانێ پێکەنیوین! ئەوانیش گوێیان بە هیچ نەدەدا و (پاپای) قسەشی لەگەڵ نەدەکردین. هەر لە ئەوێش مانەوە، تا شۆڕش تێکچوو، ئینجا هەموومان پێکەوە، ماڵەکەمان چۆڵکرد و گەڕاینەوە. بە هاوڕێکانم گوت: ئەم ئاشبەتاڵە، زیانێکی زۆری بە کورد گەیاند، بەڵام ئیمەی لەدەس (پاپای) ڕزگارکرد!

**دوو بڵاوکراوەی ناوزڕاو**

سەرکردایەتی کاتی هەرێمی باشووری (کاژیک)، دوو بڵاوکراوەی زۆر هیچوپووچی نێوەڕۆک پووچەڵ و ناوزڕاویان دەرکرد. یەکەمیان ڕۆژی (21. 1. 1975) و دووەمیشیان ڕۆژی (25. 1. 1975) بوون. هەردووکیان یەک لە یەکدی خراپتربوون، نێوەڕۆکێکی زۆر لاوازیان هەبوو، بە شێوازێکی زۆر منداڵبازانە نووسرابوون!
بە نێوەڕۆکی هەردوو بڵاڤۆکەکەدا، زۆر بە ڕوونی دەردەکەوت، ئەندامانی ئەو سەرکردایەتییە خۆسەپێنەرە، لە ئەندێشەیەکی قووڵ و بیرێکی ئەزۆکدا دەژیان، وایان دەزانی، (کوردستان)یان ڕزگارکردووە و دەوڵەتێکی (کاژیک)یان دامەزراندووە! ئیدی کاتی ئەوە هاتووە، هەردوو دەزگەی دادگەی نەتەوەیی و هێڵی سیخوڕی (کاژیک) درووستکەن، تا لە گیانی هاوبیرەکانی خەباتی دوێنێی خۆیان بەربن. وەک چۆن دوای

ئەوەی (سەددام حوسێن)، دەسی بەسەر دەسەلاتدا گرت، کۆمەڵی هاوڕێی خەباتی خۆی و ئەندامانی سەرکردایەتی (بەعس)ی پاکتاوکرد. ئایا کەس بڵاوکراوەی وا لاواز و نێوەڕۆک پوچەڵی دیوە، هێندە درێژ و توند بێ، هێندەش جنێوی تێدابێ؟!

ئەو دوو بڵاڤۆکە بە ناوی سەرکردایەتی هەرێمی باشوورەوە بڵاوکرانەوە، بێ ئەوەی ئەو دەسەلاتەیان هەبێ، هێرشێکی زۆریان کردبووە سەر (ئێران)، داوای بەرەیان لە (پارتی) و کۆمۆنیستەکانی سەر بە (قیادە مەرکەزی) کردبوو. لە کۆتایی بڵاڤۆکەکەشدا، ناوی هەموو سەرکردایەتی کۆنیان ریزکردبوو، هەموویانیان لە (کاژیک) دەرکردبوو. من کە خوێندمەوە، زۆرم پێ ناخۆشبوو، لەبەرئەوە زۆر بەتوندی، دژی ئەو بڵاوکراوەیە وەستام و ڕەخنەیەکی زۆرم لێ گرت. چونکە لەلایەکەوە، ئەوان سەرکردایەتی کاتی بوون، کەس هەڵی نەبژاردبوون. لەبەرئەوە دەسەلاتی ئەوەیان نەبوو، بڵاوکراوەی لە ئەو بابەتە دەرکەن و کەسیش دەرکەن، بەرنامەیەکی نوێش بۆ (کاژیک) دانێن.

لەلایەکی دیکەوە ئێمە هەموومان، لەژێر باڵی بەسۆزی سەرکردایەتی شۆڕش و سەرۆک (بارزانی)دا بووین. لە بڵاوکراوەکەدا، هێرشێکی توندیان بۆ سەر (ئێران) کردبوو، ئەوەش بەتەواوی، دەزگەی (پاراستن)ی تەنگەتاوکردبوو! لەلایەکی دیکەشەوە، هەموو بڕیارەکانی دانیشتنەکانی کۆنفرانسیان پێشێلکردبوو. (ئازاد)، هەموو ئەو ڕەخنانەی منی لا پەسەندبوو. بەڵام ڕاستی نەدەدرکاند، بۆچی ئەو بڵاڤۆکەیان دەرکردووە و پێی قایل بووە؟! هەرچی چۆنێ بوو، لەگەڵ (ئازاد)دا ڕێککەوتین، جاری بڵاوی نەکەنەوە و ڕایگرن. هەروەها بڕیارماندا، بۆ چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە، یەکەمین کۆبوونەوەی (کۆمیتەی سوپایی) بکەین.

من و (ئازاد)، بۆچوونەکانمان زۆر لە یەکدییەوە نزیکبوو. (کەریم سەلام) لە هێزی (زمناکۆ) لە (تەوێڵە) بوو، هێشتا هەر لە (مەنسوور) باشتربوو. ئەو زۆر لێمانەوە دوور بوو. (ئازاد) گوتی: حەزدەکەم، وەک ئەندامێکی (کۆمیتەی سوپایی)، سەرێ لە ئەو ناوە بدەی و لە ئەو سەرێشەوە، لەگەڵ (مەنسوور)دا پێکەوە بگەڕێنەوە. تا ئێوەش دێنەوە، وەلام بۆ (کەریم)یش دەنێرم و کۆبوونەوەکەمان دەکەین. منیش پێشنیازەکەیم پەسەندکرد.

## سەردانی هاوبیران

ئەو کاتە، ڕەوانشاد ملازم (تاپەری عەلی والی بەگ)، جێگری فەرماندەی هێزی (خەبات) بوو. نامەیەکم نووسی و بۆم برد. مۆڵەتی هەفتەیەکم بداتێ. مۆڵەتەکەی دامێ و بە پێکەنینەوە گوتی: ئاگات لە خۆت بێ!



( 1982 – 1936 )

هاوبیر (جەلال سەعید) لە (مەریوان)، لەگەڵ (مەلانەجیب) لە (مەکتەبی سەفەر) کاریدەکرد. هەر زوو رەزامەندی (ساواک)یان بۆ وەرگرتم و بەرەو (خانە) سواربووم. زۆر پەلەم بوو، لەبەرئەوە لە هیچ شوێنێ خۆم دوانەخست و هەر بەرێوەبووم. لە ماوەی شەو و رۆژێکدا، خۆم گەیاندە (چۆمان) و لە ماڵی رەوانشادان (حەمەشەوقی) و (عەزەی ئەحەبۆق)ی ژنبرای دابەزیم.

(عەزیز) لەگەڵ چەن پێشمەرگەیەک، لە ئەوێ بوون، بێ ئەوەی هیچ کارێکی هەبێ. (حەمەشەوقی)ش لە گەرووی (بێشێ) بوو. هەر ئەو رۆژە، وەڵامم بۆ نارد و هاتەوە. شەو و رۆژی پێکەوەبووین و ئەوی پێویستبوو، بۆم باسکرد و پاشان بۆ سبەینێ گەڕایەوە. چونکە نەیدەتوانی، ئەو بەرە گرنگەی جەنگی رووبەڕووبوونەوەی دوژمن، چۆڵکا و خۆشی زۆر بە دڵوکوڵەوە کاریدەکرد. هەر لەرێی (حەمەشەوقی)شەوە، برووسکەیەکم بۆ (مەنسوور) نارد و داوام لێ کرد، لە ماوەی دووڕۆژدا بگاتە (چۆمان). لە ئەو ماوەیەدا، چاوەرێی (مەنسوور)م دەکرد، بیستم، (فەتاح ئاغا) لە سەرەوەیە و لە (مەکتەبی عەسکەری) دابەزیوە. بە پێویستم زانی، سەرێکی لێ بدەم و مۆڵەتەکەم درێژکەمەوە. کە چوومەژوورەوە، دووقۆڵی لەگەڵ (عەبدوڵلائاگرین) دانیشتبوون. من تەنیا سڵاوم لە کاک (فەتاح) کرد، چونکە (ئاگرین) لەبەرەکەی دیکە بوو، مامۆستای پەیمانگەی کادیرانی (پارتی)ش بوو، دەنگوی ئەوەش هەبوو، کە هەر لە کۆنەوە (پاراستن) بووە!

کاک (فەتاح) بەزەردەخەنەیەکەوە لێی پرسیم: ئەوە خێرە لێرەی؟! گوتم: بۆ سەردانی هێندێ برادەری خۆشەویست هاتووم. بەبزەیەکی تەوساوییەوە گوتی: ئەو برادەرە خۆشەویستانەی، وەک خۆت بیردەکەنەوە؟! گوتم: مەرج نییە. گوتی: پارەت پێویست نییە؟ گوتم: زۆر سوپاس، پارەم پێیە. ئیدی ماوەی دوو هەفتەی دیکە، مۆڵەتەکەی بۆ درێژکردمەوە و ماڵاوایم لێ کرد.

(مەنسوور) بە پێشمەرگەیەکدا، نامەیەکی بۆ ناردم، بۆی نووسیبووم، ئێرە کەسی لێ نییە و ناتوانم، بێم، گەر دەکرێ، تۆ وەرە و چاوەڕێتدەکەم. منیش بڕیارمدا، بچم. هەر بەیانی زوو، لەگەڵ پێشمەرگەکەدا بەڕێکەوتین و تا سەر پردەکەی (حافز)، بە ئوتۆمبێل چووین. دیسانەوە بە چیای (کاروخ)دا سەرکەوتمەوە، بە (گەرەوانان) و (ئاکۆیان)دا تێپەڕیبوومەوە. دوای دوو ڕۆژ و یەک شەو، بە دیداری (مەنسوور) شادبوومەوە. بەڕاستی، دوای ئەوەی لەگەڵ بەتالیۆنەکەماندا، لە گەرووی (مێگر) گەڕاینەوە، لە ئەو بڕوایەدا نەبووم، جارێکی دیکە ئەو ناوە ببینمەوە. بەڵام وا ئەم جارەیان، بە کاری تایبەتی (کاژێک) بینیمەوە!

ئەو کاتەی ئێمە لە ئەوێ بووین، هاوینبوو. ئەو ناوە زۆر ئاوەدانبوو. لە هەردووبەری چەمەکە، لە بن دار و لەپەنا گرد و چیاکاندا، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی هەڵاتووی گوند و شارۆچکەکانی لێبوو. لەتاو فڕۆکە و سوپای داگیرکەری (عێراق)، شوێنەکانی خۆیان بەجێهێشتبوو. بەڵام ئێستە زستانە و یەک مەتر بەفرباریوە. ئەو ناوە کەسی لێ نەماوە، چۆڵوهۆڵبوو، مەگەر بە ڕێککەوت، لە ڕێ تووشی پێشمەرگە بووینایە!

## بارەگەی لقەکەی ملازم مەنسوور

ئەو کاتە (مەنسوور) سەرلقبوو. فەرماندەی بەتالیۆنەکەیان لە ئەوێ نەبوو. هەر خۆشی سەرپەرشتی بەتالیۆنەکەی دەکرد و بارەگەی بەتالیۆنەکەیان لە (دۆڵی ئاشان) بوو. بارەگەی لقەکەیان لەنێوان (حەریر) و (کۆرەک) لە نێوچەی (دۆڵی ئالانە)، لە پێشی پێشەوەی بەرەی جەنگ بوو. لەنێوقەدی چیاکەدا، (3) ژووری نزمی بچووکیان، لە قوڕ و بەرد دروووستکردبوو. ژوورێکیان هی (مەنسوور) و جێگرەکەی، دوو ژوورەکەی دیکەشیان، هی پێشمەرگەکان بوون. ژوورەکان زۆپایان تێدابوو. گەرم و خۆش بوون. سەرلووتکەی چیاکەی بەرانبەریشیان، هەمووی بە ڕەبایەی سەربازی سوپای (عێراق) گیرابوو. زۆر لە یەکدییەوە نزیکبوون و بێ دووربین، یەکدیان دەبینی. ڕۆژ نەبوو، لە ڕەبایەکانەوە بەرتۆپیان نەدەن. بەڵام گوللەتۆپەکان، ئەو شوێنەیان نەدەگرتەوە و زیانی بە پێشمەرگەکان نەدەگەیاند. هەر یەکەمین ڕۆژ گەیشتم، کەمێ دانیشتین و ماندوویبوونم دەرچوو، چەن تۆپێکی پێوەنایێن، (مەنسوور) گوتی: ئەوە بەخێرهاتنی تۆ دەکەن!

دوای نیوەڕۆ، لەگەڵ چەن پێشمەرگەیەکدا، بە چیاکەدا هەڵگەڕاین، (مەنسوور) هەموو هێڵی پێشەوەی پیشاندام و بە دووربینیش، سەیری هەموو شوێنەکانم کرد. پشتی چیاکەی بە دەس دوژمنەوە بوو، نێوچەی (حەریر) بوو. دوایی نانی ئێوارەمانخوارد، شەویش لە تەنیشت زۆپا و لەبەرتیشکی چراکە دانیشتین و قسەماندەکرد. لەبەرئەوەی لەلایەکەوە، (مەنسوور)م زۆر خۆشدەویست و زۆر هاوڕێمبوو. لەلایەکی دیکەشەوە من بە (کاژێک)م ناساندبوو، نەمدەتوانی، هیچی لێ بشارمەوە. بۆیە هەرچی هەبوو، زۆر بەڕاشکاوی بۆم باسکرد. پاشان بڕیارماندا، پێکەوە بەرەو (پێنجوێن) بڕۆین و هەموو

شتەکان، لەگەڵ هاوبیرانذا باسکەین و یەکلاییکەینەوە. بەڵام ئەو کاتە هێشتا، لێپرسراوی بەتالیۆنەکەیان نەگەڕابووەوە، ئەویش نەیدەتوانی، لە ئەو کاتە ناسکەدا، ئەو شوێنە ستراتیژییە چۆڵکا. لەبەرئەوە داوای لێ کردم، من بۆ (چۆمان) بگەڕێمەوە و لە ماڵی کاک (عەزیز) چاوەڕێیکەم.

ماوەی (3) ڕۆژ لای (مەنسوور) بووم. ئەو (3) شەوەی لە ئەوێ بووم، هەموو شەوێ پێشمەرگەکان، (خۆشاو)یان بۆ دەهێنام، بەڕاستی هێندە خۆشبوو، تێرم لێ نەدەخوارد! ئەو کاتەی لای پێشمەرگەکان بووم، هەستم بە خۆشی و چێژێکی تایبەتی دەکرد. ئەو کوڕە کوردە ئازایانە، لە هەموو خۆشییەکی ژیان و لە هەموو کەسێکیانەوە دووربوون. بەڵام هەموو کاتێ، لە مردنەوە نزیکبوون!

هەر ئەو کاتە (مەنسوور)، نزیکەی نیوەی پێشمەرگەی لقەکەی خۆی، لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی (کاژیک)دا ڕێکخستبوو. منیش لە ئەو ماوەیەدا، گوتارێکی مێژوویی درێژم، لەسەر بەشێکی درووشمەکەی (کاژیک) بۆ نووسین (کوردستان بۆ کورد) بۆ؟

## چۆمـــان

(3) ڕۆژ لای (مەنسوور) مامەوە، پاشان بەسرێکی دامێ و لەگەڵ پێشمەرگەیەکدا، تا نیوچەی (گەرەوانان)ی گەیاندم. دواییش بەتەنیا، بە هەمان ڕێدا گەڕامەوە. بە هەرچی دەردیسەرییەک بوو، بە ئەو سەرماوسۆڵەیە، خۆم گەیاندە سەرجادەی قیر، سواری ترۆمبێلی بووم و گەیشتمەوە (چۆمان). ماوەی هەفتەیەک، لە ماڵی کاک (عەزیز) بووم و چاوەڕێی (مەنسوور)م دەکرد. چەن شەوێکی خۆشم، لای برادەران (دارای حەسەن یارە، ئەسعەد قەرەداخی، ئازادی عەبدوللا فەندی، مەزنی عوسمان فایەق و عومەر شەمەیی) بەسەربرد.

ئەو شەوەی لای هاوڕێ و هاوبیری خۆشەویستم ڕەوانشاد (مەزن) بووم، (عومەر شەمەیی)ش هات، هەرسێکمان تا درەنگانی دانیشتین و باسی بارودۆخی شۆڕشمان دەکرد. من و (عومەر) خەومان لێ نەدەکەوت. واشمانزانی، (مەزن) نووستووە. لەسەر (کاژیک) دەمەتەقێمان دامەزراند. ئەوە یەکەمین جاربوو، ئێمە سەبارەت بە (کاژیک)، بەئاشکرا بدوێین. چونکە هەرگیز پێکەوە کارمان نەکردبوو. گەلێ داکۆکی لە خۆی و سەرکردە کۆنەکانی (کاژیک) کرد. (شێرکۆی هەژار) و (عوسمان ڕەشید)شی، بە تێکدەر و ئاژاوەچی تاوانبارکرد. (ئازاد مستەفا)شی بە کۆنە جەلالی و جاش دانا. منیش بێ ئەوەی یەکدی زویرکەین، وەڵامی هەموو تۆمەتەکانیم دایەوە و گەلێ شتیشم بۆ ڕوونکردەوە. ئیدی بێدەنگبوو.

پاشان گوتم: گەر ئەو کادیرانە دەیانەوێ، لەگەڵ ئێمەدا کاربکەن، ئەوا من دەتوانم، دانیشتنی سازکەم، هەردوولا پێکەوە دانیشین، دەمەتەقێ لەسەر باری (کاژیک) بکەین، هەموو پێکەوە بڕیاربدەین و ئاشتبوونەوەیەکی گشتی درووستکەین. (عومەر) گوتی: ئەو پێشنیازە خراپ نییە. بەڵام لە ئێستەدا، بڕوام بە بارەگەی (بارزانی) هەیە!

کاتی بەیانی لە خەوهەستاین، (مەزن) پێی گوتم: شەوی خەوم لێ نەکەوتبوو، گوێم لە هەموو قسەکانتان بوو، سەبارەت بە سەرکردایەتی کۆنی (کاژیک)، هەرچییەکت گوت، ڕاستبوو. ئەوان لە ئەوەش خراپترن.



( 2008 – 1900 )

من و (مەزن) لە ئەم قسانەدا بووین، دوو فرۆکەی (عێراق) هاتن. تۆپە فرۆکەشکێنەکانی شۆڕش و ڕاکێتی (هۆک) ڕاویاننان و ئاسمانیان لێ کردن بە چەرمی چۆلەکە، دووکەڵێکی زۆر، بەری ئاسمانی داپۆشی. فرۆکەیەکیان بەپەلەپرووزی دەربازبوو. ئەوی دیکەشیان، بە ئاسمانەوە گڕیگرت و کەوتەخوارەوە. شەوی ڕادیۆی (بەغدا)، هێرشێکی زۆر توندی، کردە سەر شای (ئێران) و گوتی: (ئێران) بە هەموو شێوەیە، جەنگی بەرانبەر بە (عێراق) ڕاگەیاندووە، هێزەکانیان لەنێو خاکی (عێراق) دان و بە ڕاکێتی (ئەمیریکایی)، فرۆکەیەکی (عێراق)یان بەرداوەتەوە!

## لەگەڵ (عەزەی ئەحەبۆق)دا

لە (چۆمان)، پیاوێکی لێبوو، ناوی (عەلی زەردەشتی) بوو. (عەزەی ئەحەبۆق) گوتی: خاڵە (عەلی) لە (کاژیک) کاژێکترە! با بچین، سەرێکی لێ بدەین و پێت بناسێنم. (زەردەشتی) پیاوێکی بەساڵاچووبوو، دووکانێکی چکۆلانەی هەبوو، هەمیشە دەوری پڕبوو. خەڵکی (سولەیمانی)، ڕۆژانە سەریان لێدەدا، پێیان ڕادەبوارد و تووڕەیاندەکرد. ئەویش جگە لە سەرۆک (بارزانی)، جنێوی بە یەکبەیەکی سەرکردەکانی کورد و هەموو کەسێکی دیکەش دەدا. پاشان عەرەب و تورک و فارسی دادەگرتەوە، ئەوەی خراپ بووایە، پێی دەکردن. منیش خۆم پێ ناساند و گوتی: لە کوێ پێشمەرگەی؟ گوتم: لە هێزی (خەبات). ئیدی هەر گوێم لێ گرتبوو، پەیتاپەیتا خەڵک دەهات و سەریان دەکردەسەری. ئەویش بێ دڵی خۆی نەدەکرد، بە کامی دڵی خۆی، جنێوبارانی دەکردن! ڕۆژێ لەگەڵ (عەزیز)دا چووین بۆ (مەکتەبی عەسکەری). لە دوورەوە، شوێنەکەی کاکە (حەمەی عەزیز)ی پیشاندام. لە بن دارێکدا بوو، بەچواردەوری دارەکەدا، بەگوریس چوارگۆشەیەکی چکۆلانەی دروستکردبوو. تا خەڵک لە ئەوە زیاتر، نەچنە پێشەوە. خۆشی بە ئەو سەرمایە، لە نێوراستدا بەپێوە وەستابوو، قسەی لەگەڵ خەڵک دەکرد، نامە و سکاڵای لێ وەردەگرتن. (عەزیز) گوتی: تەماشای کاکە (حەمە) بکە، خۆی هەر لە (عەدنان قەیسی) و

شوێنەکەشی، لە (حەلبەی موسارەعە) دەچێ! منیش ئەوە یەکەمین جاربوو، کاکە (حەمە) ببینم. ئەو کاتە، هێندەی دیکە ڕقم لێی هەستا. دوایی تووشی ڕەوانشاد (ستاری سەعید خەلەف) بووم، هەر زوو نووسراوێکی گەڕانەوەی بە (ئێران)دا بۆ وەرگرتم و خۆم ئامادەکرد.

پاشان (مەنسوور) هات. ئەو شەوە لە ماڵی (عەزیز) بووین. چەن برادەرێکی دیکەی خەڵکی (سولەیمانی) وەک (سلێمانی قەساب، حەسەن حوسێن، عومەری ڕەشەجووتە، جەلالی مام ئەحمەد، عومەر شەمەیی، مەزنی عوسمان فایەق) و یەک دوو پێشمەرگەی دیکەشی لێبوو، ئەمدەناسین. مەزەیان درووستکرد و تا درەنگانی خورایەوە. (عەزیز) و (سلێمان)، هەمیشە شۆخییاندەکرد و شەڕەجنێویانبوو. جارجارەش زۆرانیاندەگرت و گەلێ پێکەنین.



کۆمەڵێ پێشمەرگەی هێزەکانی (خەبات، زمناکۆ و ئەزمر)، مانگی (1)ی ساڵی (1975)، لە (چۆمان) لەبەردەم دووکانەکەی (عەلی زەردەشتی)دا گیراوە. وەستاوەکان لە ڕاستەوە: (سلێمانی قەساب، خوالێخۆشبوو ملازم وشیاری قالەورگە، حوسێن موحەممەد عەزیز، عەمید هادی حەمەرەشید، خوالێخۆشبووان عەزەی ئەحەبرق و جەمالی عەلی باپیر) دانیشتووەکان (ملازم فەرەیدوون حەمەرەشید، ئەحمەدی حەمکۆل، خوالێخۆشبوو ملازم ستاری سەعید خەلەف و مستەفا چاوڕەش).

## گەڕانەوە

بەیانی زوو، من و (مەنسوور) بەرەو (خانە) بەڕێکەوتین. بۆ ئێوارە گەیشتینە (مهاباد) و لە ئوتێل دابەزین. بەیانی لە دەنگی شیعەکان خەبەرمانبووەوە، ڕۆژی عاشووراببوو، بەسەرجادەکاندا دەگەڕان و بەزنجیر، لە خۆیان دەدا. هەر ئەو ڕۆژە سواربووین و گەیشتینە (کرماشان)، لە ئەوێش لەگەڵ (نورەی مام برایم)دا، ماوەیە پێکەوە بووین و بۆ ڕۆژی دووایی، لە (مەریوان) دابەزین.

## کۆبوونەوەی کۆمیتەی سوپایی

لەبەرئەوەی لە سەرەوە، زۆر چاوەڕێی (مەنسوور)م کرد، زۆر دواکەوتم و لە کاتی خۆیدا نەگەڕامەوە. بەداخەوە ملازم (کەریم سەلام) هاتبوو، ماوەیە لە (پێنجوێن) بوو، پاشان لە ئەوە پتر نەیتوانیبوو، چاوەڕێبکا، گەڕابووەوە بۆ (تەوێڵە).
من و (مەنسوور) لە (مەریوان)، لە ماڵی (ئازاد) بووین. کاتێ (ئازاد) پێشنیازیکرد، بچم بۆ نێوچەی سەرکردایەتی، بەڵێنیدامێ، تا ئێمە نەگەڕێینەوە و کۆبوونەوەی کۆمیتەی سوپایی نەکرێ، بڵاڤۆکەکە لە ڕیزەکانی ڕێکخستندا بڵاونەکەنەوە. بەڵام پەیمانەکەی خۆی شکاندبوو، وادیاربوو، ئەو ناردنەی من بۆ سەرەوە گەمەیەبوو، تەنیا هەر بۆ ئەوە بوو، دوورمخەنەوە! بۆیە هەر دوای من، نەک هەر لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی (کاژیک)دا، بڵاڤۆکەکەیان بڵاوکردبووەوە، بەڵکوو بۆ زۆر کەس و لایەنیشیان ناردبوو! کاتێ لە سەرەوە گەڕامەوە، (سەلاح)ی برام ماڵی (ئازاد)ی بەجێهێشتبوو، نامەیەکی بۆ دانابووم و گەڕابووەوە بۆ (سەوڵاوا).
ڕۆژی دوایی، یەکەمین کۆبوونەوەی کۆمیتەی سوپایی دەستپێکرد. ئیدی تا لێرەوە، هەموو گرفتەکان لەنێوان من و هاوبیرانی سەرکردایەتی کاتیدا، زۆر خراپ تەقییەوە. لە کۆبوونەوەکەدا، سەرەتا (ئازاد) بڵاڤۆکەکەی خوێندەوە. پاشان دەمەتەقییەکی گەرم، لەنێوان من و ئەودا دامەزرا و (مەنسوور)یش تەنیا هەر گوێگربوو. (ئازاد) بە هەموو شێوەیە دەیویست، داکۆکی لە نێوەڕۆکی بڵاڤۆکەکە بکا. بەڵام بەڵگەکانی لاوازبوون و قسەکانیشی، بە دیواری مێشکەوە نەدەنووسان. سەیر ئەوەبوو، لەگەڵ زۆربەی ڕەخنەکانی مندا بوو، دەیگوت: ڕاستەکەی، منیش گوتم: گەر ئەم ڕەخنانەت پێ ڕاستە، چۆن لەگەڵ دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم بڵاڤۆکەدا بووی؟!
ئینجا چاری نەما، هەموو شتێکی بەئاشکرا بۆ باسکردین و گوتی: سەرکردایەتی لە من، (شێرکۆ، عوسمان و برایم) پێکهاتووە. (برایم) لەجێی ئەبووان دانێن. (عوسمان) لە (هەڵەبجە) دەژی و لە ئێمەوە دوورە. لە ئەوی لەگەڵ برادەرێکدا، تێکەڵاوییەکی زۆری

پەیداکردووە. برانەرەکەش کادیرێکی پێشکەوتووی (قیادە مەرکەزیی)ە. کارێکی زۆری تێکردووە و (عوسمان)یش ئێستە، بەرەو (ماویزم) هەنگاودەنێ. (شێرکۆ)ش لێرەیە و لەنێو خۆمان دایە. دژی بۆچوونەکانی (عوسمان)ە و ناکۆکن. منیش لەنێوان هەردوولایاندا ماومەتەوە و تێداماوم. (عوسمان) داوادەکا، هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی کۆن، بە بڵاوکراوەیەک لە ڕیزەکانی ڕێکخستن دەرکرێن، ئەگینا وازدێنێ. منیش بۆئەوەی ڕیزەکانی (کاژیک) تێک نەچێ و ئەو گرفتە چارەسەرکرێ، ئەم بڵاڤۆکەم نووسیوە و وەک چارەسەرێکی مامناوەندی، دڵی هەردوولایانم ڕاگرتووە و هیچ چارێکی دیکەم لەبەردەمدا نەبوو.

ئیدی (مەنسوور) واقیورما. چونکە لە ئەو ڕۆژەدا، چاوەڕێی ئەو چەڵەمە گەورەیەی، لە سەرکردایەتی کاتی نەدەکرد. چەن دانیشتنێکی دیکەمان کرد، بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو. چونکە (ئازاد) دەیویست، من بروا بە ئەو بۆچوونانە بێنم، کە خۆشی بروای پێی نەبوو!

ئەو شەوەی بۆ بەیانی (مەنسوور) دەڕۆیشتەوە، پێی گوتم: نازانم، چی بڵێم. تۆ خۆت ئەمان باشتر دەناسی. من دەنگی خۆم بە بۆچوونەکانی تۆ دەدەم. ئیدی ئەو ماڵاوایی لێ کردین. بەڵێنیشیدایێ، لە (ورمێ)وە بگەڕێتەوە، مۆرەکان وەرگرێتەوە و بە هاوبیرێکدا بۆمان بنێرێتەوە. باشبوو، دوای دوو هەفتە، بە پێشمەرگەیەکی لای خۆیدا، بۆی ناردین.

دوایی (ئازاد) گوتی: دەبێ، بڵاڤۆکەکە لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی کۆمیتەی سوپایدا بڵاوکەیتەوە. منیش گوتم: لە شانەکاندا باسیدەکەم و بیروڕای خۆشمی لەسەر دەردەبڕم، چونکە من لەگەڵ نێوەڕۆکی ئەم بڵاڤۆکەدا نیم. (ئازاد) زۆر تکای لێ کردم، ئەو کارە نەکەم، بەڵام من بەڵێنم نەدایە. لەسەر ڕای خۆم سووربووم و گوتیشم: گەر لەسەر ئەو هەڵەیەی خۆتان بەردەوامبن، لە ماوەی یەک مانگدا، یەک هاوبیرتان بەدەسەوە نایەڵم. چونکە هەردوو هاوبیر (کەریم) و (مەنسوور)، ئێوە ناناسن و بروایەکی زۆریشیان بە من هەیە، (مەنسوور)یش دەنگی خۆی بە من داوە. هەرچی چۆنێ بوو، لەسەر ئەوە ڕێککەوتین، هەموو ئەو تێبینیانەی، سەبارەت بە بڵاڤۆکەکە هەمبوون، هەموویان بۆ بنووسم.

**حەمەی مام ئەوڕەحمان**

بەرەم خەفەتی ئەو ناکۆکی و هەڵسوکەوتە چەوتانەی، هاوبیرانی سەرکردایەتی کاتی (کاژیک)ەوە، بە جادەکانی (مەریوان)دا دەسووڕامەوە. لەپڕ تووشی ڕەوانشاد (حەمەی مام ئەوڕەحمان) بووم. (حەمە) هاورێیەکی دێرینم بوو، کۆڵێکم پێخۆشبوو، بینیم. زۆری لێ کردم، سیەی نیوەڕۆ پێکەوە نانی بخۆین، منیش دڵم نەشکاند و داواکارییەکەیم پەسەندکرد.

بۆ سبەینێ چاوەڕێی (حەمە)م دەکرد، لە دوورەوە (سەباحی غالیبی)، بە خۆی و تووپەڵی ڕیش و بە جامانەیەکی قووتەوە دەرکەوت. زۆر خۆشهاتنم لێ کرد. پاشان (حەمە) هات و هەرسێکمان پێکەوە ڕۆیشتین. (سەباح) گوتی: نیازی چیتان هەیە؟ گوتم: من لای کاکە (حەمە) داوەتم. گوتی: بە خودا ئەمنیش دێم. (حەمە)ش فەرمووی لێ کرد.

دوای نانخواردن دانیشتبووین، قسەماندەکرد. (سەباح) گوتی: (شێخ حوسێن)، ئەو جەمەدانەیەت لە کوێ کڕیوە؟ گوتم: دایکم بۆی هێناوم. گوتی: بەخودا جوانە. گوتم: پیرۆزتبێ. ئیدی ئەویش یەک و دووی لێ نەکرد، بەبەسی پیرۆزی خۆی، جامانەکەی لەسەرم کردەوە، قەدیکرد و هەڵیگرت!

پاشان دانیشتبووین، گوێمان لە دەنگوباسی رادیۆ دەگرت. رادیۆکە سەرنجی راکێشام، زۆر باشی وەردەگرت، سووکەڵە و جوانیش بوو. گوتم: کاکە (حەمە)، ئەو رادیۆیەت لە کوێ کڕیوە؟ گوتی: لە (سنە). گوتم: زۆر جوانە. گوتی: پێشکەشتبێ. گوتم: زۆر سوپاست دەکەم، خۆم رادیۆم هەیە. (سەباح)یش هەڵیدایە و گوتی: ئەدی بۆ بە من ناڵێی، پیرۆزت بێ؟! (حەمە)ش گوتی: بەخوا ناوێرم، بە تۆ بڵێم، چونکە تۆ هێندە بێ چاوورووی، جامانەکەت لەسەری ئەو پیاوە کردەوە، هەر بڵێم، پیرۆزتبێ، یەکسەر دەیبەی. ئیدی (سەباح)یش بەپێکەنینەوە گوتی: ئەدی چۆن دڵت دەشکێنم!

**فارووقی مەلامستەفا**

پێش ئەوەی لە (چۆمان) بگەڕێمەوە، دوو ئەندامی سەرکردایەتی کاتیی (کاژیک)، وەک بیرم مابێ، (شێرکۆی هەژار) و (ئازاد مستەفا) بوون، مانگی (**2**)ی ساڵی (**1975**)، لە ماڵی خوالێخۆشبوو (شێرکۆ بێکەس) لە (مەریوان)، چاویان بە (فارووقی مەلامستەفا) کەوتبوو و بە یەکی ناساندبوون. پاشان دەمەتەقێیەکی زۆریان کردبوو، بڵاوکەکەی سەرکردایەتی کاتیی ڕۆژی (**25. 1. 1975**)یشیان دابوویە.

ئەو کاتە (فارووق) لە دەرەوە، نوێنەری (قیادە مەرکەزی) بوو. داوایان لێ کردبوو، وەک دوو پارت هاوکارییکەن. ئەویش زۆری پێ باشبووبوو، بەتایبەتی لە بڵاوکەکەدا، سەرکردایەتی کاتیی (کاژیک)، زۆر بەڕاشکاوی، دانی بە ئەو تاوانانەی (کانیماسی)دا نابوو! جگە لە ئەوەی، بەشێوەیەکی فەرمیش، داوایان لە ڕێکخراوەکەیان کردبوو، بەرەیەکی (کوردستانیی) بکەنەوە.

دوایی وەک (شێرکۆ) بۆی گێرامەوە، (فارووقی مەلامستەفا) بڵاوکراوەکەی لە نیوچەی سەرکردایەتی بڵاوکردبووە و جگە لە دەزگەکانی شۆڕشی (کوردستان)، خەڵکێکی زۆریش دیبوویان!

## یەکەمین وازهێنانی ئازاد مستەفا

دوای ئەوەی بۆ (پێنجوێن) گەڕامەوە، ڕاپۆرتێکی درێژم، لەسەر شێوە و نێوەڕۆکی بڵاڤۆکەکە نووسی، هەموو بۆچوونەکان و هەڵوێستی خۆمم، دژی ئەو بڵاڤۆکە خراپە، بەڕاشکاوی دەربڕی. پاشان (ئازاد) هات بۆ (پێنجوێن) و نووسراوەکەم دایە. گوتی: گەر هەفتەی داهاتوو نەهاتم، لە (مەریوان) چاوەڕێتدەکەم. ئەوەبوو، ئەو نەهات و من چووم. ئێوارە بوو، چووم و (ئازاد) نوێژیدەکرد. زۆر سەیرم لێهات. هەفتەی پێشوو نوێژی نەدەکرد، ئەم گۆڕانکارییە کتوپڕییە چی بێ؟!

دوای نانخواردن گوتی: بۆ ئەوە بانگمکردی، تا پێت بڵێم، من وازم لە هەموو شتێ هێناوە، ڕووم لە خوا کردووە و وەک ئەو هەموو کوڕنە، چاوەڕێی ئەنجامی ئەم جەنگە دەکەم و چیدیکە، کاری ڕامیاری ناکەم. لەمەودواش (عوسمان) دەتبینێ. لەبەرئەوە پێویست ناکا، لەسەر نێوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەت، هیچ جۆرە دەمەتەقێیەک بکەین. منیش زۆر بەسەریداهاتم و گوتم: گەر تۆ وازبێنی، (شێرکۆ) و (عوسمان)، هیچ جۆرە کارێکیان بۆ بەڕێوەناچێ. ئیدی زۆری لەگەڵ خەریکبووم، تا ڕازیمکرد. بەڵام هەر گوتی: هەفتەی داهاتوو، (عوسمان) دێ و لەسەر نێوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەت، قسەت لەگەڵ دەکا.

ئەندامانی سەرکردایەتی کاتی، تازە کەتنەکەیان کردبوو. بۆئەوەی پەشیمان نەبنەوە، کارەکەیان بچەسپێ و جێی خۆی بگرێ، هەر زوو وێنەیەکیان بە پۆستدا، بۆ (جەمال نەبەز)یش ناردبوو.



دوکتۆر (جەمال نەبەز)

سەرو وێنەشیان بەدەستی، بە مامۆستا (قادر)دا، بۆ (ئەحمەد هەردی، کامیل ژیر، فایەق عارف، شێخ موحەممەدی هەرسین و حەمەی عەزیز) ناردبوو. بە مەرجی (جەمال نەبەز)، لە ڕۆژی (19. 5. 1962)وە (کوردستان)ی بەجێهێشتبوو، تا ئەوڕۆش هەر لە (ئەڵمان) دەژی. مامۆستا (فەرەیدوون عەلی ئەمین)یش، ڕۆژی (11. 7. 1972)، وازی لە ئیشکردن هێناوە و هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە (کاژیک)ەوە نەمابوو، ئینجا ناوی ئەوانیشان نووسیبوو!
هەڵبەتە ئەوانیش لە خوایان دەویست، بەڵگەیەکی وایان بەدەستەوەبێ، تا گەر دەزگەی (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی)، لەسەر (کاژیک) تووشی گێچەڵیکیان کردن، بڵێن: ئێمە ئاگامان لێی نییە و ئەوەتە ئێمەشیان دەرکردووە!
لە هەمان کاتیشدا، یاداشتێکیشیان بۆ سەرۆک (بارزانی) نووسیبوو، لەگەڵ وێنەیەک لە ئەو بلاڤۆکەدا دایاننابوو، من بییەم و وەک نوێنەری (کاژیک)، لەگەڵ (بارزانی) قسەبکەم. بە خەیاڵی پووچی خۆیان، بەرەی (کوردستانیی) لەگەڵ (پارتی) دامەزرێنن!
کاتێ (ئازاد) ئەوەی پێ گوتم، تێر پێکەنیم و گوتم: خۆت باش دەزانی، من لەپێناوی بیروباوەڕەکەمدا، لە هیچ شتێ سڵ ناکەمەوە. گەر بزانم، ئەو کارە کارێکی باشە و بەرێکی دەبێ، ئەوا ئامادەم، یاداشتەکە بگەیەنم. بەڵام لەبەرئەوەی لەلایەکەوە، بڕوام پێی نییە و بە کارێکی هەرزەکارانەی دەزانم. لەلایەکی دیکەشەوە من کێم، تا (بارزانی) گوێم لێ بگری؟! یا بەرەمان لەگەڵ بکاتەوە؟! دوور نییە،ساڵی لە ئەوی چاوەڕێبکەم، هەر وەڵامیشم بدەنەوە. گەر کاربەدەستانی بارەگەی (بارزانی)ش وەڵامبدەنەوە، دەڵێن: یاداشتەکە گەیی و سوپاس. لەبەرئەوە داوای لێبووردن دەکەم، باشتروایە، ئەو کارە بە یەکێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی کاتی بسپێرن، خۆتان لە هەموو کەس لەپێشترن و ئەم تیۆرییە نوێیەش، هەر خۆتان دانانناوە!

## عوسمان ڕەشید و تەقەلایەکی نەزۆک

مامۆستا (عوسمان) هات و لە ماڵی هاوبیری، دووقۆڵی دانیشتین. ڕاپۆرتەکەی منی دەرهێنا، دێربەدێر خوێندیەوە، دەمەتەقێیەکی زۆر توند و گەرممان لەسەر کرد. بەڵام من لەسەر بیروڕاکانی خۆم سووربووم، ئەویش هیچ جۆرە بەڵگەیەکی بەهێزی پێ نەبوو، تا باری سەنجەکانم بگۆڕی. هەرچەندە (ئازاد)، خۆشی بڕوای بەقسەکانی خۆی نەبوو، هێشتا بەڵگەکانی ئەو بەهێزتربوون!
(عوسمان) گوتی: ڕاستە، ئێمە سەرکردایەتی کاتین. بەڵام لە ئەم بارودۆخەدا ناتوانین، کۆنگرە بگرین. لەبەرئەوە دەبێ، هەنگاوبنێین، (کاژیک) پێشخەین و لە گۆڕەپانەکەدا،

خۆمان بسەپێنین. تا ئەو سەرکردە ناپاکانەش، بەیەکجاری لە ڕیزەکانی (کاژیک) دەرنەکەین، ناتوانین، ئەو ئامانجانە بپێکین. بەرەش لەگەڵ (پارتی) و (قیادە مەرکەزی)، پێویستییەکی مێژووییە و دەبێ، هەوڵی بۆ بدەین.
منیش گوتم: ئێمە لەسەر ئەوە ڕێک نەکەوتووین و ئێوە دەسەڵاتی ئەوەتان نییە، بێ لێپرسینەوە و ئاگاداری خۆیان، سەرکردایەتی کۆن دەرکەن. بەتایبەتی ئێوە خۆتان دەڵێن: مامۆستا (فەرەیدوون عەلی ئەمین)، ساڵی (1972) وازی لە (کاژیک) هێناوە، ئیدی بۆچی دەبێ، ناوی ئەوی تێدابێ و دەریکەن؟! (جەمال نەبەز)یش لە (ئەڵمان) دەژی، ئاگای لە ئەم گۆڕانکارییانە نییە، وەک سەرکردەکانی دیکە، تاوانبار نییە، بۆ ئەویشتان دەرکردووە؟! کێ دەڵێ، (نەبەز) ئێستە، هەر پێوەندیشی بە (کاژیک)ەوە ماوە؟!
پاشان گوتم: ئێوە هەموو ڕەخنە و باری سەرنجەکانتان، لەسەر (عەبدوڵلائاگرین) بوو، تەنیا ئەوتان بە پیاوی پاراستن و ناپاک تاوانباردەکرد، گەر وایە، ناوی ئەندامەکانی دیکەی سەرکردایەتی کۆنی (کاژیک)تان بۆ هێناوە؟! سەرۆک (بارزانی)یش، نەک هەر بڕوای بە چەن خوێندکار و مامۆستایەکی وەک من و تۆ و (فارووقی مەلا مستەفا) نییە، بەڵکوو بڕوای بە ئەندامانی سەرکردایەتی پارتەکەی خۆشی نییە، کە سەرۆکێتی! چونکە ئەو پیاوە، ڕابەری پتر لە (20) ملیۆن کوردە، سەرۆکی پارتێکی گەورەیە، فەرماندەی هێزی پێشمەرگەیە، هەموو جیهان دەیناسن، بێ فرمانی ئەو، لەنێو شۆڕشدا هیچ کەسێ ناتوانێ، هیچ بڕیاربدا. ئەویش بێ فرمانی (ئێران) و بەرەی خۆراوا ناتوانێ، پەنجە بە ئاودا بکا. ئێستە ئێوە دەتانەوێ، لەگەڵ دوو کوردی وەک تۆ و (فارووق) دانیشێ و وەک یەک دەنگتان هەبێ؟! یا دەتانەوێ، بە ئارەزووی دڵی خۆتان، قسەی ناشرین بە (ئێران) بڵێن و (بارزانی)یش، لێتان بێدەنگبێ؟! لە کاتێکدا، زیاد لە چارەکە ملیۆنێ کورد، لە هۆردووگەکانی (ئێران) دەژین و تۆپەقووڕسە (175) ملیمەکانیان لەبەرەکانی جەنگ، دژی سوپای (عێراق) دەجەنگن؟!
ئیدی (عوسمان) خۆشی نەیدەزانی، چی بڵێ و چی بکا، هەر خەریکبوو، لە داخاندا دڵی بتەقێ! چونکە دەیویست، بە هەر شێوەیە بێ، بڕوا بە قسەکانی بکەم، وەک دەرویش دوایانکەوم و هەرچییەکیان گوت، بڵێم: بەڵێ قوربان، فەرمایشتەکەتان بەجێیە! ئەوان دەیانویست، قەڵای قایمی مێشکم داگیرکەن و لەسەر خۆیانی تاپۆکەن، کە گەورەترین سەرمایەی ژیانمە! بەڵام کاتێ زانییان، کەڵکی نییە و ئەو کارەیان بۆ سەرناگرێ، من لە ئەوان پتر، ئەرکم بە (کاژیک)ەوە کێشاوە، لەسەر ئەو بیر و ڕێ هەڵەیەی ئەوان بەڕێوە نارۆم، وەک دوا کارت گوتی: باشە هەوڵدەدەین، بەزووترین کات کۆنگرەیەک بگرین و ئەو گرفتانە، لە کۆنگرەکەدا یەکلاییدەکەینەوە. منیش گوتم: لەمەودوا، کۆنگرە بۆ خۆتان بگرن،

چونکە ئێوە لاتانداوە، تازە بڵاڤۆکەکە، دەس هەموو لایەک کەوتووە، چۆن ئەو دەڵاقە گەورەیە پینەدەکەن؟! ئیدی بێ ئەوەی بە هیچ چارەسەر و ئەنجامێ بگەین، کۆبوونەوەکە کۆتاییهات و لە یەکدی جیابووینەوە.

## شێخ و دەروێشەکانی کاژێک

سەیر ئەوەبوو، (شێرکۆ) وەک شێخێکی ئایینی دەسبڕ، وای لە ئەو هاوبیرانە کردبوو، دەرویش ئاسا، هەموویان هەر گوێبن و زمانیان لە دەمدا نەبێ، تا ڕەخنەبگرن، بیر و هەڵوێستی چاک و خراپ، لە یەکدی جیاکەنەوە!
جێی داخە، جگە لە من کەسی نەبوو، دژی ئەو بڵاڤۆکە بوەستێ و ڕەخنەی لێ بگرێ. هاوبیرەکانی دیکە، زۆربەیان بە هەڵەیان دەزانی، بەڵام وەک بڵێی، لە ترسی (مەلا مەلا نوێژدەکا، کێرە قەپە درێژدەکا)، قرومقەپیان لێ کردبوو! بۆیە بڕیارمدا، ئەم جارەش نەهێڵم، ئەم (3) کەسە بەناوی سەرکردایەتی و کوردایەتییەوە هەڵمخەڵەتێنن، فریومبدەن و دەسمبڕن، وەک (عەبدوڵلائاگرین) و هاوبیرەکانی دیکەی، ماوەی چوار ساڵ، بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، هەڵیانسووڕانین!
دوای ئەوەی بڵاڤۆکەکەم، لە ڕیزەکانی ڕێکخستندا بڵاوکردەوە، هاوبیری نەبوو، پێی خراپبێ. هەموویان کوێرانە پەسەندیانکرد، بێ ئەوەی بزانن، ئەنجامەکەی چی دەبێ. بەڵام هەر وەک پێشەکی بە (ئازاد)م گوتبوو، لە هەموو شانەکاندا دەمخوێندەوە، دەمەتەقێی تێروتەسەلم لەسەر دەکرد، نێوەرۆکەکەیم پوچەڵدەکردەوە، تا وای لێهات، لە هەموو لایەکەوە، دەنگی نارەزای بەرزبووەوە، چەن هاوبیری بیروڕای خۆیان دەربڕی.

## هەڵوێستی نوری حەمەعەلی

(نوری) لە (ئەوێڵە) گەڕایەوە. وازی لە (کاژێک) هێنا. (3) کەس بۆ لێپرسراوی بەڕێوەبردنی کارگێری بەتالیۆنەکەی پاڵێوراوبوو. من و (فەرهاد عەبدولحەمید و مژدە تایەر). بەڵام (نوری) بۆ من ڕازی نەبوو، چونکە دەیزانی، من چیم و چۆن هەڵسوکەوت دەکەم. لە لایەکەوە ئاگام لە هەموو هەڵسوکەوتەکانی دەبێ. لە لایەکی دیکەشەوە، لەنێو هێزی پێشمەرگەی بەتالیۆنەکەیدا، ڕێکخستنی (کاژێک) دروستدەکەم. جگە لە ئەوەی، زۆر لە (پاراستن) دەترسا و نەیدەویست، جێگەکەی پێ لەقکەن!
(فەرهاد) لای (فەتاح ئاغا)، جێی خۆی کردبووەوە. لەبەرئەوە (مژدە)یان دانا. ئەو دووانەش هەردووکیان، هەر سەر بە سەرکردایەتی کۆنی (کاژێک) بوون. لە ئەو دواییانەشدا، (نوری)ش هەر دوای ئەوان کەوت. چونکە ئەوان هیچ جۆرە ڕێکخستنێکیان نەبوو، بەڵام

یەک گیانبوون و لە چەن جەستەیەکی جیاوازدابوون، نەردی خۆیان دەیانگوت: ئێمە پەیوەندییەکی (ڕۆحی) پێکمانەوە دەبەستێ و لەگەڵ سەرۆک (بارزانی) داین! بەڵام وەک گوتم، (نوری) پیاوی بیروباوەڕ و (کاژیک) نەبوو، لەبەرئەوە ئەوانیش کەلکیان لێ نەدەبینی!

## هێرش و ئاگرباران

هێرشەکانی سوپای (عێراق)، بۆ سەر ناوچەی سەرکردایەتی شۆڕش، ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، بەرفراوانتردەبوو، پتر تاوی‌دەسەند، جەنگەکە گەرمتردەبوو، سوپای دوژمن پێشدەکەوت و ناوچەی تازەیان داگیردەکرد. وای لێهاتبوو، خەڵک دەیانگوت: بە ئەم شێوەیە، کۆتایی بە ئەم شۆڕشە هات و تا شۆڕشێکی دیکە، بە خواتان دەسپێرین!

لەبەرئەوەی هێزەکانی ئەو ناوچانەی سەرکردایەتی، خۆیان لە بەرەکانی جەنگ دەدزییەوە و شەڕیان نەدەکرد، هەر خەریکی بازرگانی بوون، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە هەموو هێزەکانی ناوچەی (سۆران)ەوە، چەن بەتالیۆنێکی لێبوو. شەڕێکی سەختی خوێناویان دەکرد، شەهید و بریندارێکی زۆریان دەدا، بۆئەوەی هێزەکانیش ماندوونەبن، زووزوو دەیانگۆڕین. بەتالیۆنی وا هەبوو، دووجار سەرەی بەرکەوتبوو، لە بەرەکانی جەنگی سەرەوەدا، بە شداربووبوو. خۆ گەر کارەساتی هەرەسی بەسەردا نەهاتایە، ئەوا دوور نەبوو، هەر بەتالیۆنی پتر لە دووجاریشی بەرکەوتایە!

بۆیە ئەم جارەش، بەتالیۆنی (4) نۆرەی هاتەوە، بەرەو (زۆزک، سەری حەسەن بەگ) و بەرەکانی دیکەی (ڕەواندوز) بەڕێکران. هێندێ هاوبیری وەک (وریا براخاس، غەفوور ژاژلەیی ...)ش، لەگەڵیان چوون. بەڵام نەیانهێشت، من لەگەڵیان بچم. (فەتاح ئاغا) گوتی: جارێ تۆ لە بارەگەی هێز بمێنەرەوە، تا کارێکت بۆ دیاریدەکەم!

## هەوڵێکی زۆر!

هەرچەندە تەماشای باروودۆخی (کاژیک)م دەکرد، زۆر پێی نیگەرانتدەبووم. بە هەموو شێوەیە هەوڵمدەدا، شتێ بکەم و ئەو بارەلارە ڕاستکەمەوە. لەبەرئەوە لە دوولاوە کارمدەکرد. لەلایەکەوە خەڵکم دژی ناوەڕۆکی بڵاڤۆکەکە هاندەدا، تا گوشار بخەنە سەر سەرکردایەتی و کۆنگرە بگرن، هەموو گرفتەکان بەلایەکدابخەن. لە لایەکی دیکەشەوە، هانی (ئازاد)م دەدا، دانیشتنێ لەگەڵ کادیرە کۆنەکانی (کاژیک)دا سازکەن، کۆبوونەوەیەکی گشتی بکەین، تا دوژمن زەفەرمان پێ نەبا و دەسەمان بەخوێنی یەکدی گلاونەبێ، چونکە هەموومان چەکداربووین! هەرچەندە ئەوان ڕێکخستنیان نەبوو، بەڵام لە ترسی گیانی خۆیان دەیانتوانی، هاوبیرەکانی ئێمە پەشیمانکەنەوە.

بۆ نموونە: لە ماوەیەکی کورتدا، (فەتاح ئاغا، نوری حەمەعەلی، جەزای عەلی کاتب، مەهدی مەلاعەلی) و کەلێکی دیکەش وازیانهێنا، هەمووشی بە پیلانی ئەوان بوو، گوایە ئێمە سەر بە پاراستنین و دەمانەوێ، ناو و ناوبانگی (کاژیک) بزڕێنین، ئەندامەکانیان بۆ ئاشکراکەین، تا (پاراستن) دەسێکی باش، لە (کاژیک) بوەشێنێ، بەڵگەشیان بۆ ئەم تۆمەت و بانگەشەیە، چەن خاڵێکی لاوازی پووچی بێ بناغە بوو، وەک:

1. ئێمە چۆن وا بە ئاشکرا کاردەکەین، لە (پاراستن) ناترسین و دەسمان بۆ نابەن؟!
2. گەر پاراستن یارمەتییان نەدابین، چاپ و ڕۆنۆیمان لە کوێ بوو؟!
3. ئەو مۆرە نوێیانەمان لە کوێ درووستکردووە؟!

بەڵام چونکە ئەو کۆمەڵە کادیرە، خۆیان ترسنۆک و هیچ لەبارانەبووبوون، لە خشەی گەڵا دەسڵەمینەوە و بڕوایان بە کەس نەبوو، هەر لە بنەڕەتیشدا ڕێکخستنێکی هەمیشەیی و بەهێزیان نەبوو. لەبەرئەوە گەر چەن هاوبیری نەترسانایە، بە ئەو شێوە کیسەڵڕەوییەی ئەوان کاریان نەکردایە، هەوڵی پەلوپۆهاویشتن و بنجداکوتانیان بدایە، ئیدی ئەو تۆمەتە هەرزانە ئامادەکراوانەیان بڵاودەکردەوە، بە گومانلێکراو و پیاوی (پاراستن)یان دادەنان. کەچی خۆیان هەر یەکێکیان لە ڕیزەکانی شۆڕشدا، جێپێی خۆیان کردبووەوە!

لە هەمان کاتیشدا، (شێرکۆ) و (عوسمان)یش دەیانگوت: گەر (عەبدوڵلائاگرین) هەر لە سەرەتاوە، پیاوی (پاراستن) نەبووبێ، ناپاکی لە (کاژیک) و هاوبیرەکانی خۆی نەکردبێ، چۆن دەزگەی (پاراستن) متمانە بە ئەندامێکی سەرکردایەتی (کاژیک) دەکا، لە پەیمانگەی کادیرانی (پارتی)، بە مامۆستا دایدەمەزرێنێ؟! (شێخ موحەممەدی هەرسین) و (حەمەی عەزیز)، گەر هەر لە ساڵی (**1964**)ەوە، (کاژیک)یان وەک هێلکەیەکی پاکراو، پێشکەش بە بنەماڵەی (بارزانی) نەکردبێ، گەر جێی بڕوای دەزگەی (پاراستن) و متمانەی بنەماڵە نەبن، چۆن ئەو پلەوپایە بڵندەیان، لە شۆڕشدا پێ دەدرێ، بە مەرجێ هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی (پارتی)، خۆشیان نەدەویستن؟!

کەواتە ئایا ئێمە، پیاوی دەزگەی (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی) بووین، یا ئەو کاربەدەسە گەورانەی شۆڕش، لە پاڵ بنەماڵەی (بارزانی)دا، هەر یەکێکیان بۆ خۆیان، های لایف دەژیان، پێیەکیان لە (کوردستان) و پێیەکەی دیکەشیان، لە (ئێران) و (ئەورووپا) بوو؟!

### کۆبوونەوەکەی مهاباد

ئەندامانی سەرکردایەتی کۆنی (کاژیک)، زۆر باش دەیانزانی، ئێمە ڕێکخستنێکی پەنەو و فراوانمان هەیە، هێزێکی چەکدارمان کۆکردووەتەوە، کۆمەڵانی خەڵکیش، تازە ئێمە دەناسن و ئەوانیش، بە پیاوی (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی) دەزانن.

لەبەرئەوە، هەم لە ترسی گیانی خۆیان، هەم بۆئەوەی ئەو هاوبیرانەی دەوریان، راستییان بۆ دەرنەکەوێ و دوای ئێمە نەکەون، هەر دوای ئەوەی بڵاوکەکەیان پێگەیشت و لە (کاژیک) دوورخرابوونەوە، خۆیان بە ستەملێکراو پیشاندا، ئێمەشیان بە تێکدەر و سەرلێشێواو دانا، ئیدی بە ئەوە شێوەیە کەوتنە خۆیان، دەستیان بە پروپاگەندەی بێ بناغە و ئاژاوەگێڕان کرد.

ئەوەبوو، هێندێ ئەندامانی سەرکردایەتی کۆنی نوزەلێبڕاوی ترسنۆکی (کاژیک)، وەک (ئەحمەد هەردی، کامیل ژیر و عەبدوڵڵائاگرین)، پێوەندییان بە هێندێ هاوبیری سەر بە ڕێکخستنە کۆنەکەی خۆیانەوە کرد، چەن کەسێکی وەک (نوری حەمەعەلی، فەرهاد عەبدولحەمید، عومـــــەر شەمەیی، مژدە تایەر و نوری کەریم)یان کۆکردەوە، ڕۆژی (2. 2. **1975**) لە شاری (مهاباد)، کۆبوونەوەیەکیان سازکرد، دوابڕیاری خۆیان دا، بە هیچ شێوەیە بە ناوی (کاژیک)ەوە کارنەکەن و ڕێکخستنەکە هەڵپەسێرن. وەک کۆمەڵی مەڕ، دوای سەرکردایەتی شۆڕش، (پارستن) و بارەگەی (بارزانی) بکەون. بە هەموو تواناشیانەوە، دژی ئێمە بوەستن و بە پیاوی (پارستن)، ناومان بزڕێنن، وەک هەر لە سەرەتاوە، زۆر چالاکبووبێن و بە هەزاران، ئەندامیان هەبووبێ!

### هەڵسوکەوتی ئەندامانی سەرکردایەتی کاتیی

بۆ نەگبەتی ئێمە، سەرکردایەتی کاتیش، هێندە ژیر نەبوون و تاکتیکیان نەبوو. چونکە بەئاشکرا کاریاندەکرد، هەڕەشەیاندەکرد، بە ترسنۆک و ناپاک، ناوی سەرکردایەتی کۆنی (کاژیک)یان دەبرد. لەبەرئەوە هەرچی هاوبیرە کۆنەکانی وەک (فەتاح ئاغا، نوری حەمەعەلی، غەفوور ژاژڵەیی، شەریف مەولوود، فەتاح عەبدولڕەزاق، جەمالی سەیید عەلی، عەلی تۆفیق، جەزای عەلی کاتب، فەرهاد عەبدولحەمید، مژدە تایەر، عومەر شەمەیی) و گەلێکی دیکەش بوون، سەرکردایەتی کۆن لە ترسی تۆڵەسەندنەوە و گیانی خۆیان، لە خەوی غەفڵەتی چەن ساڵەی خۆیان ڕاستبوونەوە و لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا یەکیانگرتەوە، وایاندەزانی، ئێمە دەیانکوژین!

هەرچەندە زۆر دڵنیام، گەر (شێرکۆ) و (عوسمان) دەسیانبڕۆشتایە، یەک و دوویان لێ نەدەکرد، هەموویان بە زیندوویی، بە تێزاب دەسووتاندن، وەک چۆن (شێرکۆ) و دەەویشەکەی (برایمی حەمەحەلی)، ساڵی (**1974**) لە (پێنجوێن) ویستیان، (فوواد موحەممەد ئەمین سەڕاج) بە ئاوی گەرم بسووتێنن!

## دواتەقەلا

بۆ چارەسەرکردنی ئەو بارودۆخە ناهەموارە، بۆئەوەی هەموو ناکۆکییەکان بنەبڕکرێ، لەگەڵ (ئازاد) دانیشتم و سەبارەت ئەو کێشە گەورەیە، گەلێ قسەمانکرد. (ئازاد)، زۆر لە (شێرکۆ) و (عوسمان) زیرەک، بە توانا و هێمنتر بوو. گوتی: بۆ یەکگرتنەوەی ڕیزەکانی ڕێکخستنی (کاژیک)، هەرچی بە پێویست دەزانی، لە منەوە سەرپشکیە و بیکە.

(شێرکۆ)ش سەرەتا، بە ئەو هەنگاوە قایلبوو. بەڵام دوایی لەپڕ هەڵویستی گۆڕا. چونکە سوور دەیزانی، لە ئەو ئاشتبوونەوە گشتییەدا، کەس وەک ئەو، تووشی زیان نابێ! جگە لە ئەوەش، هاوبیرانی سەرکردایەتی کۆن، هەموو شتێکی ژیانی تایبەتی (شێرکۆ)یان لابوو، چاکیان دەناسی! لەبەرئەوە (شێرکۆ) لە ئەو ڕۆژانەدا، بەرانبەر من بەتەواوی، هەڵویستی گۆڕابوو. کەمتر سەری لێ دەداین.

(عوسمان)یش، خۆی بە نەتەوەییەکی کۆمۆنیست دەزانی و لە ئێمەوە دووربوو. من بە هیچ جۆرێ، بڕوام پێی نەمابوو. چونکە دەمزانی، هەر ئەو (عوسمان)یە، ساڵی (**1972**) لەبەردەرکی سەرای (سولەیمانی)، پەلاماری (عەبدوڵلائاگرین)ی دا. جارێکی دیکەش ساڵی (**1974**)، لە (تەوێڵە) پەلاماریدابوو، پێی گوتبوو: بۆ هاتووی بۆ ئەم ناوە؟! چیت دەوێ؟ وەک (کوردستان) بە تایبەتی، موڵکی باوکی بێ، کەس بێ پرسی ئەو بۆی نەبێ، هاتوچۆی پێدابکا! لە (پێنجوێن)یش جارێکی دیکە ویستبوویان، پەلاماربیدەن و لێیدەن، بەڵام (فەتاح ئاغا) پاراستبووی.

ڕۆژی (**7. 2. 1975**)، باوکی (عومەر شەمەیی) کۆچیدواییکرد. لەبەرئەوە (عومەر) هات بۆ (پێنجوێن) و پرسەی بۆ دانا. منیش وەک هاوبیرێکی کۆن و هاورێیەکی زانکۆ، لە پرسەکەدا لەگەڵی دانیشتم. (شێرکۆ) ئەوەی بە دڵ نەبوو، دەیگوت: نابێ، بە هیچ شێوەیە، قسە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە بکرێ و ڕێزیان لێ بگیرێ، بەڵکوو گەر ڕۆژێ دەسەڵاتمان هەبێ، هەموویان هەڵدەواسین!



خوالێخۆشبوو عومەری حەمەشەمەیی ( **1946 – 2007** )

منیش هەمیشە، جیاوازیم لەنێوان کاری پارتایەتی و پێوەندی هاوڕێیەتیدا کردووە. لەبەرئەوە گوێم لە قسەکانی نەدەگرت و گاڵتەم پێدەهات. کاتێ لە ڕێوشوێنی پرسەکەی مزگەوت بووینەوە، برادەرە نزیکەکانی (عومەر)، لە ماڵی (فەرهاد) کۆبووینەوە. ئەو نزیکبوونەوەیەم بە هەل زانی، دەمەتەقێم لەگەڵ دامەزراندن.

هەرچی چۆنێ بوو، بە هەموومان بە ئەو ئەنجامە گەیشتین، جگە لە دوژمنانی بیری نەتەوەیی، هیچ کەسێکی دیکە، قازانج لە ئەم ناکۆکییە ناکا. لەبەرئەوە دەبێ، هەردوولامان دانیشین و چارەسەرێکی بنەڕەتی بدۆزینەوە. (عومەر) و (فەرهاد) گوتیان: ئێمە ئامادەین، هەردوولامان وەک دوو دەستەی کادیری پێشکەوتووی (کاژیک)، پێکەوە دانیشین و دەمەتەقێیکەین. ئەو کاتە بڕیاری هەموو شتێ دەدەین. منیش هەر لەگەڵ ئەو پێشنیازەدا بووم.

## دەسەکەی شێرکۆ کەوتەڕوو!

ئێوارە، بە دڵێکی خۆشەوە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و (شێرکۆ) لە ئەوێ بوو. لە هەیوانەکە ڕاوەستابوو، نیازی وابوو، بڕوا. منیش پێمگوت: لەبەرئەوەی (ئازاد) لە (مەریوان)ە و لە منەوە دوورە، چەن شتێکی پەلە هەیە، دەمەوێ، بە تۆی بڵێم و تۆش ڕای خۆتم پێ بڵێی. ئیدی هەموو شتەکانم بۆ باسکرد. گوتی: کارێکی باشە. بەڵام ئێمە وەک سەرکردایەتی نەبێ، لەگەڵ ئەواندا دانانیشین. گەر دەیانەوێ، کارمان لەگەڵ بکەن، فەرموو، با نامە بنووسن، بێنەوە ڕیز و کاربکەنەوە. ئێمە دژی ئەوە نین.

منیش گوتم: گەر بمانەوێ، ڕیزەکانی (کاژیک) یەکخەینەوە و ڕێکخستنێکی پتەو دروستکەین، سەرەتا دەبێ، هەموومان وەک کۆمەڵی کادیر، پێکەوە دانیشین، دەمەتەقێ بکەین و گوێ لە یەکدی بگرین، ئەو کاتە بڕیاربدەین. ئەگینا ئەوان بە ئەوە قایل نابن، دوای ئێمە بکەون. لە ئەو بارەیەشەوە، قسەم لەگەڵ (ئازاد) کردووە، ئەویش لەپێناوی یەکگرتنەوەی ڕیزەکانی ڕێکخستنی (کاژیک)دا، بۆ هەموو شتێ ئامادەیە.

ئیدی (شێرکۆ) کەلەبیبوو، قیراندی و گوتی: چییان دەوێ؟! ئەوانە هەموویان ناپاکن و پیاوی (پاراستن)ن، لەگەڵیان دانانیشین و وەریش ناگیرێنەوە. منیش گوتم: تۆ کەمێ لەسەرخۆبە و مەقیرێنە، خەڵک لە کۆڵان گوێیان لە دەنگتە، تۆ کێیت و کێ بە سەرکردە هەڵیبژاردووی، تا بە ئەو شێوەیە هەڵسوکەوتبکەی؟! ئێوە هەموو بڕیارەکانی کۆنفرانستان پێشێلکردووە، دەبێ، لەگەڵیان دانیشین، ئەگینا یەک هاوبیرمان بەدەسەوە نایەڵن. ئینجا گوتی: تۆ هیچ پێوەندییەکت بە منەوە نییە، بڕۆ لەگەڵ (ئازاد) قسەبکە. گوتم: ئیدی بەسە، لە ئەوە پتر خۆتان مەخەڵێنن، ڕێکخستنی چی و سەرکردایەتی چی؟! گەر دەتەوێ،

کوردایەتی بکەی و (کاژیک) پێشکەوی، ئەوا بە تەنیا باڵ ناگری و نەبێ، بە هەمووومان هەوڵی یەکێتی و یەکگرتنەوە بدەین، ئەگینا (فاتیحە) بۆ خۆت و ڕێکخستنەکەت بخوێنە! ئینجا بێ ئەوەی هیچ شتێ بڵێ و ماڵاوایشبکا، بەتوورەیی ڕۆیشت. دواییش وەڵامەکەم بە (عومەر) و (فەرهاد) گەیاند و ئەوانیش ئامادەنەبوون، بێ هیچ مەرج و دانیشتنێ، لەگەڵ (شێرکۆ) کاربکەن!

## هەڵوێستی فەتاح ئاغا

لە ماڵی (فەرهاد) دانیشتبووین، (عەلی تۆفیق) هات و گوتی: کاک (فەتاح) بانگتدەکا و لە بارەگەی هێز چاوەڕێتدەکا. منیش یەکسەر خۆم پێچایەوە و ڕۆیشتم. کە گەیشتم، لە ژوورەکەی خۆی بەتەنیا دانیشتبوو. سڵاوم لێ کرد و فەرمووی لێ کردم. ماوەیە بە شت نووسینەوە، خۆی خەریککرد و پاشان سەری هەڵبڕی، بە دەنگێکی بەرز و بە توورەبوونەوە گوتی: ئەم بڵاوکراوەیە تۆ دەرتکردووە؟ گوتم: بڵاوکراوەی چی؟ ئەویش بڵاوکراوەکەی دەرهێنا و بە تەوسێکەوە گوتی: گەر نەتدیوە، فەرموو بیخوێنەرەوە! گوتم: نەخێر، من دەرم نەکردووە، بەڵام دیومە و چەن جارێکیشم خوێندووەتەوە. گوتی: بیروڕات چییە؟ گوتم: لە چ ڕوویەکەوە؟ گوتی: لە هەموو ڕوویەکەوە. گوتم: هەمووی ڕاستە. بەڵام پەلە لە بڵاوکردنەوەکەیدا کراوە. لە ئەوانەیە ئێستە، ڕۆژی ئەوە نەبێ و هێشتا زووبێ. ئیدی کەمێ توورەبوو، دەنگی بەرزکردەوە و گوتی: ئەمە گەورەترین هەڵەیە، چۆن (شێرکۆ) کاری وا دەکا؟ ئێوە دەزانن، لەسەر ئەم بڵاوکراوەیە، لە (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی)، چ هەرایە ڕوویداوە؟! ئەمە دەس (ئێران)یش کەوتووە، زۆر نارازین و گلەییدەکەن. منیش گوتم: بەڵێ، ئەوانە هەمووی دەزانم و ئاگام لێی هەیە، بەڵام من چی بکەم؟

__بەڵگەنامەی ژمارە (4) ل 420–424)__

دیارە (ئێران) وەک دەوڵەتێکی داگیرکەر پێی باش نییە و دژی ئەو جۆرە بیرکردنەوانەن. هەروەها دەزگەی (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی)ش دەیانەوێ، ئەو خەڵکە هەموویان یەک جۆربن، وەک ئەسپی عەرەبانە لغاوکرێن و بە ئارەزووی خۆیان لێیانخوڕن، هەر بۆ پێشەوە برۆن و بە هیچ لایەکدا بۆیان نەبێ، ئاوڕبدەنەوە!

دەسیکرد بە پێکەنین و گوتی: من دەمزانی، تۆ هێندە باوەڕت بە بیرەکەی خۆت هەیە، لە ئەوە دەچی، فەیلەسووفی (کاژیک) بی! گوتم: ئەم شۆڕشەی ئەورۆ، شۆڕشەکەی ساڵانی شەستەکان نییە. بە هەزاران کوڕی کوردی تازەپێگەیشتووی خوێندەوار و ڕووناکبیر، جێی خۆیان کردووەتەوە و بە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە خەباتدەکەن. جگە لە

(پارتی)، چەندین دەستە و گرووپی رامیاری دیکەی وەک (کاژیک، کۆمەڵەی مارکسی و قیادە مەرکەزی) تێدا هەیە، هەر لایەکیشیان، بیر و بۆچوونی تایبەتی خۆیان هەیە، تا سەر ئەم یەکڕەنگییە، بۆ کەس سەرناگرێ. جگە لە ئەوەی لە بڵاوکراوەکەدا، هێرش بۆ سەر هیچ لایەک نەکراوە و داوای بەرەشی لە (پارتی) دکردووە. (بارزانی)شی وەک سەرکردەیەکی قارەمانی شۆڕشی (کوردستان) دەستنیشانکردووە. بەڵام تەنیا دەیانەوێ، ئەوانیش لە پلاندانان و نەخشەکێشانی شۆڕشەکەدا، وەک بەشی لە کورد، ڕۆڵێکی دیاریکراویان هەبێ.
گوتی: ئێوە دوای کڵاوی بابردوو کەوتوون. من لە سنووری هێزەکەمدا، ڕێ بە ئەو جۆرە شتانە نادەم، چونکە دوژمنانی کورد و داگیرکەرانی (کوردستان)، کەڵکی لێ دەبینن. ئەوەتە (حەمەرەحیم)، داوای ئەو کەسانەم لێ دەکا و دەڵێ: گەر ئێوە تەمێیان نەکەن، خۆمان دەزانین، چییان لێ دەکەین. ئیدی کەمێ بێدەنگبوو، ئینجا گوتی: من ناچارم، هەمووتان دوورخەمەوە. منیش گوتم: من وەک خوێندکارێکی زانکۆ، پێشمەرگایەتیم بۆ خۆم هەڵبژاردووە، لەنێو هەموو هێزەکانی (کوردستان)یشدا، هێزی خەباتم داواکردووە. گەر دەزانی، من لێرە جێم نابێتەوە، بەهۆی منەوە لەگەڵ پاراستندا، تووشی گرفت دەبی، ئەوا زۆر تکات لێ دەکەم، هەر ئێستە نووسراوێکم بۆ (مەکتەبی عەسکەری) بۆ بنووسە، بۆ هێزێکی دیکەم بگوێزنەوە، چونکە لێرە بێ، یا لە هەر شوێنێکی دیکە بێ، هەر کوردایەتییە!
ئیدی یەکسەر لە شوێنەکەی خۆی هەستا، دەسی خستە سەر شانم و گوتی: تۆ بۆ من وەک (عەبدوڵڵا)ی برام وای. من مەبەستم ئەوە نەبوو، دڵت بیەشێنم، تا منیش لە ئەم شۆڕشەدا بم، هیچ کەسی ناتوانی، قسەیەکتان پێ بڵێ و هەر دەبێ، لە هێزی خەباتیش پێشمەرگە بی. بەڵام بارودۆخی شۆڕشەکە ڕەچاوکەن، بزانن، چی دەکەن و چی دەڵێن. بەراستی، زۆر دڵی دامەوە و ئیدی ماڵاوایم لێ کرد.
پاشان، هەرچەندە لە دڵی خۆمدا لێکمدەدایەوە، قسەکانی کاک (فەتاح)، هەمووی ڕاستبوون. ئاخر من خۆشم، دژی ئەو بڵاوکراوەیە بووم، ئیدی چۆن ڕاست ناکا؟! بەڵام حەزم نەکرد، لەبەر چاوی ئەو، ئەو بۆچوونەی خۆم بدرکێنم. چونکە دەمزانی، گەر ئەو کارەبکەم، ئیدی وەک ئەوانی دیکەم لێدێ و دەبێ، یەکسەر واز لە بیروباوەڕەکەم بێنم، هەرچی کاک (فەتاح) فەرمووی، من بڵێم: وایە. ئەوەش بە من نەدەکرا. بۆیە ئەویش سەرەتا بە هەڕەشە و گاڵتەپێکردن دەستیپێکرد، پاشان کە زانی، کەڵکی نییە و من وەڵامیدەدەمەوە، هێواشبووە و ویستی، بە شێوەیەکی دیکە چارەسەری گرفتەکە بکا و دڵی هەموو لایە ڕاگرێ.

(فەتاح ئاغا) سوور دەیزانی، ئێمە لەسەر هەقین و کاریشی بۆ دەکەین. بەڵام خۆی لە ئەو ئەرکە مێژووییە قوورسە نەدەدا، بە هەنگاو لە بنەماڵەی (بارزانی) دوور نەدەکەوتەوە، چونکە هەر پێی خواردانایە، بەڵگەی بە دەس دەیانی وەک (عەبدولوەهاب ئەتروشی، جەمال نامیق و خاڵەحاجی)وە دەدا، کە لە نێوچەکەدا یەکەمین دوژمنی سەرسەختی بوون. لەبەرئەوەی لای کۆمەڵانی خەڵک، لە هەموویان خۆشەویست، ئازا، دڵسۆز و زیرەکتر بوو. دەسەڵاتی لە بارەگەی (بارزانی)، لە دەسەڵاتی ئەوان پترببوو. بۆیە دەیانویست، بە هەر شێوەیە بێ، لە ناوونـاوبانگ و دەسەڵاتی بدەن. بەڵام ئەو لە ئەوان زیرەکتربوو، کارێکی نەدەکرد، دوژمنەکانی پێی خۆشبن!

## دواکۆبوونەوە

دوای ئەو ڕووداو و هەواڵانە، سەردانێکی (ئازاد)م کرد. شەو و ڕۆژێ لە (مەریوان) پێکەوە بووین. هەموو هەواڵەکانم پێ ڕاگەیاند و گەلێ قسەمانکرد. بەتایبەتی لەسەر ناوی (کاژیک)، هێندێ شتمان باسکرد، وامان بەچاک زانی، خاڵێ لە بەرنامەی کۆنگرەکەمان ئەوەبێ، ناوەکە بگۆڕین، تا گەر هەردووو دەستەکە، ڕێک نەکەوتنەوە، ئێمە چیدیکە، بەناوی (کاژیک)ەوە کارنەکەین. وەک دەڵێن، ئەو ناوە زل و دێ ویرانە، هەر پیرۆز بە ئەوان بێ!

هەر ئەو کاتەش، ناوی (پارتی سۆسیالیستی نەتەوەیی کورد)، لە ئارادابوو. دواجاریش بە هەموو شتەکاندا چووینەوە و دوو قۆڵی بڕیارماندا، دۆست و پشگیری بۆ خۆمان پەیداکەین. هەنگاوی یەکەممان ئەوەبوو، پێوەندی بە (کۆمەڵەی مارکسیی لینی)ەوە بکەین. من لە ڕێی خۆمەوە، ئەو ئەرکەم لە ئەستۆی خۆم گرت و هەوڵمدا، پێوەندی بە هاوڕێم (سەلامی مەلا عەبدولرەحمان)ەوە بکەم. ئەوەبوو، چەن جارێ تێلیفونم بۆ کرد و دەسم نەکەوت.

من و هاوبیر (ئازاد)، هەر لەسەر ئەو هیوایە دەژیاین، کۆنگرە بگیرێ و هەموو گرفتەکان چارەسەرکرێن. بارە چەوتە نالەبارەکەی (کاژیک)، ڕاستکرێتەوە و سەرکردایەتییەکی ڕێکوپێک و دانپێدانراو هەڵبژێرین. جا ئەو کاتە، کێ لەگەڵ دەبێ، کێ لەگەڵ نابێ و وازدێنێ، ئەوەیان گرنگ نییە!

## دەزگەی سیخووڕیی کاژیک

لە کۆتاییدا بۆم دەرکەوت، (ئازاد) لە ڕوو لەگەڵ من شتێ دەڵێ و لە بنیشەوە، لەگەڵ (شێرکۆ) و (عوسمان) ڕێککەوتوون، تا لە مەترسی من خۆیان بپارێزن و هێورمکەنەوە.

چونکە هەرچەندە ئەوان، رەخنەیان لە (پارتی) دەگرت و دەیانگوت: دەزگەی (پاراستن)یان داناوە، هیچ بایەخی بە (پارتی) نادەن و لە رۆڵی کەمدەکەنەوە. کەچی خۆشیان بە هەمان شێوە، لەنێو ئەو ڕێکخراوە چکۆلانە چەن کەسییە پەرتوبڵاوەدا، دەزگەیەکی سیخوڕییان دانابوو!
دوای ئەوەی بلاڤۆکەکەم، لە ڕیزەکانی ڕێکخستندا بڵاوکردەوە، دژی نێوەرۆکەکەی، باری سەرنجی خۆم دەربڕی، یەکێ لە ئەو سیخوڕانەی ئەوان، لە هێڵی سەربازیدا چاندبوویان، ڕاپۆرتێکی لەسەر بۆچوونەکانم نووسیبوو، هەموو قسەکانی منی بۆ گێڕابوونەوە. بەڵام من زۆر سەیرم لێهات، چونکە من بەڕاشکاوی، بە خۆیانم گوتبوو، سەبارەت بە نێوەڕۆکی بلاڤۆکەکە، بۆچوونی خۆم دەردەبڕم، کەچی ئەوان ئەوەیان بە دەسکەوتێکی گەورە دانابوو، دەیانگوت: هاوبیرانمان نەنووستوون، چاویان تیژە و هەموو هەوڵێکی تێکدەرانە ئاشکرادەکەن!

## پاراستن و لیستی ( 77 ) کەسەکە!

هەڵبەتە، چالاکییەکانی سەرکردایەتی کاتی (کاژیک) لەلایەک و جموجۆڵی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی) لەلایەکی دیکەوە، سنووری ئارامگرتن و خۆڕاگرتنی (پاراستن)ی بەزاند بوو. چونکە سەرکردایەتی کاتی، هیچ جۆرە حسابێکی بۆ (پاراستن) نەدەکرد. بە ئاشکرا لەنێو خەڵکدا، باسی (کاژیک) و ئەو بلاڤۆکە دەکرا.
کۆمەڵەی (مارکسی)ش چالاکییان دەنواند و دژی ئەو ڕەوشە خراپەی شۆڕش بوون. لەبەرئەوە دەزگەی (پاراستن)، هەروا بەئاسانی، وازی لە ئەو دوو کۆمەڵە نەدەهێنا، بەڵکوو بە هەموو توانای خۆیانەوە هەوڵیاندەدا، بەر بە ئەو جموجۆڵانە بگرن. بۆیە لیستێکی (77) کەسیان، لە ئەندامانی (کاژیک) و (کۆمەڵە) ئامادەکردبوو، بەزووترین کات بیانگرن. ئێمەش هەر زوو، لە ڕێی هاوبیر (ئەبیلی نوری مەتی)یەوە، ئاگاداری ئەو بڕیارە بووین و ناوەکانمان دەسکەوت. بەڵام بە ئەو هەموو هەڵەشەییەی خۆشمانەوە، هێشتا پاراستن، زۆربەی زانیارییەکانی بە هەڵە دەسکەوتبوو. ئەوان وایان دەزانی، هەر کەسێ هاتوچۆی ماڵی ئێمە بکا، ئیدی (کاژیک)ە و دەبێ، بگیرێ!
بۆ نموونە: (فەرهاد عەبدولحەمید)، لە دەستەی (کاژیک)ە کۆنەکان بوو، کەچی ئەویان بە لێپرسراوی یەکەمی بزووتنەوەی نوێبوونەوەکەی ئێمە دەزانی! من کەسایەتی دووەمی (کاژیک) بووم. ئیدی بە ئەو شێوەیە، لیستەکەیان بەتەواوی سیخناخکردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی هەرە زۆری ناوەکان ڕاستبوون، سەر بە ئەو دوو ڕێکخستنە بوون. (خالەحاجی)، لیستەکەی بۆ سەرکردایەتی دەزگەی (پاراستن) و بارەگەی (بارزانی) نارد

بوو، تا ڕەزامەندی ئەوان وەرگری و بمانگرن. چونکە ئێمە زۆربەمان پێشمەرگە بووین و لە ڕیزی شۆڕشدا بووین، هەر لە خۆیەوە نەیدەتوانی، بمانگری، خۆ سالانی نێوان (**1972–1974**) نەبوو، لەنێوشار بین، بانگمانکا بۆ لیژنەی ناوچە و سووکایەتیمان پێ بکا! باشیوو، لە ئەو کاتەدا، سێ شتی گرنگ ڕوویدا و ئەو پرۆژەیەی (خالەحاجی)، بە یەکجاری پەکخست:

1. (خالەحاجی)، ژنێکی بە (**5-4**) منالەوە، لە مێردەکەی داگیرکرد و مێردەکەشی لە بارەگەی (بارزانی) شکاتی لێ کرد.

2. هێندە لە خۆی بایبووبوو، بەتەواوی خۆی بیرچووبووەوە و کەسی بە پیاو نەدەزانی، لەگەل (شەفیق ئاغا)دا لێیان بووبوو بە هەرا. (ئاغا) نامەیەکی تایبەتی بۆ ناردبوو، (خالەحاجی)ش وەلامیدابووەوە و نووسیبووی: نامەکەت گەیشت، خستمە سەبەتەی کەمتەرخەمییەوە! دیارە هەموو کاتێ، (ئاغا) لە بارەگەی (بارزانی) دەسیدەڕۆی و ڕیزیان لێ دەگرت، لەبەرئەوە شکاتی لێ کردبوو.

لەبەر ئەو دوو هۆیە، (خالەحاجی)یان بۆ سەرەوە بانگکرد و لێپرسینەوەیان لەگەل کرد. بەلام لەبری ئەوەی بیگرن، یا دەریکەن، یا هەر جۆرە سزایەکی دیکەی بدەن، لە ڕێکخستنی پاراستنی (سولەیمانی) لایانبرد و بۆ ڕێکخستنی پاراستنی (کەرکووک) گواستیانەوە. هەرچەندە (خالەحاجی)، هێندە زیانبەخش و دلڕەشبوو، لە دووریشەوە، کلکی هەر دەجولاند و تۆزیدەکرد!

3. جگە لە ئەوەی، ڕێککەوتنە ڕەشە شوومەکەی (**6. 3. 1975**)ی (جەزایر)ی بەسەردا هات، هەموو شتێکی باش و خراپی لوولدا و پێچایەوە. ئەگینا سەرکردە دلسۆزەکانی (پاراستن)، هەموومانیان دەگرت، لە زیندان توندیاندەکردین، یا خوێنیان دەرشتین و گۆڕیان ونددەکردین. دووریش نەبوو، پاشان بلاوکراوەیەکیان لەسەر دەرکردینایە و بەسیخووڕی (بەعس) تاوانباریانکردینایە!

**ڕێککەوتنامەی جەزایر**

پێش ئەوەی لە (جەزایر)، ڕێککەوتنەکە ئاشکراکری، لە کۆتایی سالی (**1974**)ەوە، سەرکردایەتی (بەعس)، لەگەل ئێرانییەکاندا خەریکبوون، ڕێککەون. بە مەرجی ئەوان، دەس لە شۆڕشی کورد بەردەن. بۆ ئەو مەبەستەش، چەن جاری لێپرسراوانی هەردوو دەولەت، لەڕێی شا (حوسێن)ی (ئوردوون)ەوە، یەکیان دیبوو. بەلام بەداخەوە، چونکە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، پشتیان بە شۆڕشەکەوە نەدەیەشا و لەسەر بۆش دەڕۆی، ئاگایان لە ئەو دەنگوباسانە نەبوو، یا ئاگایان لێی بوو، بەلام بایەخیان پێ نەدەدا!

لە سەرەتای مانگی (2)شەوە، هێندێ کوردی دانیشتووی دەرەوەی وڵات، ئەو هەواڵانەیان بیستبوو، هەرزوو بە سەرکردایەتی شۆڕشیان ڕاگەیاندبوو، کەچی ئەوان بڕوایان نەدەکرد و دەیانگوت: ئەوە هەمووی پڕوپاگەندەیە، چونکە دوژمنایەتییەکی مێژوویی هێندە گەورە و قووڵ، لەنێوان عەرەب و فارسدا هەیە، گەر ڕێکیشکەون، ڕێککەوتنێکی کاتی دەبێ، زوو هەڵدەوەشێتەوە و زۆر کاریش، لە پێوەندی شۆڕش و (ئێران) ناکا، چونکە (ئەمێریکا) ئاگادارە!

ئەوان ئەوەیان لەبیر خۆیان بردبووەوە، کە (ئێران)یش هەر دەوڵەتێکی داگیرکەری بەشێکی دیکەی نیشتمانەکەمانە. نەیاندەزانی، (ئێران) و بەرەی خۆراوا، بۆچی وا بە ئەو شێوە بەربڵاوە، دەرگەی سنوورییان بۆ ئاوەڵەکردوون و یارمەتیاندەدەن. نەیاندەزانی، جیهانی ڕامیاری تەنیاوتەنیا، لە بەرژەوەندی نێودەوڵەتان پێکهاتووە و هەر کاتێ، ئەو بەرژەوەندییەی ئەوان بەئاسانترین شێوە، بەکەمترین زیان و بەزووترین کات هاتەدی، ئیدی شەقی لە هەموو مافی مرۆ و گەلانی بندەستی چەوساوە هەڵدەدەن، بەڵێنەکانی خۆیان بیردەچێتەوە، دەستی دوژمنەکانی دوێنێیان دەگوشن و دەستێکی تەڕیش، بە قوونی کورد و شۆڕشەکەیدا دێنن!

بۆیە چۆن ئەو ڕێککەوتنەی (جەزایر)، لای زۆربەی زۆری گەلانی نووستووی جیهان، کارێکی نەگمەنی کتوپڕبوو، لای سەرکردایەتی کوردی دواکەوتووش، کارێکی چاوەڕوان نەکراوبوو. ئەوەبوو، کاتێ ڕێککەوتنەکە، لە هەموو وێزگەکانی ڕادیۆ و کەناڵەکانی تێلیڤیزیۆنی جیهانەوە ڕاگەیەنرا، سەرکردایەتی شۆڕشی کوردیش، وەک ئێمە گوێیان لێی بوو، چونکە لە گوێی گادا نووستبوون و لە خەوی خۆشی غەفڵەت ڕاچڵەکین. بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، هیچیان پێ نەدەکرا!

ڕێککەوتنامەی (جەزایر)، خەڵکەکەی بە جاری لە خەوی غەفڵەت خەبەرکردەوە. لە هەموو شوێن، سەرجادە، ماڵ، بنار و چادرێکدا، لە (کوردستان) و هۆردووگەکانی (ئێران)، کۆمەڵانی خەڵک خەو و خواردنیان لێ بێزرا، هەر خەریکی دەمەتەقێبوون، چاوەڕێی ئایندەیەکی نادیار و چارەنووسێکی ڕەشیان دەکرد. هەر کەسێ خەمی خۆی و خێزانەکەی بوو، چی بکا؟ چۆن خۆی دەربازکا؟ بەرەو کوێ بڕوا و پەنا بۆ کێ بەرێ؟ لە هەمان کاتیشدا، سوپای (عێراق) لە هەموو بەرەکانی جەنگ، هێرشێکی نوێی دەستپێکردەوە، لە هەموو (کوردستان)یشدا، جەنگ بەتەواوی گەرمبوو، پێشمەرگە قارەمانەکان، دەستێکی مەردانەیان، لە هێزەکانی دوژمن وەشاند.

لە ئەو ماوەیەدا، لە بەرەکانی جەنگی نێوچەی سەرکردایەتی، هێزەکانی دوژمن نەیانتوانی، یەک بست پێشکەون و داگیریکەن. هەر زووش سوپای (عێراق)، ئەو هەرا و پشێوییەی نێو شۆڕش و ڕێککەوتننامەکەیان بەهەل زانی، پەلاماری (سەییدسادق)یان دا و داگیریانکرد.

## سەرلەئێوارەی بەهارێکی ڕەش

ڕۆژی (**9. 3. 1975**)، پاشنیوەڕۆبوو، کەمێ نەخۆشبووم و لەماڵەوە پاڵکەوتبووم. چەن جارێ تێلیفۆنم بۆ بارەگەی هێز کرد، کەس وەڵامی نەدامەوە. منیش زۆر سەیرم لێهات، لەبەرخۆمەوە دەمگوت: تۆ بڵێی، بارەگەی هێز چۆلکرابێ، یا هێلی تێلیفۆنەکە بڕابێ! ناچار خۆم کۆکردەوە و ڕۆیشتم. بەڵام بارەگەی چی، چۆلبوو!

کەمێ وەستام، زۆری پێ نەچوو، ڕەوانشاد (عەبدوڵلائاغا)ی برای کاک (فەتاح)، لەگەڵ چەن پێشمەرگەیەک هاتن. ئەو کاتە یاریدەدەری فەرماندەی هێزبوو. گوتی: ئەوە چی دەکەی؟ گوتم: هاتووم و کەسی لێ نییە. گوتی: هێزی پێشمەرگە، لە نزیک (سەیید سادق) کۆبوونەتەوە، ئێستە منیش دەگەڕێمەوە، گەر لەگەڵ من دێی، ئەوا پێکەوە دەڕۆین. گوتم: باشە، بەڵام چەکم پێ نییە. بە پێشمەرگەیەکی گوت: ڕاکە، لە ماڵەوە تفەنگێکی بۆ بێنە. ماڵەکەیان بەرانبەر بارەگەی هێزبوو، هەر زوو برنەوێکی درێژی بۆ هێنام. ئیدی پێکەوە سواربووین و ڕۆیشتین.

لە (کانیمانگا) لاماندا، تووشی دوکتۆر (لەتیف ئەمین)ی پورزام و تیپێکی تەندرووستی بووین، کەمێ لایان وەستاین و پاشان بەرەو (شانەدەری) بەرێکەوتین. لە دوورەوە، ئەو دەشتە پانوبەرینە، لەبەر پێشمەرگە بەرنەدەکەوت. ئێمە دابەزین، یەکسەر (برایمی حەمەعەلی) و (سەروەت)م دۆزییەوە. گوتیان: ئەمڕۆ سوپا و جاش هێرشیانکردووە، (سەیید سادق)یان گرتووە، بڕیارە، کاتێ تاریکبوو، پەلاماربدەین و بیگرینەوە.

کاژێر (**30: 16**) دەمەوئێوارەبوو. لەسەر سەربانی خانوویەکی گڵی نزم، لەنێوگوندەکە و لەسەر جادە گشتییەکە، دوکتۆر (کەمال خۆشناو، شێخ موحەممەدی سەیید عەلی حافز و کەریم دەرویش) دانیشتبوون. منیش چووم، سەرێ لە دوکتۆر (کەمال) بدەم. هێندێ قسەمانکرد، کاتێکمان زانی، لە چەمەکەی بەردەمی گوندەکەوە، لوولەی دوو تانک و چەن (مسەفەحە)یەک دەرکەوت. ڕیزی دۆشکەیان بەنێوخەلکەکەدا کرد. ئیدی ئەو هەموو پێشمەرگە زۆر و ئازایانە، بەجارێ سەریان لێشێوا و کەس ئاگای لە کەس نەما. ئینجا لە (سەیید سادق)یشەوە، سوپا و جاش هاتن. من لە شوێنی خۆم چەقیبووم. هەردوو ئەفسەر (ئەنوەری مەجید سوڵتان) و (سەباح نوری)، بە جیپە کوورتەکانیانەوە هاتن، چەکی (**B10**)یان لەسەر بەستبوو، بەرەوڕووی تانکەکان ڕۆیشتن و چەن گولە تۆپێکیان پێوەنان، بەڵام داخەکەم، کەلکی نەبوو، تازە درەنگبوو!

چاوم لێبوو، دوکتۆر (کەمال خۆشناو)، بەدوای جیپەکەی بارەگەی هێزدا رایدەکرد، تا دەرگەکەیان بۆ کردەوە و خەریکبوو، سەرکەوێ، فیشەکێ بەرلاقی کەوت، دەسیانگرت و ڕزگاریانکرد.



سالی (**2005**) لە ژوورەکەی د. (کەمال) گیراوە، ئەو کاتە ڕاگری کۆلێژی کشتوکاڵ بوو.

(شێخ موحەممەد) نەیتوانی، ڕاکا و دەرچێ، دەمانچەکەی دەرهێنا، فیشەکێکی بە قورگی خۆیەوە نا و خۆی کوشت، بۆئەوەی بە زیندوویی نەگیرێ. ئەوانەشی لەگەڵیدا بوون، وەک (غەفوور مایاوەیی) و چەن پێشمەرگەیەک دەسگیرکران. هێندێ پێشمەرگەش بەرگرییانکرد، بەڵام کەلکی نەبوو. لەبەرئەوە هەر پێشمەرگە بوو، بە چەن لایەکدا ڕایاندەکرد و سەری خۆیان دەردەکرد.



شێخ موحەممەدی سەیید عەلی حافز ( **1937 – 1975** )

منیش هەر خەمی (سەروەت)م بوو. هەر زوو دوزیمەوە. لەگەڵ کۆمەڵێ پێشمەرگەدا، بەنێو ئەو دەغڵەدا، بەرەو گوندی (هۆڵەسمت) ڕامانکرد. بارانیش نمەنمەدەباری، زەوی بەتەواوی تەڕکردبوو. نێودەغڵەکەش قووڕبوو، گەنم و جۆش بەرزبوویبووەوە. بە ئەو هەموو جل و قەمسەڵە قوورس و تفەنگە گەورەیەوە، بە فیشەکلەغێکی قورسەوە، زۆر بەگران دەمتوانی، ڕابکەم.

جگە لە ئەوەی بە شێوەیەکی بەردەوامیش، تەقەیان لێ دەکردین و گولە بەسەرماندا گیزەی دەهات. لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی، لەبەر (سەروەت) زۆر دوورکەومەوە. چونکە بەتەواوی ماندووبووبوو، خەریکبوو، پەکیدەکەوت. ناچار چاروبار، کەمێ لەنێو دەغڵەکەدا دادەنیشتین. دەممان زۆر وشک و هەناسەشمان سوار بووبوو، لە ئەوە پتر نەماندەتوانی، هەنگاوهەڵبێنین. لە ئەو کاتەدا، بیری بنێشتم کەوتەوە، لە گیرفانمدا پاکەتی بنێشتی سەهمی تێدابوو، سەرو دانەمان خوارد و دەسمان بە ڕۆیشتن کردەوە. کەمێ لە جادەکە دوورکەوتینەوە و لە دەغڵەکە ڕزگارمانبوو. بەڵام هێشتا هەر دەنگی تەقە دەهات. ئینجا بارانێکی وا دایکرد، پیاوم دەویست، سەرهەڵبڕی و تەماشای ئاسمان بکا. لە پێشمانەوە (جەمالی حاجی غەفووری قزڵەری بازرگان) دەڕۆی. لەپڕ هاواری لێ هەستا و گوتی: ئەی باوکەڕۆ، بریندارببووم. گولەیەک بەر سمتی کەوتبوو، بەڵام هەر دەڕۆی و لە پێ نەکەوتبوو. هەرچی چۆنێ بوو، خۆمان گەیاندە گوندی (هۆڵەسمت). لە ئەوێ هێستریکم بۆ پەیداکرد. ئیدی بە ئەو شەوە تاریک و بارانە زۆرە، بە ئەو ڕێ ناخۆش و قوڕە خەستەی ئەو دەشت و کێوە، بەرەو گوندی (چەوتان) ڕۆیشتین.

## چەوتـــان

دەوروبەری کاژێری (9)ی شەو گەیشتین. موختاری گوندەکە دایمەزراندین. من و (سەروەت)، بەر ماڵێکی جەنجاڵی زۆر باش و ڕووخۆش کەوتین. هەروا بەتەڕی، لە تەنیشت زۆپاکەوە دانیشتین. هێندە ماندووبووین، هێزمان لەبەر ڕابوو. ژوورەکە زۆر تاریکبوو، تەنیا هەر چرایەکی کز دەسووتا، چونکە نەوتیان کەمبوو، زۆریشیان زیاد نەدەکردا بەڵام چانسمان هەبوو، برنج و شلەی بێ گۆشتیان هەبوو، نانێکی باشمان خوارد.

کچێکی تازەپێگەیشتووی ناسک و جوان، بەرانبەرمان دانیشتبوو، چراکەی وا دانابوو، ڕووناکییەکەی لە دەموچاوی خۆی بدا، تا ئێمە بە باشی، ڕوخساری شیرینی ببینین. خێراخێرا، قسەی هەڵەقومەڵەقی دەکرد، خۆی بە قسەکانی خۆی، لە هەمووان زیاتر پێدەکەنی! یەک لەسەر یەکیش، چای بۆ تێدەکردین. لەپڕ منداڵە چکۆلەکەیان، تڕێکی لێدا.

---

کاتی خۆی بەبونەی یاد و بیرەوەری (40) ساڵ تێپەڕبوون، بەسەر یەکێ لە نەبەردییەکانی هێزی (خەبات) و شەهیدبوونی (شێخ موحەممەدی سەییدعەلی حلقز) لە گوندی (شانەدەری)، گوتاری (دەمەو ئێوارەی بەهارێکی ڕەش)م، لە گۆڤاری (گوڵان)ی ژمارە (969)ی ڕۆژی (17. 3. 2014)، لە لاپەرە (36-39)دا بڵاوکردەوەوە. پاشان گوتارەکەم لە پەرتووکی (بارانی خوێن و بای مەرگ)ی لاپەرە (116-127)دا، بۆ دووەمین جار بڵاوکردەوە.

کچەکەش تەماشایەکی ئێمەی کرد و بە زەردەخەنەیەکی جوانەوە گوتی: هیچ نییە، بۆ کوردییەکەی (بەغا) دەگەڕێ! ئیدی منیش لەبەر پێکەنین، ماندووبوونم بیرچووەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم: تەماشای ئەم گەلە قارەمانە بکە، سەرەڕای ئەو هەموو دەربەدەری، لێقەوماوی، دەسکورتی و بێکەسییە، هێشتا ڕازەماندەکەن، ڕووی خۆشماندەدەنێ و قسەی خۆشیشمان بۆ دەکەن!
پاشان سەرو لێفەی شڕمان وەرگرت و چوین بۆ مزگەوت. مزگەوتەکە لەبەر پێشمەرگە بەرنەدەکەوت. خۆمان ڕووتکردەوە، بە توێی دەرپێ و فانیلەیەکی کورتەوە، لە دەوری زۆپاکە وەستاین و جلەکانمان وشککردەوە. دوایی زۆر باش لێی نووستین و تا بەیانی، خەبەرمان نەبووەوە. گەر سوپای دوژمن بهاتایە، هەموومانیان هەر بە کڵاو دەگرت!
بەیانی لێفەکانمان بۆ ماڵەکە بردەوە. بەرچاییان بۆ ئامادەکردبووین و نانمانخوارد. پاشان هەموومان کۆبووینەوە و ماڵاوایمان لە خەڵکی گوندەکە کرد. ئینجا بە ئەو چیا سەختە بەرزانەدا، بەرەوخواربووینەوە، تا گەیشتینە (دۆڵەسوور).

**دۆڵەسوور**

دوای نیوەڕۆیەکی درەنگبوو، گەیشتین. لە دوورەوە کاک (فەتاح)م بینی، لەنێو کۆمەڵی پێشمەرگەدا دانیشتبوو. نزیککەوتینەوە، (برایمی حەمەعەلی، فەرهاد عەبدولحەمید، ئەحمەدی عارفی فیتک، بێستوونی مەلاعومەر، جەزای ئەحەشانە) و هەموو هاوڕێکانی دیکەمانم بینی. گەلێ دڵخۆشبووم و وەک گوڵ گەشامەوە، کە هەموویان بە ساغی دەرچووبوون!
ماوەیە لای کاک (فەتاح) دانیشتین، هەر یەکی دەنگوباسی خۆی دەگێرایەوە و هەواڵی هاوڕێکانی دیکەیان، لە یەکدی دەپرسی. پێشمەرگەیەکی لای (عەبدوڵڵائاغا) بریندارببوو، یەکسەر کلاشینکۆفەکەی دا بە من و لە کۆڵ ئەو برنەوە درێژە بوومەوە.
ئێوارە نان و چامان خوارد، کاک (فەتاح) کۆیکردینەوە و گوتی: دەبێ چەن پێشمەرگەیەک بڕۆن، پردەکەی (کەولوس) بتەقێننەوە، ئەوەک ئەم شەو سوپای دوژمن، هێرشبکەن و بە ئاسانی بگەنە ئێرە. (برایم) و (فەرهاد)، لەسەر ئەوەی کامیان لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بڕۆن و ئەو کارە جێبەجێبکەن، دەنگەدەنگیان دەسپێکرد و بەربەرەکانی یەکدیان دەکرد، چونکە لە دوو دەستە جیاوازەکەی (کاژیک) بوون! پاشان کاک (فەتاح) نێوبژێکردن و گوتی: گەر هێندە حەزدەکەن، فەرموون، هەردووکتان بچن.
من و (ئەحمەدی عارفی فیتک)یش، لە پەنایەکدا دانیشتبووین و پێیان پێدەکەنین. (ئەحمەد) گوتی: تۆش وەک خۆم وابە، شتێکیان پێ نەگوتی، بەزۆر خۆتی تێ هەڵمەقورتێنە. منیش گوتم: ڕاستدەکەی، بەڵام من وەک تۆ نابم، بەڵکوو وەک خۆم دەبم، چونکە هەر خۆم وام! ئیدی هەردووکمان پێکەنین.

پاشان کاک (فەتاح) هەموو پێشمەرگەکانی، بەسەر دوو دەستەدا دابەشکرد و گوتی: هەر دەستەیەکتان دەبێ، هەر لە ئێستەوە سەرکەونە سەر چیایەک و تا بەیانی، بەنۆرە ئێشک بگرن. ئێمەش لەنێوخۆماندا ڕێککەوتین و دەستەی خۆمان هەڵبژارد. من، (سەروەت، ئەحمەدی عارفی فێتک، شێروان بابان، بێستوونی مەلاعومەر، جەزای ئەحەشانە) و چەن پێشمەرگەیەکی دیکەش، هەر زوو سەرکەوتین و تا درەنگانێ، لە سەرماندا دانیشتبووین و قسەماندەکرد. پاشان چەن پەتۆیەکمان داخست و دوودوو بەڕیز، پشتمان بە پشتی یەکدییەوە نووساندبوو، تا کەمێ گەرمبینەوە و خەومان لێ بکەوێ. دوو پێشمەرگەش بۆ ماوەی دوو کاژێر، ئێشکیاندەگرت و بەمەرچواردەوری لووتکەی چیاکەدا دەسوڕانەوە.
بەڵام لەبەر سەرما، لەبەر قسە خۆشەکانی (ئەحمەد) و پێکەنین، خەو لە چاوانمان نەکەوت. بە ئەو شێوەیە، تا بەیانی خۆرهەڵات، هەر دوودوو بەنۆرە ئێشکی خۆمان گرت. بەیانی زووش لە چیاکە دابەزین. (برایم) و (فەرهاد)یش، لەگەڵ پێشمەرگەکاندا گەڕابوونەوە و پردەکەشیان تەقاندبووەوە. کاک (فەتاح) لووتکەی هەموو ئەو چیایانەی دەورووبەری، بە پێشمەرگە تەنیبوو. بە ئێمەشی گوت: بگەڕێنەوە بۆ (پێنجوێن)، ماوەی دوو ڕۆژ پشوویدەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ (ناوپارێز).

## پێنجوێن

ڕۆژی (**11. 3. 1975**)، هەر گەڕامەوە، یەکسەر چووم بۆ ماڵەوە. کەسی لێ نەبوو. بۆ جانتاکەی کۆمیتەی سوپایی گەڕام، دیارنەمابوو. دەرگەش نەشکابوو. لە ئەوە دەترسام، دەس (پاراستن) کەوتبێ، چونکە ناوی هەمو ڕێکخستنی بەشی کۆمیتەی سوپایی (کاژیک)ی تێدابوو. پاشان هەتمەدەرەوە و لە بازاڕ، تووشی (شێرکۆ) بووم، خۆی گێلکرد، هەرچەندە ماوەیە لەوەوبەر، هێندێ دەنگەدەنگمان بووبوو، بەڵام من بانگمکرد و گوتم: ئەم ماوەیە سەرت لە ماڵی ئێمە داوە. گوتی: بەڵێ. گوتم: جانتاکەم دیارنەماوە. گوتی: من بردوومە. منیش گوتم: باشبوو، لای ئێوە بوو، من ترسی (پاراستن)م هەبوو. ئینجا دەسی بۆ کلاشینکۆفەکەی شانم برد و گوتی: ئەمە (فەتاح) دایتی؟ گوتم: (فەتاح) نا، کاک (فەتاح). خۆشت چاک دەزانی، کاک (فەتاح) ئێستە لە کوێیە، هەر قسەی بۆش و ڕووتیش ناکا! ئەمەش تفەنگی ئەو نییە، تفەنگی شۆڕشە، شۆڕشیش بە ئەو کەسانەی دەدا، کە پێویستیان پێی هەیە، داکۆکی لە ئابڕووی ئەم خاکە و هەزارانی وەک تۆ دەکەن. ئیدی قسەی نەکرد، سەری شۆڕکرد و بێ سڵاو لێیدا ڕۆی. نازانم (ئازاد)، بە چی ئەم پیاوە نەخۆشەوە سەرسامبوو، لە کاتێکدا زۆر لە ئەو پتر، وریا و زیرەکتر بوو؟!!

### عەبدوڵلائاغا

دوای ئەوە بەرەوخواربوومەوە، تووشی رەوانشاد (عەبدوڵلائاغا) بووم. هێندێ قسەمانکرد و بۆ نانی نیوەڕۆ لە ماڵی خۆیان بانگیکردم، منیش بە خۆشییەوە قەبووڵم کرد. کەمێکی پێچوو، (مەحموود بەگی گوڵی)ش هات، ئەو کاتە سەرلقی پشتیوانی بوو. قەلیکی باشی سەربڕی بوو، نانێکی باش و بەتامامان خوارد.

پاشان کەمێ باسی شۆڕش و بیری نەتەوەییم بۆ کردن. بەڵام کاکە (عەبدوڵلا) تازە، کچەکەی (شەفیق ئاغا)ی نیشانەکردبوو، زۆر حەزی لە باسی خۆشەویستی و خێزان دەکرد. گوتی: تۆ واز لە ئەو باسانە بێنە، ئێمە ڕۆژانە خەریکی ئەو کارەین، یا کەمێ باسی وێژە بکەین. منیش یەکسەر تێگەیشتم و مەوجەکەم گۆڕی، هۆنراوە ناسکەکەی ڕەوانشاد (حەمەی مەلاکریم)م بۆ خوێندەوە. گوتی: گەر ئەرک نەبێ، بۆم بنووسەرەوە، منیش یەکسەر بۆم نووسییەوە. بۆ بەیانی گەڕامەوە بۆ (ناوپارێز).

ئازیزەکەم! بشێ، ڕۆژێ بۆم بلوێ
کورپەی دڵم، لە بێشکەی سنگتا بنوێ
بشێ، داری بەزەیی خوا بێتەبەر
ئەم دوو دڵە، ببن بە هاوڕێ و هاوسەر
ساوایەکی وەک خۆت، جوانمان پێ ببڕێ
لە کۆشماندا، پەخەی کتێب دابدڕێ
ڕۆژێ جارێک، سەربێشکەی لادەم لە ڕوو
وردبیمەوە، لە چاو و لێوی نووستوو
ئازیزەکەم! بشێ، بڵێ، تۆ بڵێ
تروووسکەیەک، خۆشی بخەرە دڵی

بە داخێکی گەورە و گرانەوە، خۆفرۆشە ناپاکەکانی کورد، داوێکیان بۆ کاکە (عەبدوڵلا)ی پێشمەرگە و نەتەوەپەروەر نایەوە، ڕۆژی (27. 9. 1987)، لە تەمەنی (39)ساڵیدا، گیانی پاکی بە نەتەوە و نیشتمانەکەی سپارد و فریای ئەوە نەکەوت، چێژ لە ژیان ببینێ. دوای برا گەورەکەشی ڕەوانشاد (فەتاح ئاغا)، ئەوە دووەمین شەهیدی ئەو بنەماڵەیە بوو!



( 1987 – 1948 )

## ناوپارێز

ماوەی (**3**) ڕۆژ بوو، لە (ناوپارێز) بووین و پاسی کۆگەکانمان دەکرد. لەپڕ ڕۆژی (ئازاد)، لە (هەڵەبجە)وە گەڕایەوە و لای من لایدا. گوتی: (عوسمان) نامەی وازهێنانی نووسیوە و دوو خاڵی تێدا دەستنیشانکردووە: یەکەم باوەڕی بە بیری نەتەوەیی نەماوە. دووەمیش: هەموو هیوایەکم بە (حوسێن) بوو، بەڵام ئەو لەگەڵ ئەو هێڵەی ئێمە نەهات و هاوبیرەکانمان لێ هەڵدەگێڕێتەوە. بەتەواوی ڕوخاوم و بڕوام بە کەس نەماوە.

منیش گوتم: بڕوابکە، گەر بەردەوامبن وازهێنانی (عوسمان)، زیانتان پێ ناگەیەنێ. چونکە بەکەڵکی کاری رامیاری و پارتایەتی نایە. جگە لە ئەوەی خۆشی گوتوویەتی: باوەڕم بە بیری نەتەوەیی نەماوە. پاشان کەمێ پێکەوە دانیشتین و دەمەتەقێمانکرد. گوتارێکم لەسەر ڕێککەوتننامەکەی (جەزایر) و ڕەوشی شۆڕش نوسیبوو، لەگەڵ خۆی بردی و بەرەو (پێنجوێن) گەڕایەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی، مامە (بەکر)م بە سواری تراکتۆرێکەوە هات و گوتی: دووکانەکەم داخستووە و بەرەو (سیتەک) دەڕۆم. ماوەیە لە ئەو ناوە دەبم، تا بزانم، چی ڕوودەدا. تۆش ئاگات لە خۆت بێ، لە (پێنجوێن) دەنگوباسی زۆر ناخۆش هەیە، سەرکردایەتی شۆڕش نیازیانوایە، جەنگی پارتیزانی دەستپێبکەن.

زۆری پێ نەچوو، (سوارە ئاغا)ی برای (فەتاح ئاغا) هات. دوو تراکتۆر چەک و تەقەمەنی، ئارد و خواردەمەنی پێبوو. گوتی: دەچین بۆ (شارباژێر)، لە ئەوێ چاوەڕوانی فەرمانی سەرکردایەتی دەکەین، تا بزانین، چی بکەین!

ئێمەش کۆمەڵێ برادەر و پێشمەرگەی خەڵکی (سولەیمانی) بووین، لە ئەو ناوە کۆبووبووینەوە. ڕۆژانە کاری خۆمان دەکرد، بێ ئەوەی ئاگامان لە هیچ شتێ بێ. ئەوەبوو، دەوروبەری (**22**)ی مانگی (**3**) بوو، دەمەوئێوارەیەکی درەنگ، کاک (عومەری سەیید عەلی) هات و ئەو شەوە لای من مایەوە. شەو تا درەنگانێ، باسی باری شۆڕش و ئایندەی کوردمان کرد. زۆر بە پەرۆشیشەوە، هەواڵی بلاڤۆکەکەی (کاژیک)ی لێ پرسیم و گوتی: ئەو هەڵویستە، تەنیا چاکسازییە یا دووبەرەکییە؟! منیش گوتم: (کاژیک) خۆی نییە، تا دووبەرەکی تێکەوێ. ئەویش هەر وەک ئەو خەڵکە تێیگەیبوو. گوتی: بڕیارە، جەنگی پارتیزانی بکەین. بەیانی زوو بەرەو دەوروبەری (سولەیمانی) ڕۆی.



لەگەڵ کاک (عومەری سەیید عەلی)دا ڕۆژی (**5. 8. 2017**) گیراوە.

زۆری پێ نەچوو، شەوی (25. 3)، لە بارەگەی هێزەوە تێلیفۆنیان بۆ کردین و گوتیان: بەیانی هەمووتان بگەڕێنەوە و ئەوی بەجێبیلن. ئیدی ئەو شەوە، خەو لە چاوانمان تۆرا، هەر لێکماندەدایەوە، ئاخۆ چی قەومابێ؟! چۆن ئەم هەموو زەخیرە و تەقەمەنییە بەجێبیلین؟ کێ ئاگای لێرە دەبێ؟!

## سەرۆک بارزانیی و بڕیارێکی سەخت

سەرلەبەیانی (26. 3. 1975)، زوو هەستاین و خۆمان کۆکردەوە. بۆ دواجاریش، نانی بەیانیمان خوارد. پاشان بە یەکەمین پاس گەڕاینەوە. دەمی نیوەڕۆبوو، پێچەکانی (ملەکەوە)مان دەبڕی و بە جادە تەختەکەدا، بەرەو (پێنجوێن) خلبووینەوە. لە دوورەوە خەڵکم دەبینی، جانتایان بە دەسەوەبوو، بەپێ بەرەوخواردەهاتن. منیش لە شۆفێرەکەم پرسی: ئەری ئەوانە بۆ کوێ دەڕۆن؟! گوتی: بۆ ئێوە نەتانزانیوە؟ گوتم: چی بزانین؟! گوتی: شۆڕش نەما و هەر کەسێ ئازادە، چی دەکا و بۆ کوێ دەچێ. خەریکبوو، لێی توورەبێم. گوتی: کاکە ئێوە دەڵێی، لە گوێی گادا نووستوون، لە دوێنێوە ئەو دەنگە بڵاوبووەتەوە، ئێستە خەڵک خەریکی راووڕووتن و فرانفراتە. منیش پاسەکەم راگرت و دابەزیم، لە یەک دووانێکم پرسی، چی ڕوویداوە؟ بۆ کوێ دەچن؟ یەکێکیان گوتی: جا هیچ ماوە، ڕوویدا! دەڕۆینەوە بۆ (سولەیمانی) و خۆمان دەدەینە دەس خوا! ئینجا سواربوومەوە و بە شۆفێرەکەم گوت: تۆ ڕاستت فەرموو، ئێمە یاغنیشبووین!

ئەو بڕیارە سەختە پڕ مەترسییەی سەرۆک (بارزانی)، لە بەهاری (1975)دا دای، لە ئەو ڕۆژە ڕەشەی گەلی کوردی تێکەوتبوو، بڕیاریبوو، زۆر گەورە و گران بوو، تا یەک کوردیش لەسەر ڕووی ئەم زەوییە مابێ، مێژوو بیری ناچێتەوە!

لەگەڵ ڕێزم بۆ سەرۆک (بارزانی)، کە خەباتێکی سەخت و دوورودرێژی، لە پێناوی کورد و (کوردستان)دا کردووە، بەڵام گەر لەبەرئەوە ئەو بڕیارەیدابێ، تا لە ئەوە پتر، خوێن نەڕژێ و خەڵکی بێتاوانی کورد تێدانەچن، بە ئەو پێیەی (ئێران) سنووری لێ دادەخستین، بەرەی خۆراوا و (ئەمێریکا)ش، پشتیان تێدەکردین و چیدیکە، یارمەتی کوردیان نەدەدا، بە ئەوەش قایل نەدەبوون، (بارزانی) لەسەر خەباتی چەکداری خۆی بەردەوامبێ، دەبووایە، بە ئەو شێوەیە، گەلەکەی خۆی بەجێ نەهێشتایە، گەر هیچی نەکردایە، هەر هیچ نەبووایە، وەک ڕەوانشاد (شێخ موحەممەدی سەییدعەلی حافز) خۆی بکوشتایە. یا وەک ڕەوانشاد پێشەوا (قازی موحەممەد)، گەلەکەی لەبەردەم ئەو ڕێ پڕ مەترسی و هاتونەهاتەدا بەرەڵانەکردایە، چارەنووسی ئەویش، وەک چارەنووسی ئەوان بووایە!



( 1979 .3 .1 – 1903 .3 .14 )

بۆیە تا من مابم، ژان و ئازاری ئەو ڕۆژەڕەشەم، لە دڵ دەرناچێ. لاوێ بووم، تەمەنم (24) ساڵ بوو، بە هەموو بڕوا و دڵسۆزی خۆمەوە، چەکم هەڵگرتبوو، وەک پێشمەرگەیەکی ئاسایی، لە ڕیزەکانی شۆڕشدا بووم، هەموو بڕوایەکی خۆمم بە (بارزانی) دابوو، هیوایەکی گەورەم بە ئەو و ئایندەی شۆڕشەکە هەبوو. بەڵام بەداخەوە، بڕواکەم لە جێی خۆیدا نەبوو، گوڵی هیواکانم هەر زوو سیسبووون و هەڵوەرین!

ئاخر گەر خوێندکارێکی گەنجی وەک من، ساڵی پێشمەرگەبووم، تووشی هیچ جۆرە زیانێکی جەستەیی نەبووم، لە تاڵان و بڕۆ، ڕاکردن و هەڵاتن، هەرەس و ماڵوێرانی خۆش نەبم، ئەدی ئەو کوردانەی، لە ماوەی ئەو (14) ساڵەی شۆڕشدا، کەسێکیان یا زیاتریان شەهیدبوون، چۆن واز لە مافی خۆیان دێنن؟ ئەو سەرکردایەتییە ترسنۆک و هەڵاتووانە دەبەخشن؟! هەڵبەتە، چاوی دادگەی مێژوو زیت و وریایە، لە تاوانی کەس خۆش نابێ!

## پێنجوێن

لەبەربارەگەی هێزدا دابەزیم، دوو پەتۆ و کلاشینکۆفێکم پێبوو. خۆم بە ژووردا کرد، تووشی (عەلی تۆفیق) و (برایمی حەمەعەلی) بووم. گوتیان: هەموو شتێ تەواوبوو، (بارزانی) بڕیاری بەرەنگارنەبوونەوەی داوە، چیدیکە نەجەنگین. لە سەرکردایەتییەوە برووسکەمان بۆ هاتووە و دەڵێن: ئەوی دەچێ بۆ (ئێران)، با بچێ. ئەوێشی دەڕواتەوە

و خۆی بەدەسەوەدەدا، ئازادە. منیش واقمورمابوو، مێشکم جەڕیبوو، هەستم تاسابوو، هۆشم نەمابوو، بە هیچ جۆرێ بڕوام نەدەکرد، بە ئەو شێوە پڕ ئاسوور و ئاساییە، شۆڕش کۆتایی، دەتگوت خەون دەبینم!

(عەلی) گوتی: نیازی چیت هەیە؟ گوتم: نازانم. بەڵام ئەی ئەو هەموو سەرکردانە، نیازی چییان هەیە؟! کاک (فەتاح) دەڵێ چی؟! گوتی: ئەویش لەگەڵ بڕیارەکەی (بارزانی) دایە.

ئیدی من بەرەو بازار ڕۆیشتم، هەر خەڵکبوو، لە ئەمبەر و ئەوبەری کۆڵان و جادەکان وەستابوون، دوودوو و سێسێ کۆبووبوونەوە، قسەیاندەکرد. هێندێکیان دەگریان و هێندێکی دیکەیان جنێویاندەدا، هێندێکی دیکەشیان، خەریکی تالانی فرۆشگە و بارەگەکانی شۆڕش بوون. بارودۆخێکی زۆر ناخۆشبوو، (پێنجوێن) خۆڵی مردووی بەسەردا کرابوو!

لەپڕ تووشی (عەبدوڵلائاغا) بووم، گوتم: چی دەکەن؟ گوتی: وەک ئەو خەڵکە، بەرەو (ئێران) یا (عێراق) دەڕۆین. گوتی: ئەی ئێوە؟ گوتم: ئێمە کێین؟ گوتی: برادەرانی (کاژیک). گوتم: ئاگام لێیان نییە. ئەوەش تفەنگەکەتان. بەپێکەنینێکی پڕ تەوسەوە گوتی: با پێتبێ، ئەوەک پێویست پێی بێ!

ئیدی دوای ئەوەش، تووشی (عەدنان عەبدوڵلا)ی هاوڕێی نزیکی (ئازاد) بووم، ئەندامی لیژنەی ناوچەی شەهید (عومەر) بوو. گوتی: ئێمە بڕیاری مانەوەمان داوە و بەرگری دەکەین، بە ناوی لیژنەی شەهید (عومەر)ەوە، هەموو دیوارەکانی (پێنجوێن)مان نووسیوە. داوامان لە خەڵک کردووە، ڕاپەڕن. ئەی تۆ دەڵێی چی؟! گوتم: کارێکی زۆر باشتان کردووە و دەمەوێ، لە پێشدا چاوم بە (ئازاد) بکەوێ. گوتی: لە (مەریوان)ە. گوتم: هەر ئێستە دەچم بۆ (مەریوان)، بزانم، ئەوان نیازی چییان هەیە و چییان بڕیارداوە! چوومەوە ماڵەوە، (برایم، سەروەت، کەریم ڕۆژ و ئەنوەری عەلی نەجار) دانیشتبوون. گوتیان: ئێمە بڕیارمانداوە، بڕۆینەوە، تۆ دەڵێی چی و چی دەکەی؟ گوتم: من دەبێ، تا (مەریوان) بچم، پاشان دێمەوە و بڕیاردەدەم. گوتیان: باشە، ئێمە چاوەڕێت دەکەین. تفەنگ و شتەکانم دانا، سوواربووم و چووم بۆ (مەریوان).

## دوابڕیاری سەرکردایەتی کاتیی

هەر خەڵکبوو بەپێ، بە سواری ترومبێل و بە ولاخ بەڕێوەبوون. هێندە جەنجاڵبوو، ڕێ بەر ڕێبوار بەرنەدەکەوت. هێندێ بەرەو (ئێران) دەڕۆیشتن، هێندێکی دیکەش بەپێچەوانەوە، بەرەو (عێراق) دەگەڕانەوە. خەڵکەکە هەموویان حەپەسابوون، واقیانوڕمابوو، ڕەنگیان تێکچووبوو، نەیاندەزانی، چی بکەن و چ چارەنووسێکی ڕەش چاوەڕێیاندەکا. ڕووناکی لە ڕووخساریاندا نەدەبینرا، ڕوویەکی خۆشم لە کەس نەبینی، جگە لە دزەکان، سەرکردایەتی (پارتی) و (پاراستن)، هەموو خەڵکەکە سەریان لێ شێوابوو!

گەیشتمە (مەریوان)، بەپەلە خۆم کرد بە ماڵی (ئازاد)دا. ئەوانیش وەک هەموو ڕەشەخەڵکەکەی دیکە، ماڵیان کۆکردبووەوە و خۆیان ئامادەکردبوو، بەرەو (سولەیمانی) بگەڕێنەوە. (ئازاد) هێزی نەبوو، قسەبکا، هەر هێندەی گوت: هەموو شتێ تەواوبوو. گوتم: چۆن؟ گوتی: زۆرمان بیر لێ کردووەتەوە، هیچ شتێ ناکرێ، هەر کەسێ بجوڵێتەوە، (پاراستن) و بنەماڵەی (بارزانی)، تەفروتونایدەکەن. لەبەرئەوە بڕیارماننداوە، گەر لە پاشەڕۆژدا شتێ بکرێ، ئەوا لەنێوشارەوە دەسپێدەکەینەوە. وابڕیارە، (شێرکۆ) بەپەلە بچێ بۆ سەرەوە، بەڵکوو لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ئەفسەرەدا، شتێ بکەن. زۆری نەبرد، پیکاپ هاتە بەردەرگە، شتەکانیان بارکرد، ئەوانیش بەرەو (پێنجوێن) سواربوون و ڕۆیشتن.
پاشان منیش بەرەو نێوبازارەکە ڕۆیشتم، لەسەر جادەکە، تووشی (شێرکۆ) بووم. گوتی: نیازی چیت هەیە؟ گوتم: من بۆ لای ئێوە هاتووم، بزانم، چیتان بڕیارداوە. بەڵام (ئازاد) هەموو بڕیارەکانی ئێوەی پێ گوتم. تکام لێ کرد و گوتم: بەخێرایی خۆت ماندوومەکە و بە هەر شێوەیە بێ، بچۆ بۆ (سووریا)، لە ئەوێ (جواد مولا) بدۆزەرەوە و داوای یارمەتی لێ بکە، بەڵکوو دەرتکا بۆ (ئەورووپا). ماوەیە لە ئەوێ چاوەڕێبکە، تا گۆڕانکارییەکی نوێ ڕوودەدا و بارودۆخەکە دەگۆڕێ. ئیدی ماڵاوایکرد و ڕۆی، هیچی دیکەی نەگوت.

## دواساتەکانی خۆرهەڵاتی کوردستان

ئەو شەوە لە ماڵی دوکتۆر (لەتیف)ی خزمم مامەوە. کۆمەڵێ برادەری وەک ڕەوانشاد (حەمەی عەبەپشی، نەژادی نووری خەفاف ...)ی لێبوو، منیشی زیادکرد. خواردنەوەیەکی زۆریان کڕیبوو، مەزەیان ئامادەکردبوو، تا درەنگانی دانیشتین، قسەماندەکرد و دەمانخواردەوە. بۆ نەگبەتی، ئەو هەموو کونیاکە خورایەوە، کەس سەرخۆش نەبوو، خەویشمان لێ نەکەوت!
ئیدی بۆ ڕۆژی دوایی، کەمێ بەنێو شارۆچکە جوانە دڵگیرەکەی (مەریوان)دا سووڕامەوە، هەموو ئەو یادگارە شیرینانەی، لە ماوەی ئەو چەن جارەی لە ئەوێ بووم، بەسەرمکردنەوە و بۆ دواجار، ماڵاوایم لە شەقام و بازارە ڕازاوەکەی کرد. لەپڕ تووشی (سەلاح)ی برام بووم. تازە لە (کامیران)ەوە هاتبوو، ئەویشم لەگەڵ خۆم برد و ئێوارە بۆ (پێنجوێن) گەڕاینەوە.

## دواڕۆژەکانی پێنجوێن

دەمەوئێوارەبوو، لە سەر سنوور سواری پیکابی بووین. کەمێ ڕۆیشتین، تووشی (خاڵەحاجی) بووین، بەتەنیابوو. بەرەو مەرزەکە دەڕۆی، چاوی بە ئێمە کەوت، ڕایکرد. کۆمەڵێکیش هوهایان لێ کێشا. ئەو وای دەزانی، کورد هێندە پیاوی مەرد، کەلەڕەق و گرنگی تێدا هەیە، سەرسنوورەکان لە بنەماڵەی (بارزانی)، سەرکردایەتی (پارتی) و لێپرسراوانی دەزگەی (پاراستن) دەگرن و نایەڵن، دەرچن. ئەو هەموو پولوپارە و زێڕە بدزن، بەرەو (ئێران) و (ئەورووپا) ڕاکەن، بەباشترین شێوەش پێی بژین. نەیزانی، کەسێ نییە، دەسیان بۆ بەرێ. ئەوەش دواجاربوو، لە ژیانمدا بیبینم!

کاتێ گەیشتینەوە (پێنجوێن)، تەواو تاریکیکردبوو. چوومەوە ماڵەوە، دەرگەداخرابوو، نامەیەکیان بەدەسکی دەرگەکەوە هەڵواسیبوو، بۆیان نووسیبووم: ئێمە ڕۆشتینەوە بۆ (سولەیمانی)، تفەنگەکەمان لە دووکانی (مەجیدی خەلیفە) بۆ داناوی. منیش هەر بە ئەو شەوە، هەموو پەرتووک و شتەکانم کۆکردەوە و بۆ ماڵی ڕەوانشاد (عەلی پورە ڕەحمە)ی خزمم گواستەوە. هەرچی نوێن و کەرەسەیەکیشیان بەجێهێشتبوو، هەموویانم بۆ ئەوان بەجێهێشت.

ئەو شەوە لای ئەوان نووستین. بەیانی زوو دەرپەڕین و بەنێوشارۆچکەکەدا دەگەڕاین. ئەو جەنجالییەی چەن ڕۆژێ لەمەوبەری تەمابوو، بە ئاشکرا پێوەی دیاربوو، وردەوردە خەریکبوو، چۆڵدەبوو، تەنیا خەلکەکەی خۆی تێدا دەمایەوە.

ئەو چەن ڕۆژە، گوند و شارۆچکەکانی باشووری (کوردستان)، پڕبووبوون لە خەلکی (ئێران)، پارەیەکی زۆریان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، چەک و تەقەمەنییان دەکڕی. هەڵبەتە دەزگەی (ساواک)، ئەو چەکانەی دەکڕی، بۆئەوەی ڕۆلەکانی کورد لە هەردوو دیوەکەی (کوردستان)، چەکی بەدەسەوە نەمێنێ!

باشبوو، هێندێ برادەری وەک (ئازاد عەبدوڵلا، ئەحمەدی عارفی فیتک، ئەنوەری مەلا حوسێن، ئەنوەر هەمزە و سەلام عەبدولڕەحمان) و گەلێکی دیکەشمان بینی، هێشتا نەگەڕابوونەوە، هەموومان پێکەوە بڕیارماندا، بەیانی دەرچین.

## دوابینینی فەتاح ئاغا

بیستم، هێشتا کاک (فەتاح) هەر لە (پێنجوێن) ماوە و لە بارەگەی هێز دانیشتووە، قسە بۆ خەلک دەکا. منیش بە (ئازاد عەبدوڵلا)م گوت: دەچم، سەرێ لە کاک (فەتاح) دەدەم، ماڵاوایی لێ دەکەم و زوو دەگەڕێمەوە. ئەویش گوتی: مەچۆ، چونکە (شەهابی شێخ نوری) و چەن برادەرێکی دیکە هاتن بۆ ئێرە، هەموومان پێکەوە چووین و سەرمان لە

بارەگەی هێز دا. کاک (شەهاب) زۆر لەگەڵ (فەتاح ئاغا) خەریکبوو، بە شانوبازوویدا هەڵیدا و پێی گوت: تۆ لەگەڵ ئێمە بمێنەرەوە، ئێمە وەک برایەکی گەورە سەیرتدەکەین. ئێمە و برادەرانی (کاژیک)، ڕێکخستنی شۆڕشەکە، لە ئەستۆی خۆمان دەگرین و تۆش وەک فەرماندەیەکی هێزی پێشمەرگە، کاروباری هێلی سەربازی بەڕێوەبەرە. (فەتاح ئاغا)ش گوتی: من ناتوانم، لە بڕیاری (بارزانی) لابدەم. پێڵاوەکانی ئەو لە کوێ بێ، سەری منیش لە ئەوێ دەبێ!

پاشان (ئازاد) گوتی: (فەتاح ئاغا) تەماشایەکی خەڵکەکەی کرد و لەنێو ئەو هەموو پێشمەرگەیەدا، ڕووی لە برادەرەکانت کرد و گوتی: ئەوە کوا (شێخ حوسێن)؟! بەدەم نەخشەی (کوردستان)ی گەورەی بۆ دەکێشام، بەلام هەواڵم پێگەیشتووە، (36) تفەنگی فراندووە و خۆی ڕادەسی (بەعس) کردووەتەوە. کەچی یەکی لە برادەرەکانت، داکۆکییان لێ نەکردی! منیش گوتم: دەزانم، داخی چی لە دڵ دایە، بۆیە ئەو قسانەی کردووە. ئیدی نەچووم.

بەڕاستی، من سەیرم لە ئەو قسانە نەدەهات، چونکە لە ئەو ڕۆژەوە، من لە هێزی خەبات پێشمەرگە بووم، تا شۆڕش دواهەناسەی مەرگی خۆی دەدا، خۆشم نەمدەزانی، من چیم؟ بە هیچ شێوەیە کاریکیان پێ نەسپاردم. چونکە دەترسان و زۆر باشیش دەیانزانی، من لەنێو هێزی پێشمەرگەدا، هێلی ڕێکخستنەکانی (کاژیک) دروستدەکەم. هەڵبەتە ئەو قسانەش، دوا دژایەتی و بەربەرەکانی من بوو، تا ناوم بزڕێنن. بەڵام کێ باوەڕی بە ئەو قسە بێ بناغانە دەکرد. چونکە من لەگەڵ ئەو برادەرانەدا، پێکەوە بەسواری تراکتۆر گەڕاینەوە!

زۆر بەداخەوە، (فەتاح ئاغا) تا بڵێی، کوردێکی نیشتمانپەروەر، خاوێن، ئازا و دڵسۆز بوو، بەلام وەک هەموو کادیرە کۆنەکانی سەرکردایەتی (کاژیک)، زۆر خۆی بە بنەماڵەی (بارزانی)دا هەڵواسیبوو. لە ئەو ڕۆژەڕەشەشدا دەبووایە، وەک کادیرێکی نەتەوەیی ڕاپەڕیایە و لەسەر شۆڕشبەرپاکردن بەردەوامبووایە. ئەز دڵنیام، بە هەزاران گەنجی وەک ئێمە، نە پەنایان بۆ (ئێران) دەبرد، نە خۆشیان ڕادەسی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) دەکردەوە. بەلام لە ئەو ڕۆژە بێ هیواییەدا، ئەو هەر خۆی ساغ نەکردەوە!

ئاخر ئێستەش تێ نەگەیشتم، ئەو سەرکردە کۆنانەی (کاژیک)، چاوەڕێی چییان دەکرد؟ ئایا لە ڕۆژی دروستبوونی ئەو پارتەوە، لە هەموو مێژووی شۆڕشەکەدا، هەل لە ئەوە لەبار و گونجاوتر، بۆ (کاژیک) هەڵکەوتبوو؟!

## خۆبەدەستەوەدان

ڕۆژی (28. 3. 1975)، بەیانی زوو نانمانخوارد و سواری تراکتور بووین. بەلای بارەگەی هێزدا تێپەڕین، تەماشایەکی ئەو ناوەم کرد، لە دڵی خۆمدا مالاواییم، لە ڕۆژانی پێشمەرگەیی پڕ لە شانازی و سەربەرزی خۆم کرد.

سەیرمکرد، (فەتاح ئاغا) لەسەر دیواری حەوشەکە چوارمشقی دانیشتووە، خەڵکێکی زۆری لە خۆی کۆکردووەتەوە، قسەیان بۆ دەکا. تا لەچاو ونبوو، هەر ئاوڕم لێ دەدایەوە و سەیرم دەکرد. ئیدی وردەوردە، ئێمە بەتەواوی دوورکەوتینەوە و لە چاو ونبووین. کاک (فەتاح) و شۆڕش و (پێنجوێن)یشمان، لە یەک کاتدا بەجێهێشت!

گەیشتینە (ناوپارێز)، کەسی تێدا نەمابوو، کوگەکانیشیان تالانکردبوو. لە ئەوێ ڕەتبووین و لە (دۆڵەسوور)، لە چاخانەکە دابەزین. چونکە هەر تا ئەوێ، تراکتۆرەکان خەڵکیان دەگەیاند. لەبەرئەو مینانەی، چەن ڕۆژێ لەمەوبەر، پێشمەرگەکانی خۆمان چاندبوویان، نەدەڕۆیشتن. لە ئەوێشەوە بەپێ ڕۆیشتین. پردەکەی (کەولوس) ڕوخێنرا بوو، لە ئاوەکە پەڕینەوە و تا (شانەدەری)، بەجادەقیرەکەدا بەپێ کوتامان.

لە (شانەدەری)ش جیپێکمان گرت. لە (سەیید سادق) بازگەی سوپای (عێراق) دەسیان لێ ڕاگرتین و ڕایانوەستانین. یەکەیەکە خۆمان بەدەستەوەدا و ناویان نووسین. گوتیان: دوای دوو ڕۆژی دیکە دەبێ، سەردانی فەرمانگەی (ئەمن) بەشی نوێ بکەن، تا نووسراوتان بۆ بکەن، هەر کەسێ بۆ سەر کار و خوێندنی خۆی بگەڕێتەوە. ئیدی تا (سولەیمانی) نەوەستاین.

## سولەیمانیی

داوی ساڵێک و (18) ڕۆژ پێشمەرگایەتی، دوای ململانێیەکی سەختی نێوخۆیی هەردوو باڵەکەی (کاژیک)، دوای ئاقیبکردن و هەڕەشەی دەزگەی (پاراستن)، بە دەس و گیرفانی بەتاڵ، بە دڵێکی بریندار و شکاو، بە دووچاوی پڕ فرمێسکەوە، بە هەناسەی سارد و دەروونی کەیلەوە، بە ورەیەکی نزم و ڕوخاوەوە، بۆ سەر لانە و هەواری خاڵی شار گەڕاینەوە!

کاتێ خۆمان بە ژووردا کرد، هەموو شتێ بەتەواوی گۆڕابوو. منداڵەکان کەمێ گەورە بووبوون. (شەوتم)ی خوشکم شووی بە مامۆستا (عارف)ی ئامۆزای دایکم کردبوو. باوکم لەسەر زمانی خۆی، لە کونی گرتووخانەی (ئەمن) توندکرابوو. بەڕاستی هێندە بێ هێز و ورە بووم، نەمدەزانی، چی بکەم. هەموو ڕووداوەکانم، وەک فیلمێکی سینەما بیردەکەوتەوە. وڕ و کاس بووبووم. بڕوام نەدەکرد، شۆڕشی خاوەنی (200) هەزار

جەنگاوەر، ئەو هەموو چەکە سووک و قورسە بێ، ئەو هەموو پارە زۆرەی هەبێ، لە چاوترووکاندنێکدا، بە بڕیاری تاکە کەسێکی وەک (بارزانی)، وەک چیایەکی بەفرین هەرەسبێنێ و بڕوخێ! ئەوەش ئەنجامی سەرکردایەتی تاک و ڕۆڵی بنەماڵە بوو، لە هەموو شۆڕشەکانی کورددا، هەر هەمان چارەنووسی هەبووە. ئاخر کەی ڕۆڵەکانی کورد، کەمێ بە خۆیاندا دەچنەوە، پەندێ لە هەڵەوپەڵەکان، تێکشکان و خۆبەدەستەوەدان، ڕووداوە مێژوویی و کارەساتە نەتەوەییەکان وەردەگرن؟!!

دوای دوو ڕۆژ، سەردانی فەرمانگەی (ئەمن)م کرد. بەڵام ئەو سەرجادە و کۆڵانانەی گەڕەکی (شۆڕش)، هێندە جەنجاڵبوو، ڕێ بەر ڕێبوار نەدەکەوت. هەر خەڵکبوو، دەگەڕانەوە و خۆیان بەدەستەوەدەدا. خەڵکەکە هێندە زۆربوو، کاربەدەستە سیخوورەکان فریا نەدەکەوتن، کارەکان ڕاپەڕێنن. لەبەرئەوە خوێندکارە عەرەبە بەعسییەکانی زانکۆیان هێنابوو، یارمەتییانبدەن.

هێندەم زانی، یەکێ لە دواوە قۆڵیگرتم، ئاوڕمدایەوە، (کەمال عەنبەر) بوو. کوڕێکی عەرەبی بەعسی خەڵکی (بەغدا) بوو، لە یەکەمین ساڵی خوێندنی زانکۆوە پێکەوە بووین. کوڕێکی زۆر قسەخۆش و باش بوو. یەکدیمان ماچکرد و بە کوردی گوتی: قەیناکە کاکە، خوا کەریمە! ئیدی بەپەلە ئیشەکەی بۆ جێبەجێکردم و گوتی: تەواو، بڕۆ، لە زانکۆ دەتبینمەوە.

**<u>بەڵگەنامەی ژمارە (5) ل (425)</u>**

دەمەوئێوارەبوو، خوالێخۆشبوو خاتوو (ئاسکە)ی دایکی لیوا (مەنسوور) هات بۆ لام و هەواڵی کوڕە تاقانەکەی لێ پرسیم. منیش نەمدەزانی، ئەو هاوبیرانەی نێوچەی سەرکردایەتی شۆڕش لە کوێن و چییان بەسەرهاتووە؟! بەڵام هێندەم ئاگا لێ بوو، دوای ئەوەی ئێمە گەڕاینەوە، هیچ جۆرە هەواڵدان و ئاگاییبوونێ نەبوو. خاتوو (ئاسکە) گوتی: ئەچم بە دوای (مەنسوور)دا و لە هەر شوێنێ بێ، دەیدۆزمەوە و لەگەڵ خۆم دەیهێنمەوە.

ئەو کاتە لە دەرەوە، بۆئەوەی کەس نەگەڕێتەوە، تۆکەرە بەکرێگیراوەکانی (پاراستن)، لەتێوکوردە پەنابەرەکانی (ئێران)دا، پڕوپاگەندەیان بڵاودەکردەوە، گوایە هەر لە یەکەمین بازگەی میرییەوە، دەرزی خراپ لە گەڕاوەکان دەدەن، لە پیاوەتیاندەخەن، دوای ماوەیەکیش بەلادادێن و دەمرن. ئەمەشیان بۆیە بڵاوکردبووەوە، تا کەس نەگەڕێتەوە، ئەو خەڵکە بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەکاربێنن و لای کاربەدەستانی دەوڵەتی (ئێران)، بازرگانییان پێوەبکەن.

خاتوو (ئاسکە) دەترسا، (مەنسوور) نەدۆزێتەوە، یا بە قسەی نەکا و لەگەڵی نەگەڕێتەوە. سووریش دەیزانی، من و کوڕەکەی چەن هاوڕێیەکی نزیکین و یەکدیمان خۆشدەوێ، لەبەرئەوە داوای لێ کردم، نامەیەکی بۆ بنووسم و دڵنیایکەم، کە هیچ شتێ لە ئارادا نییە، بەڵکوو بگەڕێتەوە. منیش نامەیەکم بۆ نووسی و بۆم ڕوونکردەوە، بە پڕوپاگەندەی کەس بڕوانەکا، تا ئێستە بارودۆخەکە باشە و هیچ ڕووی نەداوە. گەر بگەڕێیتەوە و لێرە بتوانین، ڕاژەی گەلەکەمان بکەین، گەلێ لە ئەوە باشترە، لەژێر چادرەکانی (ئێران)دا بژین. بەڵکوو هەولێشبدەی، هەردوو هاوبیر (حەمەشەوقی) و (شوان)یش، لەگەڵ خۆت بێنیتەوە.

کەچی دوای ئەوەی (مەنسوور)، لەگەڵ دایکی گەڕایەوە، بۆی گێڕامەوە، کە لەگەڵ (شێرکۆی هەژار)، لە هۆردووگەیەکی نزیک (کرماشان) پێکەوەبوون. کاتێ نامەکەی منی پێگەیشتووە، ئەو پیاوە تێکۆشەرە بێویژدانە گوتوویەتی: خۆی ڕۆیشتووەتەوە، کەچی دەڵێی وێژگەکەی (بەغدا)یە، پڕوپاگەندە بۆ (بەعس) دەکا! ئەوە لە کاتێکدا، زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی (پارتی، قیادە مەرکەزی، کۆمەڵەی مارکسی و هەردوو باڵەکەی کاژێک)، هەر زوو گەڕابوونەوە، کەس لە گوڵ کاڵتریشی پێ نەگوتبوون!

هەڵبەتە ئەو جۆرە مرۆڤە دەروون نەخۆشانە، زۆر دڵڕەش و داخ لە دڵن، بوختان بۆ خەڵک دروستدەکەن و دەیانەوێ، تۆڵەی تێکشکان و پاشەلیپیسی خۆیان، لە کەسانی نیشتمانپەروەر بکەنەوە، وەک خۆیان دوای هەرەسەکە، ڕاپەڕینێکی نوێیان بەرپاکردبێ و لە بن چادرەکانی (ئێران)، لەسەر خواتی (شا) و (شابانوو) نەلەوەڕابن! ئاخر هەر لەبەر ئەو کردار و ڕەفتارانەی بوو، لە هیچ شوێنێ جێی نەدەبووەوە! خۆ گەر خەڵکی خۆرهەڵاتی (کوردستان)یش نەبووایە، من دڵنیام، هەر زوو دەگەڕایەوە!

ئەز لە ئەو بڕوایەدام، گەر دەسەلاتدارانی (بەعس)ی (عیراق)، بە ئەو نووسراوەی سەرکردایەتی (پارتی) ڕازیبوونایە، فشەماقێکیان بە کورد بدایە، یەک کەس لە (ئێران) نەدەمایەوە و هەموویان دەگەڕانەوە. یا گەر سەرکردایەتی (بەعس)، لە (بەرزانی) و بنەماڵەکەی خۆشبوونایە، ئەوانیان لە ئەو لێبووردنە گشتییە دەرنەکردایە، وەک چەن جارێکی دیکە، لە مێژووی خوێناوی خۆیاندا گەڕابوونەوە و خۆیان بەدەسەوەدابوو، ئەوا ئەوانیش وەک سەرکردەکانی دیکە و ئەو هەموو خەڵکە دەگەڕانەوە!

* * *

## زانکۆی سولەیمانی

(1)ی مانگی (4)، کە لە هەموو جیهاندا، بە ڕۆژی درۆکردن بەناوبانگە، لەگەڵ برادەرەکانمدا چووینەوە بۆ زانکۆ. سەردانی کۆلێژەکەمان کرد و گوتیان: دەتوانن، هەر لە ئێستەوە دەس بە خوێندن بکەنەوە. ڕۆژێکی بەهاری گەرم و خۆش بوو. لەبەرچاوم زانکۆ زۆر گۆڕا بوو، جمەیدەهات. ڕێکخراوی (بەعس)ی زانکۆ و قوتابیان، لە هەموو قوژبنێکی زانکۆ، بلندگۆی گەورەیان دانابوو، بەبۆنەی تێکشکاندنی (یاخیبوونە کۆنەپەستە بەکرێگیراوەکەی مەلا!)وە، سروودی (بەعس)یان لێدەدا و بە ئەو دەنگە بەرزەی (داود قەیسی)، ئەو ناوەیان پڕکردبوو. کیژە جوانە زرد و سوورەکان و لاوە فیتوفوزەکانیش، بەجلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ، خۆیان ڕازاندبووەوە، پۆلپۆل پێکەوە دەگەڕان و قسەیاندەکرد، پێدەکەنین، لە ئەوەدەچوو، دڵیان زۆر خۆشبێ، هیچ ڕووی نەدابێ و مێش میوانیان نەبێ!

بەڵام هەر ساتێکی بۆ من، مەرگەساتێ بوو، بە تایبەتی کاتێ، هێندێ کوردزمانم بینی، لە کۆمیتەی (ی. ق. ک. ع.)دا کاریاندەکرد، هێندەی دیکە، برینەکانم کولانەوە و دڵم گوشرا!

بەڵام تازە هەموو شت کۆتاییهاتبوو، کورد واتەنی، لە پاش باران کەپەنەک!

(بارزانی) تەرمی شۆڕشی بە زیندوویی ناشتبوو، ئێمەش هەموو لە گۆڕستان گەڕابووینەوە، هەرچەندە ڕۆژێکی ڕەش و سەخت تێکەوتبووین، لەگەڵ ئەوەشدا هەر گەشبینبووم، کە کاروانی ژیان بەردەوامە، بەرەوپێشەوەدەڕوا و بەکەس ڕاناوەستێ، دەبێ، هێندەش ئاور لە ڕابووردوو بدەینەوە، قازانجی ئایندەی کوردی تێدابێ!

بەڵێ، جارێکی دیکەش لە پۆل و لەسەر کورسی خوێندن دانیشتمەوە. مانگی (4) لە کۆرسی دووەمی پۆلی سێی بەشەکەمان وەرگیرامەوە، لە کوێدا بەجێمهێشتبوو، هەر لە ئەوێدا دەسمپێکردەوە. لە کوێدا لە زانست پچڕابووم، هەر لە ئەوێدا گرێمدایەوە. بەڵام هاوڕێکانی پۆلەکەم، هەموویان نوێبوون و کەسیانم نەدەناسی. چونکە هاوڕێکانی خولی خۆم و سالی پێشووم، لە پۆلی (4) بوون، سالی پێش من کەوتبوون و منیش سالێکم لەکیسچوو، ئاخر ئەوان شاریان چۆڵ نەکردبوو، لە شاخ نەبوون!

## بەغدا

کورسی دووەمی پۆلی سێیم تەواوکرد، لە هەموو وانەکاندا دەرچووم و بە پلەیەکی زۆر باش بڕیم. هەموو ساڵێ دوای پۆلی سێی کۆلێژی کشتوکاڵ، لە پشووی سەری ساڵدا، خولی هاوینە دەسپێدەکا و ماوەی (40) ڕۆژ دەخایەنێ. ڕۆژی (1. 7. 1975)، لەگەڵ خوێندکارەکاندا بۆ مەشقکردن لە کێڵگەکانی (ئەبوغرێب)، بەرەو (بەغدا) کشاین.

لە ئەوێ لە بەشی نێوخۆیی خوێندکاران، لە (باب ئەلموعەزەم) دایاننایین. شوێنەکە زۆر لە بازاڕەوە نزیکبوو. من و (ئەحمەد عارف فێتک، کاوسی عەزیز بەگ، ئەحمەد حەمەئەمین، عەلی مەحموود غەفوور و کامیل مستەفا)، لە ژوورێکی گەورەدا بووین. هەمیشەش

پێکەوە دەردەچووین و دەگەڕاین. لە ئەو ماوەیەدا، سەرم لە (سولەیمانی) نەدایەوە. لە هەموو گرفت و ناخۆشییەکەوە دووربووم. کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد. بەڵام بەڕۆژ گەرمای (ئەبوغرێب) و بەشەویش مێشوولەکەی بەشی نێوخۆیی، هەراسانیانکردبووین!



کێڵگەکانی (ئەبوغرێب)، دووەمین ڕۆژی خولی هاوینە (3. 7. 1975)

جگە لە ئەوەی، (عەبدولستار) ناوێکی (موسڵاویی)مان لەگەڵبوو. هەموو ڕۆژێ دوای نانخواردنی نیوەڕۆ، لە دەرگەی دەدا و نەیدەهێشت، سەرخەوی بشکێنین و دەهات، لامان دادەنیشت و قسەی پڕوپووچی بۆ دەکردین. ناومان نابوو (عەبدولستار باوەشێن)، چونکە کاتی گەرماکە دەهات و بە قسەی قۆڕ باوەشێنیدەکردین. وا دیاربوو، بەعسییەکان دەیاننارد و دەیوست، رامانکێشێ. بەڵام کە زانی، هیچ کەڵکی نییە و ئاسنی سارد دەکوتێ، ئینجا شەڕی پێ دەفرۆشتین و نوکتەی لەسەر کورد دەگێڕایەوە.
ڕۆژێ نوکتەی کاکە (حەمە)ی بۆ گێڕاینەوە. گوایە لێیان پرسیوە، کوا گوێچکەت؟ ئەویش بە دەسی ڕاستی و لە پشت سەرییەوە، گوێی چەپی پیشانداون. کەچی بە تاقی تەنیا، هەر خۆی پێکەنی و ئێمەش، هەموو مۆڕەمان لێ دەکرد.
منیش گوتم: با من نوکتەیەکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە. گوتی: فەرموو. گوتم: تۆ نزیکەی (4) ساڵ دەبێ، لە (کوردستان) دەژیت، سوور دەزانی، قەحبەخانەی لێ نییە. گەنجەکانمان کاتی حەز لە گان دەکەن، بۆئەوەی ئارەزووی خۆیان دامرکێننەوە، بەرەو (بەغدا) و شارەکانی دیکەی خوارووی (عێراق) دەڕۆن. ڕۆژێ کوڕێکی گەنجی بەهێزی کورد، لە (بەغدا) دەبێ، ژنێکی سۆزانی دەدۆزێتەوە، هێندێ پارەی دەداتێ و سواریدەبێ. لە ئەو کاتەدا، کوڕە کوردەکە بەسەرییەوە دەبێ، ژنە عەرەبەکە خۆی بۆ ناگیرێ و چەن تڕێ لێدەدا. کوڕەکەش دەڵێ: ئەوە چییە؟ ژنە سۆزانییەکەش دەڵێ: هیچ نییە، بەڵام لە خۆشی

کوزم، قوتم چەقەلیدەدا! ئەم جارە، ئیمە هەموومان پیکەنین، تەنیا ئەو کەرە بەکرێگیراوە نەبێ، ڕووی گرژکرد و ملیشکاند. ئیدی بیرای بێ، سەری بە ژوورەکەی ئیمەدا نەکردەوە و ڕزگارمانبوو.

هەر لە ئەو ماوەیەی لە (بەغدا) بووم، سەرم لە ماڵی پورە (نەسرین)م دەدا. دوای هەرەسەکە، (شێخ عوسمان باراوی) مێردی پورە (مەلیح)م، بۆ (بەغدا) دوورخرابووەوە و لە ماڵی پورم لە (ئەعزەمیە) دەژیا. منیش هەموو ڕۆژانی پێنجشەممە و هەینییەک، سەرملێدەدان و شەویش هەر لای ئەوان دەمامەوە. من و جووتە ئاوەڵزاوای باراوی (شێخ عوسمان) و (شێخ موحەممەد)، پێکەوە دادەنیشتین، تا درەنگانی دەمانخواردەوە و قسەماندەکرد.

ڕۆژێ لە (بەغدا)، بەرێککەوت دوکتۆر (حەسەن بارزانی)م بینی، لەگەڵ ژنە ڕووسەکەیدا پیاسەیاندەکرد. کاتی خۆی لە زانکۆ مامۆستابوو، لێپرسراوێکی گەورەی (پارتی)ش بوو، لە بۆردوومانەکەی شارۆچکەی (قەڵادزێ)ش، هەر پێکەوە بووین. زۆری پێخۆشبوو، یەکدیمان بینییەوە. گوتی: لە پۆست کاردەکەم. تیلیفۆنەکەی ماڵەوەی دامێ، بڕیاربوو، سەری لێ بدەم، بەڵام بەداخەوە نەمتوانی. دوایی بیستم، لە (بەغدا) کوشتوویانە!



جگە لە (عەبدولستار باوەشین)، یەکەمین کەس لای ڕاستەوە بە پێوەوەستاوە، هەموو ئەو برادەرە خۆشەویستانەی دیکە، هەمیشە پێکەوەبووین. (حوسێن موحەممەد، کاوس عەزیز، بەختیار عەبدوڵڵا، ئەحمەد عارف، ئەحمەد حەمەئەمین، ئەنوەری حاجی ئەورەحمان، عەلی مەحموود)، هێندێ خوێندکاری دیکەشی تێدا هەیە. زانکۆی سولەیمانی، ڕۆژی (27. 9. 1975) گیراوە.

## دوورخستنەوە

دوای ئەوەی هەرەسەکە تەواوبوو، لە مانگی (5)دا، هەموو سنوورەکانی نێوان (ئێران) و باشووری (کوردستان) داخران. ئینجا سەرکردایەتی (بەعس) زۆر بێویژدانانە، بە ئارەزووی دڵی خۆیان، زۆربەی زۆری فەرمانبەرە نیشتمانپەروەرەکانی کوردیان، بۆ خواروو و نیوەڕاستی (عێراق) گواستەوە و لە ئەوێ دایانمەزراندن. جگە لە ئەمەش، هەر لە ئەو مانگەشدا بوو، کۆمەڵی دووکانداری خاوەن خێزانی نێوبازاڕی خەڵکی شاری (سولەیمانی) ناسراویان، بۆ نیوەڕاستی (عێراق) دوورخستەوە، هێندێ لە ئەو کوردانە (برایمی حەمەخورشە، کەمالی محەی دگل، عەلی ماردین، عەبدوڵڵا سەعید و مامە بەکرم – بەکری حاجی شێخ عەزیزی باراوی) بوون.
ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی زۆر ناخۆشبوو، فەرمانگەی (ئەمن)ی (سولەیمانی)، لۆرییەکی گەورەیان هێنا، منداڵەکانی مامە (بەکر)م و هێندێ کەلوپەلیان تێخست، هەموو لۆرییەکان لە جادەی سەهۆڵەکە ڕیزبوون، خەڵکێکی زۆر، بۆ بەڕێکردنیان هاتبوون و دواییش، ڕەوانەی (ناسریە)یان کردن.

## کاژێک دوای هەرەس

لەبەرئەوەی کاتی هەرەس، ڕێکخراوە رامیارییە کوردی و کوردستانییەکان، هیچ جۆرە هەڵویستێکی کوردانە و مەردانەیان نەبوو، هەر لەگەڵ بڵاوە بە شۆڕشەکە کرا، هەموو ڕێکخراوە رامیارییەکانی کوردستانیش هەڵوەشانەوە و بەڵگەی بوونی خۆیان لەدەسدا.
(کاژێک) هەر پێش هەرەسیش دەمێبوو، وەک لاشەیەکی بێگیانی لێهاتبوو. گەر تا ناوەڕاستی ساڵی (1973)ش، وەک یەک تەنی یەکگرتووی لاوازی نهێنی کاریدەکرد، ئەوا لە ئەوە بە دواوە، تا ڕۆژی هەرەسەکە، بەتەواوی کەرتکەرت و لاوازبووبوو. دوای هەرەسیش، وەک هەموو ڕێکخراوەکانی دیکە، بەیەکجاری نووزەی لێ بڕا. بەڵام هەموو ڕێکخراوەکان، کادیرەکانی خۆیان مابوو. تەنیا ئەوەبوو، وەک جاران لە چوارچێوەی ڕێکخستنێکی یەکگرتووی دیاریکراودا، کۆنەبووبوونەوە و کاریان نەدەکرد.
(کاژێک)، لە ئەو تاقیکردنەوە گەورەیەی ناکۆکی نێوخۆ و هەرەسی شۆڕشی ساڵی (1975)، بەتەواوی لە پەلوپۆکەوت، ناوی تەنیا لەسەرزاران و لە لاپەڕەکانی مێژوودا مایەوە. دوای ئەوەی کادیرە نەتەوەییەکان گەڕانەوە، لەسەر زۆر شت ناکۆکبوون و گرفتی گەورەیان هەبوو. بۆیە لە ئەو کاتەدا، کادیرە کۆنەکانی (کاژێک)، بەسەر چەن دەستەیەکدا دابەشبووبوون:
یەکەم: هەموو ئەو کادیرە پێشکەوتووانەی، لەگەڵ هێڵی ڕاستکردنەوەکەدا نەبوون، دوای کڵاوی بابردووی سەرکردایەتی کۆنی (کاژێک) کەوتبوون. ئەو سەرکردایەتییەی دوای

هەرەسەکەش، نووزەیەکیان لێوە نەهات، تەنانەت بڵاوکراوەیەکیان دەرنەکرد و هێندێکیشیان خۆیان لە (تاران) قایمکرد. لە ئەوانەی گەڕاشبوونەوە: (عەبدوڵلائاگرین، کامیل ژیر، عومەر شەمەیی، فەرهاد عەبدولحەمید، مژدە تایەر، نوری حەمەعەلی، عەلی توفیق، غەفوور ژاژڵەیی و شەریف مەولوود) بوون، چەن دۆست و هاوبیرێکی دیکەشیان لەگەڵبوو. بەڵام ئەمانە، هیچ جۆرە چالاکییەکیان نەبوو، بەتەواوی لەیەکدی پچڕابوون، زۆربەشیان بڕوایان بە هیچ نەمابوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لە دەستەی دووەم دەسڵەمینەوە، کە بەناوی (کاژیک)ەوە کاربکەن و تووشی شتێکیان بکەن. یا لەسەر بڕیارە کۆنەکەی خۆیان مابن و تۆڵەیان لێ بکەنەوە.

دووەم: هەموو ئەو کادیرانەی، لەگەڵ بزووتنەوەی هێڵی راستکردنەوە و نوێکردنەوەی (کاژیک)دا بوون، دژی سەرکردایەتی کۆن کاریاندەکرد. وەک (ئازاد مستەفا، عەدنان عەبدوڵلا، قادر مستەفا، جەلالی حسەکەلوش، لیو مەنسوور حەفید) و هێندێ ئەندامی خواریشەوەیان لەگەڵبوو.

سێیەم: دەستەیەکی پچووکیش هەبوون، سەرەتا لەگەڵ نوێبوونەوەکەدا بوون، بەڵام کاتێ ئەو بڵاوکراوەیەیان دەرکرد و گرفت لە نێوانیاندا درووستبوو، لەگەڵ هیچ یەکێ لە ئەو دوو دەستەیەدا نەمان، بەڵکوو هەوڵی یەکگرتنەوەی هەموو هاوبیرانیان دەدا و پێوەندییان بە هەردوو دەستەکەشەوە هەبوو. وەک من، (وریا براخاس، سەروەت موحەممەد ئەمین، کەریم رۆژ، برایمی حەمەعەلی) و چەن ئەندامێکی دیکەش بوون.

## کادێرەکانی سەرکردایەتی کاتیی

سەرکردایەتی کاتی هەرێمی باشوور، لە (شێرکۆی هەژار، عوسمان رەشید، ئازاد مستەفا و برایمی حەمەعەلی) پێکهاتبوو. دوای هەرەسەکە، (شێرکۆ) نەگەڕایەوە و لە (هۆڵەند) نیشتەجێبوو. (عوسمان) هەر زوو وازیهێنا و وەک خۆشی دەیگوت، بوو بە کوردێکی کۆمۆنیست. (ئازاد) گەڕایەوە، بەڵام تا ئەو کاتە، هیچ چالاکییەکی نەبوو. (برایم) هەر لە (پێنجوێن)ەوە وەڕسبووبوو، لە هاوبیرەکانی خۆی بە گومانبوو، دەمی بوو، باسی هیچی نەدەکرد و هەر لە سەرەتاشەوە، لە جێی نەبووان بوو!

ئەندامانی کۆمیتەی سوپایی، جگە لە من، (ئازاد مستەفا، لیوا مەنسوور حەفید، ملازم کەریم سەلام) بوون، رەوانساد ملازم (حەمەشەوقی)ش پاڵێوراوبوو. ئێمە هەموومان گەڕاینەوە، بەڵام لەنێو خۆماندا ناکۆکبووین.

کاتێ (ئازاد) ورەی بەرزبووەوە، تەکانێکی بە خۆی دابوو و دەسی بە چالاکی کردبووەوە. سەرەتا پێوەندی بە (مەنسوور)ەوە کردبوو. ئەویش لە گوماندا دەژیا و نەشیدەتوانی،

دەسبەرداریبن و بێ خەباتی کوردایەتی دانیشن. تەنانەت تا ماوەیەکیش، (مەنسوور) نامەی بۆ (ئازاد) دەنووسی، بەڵام بە دەسی خۆی نەیدەنووسی، بەڵکوو نامەکانی بە دەسوخەتی یەکێ لە خوشکەکانی دەنووسی!
کاتێکیش (ئازاد)، پێوەندی بە (کەریم)ەوە کردەوە، زۆر بەشێوەیەکی ناشیرین وەڵامی دابووەوە و دەریکردبوو. پێی گوتبوو: ئێوە بڕیاربوو، وەک (پارتی) و بنەماڵەی (بارزانی)، ئەو خەڵکە بەرەڵانەکەن و ڕاپەڕن، کەچی دەسی ئێمەشتان بڕی!
هێندەی ئاگام لێبێ و (کەریم) خۆشی بۆی گێرامەوە، لە کاتی هەرەسەکەدا، لە (تەوێڵە) زۆربەی کادیرە سەربازییەکانی (کاژیک)یان کۆکردبووەوە، دەسیشیان بەسەر چەک و تەقەمەنییەکی زۆردا گرتبوو. چاوەڕوانی فرمانی سەرکردایەتی کاتی (کاژیک)یان دەکرد. وەڵامیان بۆ بنێرن و لەسەر شۆڕشبەرپاکردن بەردەوامبن. لەبەرئەوە تا درەنگانی مابوونەوە و نەگەڕابوونەوە. بەڵام پاشان زانیبوویان، ئەندامانی سەرکردایەتی کاتی، لە (سولەیمانی) تۆزدەکەن، ئیدی ئەوانیش لە ناچاریدا گەڕانەوە. بۆیە بە هیچ جۆرێ، بڕوای بە سەرکردایەتی (کاژیک) نەمابوو، دواتریش باوەڕی بە (پاسۆک)یش نەبوو. هەرچەند لە خوارووی (عێراق)یش دەهاتەوە، من دەمبینی و دڵخۆشیم دەدایەوە، بەڵام چونکە وەڕسبووبوو، خواخوایبوو، جوڵانەوەیەک دەسپێبکا، یەکسەر پێوەندییان پێوەبکا و خۆی لە ئەو سووکایەتیپێکردنە قوتارکا.
ڕەوانشاد (شەوکەتی حاجی موشیر) و (حامی حاجی غالی)، هەردووکیان دوو هاوبیری هێلی سەربازی خۆمان بوون، یەکەمیان ساڵی (**1991**) لە (لەندەن) و دووەمیشیان ساڵی (**1998**) لە (ئەمستەردام)، ئەم ڕاستییانەیان بۆ گێرامەوە و گوتیان: ئێوە، ئێمەتان بەجێهێشت!

## کەریم سەلام و کۆمەڵە

(کەریم) ڕۆژێ بە منی گوت: (کۆمەڵە) پێوەندی پێوە کردووم، داوایان لێ کردووم، لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ئەفسەرەدا بچینەدەرەوە. تۆ دەڵێی چی؟! ئەمە بۆ من پرسیارێکی زۆر قورسبوو. لێم پرسی: کێ پێوەندی پێوە کردووی؟ گوتی: (ئازادی موحەممەدی مەلاحەمە ئاغا).
ڕەوانشاد (ئازاد)، کوڕێکی زۆر باشبوو، تا بڵێی، هێمن و لەسەرخۆ، بێدەنگ و ڕێکوپێک بوو. لە ناوەندیی شۆڕش، هەرسێکمان پێکەوە لە پۆلێکدا بووین. زۆر کوردپەروەربوو، خۆشماندەویست و بڕوامان پێی هەبوو. بەڵام پێم گوت: ئەوان مارکسین، تۆ ئێستەش خۆت بە نەتەوەیی دەزانی، بڕواناکەم، لەگەڵیان هەڵکەی. گوتی: گرنگ نییە. کاتی خۆشی

(کاژیک) بووم، کەچی پێشمەرگەی شۆڕشی (**11**)ی سێپتێمبەر بووم. من هەر خۆم بە نەتەوەیی دەزانم، چونکە من پێشمەرگایەتی بۆ کورد دەکەم و لە ئەوە پتر ناتوانم، ئەو سەرشۆڕییەی (بەعس)ی داگیرکەر قەبووڵکەم. لەبەرئەوە، ماوەی مانگی لە کارەکەی، مۆڵەتی وەرگرت و لەگەڵ (ئازاد)دا چووەدەرەوە. جگە لە هەرسێکمان، کەسی دیکە پێی نەدەزانی. بەلام دوای دوو هەفتە هاتەوە و گوتی: ئەو مارکسییەتە وشکە، بە من نەدەکرا و هاتمەوە. ئیدی بۆ سەر کارەکەی خۆی گەڕایەوە.

بەداخەوە دوای ئەوە، (ئازادی مەلا) ساڵی (**1977**) گیرا، لە گرتووخانە ئەشکەنجەیەکی زۆریان دا، هێندە خۆڕاگربوو، نەک هەر ناوی کەسی نەهێنا، بەڵکوو تەنانەت دانی بە تۆمەتەکەی خۆشیدا نەنا. دوایی لە لێبووردنەکەی ساڵی (**1979**)دا ئازادکرا. ماوەیە لەنێوشار مایەوە و ئیدی لە ئەوە پتر نەیتوانی، خۆی بگری، چووەدەرەوە. پاشان بۆ کارێکی تایبەت هاتبووەوە بۆ (سولەیمانی)، بەلام لە گەڕانەوەدا، شەوی (**7/8. 3. 1981**)، لە گەرەکی (برایم پاشا) شەهیدکرا.



ڕەوانشاد ئازادی موحەممەدی مەلاحەمە ئاغا ( **1950 – 1981** )

دوای ئەوەی ساڵی (**1978**)، ملازم (ستاری سەعید خەلەف)، وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا و خۆی ڕادەسی دەسەلات کردەوە، یارمەتی کۆمەڵی ئەفسەر و مفەوەزی هاوڕێی خۆی دا، لە خوارووی (عێراق)ەوە بۆ (کوردستان) گەڕانەوە. ئیدی جارێکی دیکە و لە ئەو کاتەوە، (کەریم) پەیوەندی بە (شێخ مەنسووری حەفید)ی پارێزەرەوە هەبوو، خۆی بە (بزووتنەوەی سۆسیالیست) دەزانی و هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە (پاسۆک)ەوە نەبوو!

## تێهەڵچوونەوە و هەوڵدان

کارێکی باشبوو، زۆربەی هاوبیرەکانمان، (ئێران)یان بەجێهێشت و گەڕانەوە. (مەنسوور) و (شەوقی)، سەرو نامەیان لە (شێرکۆی هەژار)ەوە هێنابوو. لە یەکێ لە ئەو نامانەدا، فرمانی بە (ئازاد مستەفا)ی شاگردی کردبوو، ڕێکخستن دروووستکەنەوە. بەڵام نابێ، (حوسێن موحەممەد) وەرگیرێتەوە!

من زۆر سەیرم لە ئەو نامەیە دەهات. لە ئەوە دەچوو، ئەم پیاوە هێندە بەخۆیدا ڕاپەڕموویی، هەموو کوردی بە ئاژەڵ تێبگا! لە ئەو بڕوایەدا نەبووم، (شێرکۆ) لە ئەو جۆرە کەسانە بێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان، بە هەڵەکانی خۆیدا بچێتەوە. کەمێ ڕێزی خۆی بگرێ، لە دوورەوە قسەی زل نەکا و پەلاماری بەردی گەورە نەدا! ئاخر ئێمە لە بندەستی (بەعس)دا بووین، دەمانتوانی، بڕیاربدەین، چی بکەین و چی نەکەین؟ لەگەڵ کێدا کاربکەین و کێ لە ڕێکخستنەکە دوورخەینەوە. جگە لە ئەوەی، لە ماوەی ئەو ساڵەی لە دەرەوە، لە سەرکردایەتی کاتی (کاژیک)دا کاریدەکرد، لە زیان پتر، هیچ جۆرە کەڵکێکی بە ڕێکخستنەکە نەگەیاند، هەموو هاوبیرەکانیش لە گرێوگۆڵە دەروونییەکانی، باش شارەزابوون!

دوای ئەوەی گەڕاینەوە، هێندێ جار من و (ئازاد)، یەکتریمان دەبینی. من بەڕۆژ پتر، خەریکی خوێندن بووم. شەوانەش زۆربەی کات، لەگەڵ برادەراندا لە یانەی مامۆستایان دادەنیشتین و دەمەتەقێماندەکرد. زۆربەی شەویش (ئازاد)م لە ئەوێ دەدەی، دەیخواردەوە و یاری کاغەزی دەکرد. شەوێ چاوەڕێمکرد و تا درەنگانێ، دووقۆڵی پێکەوە لە چیمەنەکەدا دانیشتین. گەلێ شتمان باسکرد، بەڵام بە هیچ ئەنجامێ نەگەیشتین.

ناوەڕاستی مانگی (6) بوو، لە چاکەی ئەوەی ئەو هەموو ڕاژەیەی خوشکە (لەعلی) خێزانی، لەگەڵ من و (سەلاح)ی برام کردبووی، حەزمکرد، لەگەڵ دایکم و ماڵەوەدا، یەکدی بناسن. لە هەمان کاتیشدا، لەگەڵ (ئازاد)دا دانیشین، کەمێ قسەبکەین و بڕیارێکی بنەبڕی بدەین. ئەوە بوو، ڕۆژێ لە بەیانییەوە هاتن و ماوەیەکی زۆر پێکەوە ماینەوە.

لە ڕاستیدا، هیچ جۆرە ئامادەییەکی تێدا نەبوو، کاریکا، خۆی لە وەڵامی پرسیارەکان دەدزییەوە. لە ئەوەدەچوو، بڕوای بە هیچ شتێ نەمابێ! بەڵام من لە ئەو ڕۆژەدا، چاوەڕێی گەلێ شتی گەورەم لێ دەکرد و زۆر بڕوام پێی بوو. چونکە دەمزانی، ئەو ڕاکردنەی لە ترسەوە نییە، بەڵکوو پیاوێکی مەرد و ئازا، خوێندەوار و ڕووناکبیرێکی باشە. وا باشترە بە شێوەیەکی بەردەوام، لەگەڵیدا خەریکبم، تا دیسانەوە گوڕ پەیدا دەکاتەوە، کادیرە چالاک و دڵسۆزەکەی، بیری نەتەوەیی جارانی لێ دەردەچێتەوە!

هەرچەندە دانیشتنی ئەو ڕۆژەش، هیچ جۆرە ئەنجامێکی نەبوو، بەڵام بڕیارماندا، مانگی جارێ یەکدی ببینین.

## بارودۆخی زانکۆ

دوای ئەوەی بۆ زانکۆ گەڕامەوە، ئیدی زۆر بە ڕێکوپێکی و باشی دەمخوێند. جگە لە هاوڕێ کۆنەکانی خۆم، زۆر کەم تێکەڵاوی خوێندکارانی دیکە دەبووم. خوێندکارە بەعسییەکان، گوشارێکی زۆریان لێ دەکردم و داوایاندەکرد، کاریان لەگەڵ بکەم. منیش زۆر بەڕاشکاوی پێم دەگوتن: من بڕوام بە کاری ڕامیاری نەماوە، خۆم بۆ خوێندن و زانست تەرخانکردووە. چەن جارێ هاتن و ئەمەیان بە گوێمدا دەدا، منیش هەموو جارەکان، هەر هەمان قەوانم بۆ لێدەدانەوە. ئیدی باشبوو، زوو لە کۆڵمبوونەوە.
بەڵام بەداخەوە، هێندێ کەس هەبوون، بەرگەی هەڕەشەی ئەوانی نەگرت. لەبەرئەوە بانگهێشتنەکەیان پەسەندکردن و هاوکارییان لەگەڵدا کردن. سەیر ئەوەبوو، نە خۆیان شاد و نە ویژدانیان ئاسوودەبوو، نە لای ئێمەش ڕوویاندەهات، باسییکەن!

## نەخۆشیی

هەرچەندە ئەو ماوەیەی لە (بەغدا) بووم، کاتێکی زۆر خۆشم، لەگەڵ برادەراندا ڕابوارد، بەڵام کاتێ بۆ (سولەیمانێ) گەڕامەوە، نەخۆشی هەمووی لە کونەلووتمەوە دەرهێنایەوە. بە جارێ تووشی هەردوو نەخۆشی مەلاریا و گرانەتا بووم، زۆر بێهێز و وەڕسی کردبووم، بەتەواوی پەکیخستبووم. چەن جارێ سەرم لە نەخۆشخانە و نۆرینگە دا، هەر کەڵکی نەبوو. بەڕاستی، پیاوەتی (ئەنوەری حاجی ئەوڕەحمانی مەلاسەعید)م بیرناچێ، هەمیشە بەسەرسەرمەوەبوو. بۆ لای پزیشکی دەیبردم و دەرمانی بۆ دەهێنام. بەڵام دوکتۆرەکان چاریان نەکردم، تا پەنام بۆ (ئازاد مستەفا)ی هاوڕێم برد. ئەو کاتە، لە تاقیگەی پشکنینی خوێن، لە نەخۆشخانەی سەرەوە کاریدەکرد. هەر چاوی پێم کەوت، گوتی: با خوێنەکەت وەرگرم و بیپشکنم. دوور نییە، نەخۆشی مەلاریات هەبێ. دوایی هەرواش دەرچوو، (21) دەنک حەبیان بۆ نووسیم، دوای ئەوەی حەبەکان تەواو بوو، ڕاستبوومەوە.

## پەلەقاژەی خەبات

دوای ئەوەی لە (ئازاد مستەفا) نائومێدبووم، قسەم لەگەڵ (وریابراخاس، سەروەت و برایمی حەمەعەلی) کرد، تا لە خۆمانەوە دەستپێبکەین و پێوەندی بە ئەو هاوبیرانەوە بکەینەوە، کە پێشتر دەمانناسین. بەڵام بڕیارمان نەدابوو، بە ناوی چییەوە کاربکەین، بەڵکوو ئەرکی ئەو قۆناغەمان، تەنیا هەر کۆکردنەوەی هاوبیران و یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکەی (کاژیک) بوو.
من لەڕێی خۆمەوە، پێوەندیم بە چەن هاوبیرێکی کۆنەوە کرد، هێندێکیان ئامادەییان تێدابوو، سەرلەنوێ کارمان لەگەڵ بکەنەوە. هێندێکی دیکەشیان قایل نەبوون. بەهۆی

(فەرهاد عەبدولحەمید) و (مژدە تایەر)ەوە، لەگەڵ دەستەی یەکەم و لەڕێی (ئازاد)یشەوە لەگەڵ دەستەی دووەمم پەیوەندیم هەبوو. بەڵام ساڵی (1975)، زوو ڕژێی و بە هیچ ئاکامی نەگەیشتین.

## ساڵی خوێندنی نوێ

سەرەتای مانگی (9)ی ساڵی (1975) بوو، دەرگەی زانکۆ کرایەوە و خوێندن دەستیپێکردەوە. لە کۆرسی یەکەمی پۆلی (4)دا بووم، کاتێ (فەرهاد) خوێندنی تەواوکرد، دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، ڕەوانەی (ئێران)یان کردەوە. بەڕاستی هەواڵێکی زۆر ناخۆشبوو، چونکە (فەرهاد)م زۆر خۆشدەویست، کوڕێکی تا بڵێی، هێمن و لەسەرخۆ، وریا و ژیر بوو. خەڵک زۆر ڕێزیان لێ دەگرت. وامدەزانی، جارێکی دیکە نایبینمەوە. ئەو شەوە لەگەڵ (سەروەت) و (برایم)دا سەرماندا و ماڵاواییمان لێ کرد. هەمووومان لە بێدەسەڵاتیدا، دڵمان پڕبووبوو، بەتایبەتی من و (فەرهاد)، زۆر بەسەر یەکدیدا گریاین.



ڕۆژی (3. 2. 1972)، لە زانکۆی (سولەیمانی) گیراوە.



سەرلەبەیانی ڕۆژی (8. 4. 1976)، لەبەردەرگەی زانکۆ چاوەڕێی خوێندکارانمان دەکرد، بەرەو سەیرانی (ئەحماوا) بڕۆین. (ئەحسین، عەلی مەحموود، ئەحمەد عارف، حوسێن موحەممەد و ئەحمەد حەمەئەمین).

## نەورۆزی ساڵی ( 1976 )

دوای هەرەس و ساڵی (**1976**)، ڕۆڵە دڵسۆزەکانی کورد، یادی جەژنی نەورۆزیان کردەوە. ئەوەش بۆ ئەو ڕۆژە، ڕووداوێکی گەلی گرنگبوو، هەموو نیشتمانپەروەرانی شاری (سولەیمانی) ڕاچڵەکان. جگە لە ئەوەی، سەرلەئێوارەی (**20**)ی مانگ، وەک کەلتوورێکی کۆنی نەتەوەی کورد، لە زۆربەی سەربان و باڵەخانە بەرزەکانی ئێوشار، ئاگرکرابووەوە. لە هەمان ئێوارەشدا، چەن کوردێکی مەردی وەک (جەمالی عەلی باپیر)، لە هاوڕێیانی (کۆمەڵەی مارکسی – لینینی)، لە دەرگەی ماڵانیان دەدا، داوای ڕاپەڕین و شۆڕشیان لە خەڵک دەکرد.

هەروەها خوێندکارانی زانکۆی (سولەیمانی)ش، دوای ئەوەی لە زانکۆ یادی نەورۆزیان پیرۆزکرد، لە زانکۆوە بە کۆمەڵ، بەدەم سروودی نەورۆزەوە، بەبا بژی کورد و (کوردستان)، بە جادەی شێخاندا بەرەو مزگەوتی گەورە هاتنەخوارێ. دوای ماوەیەکی کەم، سەگ و گوورگەکانی (بەعس) و کوردە خۆفرۆشەکان بەپەلە هاتن، پەلاماری خۆپیشاندەرەکانیان دا، چەن کەسێکیان گرت و بڵاوەیان بە خۆپیشاندانەکە کرد. ڕۆژی دوایی ئەم دوو ڕووداوە، لەنێو جەماوەری شاردا، بەتەواوی دەنگیدایەوە و هەستی نەتەوەیی، خەڵکێکی زۆری جوڵان.

هەر لە یادی جەژنی نەورۆزی هەمان ساڵدا، بڵاڤۆکێ بە ناوی (پارتی سۆسیالیستی نەتەوەیی کورد)ەوە دەرچوو. لەسەر ئاستێکی زۆر کەم بڵاوکرایەوە. دیارە (ئازاد) حەزی نەکردبوو، ڕاستەوخۆ بڵاڤۆکەکەم بداتێ، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، بۆی ناردبووم. ئەوەش تەنیا هەر بۆ ئەوەبوو، تێمبگەیەنێ، کە ڕێکخستنێ بە ئەو ناوەوە هەیە، چیدیکە پێویست ناکا، سەری خۆتان بێەشێنن و ڕێکخراوی نوێ درووستکەن. منیش کە بڵاڤۆکەکەم خوێندەوە، یەکسەر شێوەی نووسینەکەم ناسییەوە و زانیم، دەسی (ئازاد)ی تێدا هەیە. جگە لە ئەوەی ناوی ڕێکخراوەکە، بەلامەوە ئامۆ نەبوو، چونکە چەن جارێ لە (پێنجوێن)، لەبری ناوی (کاژیک)، ئەو ناوە پێشنیازکرابوو. ئەمانە هەموویان وایان لێ کردم، پتر بجوڵێم و سەرلەنوێش، پێوەندی بە (ئازاد)ەوە بکەمەوە.

## یەکێتی قوتابیانی کوردستان – عێراق

یەکێ لە ئەو هاوڕێ خۆشەویست و جێی باوەڕانەی، زۆر جار دەمبینی، باسی ڕەوشی (کوردستان) و ڕێکخستنمان دەکرد، (سەلامی مەلاعەبدولرەحمان) بوو. چەن جارێ یەکدیمان بینی و لەسەر بارودۆخی گەلەکەمان دەمەتەقێمانکرد. لە ئەنجامدا هەردووکمان لە ئەو بڕوایەدا بووین، ئێمە وەک خوێندکار دەبێ، سەرەتا (ی. ق. ک.) دامەزرێنینەوە. بێ جیاوازی بیروباوەڕ و پارتایەتی، هەموو خوێندکاران لە چوارچێوەی ڕێکخستنێکی هاوچەرخی پیشەییدا کۆکەینەوە.

پاشان لە مانگی (8)ی (1976)دا بوو، بڵاوکراوەکی بە ناوی قوتابیانەوە دەرچوو. (سەلام) وێنەیەکی بۆ هێنام، بەڵام من ناوەرۆکەکەیم بە دڵ نەبوو، چونکە لەگەڵ ئەوە نەبووم، هێرش بۆ سەر هیچ کەسایەتی و لایەنێکی رامیاری بکرێ، دواییش ناملکەیەکی چکۆلانەی بۆ هێنام، بە زمانی عەرەبی نووسرابوو، ناونیشانەکەی (ئەلئیتحاد ئەلوەتەنی ئەلکوردستانی لماذا) بوو. ئیدی من گومانی ئەوەم پەیداکرد، ئەو یەکێتییەی ئەو دەیەوێ، لەگەڵ مندا درووستیبکا، سەر بە (یەکێتی نیشتمانیی) بێ!

بۆیە هەر زوو، لە یەکدی جیابووینەوە و نەمانتوانی، زەمانێکی هاوبەش بدۆزینەوە و پێکەوە کارێکی هاوبەش بکەین. چونکە (یەکێتی) بەشێوەیەکی بەردەوام، هێرشی توندی بۆ سەر (پارتی) و بنەماڵەی (بارزانی) دەکرد، ئەوەش لەگەڵ دید و بۆچوونی، ئەو کاتەی ئێمەدا نەدەگونجا. جگە لە ئەوەش، بە ئەو شێوەیە نەماندەتوانی، هەموو خوێندکاران لە یەک رێکخراوی پیشەیی یەکگرتوودا کۆکەینەوە.

## سەرکردایەتی کاتیی پارتیی (قیادە موەقەتە)

رۆژێ (کەمالی حەسەن چاومار)، تیلیفۆنی بۆ کردم و گوتی: دەمەوێ، چاوم پێت بکەوێ. کاتمان دانا و لە یانەی مامۆستایان یەکدیمان بینی. پێشەکی هێندێ قسەیکرد و پاشان داوای لێ کردم، کاریان لەگەڵ بکەم. منیش زۆر بەکراوەی و راشکاوی گوتم: کاتی خۆی پێکەوە، ئەندامی رێکخراوی قوتابیانی (پارتی) بووین، لە ئەو پەڕی لووتکەی دەسەڵاتی (پارتی) و لە ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی لە رێککەوتننامەکەی (11)ی مارسدا بەدەسیهێنا، بڕوام بە (پارتی) نەبوو، چونکە هەرگیز پارتێکی نەتەوەیی نەبووە و نەیتوانیوە، دەرد و ئازارەکانی گەلی کورد تیمارکا. جگە لە ئەوەی لەسەر (کاژیک) منتان لە (پارتی) دەرکرد و خراپترین بڵاوکراوەتان لەسەر دەرکردم، ئێستە دەتانەوێ، دوای ئەو کارەساتە گەورەیەی، سەرکردایەتی (پارتی) بەسەر گەلەکەمدا هێنایان، جارێکی دیکە باوەڕتان پێ بکەم و کارتان لەگەڵ بکەمەوە؟!

هەرچەندە گەلێ بەڵگە و بەروبیانووی بێبناغەی هێنایەوە، بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو، چونکە بە هیچ شێوەیە، بڕوام بە ئەو قسانە نەبوو. لەبەرئەوە چۆن هاتبوو، هەرواش بە نائومێدی گەڕایەوە. بەڵام بە ئەو دانیشتنەدا تێگەیشتم، (پارتی) لە ساڵی (1976)ەوە، رێکخستنی خۆی دامەزراندووەتەوە و (کەمال)یش، یەکەمین کادیری پێشکەوتوویانە. لەگەڵ ئەوەشدا، (کەمال) تا ئەو رۆژەی لە (سولەیمانی) رایکرد، هەر وەک دوو کوردی دڵسۆز، هەڵسوکەوتمان لەگەڵ یەکدی دەکرد و رێزی یەکدیمان دەگرت.

## وریا براخاس

ئەو کۆمیتە کاتییەی، لەگەڵ (سەروەت) و (وریا)دا دامان مەزراندبوو، تەنیا هەر وەک پێوەندییەکی سێ قۆڵی نێوخۆمان وابوو، بۆئەوەی یەکدی لە هەموو گۆرانکاری و رووداوەکان ئاگادارکەینەوە و گەر کرا، لە دوارۆژدا پێکەوە کارێکی رێکوپێک بکەین. بەڵێنیشمان بە یەکدی دابوو، هیچ جۆرە شتێ لە یەکدی نەشارینەوە.

رۆژێ دوکتور (سەیوانی عەلی رەزا)ی خوشکەزای (وریا)م بینی، گوتی: دوێنێ (عەبدوڵلائاگرین) لای خالە (وریا)م بوو. ماوەیە لە ماڵەوە پێکەوە دانیشتن و نازانم، باسی چییان دەکرد. منیش هیچ قسەم نەکرد، بەڵام زۆر سەیرم لێهات، چونکە ئێمە بریارماندابوو، هیچ شتێ لە یەکدی نەشارینەوە، ئاخۆ دەبێ، (وریا) بۆچی باسی ئەو یەکدی بینینەی نەکردبێ؟! یا (ئاگرین) لەگەڵ ئەودا، خەریکی چی بن؟! بە مەرجێ لە رۆژی ئاکۆکییەکەی نێو رێزەکانی (کاژیک)ەوە، کەسمان قسەمان لەگەڵ (ئاگرین)دا نەدەکرد. بە (سەروەت)م گوت: باسی مەکە، بزانین (وریا) خۆی بۆمان باسدەکا. چونکە (ئاگرین)، سەر بە دەستەی دووەمبوو.

ماوەی هەفتەیەکی پێچوو، هەموو ئێوارەیە (وریا)مان دەدی، بە هیچ شێوەیە، بەلای ئەو باسەدا نەدەچوو. ئێوارەیەک هەرسێکمان پیاسەماندەکرد، لێم پرسی: (عەبدوڵلائاگرین)ت دیوە؟ وەک لە بانی بەربیەیتەوە، یەکسەر پەشۆکا و گوتی: تۆ چۆزانی؟ گوتم: گرنگ نییە. گوتی: بەڵێ دیومە و لە ترساندا هاتبوو بۆ لام، وای دەزانی، من لەگەڵ (شێرکۆ) و ئەوان کاردەکەم. من و (مەهدی مەلاعەلی)یان راسپاردووە، بیکوژین. هەزار پاکانەی کرد، گوایە هەرگیز دژی من لەنێو (کاژیک)دا، قسەی خراپی نەکردووە. منیش دڵمدایەوە و پێم گوت: مەترسە، من کاری وا ناکەم، ئاگاشم لە هیچ جۆرە رێکخستنێ نییە. پاشان من گوتم: بۆچی بۆ ئێمەت باس نەکرد؟ گوتی: بە پێویستم نەزانی. منیش گوتم: کەواتە، لە ئەم ساتەوە حەزدەکەم، تەنیا هەر برادەربین و هیچ جۆرە شتێکمان، لە نێواندا نەمێنێ. بە ئەو شێوەیە، ئەو هەڵەش هیچی لێ سەوز نەبوو!

## دانیشتنێکی چوارقۆڵی

(مەنسوور) بۆ جەژنی نەورۆز، لە خوارووی (عێراق) هاتبووەوە. ئەم دەنگوباسانەم بە گوێیدادا و پێم گوت: پێویستە، چیدیکە لە ئەوە پتر، چاوەرێ نەکەین و هەنگاوبنێین. ئەگینا ناپاکی لە نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆمان دەکەین. بۆ رۆژی دوایی، لەبەر چاخانەی (جمهوری)، من و (برایم) وەستابووین، (مەنسوور) هات. من داوام لێ کرد، بە (ئازاد) بڵێ، دانیشتنێکی چوارقۆڵی سازکەین. ئەویش هەر ئەو کاتە رۆیی و گوتی: لێرە چاوەرێمکەن، ئێستە دێمەوە. دوای ماوەیە گەرایەوە و گوتی: سبەی ئێوارە، لێرە یەکدی دەبینین و دادەنیشین.

ئێوارەی ڕۆژی (**23. 3. 1976**)، لە ماڵی (مەنسوور) دانیشتین. (ئازاد) بەتەواوی بیری گۆڕابوو، ورەی بەرزبووبووەوە، بەقسەکانیدا وادیاربوو، بەتاوی ڕێکخراوێکی ڕامیاری نەتەوەیی نوێیەوە دەدوێ!
سەرەتا زۆر بەتوندی و تووڕەیی هاتەپێشەوە، ڕووی لە (برایم) کرد و گوتی: چیت دەوێ؟! ئەویش گوتی: دەمەوێ، هەمووومان وەک برا، پێکەوە ئیشبکەین و لە یەکدی دانەبڕێین، لە ئەم ڕۆژەڕەشەدا، ڕاژەی گەلەکەی خۆمان بکەین.
ئیدی (ئازاد)، بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین وەلامیدایەوە و لەسەر کارەکانی سەردەمی (پێنجوێن)، زۆر بەتوندی ڕەخنەی لی گرت و (برایم)یش وەلامی بۆ نەدەدرایەوە. جاروبار من هەڵمدەدایە و داکۆکیم لە هەڵویستەکانی دەکرد، دەمگوت: با باسی ئەو کارانە نەکەین و ئەوانە ڕۆیشتن، گرنگ ئەوەیە، ئێستە چی بکەین؟ کەچی (ئازاد) گوتی: من و تۆ، دوایی یەک دەبینین و قسەدەکەین. بەلام بە هیچ شێوەیە ئامادەنیم، جارێکی دیکە لەگەڵ (برایم) کاربکەم. بەڕاستی کارێکی پی کرد، (برایم) زۆر پەستبووبوو، ئەو کارەی بە من بکردایە، دووڕنەبوو، پەلاماربیدەم، تا دوا جار (برایم)یش وەک پەرچەکرداری گوتی: منیش ئامادەنیم، جارێکی دیکە لەگەڵ تۆ کاربکەم. بەلام بەڵێنبێ، خۆم بەباشی پەروەردەبکەم، تا منیش مابم، لە ڕاژەکردنی نیشتمانەکەم لانەدەم. لە کۆتاییشدا، (ئازاد) کاتێکی بۆ من دیاریکرد و کۆتاییمان بە دانیشتنەکە هێنا.
ئێستە (**42**) ساڵ بەسەر ئەو دانیشتنەدا تێپەڕبووە، نازانم، چی بڵێم؟ ئایا (ئازاد) بۆ ئەو کارەی کرد؟! ڕاستبوو، یا گەورەترین هەڵەیکرد؟ چونکە (برایم) بەڵێنەکەی خۆی بردەسەر، لەگەڵ (کۆمەڵە)دا دەسپێکرد و ئیشێکی زۆری بۆ کردن، تا وای لێهات، لە ماوەیەکدا لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی شاری (سولەیمانی) بوو! کاتی (ئازاد)یش لە شاخبوو، نامەی بۆ من دەنووسی: هەوڵبدەم، لەگەڵ کاکە (بلە)دا قسەبکەم و هاوکاریمان لەگەڵ بکا. من نەوەلامی ئەوم دایەوە، نەهیچیشم بە (برایم) گوت!

## ئەڵقەی ڕۆشنبیریی

لەگەڵ (ئازاد)دا، لە باخی گشتی یەکدیمان دەدی، پێشەکی لەسەر (برایم)، گەلی سەرزەنشتمکرد. پاشان هێندی دەنگوباسمان ئاڵوگۆڕکرد. دەمەتەقییەکی زۆرمان، لەسەر کارەساتی هەرەس، ڕۆڵی (بارزانی)، سەرکردایەتی (پارتی) و (کۆمەڵە) کرد. لە زۆر شتدا، وەک یەک بیرماندەکردەوە و لە هێندی شتی بچووکدا، کەمی جیاوازیمان هەبوو. دوایی بڕیارماندا، هەر لە باخی گشتی، هەفتانە یەکدی ببینین و دەمەتەقێکانمان پەرەپێبدەین. جگە لە ئەوەی هەر هەفتەی یەکێکمان، بابەتێکی گرنگی نەتەوەیی ئامادەکا و دەمەتەقێی لەسەر بکەین. پاشان هەر لە باخەکە جیابووینەوە.

یەکەمین هەفتە، من باسی پەرتووکی (گاندی ئەلقەدیس ئەلسائر)م بۆ کرد، کە نووسەرێکی فەرەنسی نووسیبووی. پتر بایەخم بە بنەما سەرەکییەکانی، شۆڕشە ئاشتیخوازانەکەی و ڕۆڵی (گاندی)، لە ڕزگارکردنی (هیندستان) و پەیوەندی لەگەڵ (جەواهیر لال نەهرو)دا دابوو، دەمەتەقێمان لەسەر دەکرد. هەفتەی داهاتوو، (ئازاد) پەرتووکی (ئەمیر)ی (ماکیاڤیلی) خوێندبووەوە، زۆر بەجوانی و بەکورتی بۆی باسکردم. هەرچەندە خۆشم، ماوەیە لەوەوبەر خوێندبوومەوە. بەڵام تەنیا تێبینیەکم، لەسەر قسەکانی هەبووبێ، ئەوەبوو، گوتم: کورد دەبێ، تەنیا دژی داگیرکەران، کەڵک لە بیروباوەڕەکانی ئەو پیاوە وەرگرێ، نەک ئەو سەرەتایانە، دژی یەکدی بەگەڕخەین. هەرچەندە گوتی: زۆر ڕاستە، بەڵام من بڕوام بە بەڵێنەکەی نەبوو، چونکە زۆر بە بۆچوونەکانی (ماکیاڤیلی)یەوە سەرسامبوو!

هەفتەی دوایی، دەمەتەقێمان لەسەر پێوەندی نێوان باوەڕی ناسیۆنالیزم و مارکسیزم کرد. ئەو لە ڕوانگەی ئایینەوە، بە هەموو شێوەیە مارکسیزمی ڕەتدەکردەوە. منیش پێم لەسەر ئەوە دادەگرت، کە نابێ، بە ئەو شێوەیەی جاران، دژایەتی مارکسیزم بکەین. بەڵکوو پێویستە، کەڵکی لێ وەرگرین. تەنانەت گوتم: گەر بزانم، بە مارکسیزم (کوردستان) ڕزگاردەبێ، ئەوا بێ هیچ جۆرە مەرجێ، دەبم بە مارکسی. چونکە کوردی نەتەوەیی دەبێ، لەپێناوی ئازادکردن و سەربەخۆیی نەتەوە و نیشتمانەکەیدا، قوربانی بە هەموو بیر و ڕێکخراوێ بدا. گەر بەڕاستی نەتەوەیی بێ و لە هەموو شتێ پتر، نەتەوەکەی خۆی خۆشتربووێ، لە هەر لایە، سەرکەوتنی نەتەوەکەی تێدابێ، ئەو لەسەر ئەو لایە دەبێ!

کەچی (ئازاد)، لەنێو هاوبیرەکاندا بڵاویکردبووەوە و گوتبووی: (حوسێن) بووە بە مارکسی و دەیەوێ، باوەڕیش بە من بێنێ، ڕێکخراوێکی مارسییانە دامەزرێنین. جا گەر من ئەوەم بویستایە، بۆ سەری خۆم لەگەڵ (ئازاد) دێشان؟! بۆچی یەکسەر لەگەڵ (کۆمەڵەی مارکسی – لینینی)دا، کارم نەدەکرد؟!! بەڵام ئەو هەر وابوو، گەر شتێکی بە دڵ نەبووایە، بە شێوەیەکی دیکە لێکیدەدایەوە.

لە دوا ئەڵقەی ڕۆشنبیرییەکەماندا، باسی دامەزراندنی کۆمەڵە ڕامیارییەکانی کورد و کوردستانیمان کرد. وەک (کۆمەڵەی هیوا، ژ. ک.، پارتی و کۆمەڵەی مارکسی). لە هەمان کاتیشدا، لەگەڵ ڕێکخستنە کۆمۆنیستی و ناسیۆنالیستییەکاندا بەراوردمانکردن. دواتریش (کاژیک)مان بە نموونە هێنایەوە و لە ڕووی ڕێکخستنەوە، هەموو هەڵەکانیمان دەستنیشانکرد. دواجاریش بڕیارماندا، هەفتەی داهاتوو یەکدی ببینینەوە و بڕیارێکی بنەبڕی بدەین، چی بکەین و چی نەکەین. بەڵام من بە هیچ شێوەیە، باسی بڵاوکەکەی نەورۆز و (پارتی سۆسیالیستی نەتەوەیی کورد)م لێ نەپرسی، ئەویش باسی نەکرد. سووریش دەمزانی، چاوەڕێی منە، ئەو پرسیارەی لێ بکەم!

## جێژنی کرێکاران

هەموو ساڵێ لە سەرانسەری جیهاندا، بە بۆنەی ڕۆژی (1)ی مایەوە، خۆپیشاندان و ئاهەنگی تایبەتی سازدەکرێ. بەعسییەکانیش ئەم نەریتەیان لە کۆمۆنیستەکانەوە وەرگرتبوو، ساڵانە یادی ئەو جەژنەیان دەکردەوە.

ڕۆژی (**1. 5. 1976**)، سەندیکای کرێکارانی سەر بە دەزگەکانی (بەعس)، خۆپیشاندانێکی زۆر گەورەیان ڕێکخست. کۆمەڵێ گەنجی خاوەن بیروباوەڕی جیاوازی دژ بە (بەعس)ی خەڵکی شاری (سولەیمانی)ش، وەک (بەختیار مستەفا، عەتای شێخ عومەر باراوی و ساجید عەلی)، دەسپێشکەرییانکرد و بەشدارییان لە خۆپیشاندانەکەدا کرد. لە کاتێکدا هەموو درووشمەکانی خۆپیشاندانەکە دانرابوو، هەمووی بە شانوبازووی (بەعس)دا هەڵیاندەدا. بەڵام ئەو کۆمەڵە لاوە، هێندێ درووشمی تایبەتی خۆیان دەگوت و هاواریاندەکرد: چیتان دەوێ کرێکاران، گەڕانەوەی کوردەکان!

لەسەر ئەوە لای ئامادەیی (سولەیمانی)ەوە، سیخوورەکانی (بەعس) پەلاماریاندان و ئەو چەن کوڕە گەنجەیان دەسگیرکرد. پاشان لە دادگەیەکی تایبەتدا، یەکی بە دوو ساڵ گرتن سزادران و لە گرتووخانەی (ئەبوغریب) توندکران. ئەوە یەکەمین کاری کۆمەڵێ کوڕی لاوی سەربەخۆی تێکۆشەری کوردبوو، کە هەستیان بە چەوساندنەوە و ستەمێکی زۆری داگیرکەری (بەعس) دەکرد!

## ئاهەنگ و خۆشیی

لە مانگی (**6**)ی ساڵی (**1976**)دا، خوێندنی زانکۆم تەواوکرد و هەردوو کۆرسەکەی پۆلی چوارەم، بە پلەی زۆر باش بڕی و یەکێ بووم، لە ئەو دە کەسەی لەسەر ئاستی کۆلیژی کشتوکاڵ، پلەی بەرزم هێنابوو.

ڕۆژی (**26. 6. 1976**)، لە پارکەی (سولەیمانی)، ئاهەنگی دەرچووانی زانکۆ دەسپێکرد. تا بڵێی، ئێوارەیەکی خۆش و ئاهەنگێکی ڕازاوەبوو. لە ئاهەنگەکەدا، چەن خەڵات و دیارییەکم وەرگرت.

دوای ئەوەی ئاهەنگەکە تەواوبوو، لەگەڵ برادەرەکانمدا (براییمی حەمەعەلی، سەروەت موحەممەد ئەمین و شوانی عوسمان فایەق)، تا درەنگانێ لە یانەی فەرمانبەران دانیشتین و بە ئەو بۆنەیەوە، ئاهەنگێکی بچووکمان گێڕا. ئیدی بەتەواوی، لەدەس خوێندن ڕزگارم بوو، دەسم بەتاڵبوو، ئەو ماوەیە پتر، خەریکی خوێندنەوە بووم و زووزووش، لەگەڵ (ئازاد)دا یەکدیمان دەبینی.

<u>بەڵگەنامەی ژمارە (6) ل (425)</u>





لە ڕاستەوە (گولیزار، حوسێن، چلنار، برنادیت و ماموستا نیگار)



## سەرەتای دامەزراندنی دەستەچەکدارەکان

کۆتایی سالی (1975) بوو، کۆمەڵی کادیری (کۆمەڵەی مارکسی – لینینی) وەک (شەهابی شێخ نووری، عومەری سەیید عەلی، فەرەیدوون عەبدولقادر، ئاوات عەبدولغەفوور و ئەرسەلان بایز ...) پەنایان بۆ (ئێران) برد. پاشان دەسەڵاتدارانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە، رۆژی (1. 1. 1976)، رادەسی (عێراق)یان کردنەوە و هەموویان گیران. (موحەممەد سەعیدی مەلاعەبباس)، لەژێر ئەشکەنجە و لەتاو ئازار، خۆی بۆ نەگیرا و ناوی کۆمەڵی لە هاورێکانی گوت. وەک (ئەنوەر زۆراب) و (جەعفەر عەبدولواحید)، هێندێکیشیان ئاشکرابوون. بەلام پێش ئەوەی بیانگرن، لەنێوشارەکاندا خۆیان شاردەوە.

رۆژی (24-26. 7. 1976)، چەن هاورێیەکی کۆمەڵەی وەک (جەمالی عەلی باپیر، نەجمەدینی عەزە شانشکاو – سالار عەزیز و تەهای شێخ رەووف باراوی) هەڵاتن، لە گوند و چیاکانی (کوردستان)، خۆیان قایمکرد.

رۆژی (3-5. 8. 1976)، یەکەمین ئەفسەری کورد رەوانشاد (ستاری سەعی خەلەف)، لەگەڵ دەستەیە لە دۆست و برادەرەکانی خۆی (خالە نەبەز، کەریمی دادەمەنە، غەفوور حەسەن، فایەقی شەفیق و ئەبوشەهاب)، بە یارمەتی (ئەنوەری توفیق هەورامی) چوونە دەرەوە. یەکەمین فیشەک لە شۆرشی نوێدا، (جەمالی عەلی باپیر) تەقاندی، پەلاماری رەبایەیەکی دا و چەن چەکێکیشی گرت. دواتریش هێندێ ئەفسەری کوردی دیکەی وەک (تایەری عەلی والی بەگ، ئەنوەری مەجید سوڵتان، عومەری حاجی عەبدوللا) رایانکرد.

ئیدی بە ئەو شێوەیە، وردەوردە، دەستە چەکدارەکان دامەزرایەوە و سەرەتای شۆرشی نوێی گەلەکەمان، لە چیاکانی (کوردستان) دەسپێکردەوە. لە هەمان کاتیشدا، هێزێکی چەکداری سەرکردایەتی کاتی (پارتی)ش، بە فەرماندەی (کەمال کەرکوکی) لە دەوروبەری سنوورەکان دەسوورانەوە.



## هێڵی پێشمەرگەی نێو شار

لەبەرئەوەی کاتی خۆی، کارگێری کۆمیتەی سوپایی (کاژیک) بووم، ناوی هەموو هاوبیرەکانی هێڵی ڕێکخستنی پێشمەرگەم لابوو. زۆربەیانم دەناسی و برادەریشم بوون. کاتێ گەڕاینەوە، هەرزوو پێوەندیم بە ڕەوانشاد (ئەنوەری عەلی تەجار)ەوە کرد. (ئەنوەر)، جگە لە ئەوەی برادەرمبوو، زۆر جاریش یەکدیمان دەبینی و باسی کوردایەتیمان دەکرد. بەڵام هەر هێندەم پێ دەگوت: جاری پەلەمەکە، چونکە هێشتا (کاژیک)، برینەکانی بە تەواوی ساڕێژنەبووتەوە و لەدەس زەبری کوشندەی هەرەس، ڕزگاری نەبووە. هەر کاتێ ڕێکخستنەکانیش زیندووبوونەوە، ئاگادارتدەکەم. ئەویش هەرچییەکی بیبیستایە، بۆی دەگێرامەوە، هەرچیشی بکردایە، پێشەکی پرسی پێ دەکردم.

ڕۆژێ گوتی: ئێوارە وەرە بۆ ماڵەوە، شتێ هەیە، بۆت باسدەکەم. ئەو کاتە ماڵەکەیان، لە کۆڵانەکەی پشت ئۆرزدیباک بوو. ساڵی (**1976**) و دەمەو بەهاربوو، شەو تاریکیکردبوو، دووقۆڵی لە ماڵەوە دانیشتبووین، قسەماندەکرد. لەپڕ لە دەرگەیاندا. منیش یەکسەر گڵۆپی ژوورەکەم کوژاندەوە، بەتاریکی دانیشتم و گوێم هەڵخست. (ئەنوەر)یش دەرگەکەی لەسەر داخستم، تا کەس نەیەتەژوورەوە و من نەبینێ. دەرگەی کردەوە، (یاسین حەسەن – یاسینەڕەش) بوو. هاتە حەوشەکە و (ئەنوەر) پێی گوت: داوای لێبوردن دەکەم، میوانم هەیە، ناتوانم، فەرمووت لێ بکەم. ئەویش گوتی: سوپاس، درەنگە و دەبێ، هەر ئێستە بڕۆم. بەڵام ئەمەم بۆ هێناوی و دوایی یەکدی دەبینینەوە. ئیدی ڕۆیشت.

ئاخ چەن حەزمدەکرد، بانگیکەم، ئێرتێر ماچیکەم و هێندێ قسەی لەگەڵ بکەم. چونکە (یاسین)م لە ساڵی (**1970**)ەوە دەناسی و لە یەکێتی جووتیاران، پێکەوە کارماندەکرد. برادەرێکی نزیکم بوو، یەکدیمان زۆر خۆشدەویست. بەڵام حەزم نەکرد، لە ماڵی (ئەنوەر) بمبینێ، منیش بناسێ و دەسەکەی (ئەنوەر)یش ئاشکرابێ! دیارە خێری پێوە بوو، یەکدیمان نەبینی، چونکە کاتێ گیرا و ئەشکەنجەیەکی زۆریان دا، چیدیکە خۆی بۆ ڕانەگیرا، دوور نەبوو، ناوی منیشی بدایە، وەک هێندێ کەسی تووشکرد و هەمووشیان لە سێدارەدران!

(ئەنوەر) هاتەوە، گڵۆپەکەی داگیرسان و دانیشتین. ئەوەی (یاسین) بۆی هێنابوو، زەرفێ بوو، دەمانچەیەکی چواردەخۆری تێدابوو. گوتم: ئەمە چییە؟! گوتی: ئاخر من بۆ ئەم بەزمە، تۆم بانگکردووە. ماوەی مانگێ دەبێ، هێڵی پێشمەرگەی نێوشار دامەزراوە. (یاسین) پێوەندی بە منەوە کردووە و منیش قایلبووم. ئێستە من و (خەسرەوی حەمەی محە) و (سەلاحی مەجید)، پێکەوە کاردەکەین. ئەم شەو ئەم دەمانچەیەی بۆ هێناوم، گوایە دوایی پێم دەڵێ، چی بکەین و دەس لە کێ بوەشێنین.

منیش کە ئەو ناوانەم بەرگوێ کەوت، یەکسەر گوتم: ئەو دوو برادەرە، هەردووکیان هاوبیری خۆمان بوون و دەبێ، زۆر ئاگات لێیان بێ. ئیدی ناچاربووم، خۆم ئاشکراکەم و ڕاستی پێ بڵێم. گوتم: ئێستە لەبری (کاژیک)، ڕێکخستنی (پاسۆک) درووستبووە. گەر دەتەوێ، کارمان لەگەڵ بکەی، ئەوا لە ئەم کاتەوە، من و تۆ پێکەوە کاردەکەین. تۆش جارێ بە (خەسرەو) و (سەلاح) مەڵێ، کە شتێکی وا نامەزراوە، تا خۆم وەڵامت لێ دەگێڕمەوە و ڕێکیاندەخەین. بەڵام خۆت سەرپەرشتییانبکە.

گوتی: ئێمە ئێستە، پێشمەرگەی نێوشارین و لەگەڵ کۆمەڵەدا کاردەکەین. واز لە ئەوان بێنین و لەگەڵ ئێوەدا بین؟ یا چۆن؟! گوتم: بە هیچ شێوەیە وازناهێنن و کاریان لەگەڵ دەکەن. لە هەمان کاتیشدا، لەگەڵ ئێمە دەبن و هەموو فرمانێکیش، هەر لە ئێمە وەردەگرن، بەمەرجێ، ئەوان بە ئەو پێوەندییە نەزانن. هەر کارێکیشیان پێ سپاردن، پێشەکی دەبێ، پرس بە ئێمە بکەن، ئینجا بیکەن. گوتی: زۆر باشە، چونکە من زۆر بڕوام بە ئەوان نییە. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە توانیمان، لەنێو هێڵی پێشمەرگەی نێوشاردا، جێپێی خۆمان بکەینەوە و پاشان ئەو پێشمەرگانەش، بە (جەلالی حسەکەلوش)ەوە ببەستینەوە.

## عوسمانی قالەمنەوەر

(عوسمان)، جگە لە ئەوەی کوڕی گەڕەک بوو، هاوڕێی قوتابخانەشم بوو. دوای هەرەسەکە، هێندێ جار لە (کانیسکان) دەمبینی، ڕۆژێ لە چاخانەکەی (بەکری حەمەی مەلا) پێکەوە دانیشتین و باسی ڕەوشی کوردی لێ پرسیم. (عوسمان) زۆر پەلەیبوو، حەزیدەکرد، ڕۆژێ زووتر بچێتەدەرەوە، جارێکی دیکە چەکی کوردایەتی لەشانکاتەوە و ببێتەوە بە پێشمەرگە. بەڵام من زۆری لەگەڵ خەریکبووم، کەمێ ئارامبگرێ و چاوەڕێکا، تا بارودۆخەکە، بەتەواوی ڕووندەبێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هێندە پەلەیبوو، هیچ کەڵکی نەبوو، گوێی لە کەس نەدەگرت!

ئێوارەیەک من و (شێخ مەنسوور)ی پارێزەری داوەتکرد. لە یانەی فەرمانبەران لەگەڵ (نووری خەراجیانی، شێخ بەکری گولانی و حەمەبارێکی بەنا) دانیشتبوون، یاری کاغەزیان دەکرد و دەیانخواردەوە. دوایی ئەوان ڕۆیشتن و سێقوڵی ماینەوە. دیسانەوە باسی شۆڕشی کردەوە و زۆر تامەزرۆی هەواڵەکان بوو. منیش پێم گوت: هێشتا شۆڕشەکە، هی ئەوە نییە، خۆتی لێبدەی. چونکە هەموو ڕەهەندەکانی، بەجوانی ڕوون نەبوونەتەوە. هەرایەکە و هەرکەس و لایەنێ، بۆ خۆیان کوێخا دییەکن!

بەڵام لە ئەوەدەچوو، قسەکانی من کەڵکی نەبووبێ و کاری تێ نەکردبێ. بۆیە دوای ئەو دانیشتنە، هەمووی دوو هەفتەی نەخایان، وا بزانم، لە مانگی (**10. 1976**)دا بوو، هەواڵی ڕاکردنی (عوسمان)م پێگەیشت، هەرچەندە (ستاری سەعی خەلەف)یش، وەڵامی بۆ ناردبوو، کە جارێ دان بە خۆیدا بگرێ و شار چۆڵ نەکا. بەڵام (عوسمان)، گوێی لە کەس نەگرت و دوای بڕوای خۆی کەوت!



( 1994 – 1947 )

**هەڵسوکەوتی ئەندامێکی سەرکردایەتی کاتیی کاژیک**

شەوێکی زستانی ساڵی **(1976)** بوو، مامە (ساڵح)م تیلیفۆنی بۆ کردم و گوتی: لە یانەی مامۆستایان دانیشتووم، تۆش وەرە. یانەکە لە ماڵی ئێمەوە زۆر نزیکبوو، هەمووی چەن خولەکێ دووربوو. کە چووم، (3) مامۆستای دیکەی لەگەڵ بوو، چوارقوڵی پێکەوە دانیشتبوون. چاوم بە ئەندامەکەی سەرکردایەتی کەوت، زۆر پەشیمانبوومەوە. بەڵام تازە چارنەما و نەدەبووایە، دانیشتمایە. جگە لە سڵاو، بە هیچ جۆرێ قسەمان لەگەڵ یەکدی نەکرد. پاشان ئەندامەکە کەللەی گەرمبوو، دەمارەکانی مێشکی داگیرسا و قسەی هەلەقومەلەقی دەسپێکرد!

شەوانی هەینێ، لە یانە یاری دومبەڵەیان دەکرد. ئەو شەوە خوالێخۆشبوو خالە (حەمەفەرەج)ی هونەرمەند و خۆشنووس، بە ئەو دەنگە بەسۆزەی خۆی دەیخوێندەوە. خەڵکەکە هەموویان گوێقوڵاخبووبوون و خەریکی ژمارەکان بوون، دەیانکوژاندەوە. ئەندامەکەش بێ ئەوەی پارێبکا، زووزوو دەنگی بەرزدەکردەوە و بە پلارەوە دەیگوت: (حەمەفەرەج) دەیخوێنێتەوە! ناوبەناویش هاواریدەکرد و دەیگوت: چەرخەلە. تا دوایی خەڵکەکە، لێی توورەبوون، بەرپرسەکانی یانە هاتن و کردیانەدەرەوە.

بۆ سبەی شەو، لەگەڵ برادەراندا چووین بۆ یانە. فرمانێ لە بەڕێوەبەرایەتی یانەوە دەرچووبوو، بە تابلۆی ئاگادارییەکانەوە هەڵواسرابوو، بۆ ماوەی (3) مانگ، هاتنە ژوورەوەیان لێ قەدەغەکردبوو.

هەرچەندە بیرم لە هەڵسوکەوتی ئەو مامۆستا نەگبەتە دەکردەوە، یادگارەکانی ڕۆژانی (پێنجوێن)م بیردەکەوتەوە، پێکەنینم دەهات و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ساویلکەیی ئێمە بە ئەو ئەندازەیە بوو، دوای چەن دەروون نەخۆشی کەوتبووین، ئاخر گەر نەگبەتی کورد نەبێ، پیاوی وا دەبێ، ئەندامی سەرکردایەتی پارتێکی نەتەوەیی کورد بێ؟!!

## تێکەڵبوونەوە

ڕۆژێ (ئازاد) هات بۆماڵەوە و گوتی: کاتی ئەوە هاتووە، هەموو شتەکان بەکراوەیی باسکەین. سەرەتا باسی نامەکەی (شێرکۆی هەژار)ی بۆ کردم، کە نووسیبووی: نایێ (حوسێن) وەرگیرێتەوە. پاشان سەبارەت بە دامەزراندنی (پاسۆک) و بڵاوکراوەکەی، بە بۆنەی نەورۆزەوە دەریکردبوو، گوتی: من و (شێرزاد فاتیح) و (فەرهاد عەبدولقادر) کۆبووینەوە و ئەو پارتەمان دامەزران. ناوی (پارتی سۆسیالیستی نەتەوەیی کورد) بوو.
منیش گوتم: ئاگام لە هەمووی هەیە، بەڵام قسەم نەدەکرد، تا بزانم، کەی ئەو شتانەم بۆ باسدەکەی. جگە لە ئەوەی، ئەم زانیارییانە نوێ نین، چونکە هەر لە (پێنجوێن)، ئەو پێشنیازە کرابوو، چیدیکە بە ناوی (کاژیک)ەوە کارنەکەین. گوتی: هەمووی ڕاستە، بەڵام (شێرکۆ) و (فەرهاد)، ڤیتۆیان لەسەر تۆ هەبوو، بۆیە پێوەندیسان پێوە نەکردی.
پاشان گوتی: بە پێویستمان زانی، هێڵێکیش لە دەرەوە دامەزرێنین. لەبەرئەوە (شێرزاد) و (فەرهاد) چوون بۆ (ئەڵمانیا) و چاویان بە (جەمال نەبەز) کەوت، باسی هەموو شتێکیان بۆ کردبوو. ئەویش گوتبووی: ئەو ناوە کەمێ خراپە، چونکە لە ناوی پارتە نازییەکەی (هیتلەر) دەچی. پێشنیازیکردبوو، وشەی نەتەوەییەکە لاببرێ و ببێ بە (پارتی سۆسیالیستی کورد)، هەر خۆشی پیتەکانی لێکدابوو، ناوی (پاسۆک)ی دانابوو.
گوتم: جا باشە، تا ئێستە چیتان کردووە؟ گوتی: هیچ. چونکە تا ئێستە نەکۆنفرانس و نەکۆنگرەمان نەگرتووە. پێڕەو و پرۆگرامان نییە. لەنێوخۆماندا زۆر ناکۆکین. بۆیە داوات لێ دەکەم، سەرلەنوێ دەسی هاوکاری و هاوبیری، لەنێودەسی یەکدی بنێن و بەهەمووومان، ئەم پارتە ببوژێنینەوە و پێشیخەین. بەڵام بە مەرجی تۆ دەبێ، لەسەرەتاوە دەسپێبکەیتەوە و بە خەباتی خۆت، خۆت بسەپێنی.
گوتم: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، ئێوە سەرکردایەتی بن و منیش کوێرانە دواتانکەوم، هەرگیز شتی وا قەبووڵ ناکەم. ئێمە هەمووومان وەک یەک واین، با پێکەوە سەرلەنوێ، ئەم پارتە دروستکەینەوە و تا بەباشترین شێوە کاربکا. گوتی: ئەوە جێی دەمەتەقێ و دانوستانە، بۆ دوایی هەڵیدەگرین. گوتم: ئەزموونی خەباتی ڕامیاری، ئەو چەن ساڵەی لە (کاژیک)دا کارمکردووە، فێریکردووم، کوێرانە دوای کەس نەکەوم و هیچ شتێکیش پەسەندناکەم، گەر بڕوام پێی نەبێ.

پاشان بێ دەنگبوو. منیش گوتم: کەواتە منیش مەرجێکم هەیە. گوتی: چییە؟ گوتم: گەر ئەم ڕێکخستنە، تەواوکەری (کاژیک) و هێڵەکەی (پێنجوێن) بێ، ئەوا من بەهیچ جۆری ئامادەنیم، کارتان لەگەڵ بکەم. جگە لە ئەوەی دەبێ، دان بە ئەوەدا بنێن، ئەو بلاڤۆکەی ڕۆژی (**25. 1. 1975**) لە (پێنجوێن) دەرتانکرد، هەڵەبوو، لێی پاشگەزبنەوە. گەر ئەم ڕێکخستنە تازەشە، ئەوا دەبێ، بەزووترین کات هەوڵبدەن، هەموو کادیرە نەتەوەییەکان کۆکرێنەوە، کۆنفرانس یا کۆنگرە بگیرێ. (ئازاد) گوتی: دڵنیاتدەکەم، ڕێکخستنەکە تەواوکەری (کاژیک) و هێڵەکەی (پێنجوێن) نییە، داواکارییەکانیشم زۆر لا پەسەندە. ئینجا گوتم: کەواتە با پیوەندی بە هاوبیرە کۆنەکانی (کاژیک)ەوە بکەم و ئەم ڕاستییانەیان بۆ ڕوونکەمەوە. گوتی: زۆر باشە.

**کۆبوونەوە**

بەگوێرەی ئەو خاڵانەی لەگەڵ (ئازاد)دا لەسەری ڕێککەوتین، ناوی هێندێ هاوبیری وەک (سەلاح)ی برام، (جەلال سەعید، فەرهاد خەففاف، سەروەت موحەممەد ئەمین، فوواد یاسین و سەباح)ی برایم دایە.
بۆ (فوواد) گوتی: خۆت قسەی لەگەڵ بکە. چونکە ماوەیە پێش ئێستە دیومە و داوای کردووە، بیکەین بە ئەندامی سەرکردایەتی، ئەگینا کارمان لەگەڵ ناکا. منیش داواکارییەکەیم ڕەتکردەوە. پاشان دوای ماوەیە، جارێکی دیکە چووم، قسەی لەگەڵ بکەمەوە، زۆر بە ڕاشکراوی پێی گوتم: پێویست ناکا، هیچ جۆرە نهێنییەک بدرکێنی، چونکە ئێستە، لەگەڵ ڕێکخراوێکی (مارکسی لینینی) کاردەکەم. ئیدی منیش وازم لێ هێنا. گوتم: باشە، من خۆم قسەی لەگەڵ دەکەم.
ڕۆژێکی هەبینیمان، بۆ کۆبوونەوەی ئەو هاوبیرانە دەستنیشانکرد. کۆبوونەوەکە لە ماڵی (سەروەت)ی هاوڕێم بوو. (ئازاد) خۆی چووبوو، کۆبوونەوەی پێ کردبوون. پاشان کە لێبووبوونەوە، لە دەرەوە بە دزییەوە، بە (سەباح یاسین)ی گوتبوو: لەمەودوا تۆ دوو پیوەندیت دەبێ، یەکێکیان لە ئەم شانەیەدا، وەک ئەندامێکی (پاسۆک) کاردەکەی، ئەوی دیکەشیان پیوەندی پاراستنە و پێکەوە کاردەکەین. هەر شتێ سەبارەت بە ئەو هاوبیرانەی، لە شانەکەدا لەگەڵت کاردەکەن، دەزانی، یا هەر قسەیەکیانکرد، بۆم بگێڕەرەوە. ئەویش پێی گوتبوو: جا باشە گەر ئێمە هەموومان، لە یەک شانەدا کاربکەین و هاوبیری یەکدی بین، ئیدی چ پێویست دەکا، من بەسەر هاوبیرەکانی خۆمەوە، سیخوڕییکەم و پاراستنبم؟! من ئەمە ناکەم و نامەوێ، جارێکی دیکە هیچ جۆرە پیوەندییەکیشم پێوە بکەیتەوە!

هەر ئەو ڕۆژە، (سەباح یاسین) هات بۆ ماڵەوە و هەمووی بۆ گێڕامەوە. منیش کەمێ هێورمکردەوە و گوتم: با کۆنفرانس بگرین، هەموو ئەو گرفتانە چارەسەردەکەین. بەڵام زۆر سەیرم لێهات، (ئازاد) ئەو کارەی بۆ کردووە؟ ئاخر لە ئەو ڕۆژە پڕ مەترسی و نائومێدییەدا، چەن گەنجێ بیانەوێ، ملیان لە چەقۆی مەرگ بسوون و دژی داگیرکەری نیشتمانەکەیان خەباتبکەن، چۆن دەبێ، لە یەکەمین دانیشتنەوە، بە ئەو شێوەیە ڕەفتار بکا؟! ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، بڕوای بە هاوبیرەکانی دیکەی شانەکە نەبووبێ!

جا هەر بەڕاستی، خۆشی نەیدەزانی، چی دەوێ. چونکە لەلایەکەوە، لەگەڵ ئێمە ڕێککەوتبوو. لەلایەکی دیکەشەوە، بڕوای پێ نەدەکردین! هەروابووە، گومانی لە هەموو کەس دەکرد، نەشیدەتوانی، واز لە ئەو گومانکردنە بێنێ! پاشان لەگەڵ (فووئاد) قسەمکرد، ئەویش ڕازی نەبوو، کارمان لەگەڵ بکاتەوە و گوتی: تازە من پێوەندیم بە لایەکی دیکەوە هەیە.

## هەوڵی کوشتنی پارێزگاری سولەیمانیی

ڕۆژی (**21. 12. 1976**)، لەسەرجادەی (مەولەوی)، بەپێی بەرنامەیەکی ڕێکوپێک و وانەکراو، ئەو کاتەی (موحەممەد ئەمین موحەممەد) پارێزگاری (سولەیمانی)، دەچوو بۆ پارێزگە، چەن کوڕە کوردێکی ئازا و بەجەرگی کۆمەڵە (ئەنوەری تۆفیق هەورامی، خولەی ئەمینی بووک، سەلاحی مەجید ...) بە کلاشینکۆف تەقەیان لێ کرد. ئەوە یەکەمین کاری شۆڕشگێرانەی شۆڕشی نوێ بوو. هەرچەندە بریندارببوو، نەکوژرا. بەڵام لە هەموو (کوردستان)دا، دەنگێکی زۆری دایەوە، وزەی خەڵکی بەرزکردەوە، بۆ خەبات و کوردایەتی هانیدان. بەعسییەکانیش خەڵکێکی زۆریان گرت و لە قوڕبنی گرتووخانەکان توندیانکردن.

## ساڵح عانی

ڕۆژی (**9. 1. 1977**) بوو، هەواڵی کوشتنی (ساڵح عانی)، بە هەموو شاری (سولەیمانی)دا بڵاوببووەوە. لە ڕاستیدا، هەرچەندە کارێکی چاوەڕواننەکراوبوو، بەڵام پتر لە ئاکۆکی و دژایەتیکردنی، نێوان (ساڵح) و چەن کارمەندێکی زانکۆ دەچوو، لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ ئەو ڕۆژە، کارێکی گەلێ گرنگ و بەکەڵک بوو، دەنگێکی زۆری دایەوە، بەجارێ وزەی کۆمەلانی خەڵکی بەرزکردەوە. لە هەمان کاتیشدا، دەزگە داپلۆسێنەرەکانی (بەعس) و کادیرەکانیشی، لە خەوێکی خۆش ڕاچڵەکاند و وریایکردنەوە!

(ساڵح عانی) ساڵی (**1974–1975**)، کۆلیژی کشتوکاڵی زانکۆی (سولەیمانی) تەواوکرد بوو. دوو ساڵ پێش من بوو. گەلێ جار وەک نوێنەری (بەعس)، لە بۆنەکانی (**11**)ی

مارس، جەژنی نەورۆز، دامەزراندنی یەکێتی قوتابیانی (کوردستان) و (پارتی)دا ئامادە دەبوو و دەمبینی، کوڕێکی هەژار، ساکار و بێدەسەلات بوو، بەڵام کاتی خوێندنی تەواوکرد، بەعسییەکان لە زانکۆ دایانمەزراند و پۆستی یاریدەدەری ڕاگریان دایە. لە (بەعس)یشدا، ئەندامێکی دەسروشتووی لقی (سولەیمانی) بوو.
ئیدی ئەم گەدایە، بەتەواوی لە خۆی گۆڕا و کەسی نەدەناسییەوە، وەک سەگی هاری لێهاتبوو، پەلاماری هەموو کوردێکی دەدا. باشبوو، غەدریان لێ نەکرد، هەر زوو هەقی خۆیان دایە و تۆڵەی خەڵکی بێتاوانیان لێ سەندەوە!

## عومەری حەمەشەمەیی

وەک یەکەمین هەوڵدان، بۆ یەکگرتنەوە و ڕێکخستنەوەی کادیرە نەتەوەییەکان، لە ماڵی (جەلالی حسەکەلوش)، دانیشتنێ بۆ (ئازاد) و (عومەر شەمەیی) سازکرا. تا بۆ دواجار هەوڵی، لەگەڵ ئەو کادیرانەی دەستەی دووەمدا بدرێ و هەموو پێکەوە کاربکەین.
بێگومان، (عومەر) بە هیچ شێوەیە ئامادەنەبوو، کار لەگەڵ هیچ دەستە و ڕێکخراوێ بکا. لەبەرئەوە زۆر بەڕاشکاوی گوتبووی: من وازم لە کاری ڕامیاری و پارتایەتی هێناوە، بڕوام بە هیچ شتێ نەماوە و بۆ خۆم دادەنیشم. ڕاستیشیدەکرد، تەنانەت کاری لەگەڵ دەستەکەی خۆشیاندا نەدەکرد، چونکە وای لێهاتبوو، بڕوای بە کەس و هیچ شتێ نەمابوو، تووشی ڕەشبینییەکی گەورە ببوبوو، تەنانەت لە سێبەرەکەی خۆشی سڵی دەکردەوە!

## مژدە تایەر

دوای ئەوەی (فەرهاد)یان لە (عێراق) دەرکرد و ڕەوانەی (ئێران)یان کردەوە، وەک دواتەقەلایەک، تەنیا (مژدە)م بەدەسەوەمابوو، تا لەگەڵ دەستەی دووەمدا، قسەیکەم و یەکێتی ڕیزەکانی بیری نەتەوەیی یەکخەمەوە.
ئێوارەیەک لەگەڵ (مژدە)دا، لە یانەی مامۆستایان پێکگەیشتین. هێندێ دەمەتەقێمان لەسەر ڕابووردووی (کاژیک) و سەرکردەکانی کرد. هەروەها باسی بارودۆخی (کوردستان) و قۆناغی نوێی تێکۆشان، بیری نەتەوەیی و (پاسۆک)مان کرد. دوایی هەر ئەو شەوە، دانیشتنەکەمان لە ماڵی (مژدە) تەواوکرد و تا بەرەبەیان، بە دەمەتەقێوە خەریکبووین.
دوای ئەوەی (مژدە)، بڕوای بە هەموو بۆچوونەکان هێنا، بەڵێنیدا، بە هەموو توانایەوە، هەوڵ بۆ یەکگرتنەوە و یەکێتی ڕیزەکانی هاوبیرانی بیری نەتەوەیی بدا، منیش سێ مەرجم بۆ دانا:

**1.** هەر کەرەسەیەکی ڕۆشنبیری و تیۆری (کاژیک)ی لا هەیە، بۆمان بێنێ.
**2.** جارێکی دیکە، بە ناوی (کاژیک)ەوە کارنەکرێ و (پاسۆک)یان قەبووڵبێ.
**3.** لیستی ناوی ڕێکخستنی هاوبیرانمان بداتێ، تا پێوەندییان پێوەبکەینەوە.

دوای دوو ڕۆژ، کاژێکنامە، هەموو نامیلکە و بڵاوکراوەکانی دیکەی (کاژیک)ی بۆ هێنام. ناوی هاوبیرەکانی خۆشیانی پێ گوتم. لە ئەو بارەیەوە لەگەڵ (ئازاد)دا قسەمکرد، زۆری پێخۆشبوو. بەڵام لەسەر (نووری حەمەعەلی) و (عەلی توفیق)، تێبینیان هەبوو. بڕیاریاندا، بە هیچ شێوەیە لە ڕیزەکانی (پاسۆک)دا وەرنەگیرێنەوە. هەرچەندە ئەو بڕیارەم پێ ناخۆشبوو، بەڵام زۆرم لێ نەکرد، چونکە هەردووکیانم زۆر باش دەناسی و سووریش نەمزانی، لە ئەو ڕۆژە سەخت و دژوارەدا، کوری خەباتی نهێنی و قوربانیدان نین، تا ئەو کاتەش، هەر بە هیوای بنەماڵەی (بارزانی) و سەرکردایەتی کاتی (پ. د. ک.) بوون. چونکە (مژدە)، پتر لایەنی پێوەندی دۆستایەتی و هاوڕێیەتی نێوانیانی لێکدەدایەوە، وەک ئەوەی لە لایەنی پێویستییەکانی بیروباوەڕ، خەبات و هەڵسوکەوتیان بڕوانێ. بۆیە لەسەر ئەوە، لەگەڵ (مژدە) ڕێک نەکەوتین، چونکە ئەو تێبینیانەی، لەسەر ئەو دوو هاوبیرە گوتە هەمانبوو، مێشکی وەری نەدەگرت. لە ئەنجامیشدا، تێکەڵوبوونەوەکە سەری نەگرت. لەگەڵ ئەوەشدا (مژدە) خۆی، هەر پێوەندی بە منەوە هەبوو.

<u>**بەڵگەنامەی ژمارە (7) ل (426)**</u>

## پڕوپاگەندە

پاشان دەسمان بە کارکردن کردەوە، لەگەڵ ئەو چەن هاوبیرەی دەمناسین، بڕیارماندا، پڕوپاگەندەیەکی فراوانی گەورە، بۆ (پاسۆک) بکەین و بە جەماوەری بناسێنین.

من نووسینم لەسەر دیواری توالێت و شوێنە گشتییەکانی وەک مزگەوت، خوێندنگە، زانکۆ، سینەما، یانەکانی مامۆستایان و فەرمانبەرانم، بە ئاسانترین و باشترین شێوازی پڕوپاگەندەکردن دەزانی. لەبەرئەوە لە ماوەیەکی کەمدا، لە زۆربەی ئەو شوێنانە، هێندی دروشمی وەک (کوردستانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیار، کوردستان تەنیا موڵکی کوردە، مردن بۆ داگیرکەرانی کوردستان، مردن و سەرشۆڕی بۆ کوردە خۆفرۆشەکان، بژی پێشمەرگە قارەمانەکان)، هێندێکی دیکەشمان نووسی و لەژێر ئەو دروشمانەشدا، ناوی (پاسۆک)مان دەنووسی. وامان لێهاتبوو، شارەزای هەموو مزگەوتەکانی شار بووبووین و کەم مزگەوت مابوو، دیوارەکانیمان ڕەش نەکردبێتەوە!

بەڵام لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو، لە دیواری ئاودەستێکی یانەی فەرمانبەرانم نووسی بوو: (مژدەی لەدایکبوونی پارتی سۆسیالیستی کورد – پاسۆک)تان پێ ڕادەگەیەنین. کەچی چەن شەوی دوای ئەوە، کەسێکی ساکار و هیچ لەبارانەبوو، لەژێریدا نووسی

بووی: (حیزبەکەی شێخ حوسێن)، منیش کە ئەوەم بینی، جگە لە ئەوەی دەسوخەتەکەم ناسییەوە، نەمکوژاندەوە و لەبن نووسینەکەی ئەودا نووسیم: (خۆفرۆشن). ئیدی بۆ شەوی دوایی، هەردووکیان کوژاندبووەوە و تەنیا نووسینەکەی (پاسۆک)یان هێشتبووەوە!

## کۆمپانیایەکی پۆڵەندی Pol. Servic Company

خوێندنم تەواوکردبوو، بێکار دەسووڕامەوە. بەهۆی (کامیل مستەفا)ی هونەرمەندی هاوڕێمەوە، من و (ئەحمەد حەمەئەمین)، لە کۆمپانیایەکی پۆڵەندی بە ئەندازیاری کشتوکاڵ دامەزراین. ئەو کاتە شوێنی ئیشەکەمان، لە (پێنجوێن) بوو. هەموو پێکەوە چووین و ئەوە یەکەمین جاربوو، دوای هەرەسەکە (پێنجوێن) ببینمەوە. بڕێتی کۆنم کولایەوە، ئەو شارۆچکەیەی بارەگەی هێزی خەبات، لیژنەی ناوچە، هەردوو لقی پارتی (سولەیمانی) و (کەرکووک)، هەردوو دەزگەی پاراستنی ئەو دوو شارە گەورەیەی لێبوو. ئەو شارۆچکەیەی مەڵبەندی سەرەکی ڕاپەڕینەکەی (کاژیک) بوو. ئەو شارۆچکەیەی ماوەی یەک ساڵی ڕەبەق، تێیدا ژیام و لە هێزی خەبات پێشمەرگە بووم، کەچی ئێستە بەئاشکرا، بارەگەی (بەعس) و فەرمانگە سیخووڕییەکانی دەوڵەتی داگیرکەری (عیراق)ی تێدا کراوەتەوە، پڕبووە لە پۆلیس و سەربازی عەرەب، لەسەر تابلۆی فەرمانگەکان، درووشمی (ئومە عەرەبیە واحدە زات ڕسالە خالیدە) هەڵواسراوە!
هەرچەن بیرم لێ دەکردەوە، سەیرم لێدەهات. لە هەمان کاتیشدا، بیرم لە ئەوە دەکردەوە و لەبەرخۆمەوە دەمگوت: شتێکی زۆر سەیرە، هەموو شتەکانی ژیانی تایبەتی خۆم، بۆ یەکەمین جار، هەر لە (پێنجوێن) دەسپێکردووە و دەسپێشپێدەکا. ئاخر جگە لە ئەوەی ساڵی (**1950**)، لە (پێنجوێن) لەدایکبووم و چاوم بە ژیان هەڵهێناوە، یەکەمین جار هەر لە (پێنجوێن) و لە هێزی (خەبات) بووم بە پێشمەرگە. یەکەمین جار هەر لە (پێنجوێن) لە هێڵی ڕاستکردنەوەی (کاژیک)دا کارمکردووە. ئەوا ئێستەش یەکەمین جار، هەر لە (پێنجوێن) وەک ئەندازیاری کشتوکاڵ دامەزرام و کاردەکەم. پاشان دوای (**10**) ساڵ دەربەدەری و ئاوارەیی دەرەوەی وڵاتیش، یەکەمین جار هەر لە (پێنجوێن)ەوە، بەرەو (سولەیمانی) گەڕامەوە!
ماوەی هەفتەیەک لە ئەوێ بووین، هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو، لەگەڵ پرۆفیسۆر (مارچێنیک) و دوکتۆر (کەنجۆرا)، کرێکارەکانمان کۆدەکردەوە و بە ترۆمبێلەکانی کۆمپانیاکە دەچووین، سەرمان لە گوندەکانی دەوروبەری (پێنجوێن) دەدا. توێژینەوەمان لەسەر چینەکانی زەوی، قووڵایی ئاوی ژێرزەوی، جۆر و پێکهاتەکانی گڵ دەکرد. جگە لە ئەوەی وەک وەرگێری لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی، لەنێوان پۆلۆنییەکان و کرێکارە کوردەکاندا کارمدەکرد. هەرچەندە موچەکەی زۆر کەمبوو، مانگی (**80**) دیناری ساڵی (**1976**) بوو، بەڵام لە سوورانەوە باشتربوو، چونکە ئەو کاتە، دامەزراندن کەمی گرانبوو.

هەر دوای دوو ڕۆژ، (ئەحمەد) وازیهێنا و خۆم بە تەنیا مامەوە. بەڵام هێندێ هاوڕێی وەک ڕەوانشادان (حەمەسالحی عەبەپشی) و (سەعدوڵلا کەرکووکی)، لە ئەوێ مامۆستا بوون، جاروبار سەرم لێدەدان و چەن شەوێکی خۆشمان بەسەربرد. ئەو ماوەیەی لە (پێنجوێن) بووم، هەموو هەفتەیە پاشنیوەڕوانی ڕۆژی پێنجشەممە بۆ (سولەیمانی) دەگەڕامەوە، تەنیا لە ئەو کاتانەشدا دەمتوانی، (ئازاد) ببینم.

لە (پێنجوێن) چەن کرێکارێکم لابوو، کاتی خۆی پێشمەرگەی شۆڕشی (**11**)ی سێپتێمبەر بوون. یەکدیمان زۆر خۆشدەویست و هەموو ڕۆژێ، لە ئەو دەشتە سەوزە گەرمە، لە کاتی نیشکردندا، باسی کۆنیان بۆ دەگێڕامەوە و خۆیان وا پیشاندەدا، کە ئێستەش هەر کوردێکی پاکن و ئامادەی هەموو کارێکیشن. منیش دوو کرێکاری باشم لێ هەڵبژاردن، یەکێکیان ناوی (ئەحمەد) و ئەویدیکەشیان ناوی (ڕەحیم) بوو، پێیان دەگوت: (ڕەحیمە کەچەڵ)، (ئەحمەد) دەستێکی لە شۆڕشی ساڵی (**1974–1975**)دا، بریندارببووبوو، زۆر پێوەی دیاربوو. ئەم دوو کرێکارە، هەفتەی دوو جار سەریان لێ دەدام وقسەم بۆ دەکردن. لە ئەنجامدا لە ماوەی مانگێکدا توانیم، ڕێکیانخەم. پاشان نامەیان نووسی و نامەکانیشم گەیاند، تا ئەو کاتەی خۆم لە ئەوێ بووم، سەرپەرشتیمدەکردن.

ئەو کاتە لە ئەو ناوە، چەن پێشمەرگەیەکی (پارتی) لێبوو، ملازم (عەبدولمەلیک) و (شەفەکەچەڵ) سەرپەرشتیاندەکردن. پۆلۆنییەکان زۆر دەترسان و هەر دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ، بەزیادماندەکرد و دەگەڕاینەوە.

لە ئەو هەموو پۆلۆنییە، تەنیا یەکێکیان کۆمۆنیست بوو، ئەوانی دیکەش، هەموو بێلایەن بوون. زۆر جار پرۆفیسۆر (مارچێنیک)، باسی کوردی دەکرد و هێندێ پرسیاری لێ دەکردم. منیش وەڵامدەدایەوە. ئیدی وا ڕێککەوتبووین، وەک دەڵێن: موو بە نێوانماندا نەدەچوو، بڕوایەکی تەواویان بە من هەبوو.

زەوی ئەو ناوە زۆر ڕەقبوو، دەبووایە، بە شیشێکی نووک تیژ (بوور)، تزیکەی دوو مەتر بە قووڵایی هەڵمانکەندایە. جاری وا هەبوو، کرێکارەکان شیشەکەیان فڕێدەدا و تووڕەدەبوون، دەیانگوت: لەسەر ڕەقانییە و لە ئەوە زیاتر ناڕوا. ئەندازیارێکی پۆلۆنیشمان لەگەڵبوو، خۆی تووڕەدەکرد، شیشەکەی هەڵدەگرت، شێتومۆڕدەبووەوە و بە هەموو هێزی خۆی بایدەدا. ئینجا کەمێکی دیکە دەڕۆی و لەپڕ تریکیشی لێدەدا. کرێکارەکانیش پێدەکەنین و دەیانگوت: براقۆ. ئاخر کەماڵ باوک، بڕوا بە ئێمە ناکەی، ئەوا خوا پێی نواندی!

ڕۆژی دوای نانخواردن، (ڕەحیمەکەچەڵ) یەک دوو قرقینەی گەورەی لێدا. پۆلۆنییەکەش تووڕەبوو، گوتی: ئەوە زۆر ناشیرینە، پێیان بڵێ، جارێکی دیکە ئاگایان لە خۆیان بێ، قرق لێ نەدەن. منیش تێمگەیاندن. (ڕەحیم)یش گوتی: پێی بڵێ، گەر لە خوارەوە بۆیان بەردەینەوە، قسەناکەن، بەڵام هی سەرەوەیان پێ ناخۆشە، بۆ کامیان بۆنی ناخۆشترە؟! ئیدی من لەبەر پێکەنین نەمدەزانی، چی بڵێم. بە خوا برا کورد قسەی خۆشی لایە!

## سەرەتای ناکۆکیی نێوان ئازاد و فەرهاد

لە نێوەراستی مانگی (9)دا بوو، ئێوارەی رۆژی پێنجشەممە، لە (پێنجوێن) گەرامەوە. (ئازاد) هات بۆ لام، زۆر بێ تاقەتبوو، بەتەواوی پەشۆکابوو. منیش گوتم: چی روویداوە؟ گوتی: با بەراستی و بەراشکاوی، هەموو شتێک بۆ باسکەم. گوتم: بۆ تا ئێستە، هیچت لێ شاردوومەتەوە؟ گوتی: بەڵێ. گوتم: جا ئێش لە ئەوە باشتردەبێ، فەرموو. گوتی: من و (فەرهاد)، پێکەوە هەڵ ناکەین. تا بڵێی، پیاوێکی ترسنۆکە و لەبەر ژنەکەی ناتوانێ، ئەرکەکانی سەرشانی خۆی، وەک پێویست جێبەجێکا. خۆی لە زۆر شت دەدزێتەوە.

منیش سەیرم لێهات، گوتم: بۆ تازە دەزانی، (فەرهاد) وایە؟! ئەی سالی **(1974)** لە (پێنجوێن)، وازی نەهێنا و نەیگوت: ئەم کارە بە من ناکرێ، هەر زوروش خۆی بە (بارەگەی بارزانی)دا هەڵواسی! خۆ کوردایەتیش بەزۆر ناکرێ، گەر نایەوێ، کاربکا، وازی لێ بێنە، ئیدی هەموو گرفتەکان کۆتایدێ. گوتی: ئاخر گرفتەکە لە ئەوە دایە، نامەوێ، وازی لێ بێنم. بەڵکوو دەمەوێ، ئەو کەموکوورییانەی نەهێڵم و بە باشی کاربکا. پاشان گەلێ شی دیکەی بۆ باسکردم و رای منی وەرگرت. منیش گوتم: بۆئەوەی هەموو ئەو چەڵەمانە چارەسەرکەین، ئەندامانی سەرکردایەتیش، بەشێوەیەکی راست و دیموکراسی هەڵبژێررێ، باشترین چارەسەر ئەوەیە، کۆنفرانسی بگرین. گوتی: بەڵێ راستدەکەی. من بەتەنیا ناتوانم، ئەم ئەرکە مێژووییە، لەسەر شانی خۆم دانێم.

## رانیێ

کۆمپانیای پۆڵەندی، بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان لە (پێنجوێن) مانەوە و بەشەکەی دیکەشیان، چوون بۆ (رانیێ). کۆتایی مانگی **(9)** بوو، منیان لەگەڵ دەستەی دووەم نانا، گەلێکم پێخۆشبوو، چونکە حەزمدەکرد، بزانم، دوای کارەساتی هەرەس، رەوشی ئەو ناوە چۆنە؟! جگە لە ئەوەی، ماڵی پوورە (سەبیح)م لە ئەوێ بوو، هێندێ برادەری خەڵکی (سولەیمانی)ش، لە ئەوێ کاریاندەکرد.

پۆڵۆنییەکان خۆیان بیستبوویان، کە ئەو ناوچەیە، پێشمەرگەی زۆری لێ هەیە، هەمیشە لەنێوان هێزەکانی سوپای داگیرکەری (عێراق) و پێشمەرگەدا شەرە. یەکەمین رۆژ گەیشتین، سەرمان لە (قایمقام) دا. من نەمدەناسی، بە کوردی هێندێ بە شانوبازووی (بەعس)دا هەڵیدا و پێی گوتم: تێیانبگەیەنە. منیش هەر هێندەم بۆ باسکردن، کە ئەم ناوە هیچی لێ نییە و پێویست ناکا، بترسن. گەر پۆلیسیشتان دەوێ، ئەوا هێزێکتان لەگەڵ دەنێرم. ئەوانیش لە منیان پرسی: تۆ دەڵێی چی؟! گوتم: گەر پۆلیسمان لەگەڵ بێ،

هەمووومان دەکوژن. لەبەرئەوە وا باشترە، هەر خۆمان بڕۆین. ئینجا (قایمقام) ڕێیدایین، دەس بە کارەکانمان بکەین و بە ئازادی، بە ئیوچەکەدا بسووڕێینەوە. سنووری ئیشەکەشمان لە گوندی (سەرسیان)ەوە دەسییێدەکرد، هەر لە ئەو بەر دەربەندەکەی (ڕانی)وە بوو، لە گوندەکانی دەوروبەری شارۆکەی (بنگرد) کۆتاییدەهات. هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو، سواری تیوتاکان دەبووین، بە قەیاغ دەپەڕینەوە، تا کاژێری (3)ی پاشنیوەڕۆ کارماندەکرد.
ئەو ماوەیەی لە ئەوێ کارمدەکرد، دوو کرێکاری لاوم، لە خۆم نزیککردەوە. هەموو ڕۆژێ بەدەم زەوی هەلکەندنەوە، باسی ئەو ناوە و هێزی پێشمەرگەمان دەکرد. پاشان بۆم دەرکەوت، کە دوو کوڕی کوردی چاونەترس و پاکن. لە دوا هەفتەی کارەکەماندا، قسەم لەگەل کردن و وەک دوو دۆستی (پاسۆک) هاتنەریزەوە.
ئەو کاتە، هێندێ جار پێشمەرگە دەهاتنە نێوشار، هێندێ تەقەیاندەکرد و دەگەڕانەوە. هێزەکانی میری، بە تەواوی لەنێوشارەکەدا بلاوبووبوونەوە و دەسەلاتیان پەیداکردبوو. تەنانەت بە شەویش، پاسەوانەکانیان بە جادە و کۆلانەکاندا دەگەڕان. لە دوای کارکردن، هێندێ برادەری وەک (نەجاتی عومەرە گۆج، بەختیار عەبدوللا و جەلال جاف)م دەبینی و پێکەوە دادەنیشتین.
شەوێکیان (نەجات) هات بۆ لام و گوتی: سبەی شەو لەگەل (حەسەنی شیرین) دادەنیشین و دەبێ، تۆش بێی. منیش زۆرم پێخۆشبوو، چونکە (حەسەن) کوڕێکی باش و نیشتمانپەروەر بوو، قسەی خۆشی دەکرد و دەنگیشی خۆشبوو.
کاتێ چووم، (حەسەن) و سێ کەسی دیکەشی لێبوو، نەمدەناسین. خوانیان ڕازاندەوە و تا درەنگانێ، بە خواردنەوە و گۆرانی خۆشەوە ڕامانبوارد. (حەسەن) زۆر دەنگی خۆش بوو، (مامڵێ)یەکی باشی دەگوت. ئیدی شەومان درەنگکردبوو، بەلام زۆری خواردبووەوە، زمانی گۆی نەدەکرد و قاچیشی زەوی نەدەگرت. من و کوڕێکی دیکە، چووینە ژێر بالی. بە ئەو کۆلانە تاریکانەدا دەڕۆیشتین، لەپڕ میلی کلاشینکۆفیان لێ ڕاکیشاین و یەکێ بە عەرەبی گوتی: لە شوێنی خۆتان بوەستن و دەس بەرزکەنەوە. (حەسەن)یش بە کوردی گوتی: خۆمانین! ئێمەش دەسمان هەلبڕی و پێم گوتن: کەستان قسەمەکەن، من وەلامیان دەدەمەوە. پۆلیسەکان هاتنە پێشەوە و ئێمەیان پشکنی. هیچیان نەدۆزییەوە. پاشان داوای ناسنامەیان لێ کردین. ئینجا گوتیان: لە کوێ بوون و بۆ کوێ دەچن؟ هەموویم تێگەیاندن و ئیدی وازیان لێ هێناین. دوای ئەوە جارێکی دیکە بە شەو نەچوومەدەرەوە.

## هێلی کچان

زۆر بە پێویستم زانی، هێڵێکی ڕێکخستن، لەنێو زانکۆی (سولەیمانی)دا دروستکەم. هێندێ خوێندکاری کچم دەناسی، ساڵێ یا دوو ساڵ، لە دوای منەوە بوون و دەیانخوێند. پێوەندیم پێوە کردن و قایلبوون. کچەکانیش (بەدریە کەریم، سەبیحەی حەسەنی قیر و سۆزەی ئەسعەد بەگ) بوون. بەڵام تەنیا هەر پێوەندییان، بە خۆمەوە هەبوو، کەس نەیدەناسین.

## تەقینەوە

سەرەتای مانگی (10) بوو، (ئازاد)م بینی و گوتی: سبەی ئێوارە، (سەروەت) لەگەڵ خۆت بێنە و لەماڵەوە چاوەڕێتاندەکەم. ئەو کاتە، ماڵەکەیان لە گەڕەکی (سەرشەقام) بوو. لە خانوویەکی گەورەدا بوون، حەوشێکی زۆر فراوانی هەبوو. چەن ماڵێکی تێدا دەژیان. خۆی و خێزانەکەی، تاقە ژوورێکیان لەسەر هەیوانی گرتبوو. ئەوە یەکەمین جاربوو، سەردانی ماڵی (ئازاد) بکەم و ناونیشانی خۆیم بداتێ. کە چووین، خوشکە (لەعلی) هاوسەریمان بینی و گەلێ ڕێزی گرتین. دوای ماوەیە، ژوورەکەی بۆ چۆڵکردین.
پاشان (ئازاد) گوتی: ئێمەی ئەندامانی سەرکردایەتی، (5) کەسین. من، (فەرهاد، شێرزاد، جەمال نەبەز و شێرکۆی هەژار). بەڵام لێرە بەتەنیا هەر منتم. من لەگەڵ (فەرهاد)دا ڕێک ناکەوم. یا من یا ئەو دەبێ، یەکێکمان لە ئەم ڕێکخراوەدا نەمێنین. (شێرزاد)یش ئاگای لە هیچ نییە، ئامادە نییە، هیچ کاریبکا. منیش بە تاقی تەنیا، ئەم ڕێکخراوەم پێ بەڕێوەناچێ و وازدەهێنم. بۆ خۆتان خەریکبن و کاربکەن. من و (سەروەت)یش تەماشایەکی یەکدیمان کرد، وەک بمانەوێ، بە یەکدی بڵێین: هێشتا هیچ نەبووە، ئەم دوو هاوبیرە، لەنێوخۆیاندا ڕێک ناکەون، جا گەر سبەی (پاسۆک) پێشکەوت و جڵەوی کارەکانی بەدەسەوەگرت، دەبێ چی بکەن و چۆن لەگەڵ یەکدیدا، هەڵسوکەوتبکەن؟!
بەڵام ئەوە یەکەمین جار نەبوو، من ئەو قسانە ببیستم و هەڵسوکەوتی لە ئەو جۆرە، لە هاوبیرەکانم بەگشتی و لە (ئازاد) بەتایبەتی ببینم. بەڵکوو پێشتر، هێندێ شتی دیکەی وام دیبوو. لەبەرئەوە یەکسەر وەڵامدایەوە و گوتم: دەتوانی، هۆکانیمان بۆ باسکەی؟ گوتی: (فەرهاد) پیاوێکی ترسنۆکە، زۆر جار بەڵێندەدا و جێبەجێی ناکا! خۆی لە کار دەدزێتەوە، لەگەڵ برای خۆیدا پاک نییە، زۆر لەبلەبانە و پتر بەرژەوەندی خۆی دەوێ. وەک ئەوەی خۆی بۆ (پاسۆک) و کورد تەرخانکا!
من تا ئەو کاتە، (فەرهاد)م بەهۆی (فەرەیدوون)ی برایەوە دەناسی. هیچ جۆرە ناسیاوی و تێکەڵاوییەکی نزیکی کۆمەڵایەتی، پێوەندییەکی ڕامیاری و پارتایەتیمان نەبوو.

لەبەرئەوە بە هیچ شێوەیە نەمتوانی، قسەکانی (ئازاد) بسەلمێنم. بەڵام دەمزانی، (فەرەیدوون)ی برای بابی چەتە و لای خەڵکیش، دەسەکەی ئاشکرابوو. چونکە پیاوێکی زۆر هەلپەرست، دووڕوو و داوێنپیس بوو. لە هەر شوێنێ، دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا بهاتایە، ئەو لە ئەوێ، سەرچۆپی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەگرت. هێندەی مەرایدەکرد، بێ ئامبوویبوو، هەر زووش لە ڕیزی یەکێتی قوتابیاندا پێشکەوت!

بۆ نموونە: پێش ئەوەی ڕێککەوتننامەی (**11**)ی مارس دەرچێ، لە ڕیزی جەلالییەکاندا کاریدەکرد و کادیرێکی پێشکەوتووی زانکۆیان بوو. دوای ئەوەی جەلالی و مەلایش تێکەڵاوبوونەوە، لە ماوەیەکی کەمدا، بوو بە ئەندامی بیرۆی جێبەجێکردنی قوتابیان. هەروەها لە (کاژیک)یشدا کاریدەکرد. کاتێ ساڵی (**1974**)یش، جەنگ لە (کوردستان) دەستپێکردەوە، هەر زوو لە دەرەوە، خۆی گەیاندە (نووری شاوەیس) و بوو بە سکرتێری. بە کوردییەکەی، هەرگیز لە شوێنێکدا نەنووستووە، ئاو بچێتە ژێری!

بەڵام من لە خوو و ڕەوشتی (فەرەیدوون)ەوە، تەماشای (فەرهاد)م نەدەکرد. لەبەرئەوەی جیاوازییەکم لەنێوانیاندا دەبینی. (ئازاد)یش چارەی (فەرەیدوون)ی نەدەویست. چونکە هەموو ئەو شتانەی دەزانی و گوتی: ڤیتۆم لەسەرداناوە و نابێ، لە (پاسۆک)دا ئیشبکا!

پاشان باسی چاپێکی بۆ کردین، کە لەگەڵ (فەرهاد)دا فڕاندبوویان. گوتی: پیاوێکی پیر، لەبەردەم فەرمانگەی چاککردنی کشتوکاڵدا، بەرانبەر باخی گشتی دادەنیشت و چاپێکی دانابوو، سکاڵانامەی بۆ خەڵک دەنووسی، ژیانی ڕۆژانەی خۆی و خێزانەکەی پێ دابین دەکرد. ئەو شوێنەمان، بە باشترین شوێن زانی، تا چاپەکە بفڕێنین و بە کۆڵانی گەراجەکەی (سەعەتاکوییی)دا بۆی دەرچین. سەرەتا بڕیاربوو، من و (فەرهاد) ئەو کارە بکەین، بەڵام کاتێ ڕۆیشتین، ئەو هیچی نەکرد و لە ئەوە دەچوو، پەشیمانبوویبێتەوە. منیش بۆئەوەی ئەو هەلە لەدەس نەدەم و چاپێ بۆ (پاسۆک) پەیداکەم، هەر پیاوە پیرەکە لە شوێنی خۆی هەستا و کەمێ دوورکەوتەوە، بە ئەو لاوازی و بێتواناییەی خۆمەوە، لە ناچاریدا، یەکسەر پەلاماری ئەو چاپە قورسەم دا و فڕاندم. کەچی (فەرهاد) خۆی نەکرد بە خاوەنی و یارمەتی نەدام، تەنیا هەر لە نزیک منەوە دەڕۆیشت، منیش حەزم نەکرد، داوای یارمەتی لێ بکەم.

گوتم: بەڵام ئەوە ناهێنێ، ئێوە لە یەکدی زویربن. تۆ دەتوانی، لە کۆنفرانسەکەدا ڕەخنەی لێ بگری و ئەو گرفتانە، بەلایەکدا بخەن. من بە پێویستی نازانم، لە ئەم کاتەدا، لەگەڵ یەکدی تێکچن. بەتایبەتی ئێمە خۆمان، جارێ هیچ نین، وەک دەڵێن: هەمووی دوو کەس و لەتێکین! ئیدی هەرسێکمان بڕیارماندا، بە زووترین کات کۆنفرانس بگرین و هەموو گرفتەکان چارەسەرکەین.

## کۆمەڵە

هەر دوای ڕێککەوتننامەی (**11. 3. 1970**)، ڕۆژی (**10. 6. 1970**)، واتە دوای (**3**) مانگ، کۆمەڵێ کادیری جەلالی کۆن کۆبوونەوە و (کۆمەڵەی مارکسی لینینی)یان دامەزران. لەبەرئەوەی جەلالیەکان، پێشتر لە نێوشار و شارۆچکەکانی (کوردستان)، بە ئاشکرا کاریاندەکرد، ڕێکخستنێکی فراوان و بەربڵاویان هەبوو، هەر زوو توانیان، کادیرەکانیان کۆکەنەوە، ڕێکخستنێکی نهێنی ڕێکوپێک دامەزرێنن و گەشەبکەن.

بەڵام ئەو ڕێکخستنە، هەروا بە نهێنی مایەوە، بێ ئەوەی هیچ جۆرە کارێکی گرنگیان، لە ڕەوشی نەتەوەیی و ڕامیاری باشووری (کوردستان) کردبێ! هەر زووش تووشی گەڵێ گرفت بوون، چونکە جگە لە ئەوەی، خۆیان گرفتی نێوخۆیان هەبوو، دەزگەی پاراستنی (پارتی)ش، هەمیشە چاودێریاندەکردن و بەدوایانەوەبوون. کاتێ ساڵی (**1975**)یش شۆڕش تێکچوو، وەک هەموو پارتەکانی دیکە، هیچیان بۆ نەکرا و بەرەو (عێراق) گەڕانەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، دوای هەرەس لە هەموو لایەنەکانی دیکە، چالاک و کاریگەرتربوون، چونکە ڕێکخستنەکەیان وەک خۆی مابوو، لەنێو شار و شارۆچکەکاندا، دەسیان بە کارکردنەوە کردەوە. بەڵام دیسانەوە هەر زوو، دەزگەی هەواڵگری دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، هەستیان بە جموجۆڵ و چالاکی ڕێکخستنەکەیان کرد، دەسێکی باشیان لێ وەشاندن و کۆمەڵێ کادیری پێشکەوتووی وەک (حەمەی میرزاسەعید)یان گرت، ئەویش خۆی بۆ ڕانەگیرا و لەژێر ئەشکەنجەدا، ناوی هێندێ لە کادیرەکانی کۆمەڵەی درکاند. بۆیە ئەو کادیرانەی لە خۆیان دەترسان و هێشتا نەگیرابوون، خۆیان شاردەوە. تا لە ئەنجامدا بڕیارياندا، ڕوو لە دەرەوەی وڵات بکەن.

لەبەرئەوە ڕۆژی (**14. 9. 1975**)، کۆمەڵێ کادیری سەرکردایەتی کۆمەڵە، وەک (شەهابی شێخ نوری، جەعفەر عەبدولواحید، عومەری سەییدعەلی، فەرەیدون عەبدولقادر و عەلی پچکۆل)، لە شار دەرچوون و ڕوویان لە (ئێران) کرد. بەڵام چاوساغەکەیان سیخوڕی (ئێران) بوو. لەبەرئەوە شەوی (**19/18. 9. 1975**)، لە گوندی (چەمپاراو)، جەندرمەکانی (ئێران) هەموویانیان گرت. ڕۆژی (**1. 1. 1976**)، ڕادەسی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)یان کردنەوە. دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر، بەعسییەکان دادگەیەکیان لە هێندێ کادیری سەبازیی و شۆڤێنی، درووستکرد و دادگایيانکردن.

لە ئەنجامدا، هێندێ لە کادیرەکانیان هیچیان لەسەر نەسەلمێنرا و بەرڵابوون، هێندێکی دیکەشیان وەک (عومەری سەییدعەلی، فەرەیدون عەبدولقادر و عەلی پچکۆل ...)، بە (**6**) ساڵ زیندانیکردن سزادران. بەڵام سێ کادیرەکەی دیکەیان (شەهابی شێخ نوری، جەعفەر عەبدولواحید ئەحمەد و ئەنوەر زۆراب ئەحمەد)، فرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو.

ئەوە بوو، ڕۆژی (**21. 11. 1976**)، دڕندەکانی ڕژێمی داگیرکەری (بەعس)، فرمانەکەیان جێبەجێکرد! ئەوا ئێستە (**42**) ساڵ، بەسەر لەسێدارەدانیاندا تێپەڕدەبێ، ڕەوانیان شادبێ، ناو ویادگاریان هەر زیندووبێ!

## کۆمەڵە و پاسۆک

دوای ئەوەی (سەلامی مەلاعەبدوڵڵا)، لە (ئەڵمانیا) گەڕایەوە، (ئازاد) پێوەندی پێوە کرد و لە ڕیزەکانی (پاسۆک)دا ڕێکخرایەوە. (سەلام) هاوڕێی (تەها باراوی) و (عومەری سەییدعەلی) و ئەو کۆمەڵە برادەرە بوو، کە لە (کۆمەڵەی مارکسی لینینی)دا کاریان دەکرد، زۆر پێش ئێمە هەبوون و لە گۆڕەپانەکەدا، قووڕسایی خۆیان هەبوو!



مامۆستا سەلام عەبدوڵڵا

لەڕێی (سەلام)ەوە، لە مانگی (**9**)ی (**1976**)دا، (ئازاد) لەگەڵ ڕەوانشاد (شاسوار جەلال – ئارام)، یەکتریان بینیبوو، لەسەر بەنارمەی (بەرەی کوردستانیی) دەمەتەقێیانکردبوو. لە کۆتاییدا، لەسەر زۆر شت ڕێککەوتبوون، تەنیا هەر لەسەر سەرکردایەتی کاتی (پارتی)، ناکۆکبوون و ڕێک نەکەوتبوون. (ئازاد) گوتبووی: پێویستە، ئەوانیش پشکوی ئەخرێن و بەرەیان لەگەڵدا بکرێتەوە. (ئارام)یش گوتبووی: ئەوان لە (کوردستان) نین و قووڕسایی ڕامیارییان نییە، ئیدی بۆ بەزۆر زیندوویانکەینەوە؟! (ئازاد) گوتبووی: گەر هەر لە ئێستەوە، بە ئەوە قایل نەبین، کار لەگەڵ (پارتی) بکەین، دیسانەوە تووشی جەنگی نێوخۆ دەبینەوە. یا لە (کوردستان)یش نەبن، گرنگ ئەوەیە، ئێمە لەسەر ئەوە ڕێککەوین، کورسییەکیان بەچۆڵی بۆ بەجێبێڵین، گەر لە پاشەڕۆژدا لە (ئێران) گەڕانەوە، بەشداری شۆڕشەکەیان کرد و بڕوایان بە بەرەی کوردستانیی هێنا، ئەوا شوێنی خۆیان دەگرن، هەموو پێکەوە کاردەکەین و لە جەنگی نێوخۆ دووردەکەوینەوە. گەر نەشهاتنەوە بۆ

(کوردستان)، درێژەیان بە خەباتی رامیاری و چەکداری نەدا، ئەوا هیچمان لەکیس ناچێ و شوێنەکەیان دەفەوتێ. بەڵام (کۆمەڵە)، بڕوای بە ئەو بۆچوونە نەبوو، لەبەرئەوە لەسەر هیچ شتێ ڕێک نەکەوتین و ئەو پرۆژەیە، هەروا مایەوە!

مانگی (11)ی ساڵی (1976) بوو، هێندێ کادیری کۆمەڵە، وەک رەوانشاد (ئارام) و (تەها باراوی)، لە ماڵی (شێخ عوسمان باراوی) زاوام بوون و خۆیان شاردبووەوە. رۆژێ (تەها) بە (سەلاح)ی برامدا، وەڵامی بۆ ناردم و گوتبووی: دەمانەوێ، ببینین. منیش سوور زانیم، بۆ کاری رامیارییە. لە ئەو بارەیەوە، لەگەڵ (ئازاد) قسەمکرد. گوتی: پێویست ناکا، بچی، چونکە هیچ کەڵکی نییە. جگە لە ئەوەی، لە کەناڵی تایبەتی خۆمانەوە، پێوەندیمان لەگەڵیان هەیە و بە ئەم زووانە یەکلاییدەکەینەوە. منیش نەچووم. ئیدی ئەوە دوا هەوڵی پێوەندی نێوان (کۆمەڵە) و (پاسۆک) بوو!

## یەکەمین دانیشتن: کۆبوونەوەیەکی کتوپڕی سەیر!

دوای ئەو دانیشتنەی لەگەڵ (ئازاد) کردمان، ئێوارەی یەکەمین رۆژی جەژنی قوربان بوو، من و (سەروەت) لە یانەی فەرمانبەران دانیشتبووین، نزیکی (11)ی شەوبوو، مامۆستا (قادر مستەفا) خۆی کرد بە ژووردا و منی بانگکرد. ئەو کاتە، نە من و نە (سەروەت)، هیچمان قسەمان لەگەڵی نەبوو. گوتی: هاوبیران چاوەڕێتاندەکەن و کۆنفرانسمان هەیە. (جەلالی حسەکەلۆش)یش، لە دەرەوە وەستاوە و دەبێ، هەر ئێستە بڕۆین. منیش وەک لەبانی بەرمدەنەوە، بە ئەم نیوەشەوە، کۆنفرانسی چی؟! ئەی نابێ، ماوەیە لەوەوبەر ئاگادارمانکەن؟! دیارە شتێ ڕوویداوە و ئێمە نەمانزانیوە!

هەرچی چۆنێ بوو، لەگەڵیان سواربووین و ڕۆیشتین. بە قسەکانی (قادر) و (جەلال)دا وا دەردەکەوت، (ئازاد) فرمانی پێ کردوون، وەک ئەرکێکی ڕێکخستن، ئەمانی بە دوای (فەرهاد) و (شێرزاد)دا ناردووە بۆ (کەرکووک)، گەر رازیش نەبوون، بە ئەو شەوە و بە ئەو چەژنە بێن، ئەوا دەبێ، بە شەق بیانهێنن! دوای ماوەیە، لەبەردەمی ماڵی (فەرهاد)دا دابەزین. ئەو کاتە ماڵەکەیان، لە سەرەتای کۆڵانەکەی نزیک مزگەوتی (سەلیم بەگ) بوو. بەشدارانی کۆبوونەوەکە (7) کەسبوون: من، (ئازاد، فەرهاد، شێرزاد، جەلال، قادر و سەروەت).

هەمووومان لە ژوورێکی چکۆلانەی سەرکۆلانەکەیاندا کۆبووبووینەوە. ژوورەکە زۆر ڕووتبوو، جگە لە چەن کورسی و مێزێ، هیچی دیکەی تێدا نەبوو. کورسییەکانیش بەشی هەمووومانی نەدەکرد، لەسەریان دانیشتین. قاپێ عەرەقی مەستەکی و کۆمەڵێ پەرداخیان دانابوو، چەن مەزەیەکی کەمیشیان دروستکردبوو، گوایە، گەر سیخوورەکانی میری پێیان زانی و هاتنەسەرمان، بڵێین: جەژنی قوربانەوە دانیشتووین و دەخۆینەوە.

سەیر ئەوەبوو، کەس دانەنیشتبوو، هەمووومان بەپێوە وەستابووین، چونکە کورسییەکان بەشی نەدەکرد. جگە لە ئەوەی، لە ژووری سەرکۆلانەکەوە، دەنگمان لەسەر جادەکەی خواریشەوە دەبیسرا! سەرو پێک عەرەقمان تێکرد و ئیدی بوو بە گەرەلاوژێ. (جەلال) و (قادر)، وەک دوو سەربازی گوێڕایەڵ وابوون، هەردووکیان لای (ئازاد)وە وەستابوون، وەک ئەوەی بڵێی، چاوەڕێی فرمانی (ئازاد) بن و بە جووتە، (فەرهاد) و (شێرزاد) داپڵۆسن!

ئەو شەوە، جگە لە (ئازاد) و (فەرهاد)، کەسی دیکە دەنگی لێوە نەهات. (ئازاد) گلەییەکی زۆری لە (فەرهاد) و (شێرزاد) کرد، لەبەرئەوە فریای هیچی دیکە نەکەوتین. باسی هیچ جۆرە شتێکی گرنگ نەکرا. کاتمان درەنگکرد و دەوروبەری چواری بەیانی بوو، هێشتا هەر سەرەتامان بوو. هیچ جۆرە گرفتێکیشمان چارەسەر نەکردبوو. کەس لە کەس تێ نەدەگەیشت. منیش خواردبوومەوە و خەوم دەهات. گوتم: ئەمە نە کۆبوونەوەیە و نە کۆنفرانسە. تازە شەویش درەنگە، با بلاوەی لێ بکەین. هەفتەکەی دیکە، من شوێنتان بۆ دابیندەکەم و هەر زوو دادەنیشین. هەموو قایلبوون و ئیدی بلاوەمان لێ کرد. (جەلال) من و (سەروەت)ی گەیاند و ئەو شەوە، لە ماڵی (سەروەت) نووستم، چونکە لە ماڵی (فەرهاد)ەوە نزیکبوو.

بەیانی کە هەستاین، بیرم لە ئەو هەڵسوکەوتەی (ئازاد) کردەوە، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: گەر (پاسۆک) ئەوەبێ و کوردایەتیش وابێ، ئەوا نەفرەتیان لێ بێ، پیاو لە ماڵی خۆی دانیشێ و سەری خۆی کزکا، گەلێ لە ئەوە باشترە، بەخۆڕای سەری خۆی بیەشێنێ، هیچ ئەنجامێکی نەبێ و دڵی خەڵکیش، لە خۆی برەنجێنێ!

ئەو کاتە (فەرهاد) لەگەڵ خێزانەکەیدا، بە میوانی چووبوون بۆ (کەرکووک). (ئازاد)یش ئەو دوو برادەرەی ناردبووە سەریان و لە ئەوێوە، ڕاپێچیانکردبوون. باشبوو، (فەرهاد) هەر خۆی گەڕابووەوە، خێزانەکەی لە ئەوێ بەجێهێشتبوو، ئەگینا هەر بە ئەو شەوە، هەموومانی دەگرتەدەرەوە!

## دووەمین دانیشتن

مامە (عومەر)م لە (بەغدا) بوو. بە هەلم زانی، کۆبونەوەکەمان لە ماڵی ئەوان بکەین. چونکە لەلایەکەوە، کەس گومانی لە ماڵی ئەوان نەبوو. مامم پیاوێ بوو، هەر خەریکی میوەفرۆشی و خواردنەوە بوو. لەلایەکی دیکەشەوە، ماڵەکەیان زۆر چەپەکبوو، کەس هاتوچۆی بە ئەو ناوەدا نەدەکرد.

ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممەی کۆتایی مانگی **(10)** بوو، ئامۆژن و منداڵەکانیم، نارد بۆ ماڵی خۆمان. هەر زوو من و (سەروەت) چووین بۆ ئەوێ. کەمێکی پێچوو، (ئازاد،

جەلال، مەنسوور و قادر)یش هاتن. ماوەیە چاوەڕوانی (فەرهاد) و (شیرزاد)مان کرد، نەهاتن. پاشان دەمەتەقێ دامەزرا و (ئازاد) گوتی: دەبێ، ئەو دووانە لە (پاسۆک) دەرکرێن. کێ لەگەڵ ئەم پێشنیازەیە، با دەس هەڵبڕێ. خۆی و (جەلال، مەنسوور و قادر)، دەسیان بەرزکردەوە. من و (سەروەت)یش مابینەوە. (ئازاد) گوتی: زۆربە لەگەڵ دەرکردنی ئەو دووانەن.

(ئازاد) پێی وابوو، گەر (فەرهاد) دەرکا، ئەوا (شیرازد)یش یەکسەر وازدێنێ، چونکە ئەو هیچ نەبوو، لەجێی نەبووان بوو، بێ (فەرهاد) هیچی نەدەکرد. ئیدی گورەپانەکەی بۆ تەختدەبێ و بە ئارەزووی خۆی، هەڵماندەسووڕێنێ، کەڵکی لە ئەزموونی کارکردنی نێوانمان وەرنەگرتبوو. کە شتی باوەڕم پێی نەبێ، هێز نییە، بەسەرمدا بیسەپێنێ!

ئینجا من هەڵمدایە و گوتم: من بڕوام بە ئەو زۆربەیە نییە. با ئەمەش نەکەین بە بەزمەکەی (پێنجوێن). دەبێ، ئەو دوو هاوبیرە بانگکرێن و قسەیان لەگەڵ بکرێ. تا بزانین، بۆچی نەهاتوون. گەر خۆیان کاریان لەگەڵ نەکردین، ئیدی ئێوە بۆچی دەریان دەکەن؟! ئەمە کەی پارتە، ئێوە داتان مەزراندووە، هیچ جۆرە شتێکتان نییە، کۆبوونەوە ناکەن، پەیڕەو و پرۆگرامتان نییە. ئیدی بۆچی لۆمەی سەرکردایەتی کۆنی (کاژیک) دەکەن، ئەوانیش هەر پارتەکەیان دامەزراند و ئیدی پاڵیان لێ دابووەوە!

جگە لە ئەوەی نازانم، ئەم کۆبوونەوانە ناودەنێن چی؟! ئاخر کۆنفرانس دەبێ، چەن لیژنەیەکی جیاوازی تێدا هەڵبژێررێ، هەر لیژنەیەک بە جیا، کاری خۆی ڕاپەڕێنێ، پاشان هەموو هاوبیران، گوێ لە ڕاپۆرتەکان بگرن و بە کۆی دەنگ، پەسەندیبکەن. جگە لە ئەوەی دەبێ، ڕاپۆرتی ڕێکخستن، دارایی و گشتی ئامادەکرێ، باسی ڕەوشی (کوردستان) بکرێ، پلانی دوور و نزیک دانرێ، پاشان لە کۆتاییدا، سەرکردایەتی هەڵبژێررێ.

ئینجا (جەلال) و (قادر)یش هەڵیاندایە و گوتیان: ئەم قسانە ڕاستن و با مۆڵەتێکی دیکەیان بدەینێ. (ئازاد)یش هیچ چارێکی نەما و گوتی: ئاخر ئەم جارەش نایەن. منیش گوتم: من بانگیاندەکەم. گوتی: بە بڕوای تۆ، چی بکەین و کەی کۆنفرانس بگرین؟! گوتم: ئەم ماوەیە، لەسەر کاری خۆمان بەردەوامدەبین، پاشان کۆنفرانسی خۆمان دەگرین. بە مەرجێ دەبێ، (فەرهاد) و (شیرزاد)یش ئامادەبن، ژمارەی ئەندامانی کۆنفرانسیش زیادکرێ، تا زۆرترین ئەندام، لە کۆنفرانسەکەدا بەشداربن و بڕیارێکی بنەبڕێ، لەسەر چارەنووس و ئایندەی (پاسۆک) بدەن. گەر ئەو دەسەڵاتەش بە من دەدەن، ئەوا تا ئەو کاتە، من ڕاپۆرتەکانیش دەنووسم، هەر کاتێ لە نووسین بوومەوە، کات و شوێنی کۆنفرانسەکەش دیاریدەکەین. هەموویان گوتیان: باشە، لەسەر ئەو خاڵانە ڕێککەوتین و ئیدی بڵاوەمان لێ کردا

## بەزمی خوالێخۆشبوو مامە شێخ عومەرم

وا بڕیاربوو، ئەو شەوە مامم بێتەوە، من و (سەروەت) لە ئەوی مابووینەوە، سەیری تیلیڤیزیۆنمان دەکرد. لەپڕ یەکێ لە دەرگەی دا، خێرا کردمەوە، مامم بوو، چاوی بە من کەوت، سەیری لێهات، ئاخر دەبێ، من بە ئەو نیوەشەوە، لە ماڵی ئەوان چی بکەم؟!

هاتەژوورەوە و (سەروەت)م پێ ناساند. کەمێ سەیرێکی ماڵەکەی کرد، کەسی دیکەی لێ نەبوو، ژن و مناڵەکانی دیار نەبوون، بە جاری حەپەسا! مامیشم زۆر ترسنۆکبوو، لە ژیانیدا پارتایەتی و کوردایەتی نەکردبوو، هەمیشە دەیگوت: پیاو لەسەر تایەترێ بکوژرێ، نەک لەسەر کورد بیکوژن! هەموو شەوێ نەیخواردایەتەوە، خەوی لێ نەدەکەوت. گەر بەرێکەشەوە بووایە و میوە و سەوزەی بهێنایەوە، ئەوا لە پێشی لۆرییەکەدا دەیخواردەوە. شەویش هەر کاتێ بگەیشتایە، مەزەی خۆی درووستدەکرد. خێزانەکەشی هەڵدەسا و خواردنی بۆ گەرمدەکردەوە. ئیدی تا خەوی لێ دەکەوت، تێر عەرەقی نۆشدەکرد!

دوای ئەوەی کەمێ هێوربووەوە، گوتی: مناڵەکان لە کوێن؟! منیش گوتم: لە ماڵی ئێمەن. گوتی: بۆ؟! هیچ ڕوویداوە؟ گوتم: نەخێر. بەلام تۆ خۆت بگۆڕە و دانیشە، ئێستە هەموو شتێکت بۆ باسدەکەم. من بە تیلەی چاو تەماشامدەکرد، ڕەنگی پەڕیبوو، سەری لێ تێکچووبوو، نەیدەزانی، شتەکانی لە کوێ دایە. خەریکبوو، دڵی دەتەقی. بۆیە یەکسەر هەڵیدایە و گوتی: دە پێم بڵێ، بزانم چییە، وا ئێوە بە جووتە لێرەن؟! گوتم: دڵت هیچ نەکا، تۆزێ ئیشی خۆمان هەبوو. چەن برادەرێکم لە دەرەوە هاتبوونەوە، لێرە چاومان بە یەکدی کەوت و پاشان ڕۆیشتن. ئیدی کە وام گوت، ئاگریکردەوە، هەر هێندەی مابوو، لە داخاندا و لە ترساندا بەرشەقبدا. گوتی: قسەی قۆڕ مەکە، برادەری چی؟ ئەو پیاوە بەرزانە، کێ بوون؟! من و (سەروەت)یش، لەبەر پێکەنین خۆمان بۆ ڕانەدەگیرا.

زانیم، زۆر لێم تووڕەیە، بیرمکردەوە، تۆزێ سەربکەمەسەری و بیترسێنم. گوتم: کەسی وا نەبوون، هەموویان ئاسیاوبوون. (عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە و تەها باراوی) بوون. گوتی: جا ئەو پیاوانە، ئیشیان بە ماڵی من چییە؟! گوتم: بلێم چی، تازە هاتبوون، خۆ دەریان ناکەم. بەلام یەکێکیان لەگەلبوو، ڕەشاشێکی برێنی پێبوو، هەموو سەروچاوی خۆی، بە جامانە و مشکی بەستبوو، گوتی: ئەو گەوادە کێبوو؟! گوتم: بە خوا نەمدەناسی. گوتی: بە خوا لێرە بوومایە، هەر بە جامانە و مشکییەکەی خۆی، چوارپەلم دەبەست، دوو پۆلیسم بۆ بانگدەکرد و بە گرتمدەدا. سەگبابێ وا ئیشی بە ماڵی من چییە؟! گوتم: جگەرەی زەلیشی دەکێشا، هەرچەند مژێلیدەدا، قرچەقرچی لێدەهات. دەتگوت دەمارقاچانە و ژوورەکەشی پڕکردبوو لە دووکەڵ. مامم گوتی: دەبێ، ئەو کەربابە کێ بووبێ، وا دەمارقاچانی کێشاوە؟! گوتم: هەر قسەشیدەکرد، دەیگوت: سیققەتان هەبێ، ئێمە کوردایەتی

دەکەین. مامم گوتی: ئەی ئەی ئەی، ئەو سیقەتە خراپە، بە خوا من سیقەت بە باوکی خۆشم ناکەم. گوتم: بەداخەوە نازانم، کێیوو، نەمناسی. بەڵام دوایی کە ڕۆی، گوتی: هەواڵی مامە (شێخ عومەر) بپرسە و من چاکی دەناسم. مامم گوتی: ڕووی بابی ڕەشبێ، وەڵڵای درۆدەکا، من کرامباوگاوی وا ناناسم، لە ژیانمدا نەمدیوە و ناشمەوێ، ساختەچی وا بناسم. پیاوی دەموچاوی خۆی هەڵپێچێ، دەمارقاچان بکێشێ و بڵێ، سیقەتتان بێ، حاشاوەلیلا نەدەیناسم و نەحەزیش دەکەم، بمناسێ. ئیدی خۆ من و (سەروەت)، لەبەر پێکەنین ژانمانکردبوو. ئەویش لە ترساندا، بە هیچ شێوەیە تێ نەدەگەی و هەستی پێ نەدەکرد، من شۆخی لەگەڵ دەکەم. لە تاواندا گوتی: تۆ خوا تۆ ئەمە بەزمە، بە منی دەکەی؟ من ماندوو و برسی، لە (بەغدا) گەراومەتەوە، دەمەوێ، لە ماڵەکەی خۆم و لەنێو منالەکانمدا دانیشم، قومێ عەرەق بخۆمەوە و بنوم، کەچی تۆ ئەم شەو، ژیان لێ تێکدام. منیش گوتم: بە خوا ئیدی، شوێنێکی دیکەم دەس نەکەوت و لە ئەوە پتر، چارم نەبوو، بڵێین چی، گوێ مەدەرێ، هەمووی بۆ کوردە، بە زایە ناچێ و دەبێ، هەموومان قوربانی بدەین. گوتی: قسەی هیچوپووچ مەکە، قوربانی چی، بەخوا بزانم، شتێ هەیە، قورقوراگەت دەردێنم و بەهەڵواسیتتەدەدەم. من منالم وردە و دڵم بە بەرییەوە نییە، وازم لێ بێنە و ڕاستیم پێ بڵێ.



ساڵی (**2015**) لەگەڵ مامە (شێخ عومەر)م لە گوندی (باراو).

ئینجا زانیم، بەڕاستیتی و زۆر نیگەرانە، گوتم: بڕوابکە، هیچ نەبووە و تەنیا چەن برادەرێکی خۆم بوون، پێکەوە دانیشتین و هێندێ قسەمانکرد. گوتی: ئەی دەمارقاچان و سیققەتەکە؟ گوتم: ئەو قسانە هەر بۆ خۆشیبوو. گوتی: باشە، چۆن هەروا دانیشتوون، بۆ نەچوونە چاخانەیەک و تا درەنگ، بۆ خۆتان دانیشن و قسەبکەن؟ گوتم: ئاخر حەزمان نەکرد، کەس بمانبینێ. گوتی: گەر هەروا دانیشتوون، کوا چیتان خواردووەتەوە؟ گوتم: خواردنەوەی تێدا نەبوو. گوتی: بە خوا ئینجا دەزانم، کۆبوونەوەتان هەبووە. مردووتان نەمرێ، شێتبوون، چی، بۆ واز لە ئەم بەزمە قۆڕە ناهێنن، گەر هەر داشدەنیشن، نەدەبوو، شتێ بخۆنەوە و دوو قسەی خۆش بکەن؟! گوتم: بە پێویستمان نەزانی.

پاشان کەمێ خاوبووە و گوتی: برسیتان نییە؟ گوتم: بەرەوەڵلا، هیچمان نەخواردووە. باشبوو، یەکسەر چوو بۆ مویەقەکە، شفتە و تەماتە و سەوزەیەکی زۆر، دوو پەرداخ و نیوقاپ عەرەقیشی هێنا. گوتم: ئەی پەرداخ بۆ من؟! گوتی: سیققەتت بێ، هەر دانێکت ئەوەندە دەربێ، دەمی لێ نادەی، بڕۆ، با کابرای مشکی بەسەر بۆت تێکا. ئەوان دووقوڵی خواردیانەوە، منیش تا لێبوونەوە هەر تەماشامدەکردن. (سەروەت)یش سەیری منی دەکرد و پێدەکەنی، پێکەکەی بەرزدەکردەوە و دەیخواردەوە!

## ڕاپۆرت

کاتێ گەرامەوە بۆ (رانی)، بڕیارمدا، شەوانە خۆم بۆ نووسینی ڕاپۆرتەکان تەرخانکەم. لە سەرەتای مانگی (11)ەوە، دەسم بە نووسین کرد، دوو بابەتی سەرەکیم هەڵبژارد و هەموو سەردێڕی بابەتەکانیشم دیاریکرد.

یەکەمین بابەت، سەبارەت بە ڕێکخستن و هێندێ زاراوەی ئیتی و ڕامیاری بوو. لە چەن باسێکی لاوەکی دیکەی گرنگ پێکهاتبوو، وەک نەتەوە و مەرجەکانی نەتەوە، ڕێکخراو و جۆرەکانی ڕێکخراو، سەرکردایەتی دەبێ، چۆن بێ و مەرجەکانی چی بێ، ڕەوشتی گشتی، ئەرک و مافەکانی ئەندامان، پرۆسەی ڕەخنە و ڕەخنەلەخۆگرتن، تاکرەوی و دیکتاتور، سیستەمی دیموکراسی و دیکتاتۆری، چۆن دەتوانین، ڕێکخراوێکی نەتەوەیی بەهێز و ڕێکوپێک دامەزرێنین .. هێندێ باسی لاوەکی دیکەشی تێدابوو.

دووەمین بابەت، سەبارەت ڕەوشی ئەو سەردەمەی (کوردستان)، بەرەی کوردستانی، پارتەکان، هەنگاوەکانی ئەم قۆناغەمان و باری نێوخۆی (پاسۆک) بوو. جگە لە ئەوەی ڕۆڵی (کاژیک) و هێڵی ڕاستکردنەوەی (پێنجوێن)یشم باسکردبوو، ڕەخنەیەکی توندیشم لێ گرتبوون.

## دوابڕیـــار

دوای ئەوەی باسەکانم گەڵاڵەکرد، زۆری نەمابوو، بەتەواوی لێیمەوە، ئێوارەی ڕۆژی پێنجشەممەی مانگی (11) بوو، لە (ڕانی) گەڕامەوە و لە باخی گشتی (ئازاد)م بینی. یەکەمین شت، هەواڵی لەسێدارەدانی ڕەوانشادان (شەهابی شێخ نوری، جەعفەر عەبدولواحید و ئەنوەر زوراب)ی پێ ڕاگەیاندم. داخێکی زۆریان، بە دڵی هەردووکماندا کرد. (ئازاد) زۆر بێتاقەتبوو، دەردی دڵی خۆی لای من هەڵڕشت. لە هەمان کاتیشدا، ئیرەیی بە کۆمەڵە دەبرد، کە ڕابەری وا تێکۆشەر و گەورەیان هەیە، دوای خۆشیان، ناو و ناوبانگێکی باش، بۆ کۆمەڵەکەیان بەجێدێڵن. بیری نەتەوەیی و (پاسۆک)یش، بە ئەو بێکەسی و گرفتە زۆرەوە داماوە!

هەر ئەو ڕۆژە، لەسەر شوێن و کاتی کۆنفرانسەکە، هێندێ دەمەتەقێمانکرد. من پێم باشبوو، ڕۆژی (1. 1. 1977)، کۆنفرانسەکە بگرین. چونکە شەوی (31. 12)، هەموو خەڵک خەریکی یادکردنەوەی جەژنی سەری ساڵی نوێ دەبن، جادە و کۆڵانەکان چۆڵدەبن، هاتوچۆ کەمتردەبێ و کەمترین کەسیش نەمانبینن. هێزەکانی دوژمنیش، لەبەر ئاهەنگێڕان، ئاگایان لە ئێمە نابێ و لە ئەو باوەڕەشدا نین، کۆمەڵێ لاوی کورد هەبن، لە ئەو کاتەدا خۆیان بە کاری ڕامیارییەوە خەریککەن. (ئازاد) زۆری پێ باشبوو. (مەنسوور)یشم لە ئەو بڕیارە ئاگادارکرد، کە دانیشتنەکە لە ماڵی خۆیان دەبێ، چونکە ماڵی ئەوان، لە گەڕەکی شێخان و پشت مزگەوتی (بنتەبەق)ەوە بوو، ئاقە ماڵبوو، دراوسێیان نەبوو، زۆر ڕێی هاتوچۆی بەسەرەوە نەبوو.

ئیدی دوابڕیار ئەوەبوو، من (فەرهاد) و (شێرزاد) بانگکەم، هێندێ هاوبیری دیکەش، لە کۆنفرانسەکەدا بەشداربن، کاژێری (9)ی سەرلەبەیانی، ڕۆژی (1. 1. 1977)، هەموومان لە ماڵی (مەنسوور) ئامادەبین. دوو ڕۆژ پێش دانیشتنەکەش، (فەرهاد)م دۆزییەوە و ئاگادارمکردەوە. گوتی: جا کەڵکی هەیە؟ گوتم: ئێوە وەرن، بە هەموومان هەوڵێکدەدەین، گەر هیچی لی سەوز نەبوو، ئەوا هەمووومان بڵاوەی لی دەکەین! هەرچی چۆنێ بوو، (فەرهاد)م ڕازیکرد، خۆی و (شێرزاد)، بەشداری لە دانیشتنی ئەم جارەدا بکەن.

## سێیەمین و دوادانیشتن

بەیانی زوو هەستام و خۆم پێچایەوە. هەردوو دەفتەرە (100) لاپەڕەییەکەم هەڵگرت و بەرەو ماڵی (مەنسوور) ڕۆیشتم. کاژێری (9)ی ڕێک، هەموو هاوبیران ئامادەبوون. بەشداراتی کۆبوونەوەکە ئەمانە بوون: (ئازاد مستەفا، لیوا مەنسووری شێخ کەریمی حەفید، فەرهاد عەبدولقادر، شێرزاد فاتیح، سەروەت موحەممەد ئەمین، حوسێن

موحەممەد عەزیز، عیرفان عەبدوڵڵا، قادر مستەفا و جەلالی حاجی حوسێن). بڕیاربوو، ملازم (شوان)، هەردوو مامۆستا (فەرهاد سدیق) و (سدیق) ناوێکی دیکەش بێن، بەلام بۆیان هەڵ نەسووڕابوو، ئامادەبن.

هەموو هاوبیران، بەرانبەرم دانیشتبوون، میز و کوردسییەکیشیان، بۆ من دانابوو، تا ڕووبەڕوویان، ڕاپۆرتەکان بخوێنمەوە و دەمەتەقێی لەسەر بکەین. لە کاژێری (9) تا (13)، ڕاپۆرتی یەکەمم تەواوکرد. پاشان کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ هات، خاتوو (ئاسکە)ی دایکی (مەنسوور)، گفتەسلقاوێکی زۆر خۆشی لێنابوو. دوای نانخواردن و چاخواردنەوە، کاژێری (15) ڕاپۆرتی دووەمم دەسپێکرد. بەداخەوە، جگە لە (ئازاد)، کەسی دیکە نەبوو، دەمەتەقێیەک لەسەر نێوەڕۆک و ئامانجی باسەکان بکا! هەر زۆر هەستمپێکرد، کە ئاستی ڕووناکبیری و هوشیاری ڕامیاری هاوبیران نزمە، زۆر کارێکی قوورسە، بە ئەو کۆمەڵە کادیرەوە، وەک پێویست بتوانین، کارەکانی (پاسۆک) ڕاپەڕێنین، نموونەیەکی سەرکەتووی ڕامیاری، پێشکەش بە ڕۆڵەکانی گەلەکەمان بکەین، سەرکردایەتی پارت و گەلی بکەین!

سەرەتا ڕەخنەیەکی زۆرم لە (ئازاد) گرت، کە بە ئەو شێوەیە، ڕەفتاری لەگەڵ هەردوو هاوبیر (فەرهاد) و (شێرزاد) کردووە. هاوبیران (جەلال) و (قادر)ی بە دوایاندا ناردووە. پاشان دژی بلاڤۆکەکەی ڕۆژی (25. 1. 1975)ی (پێنجوێن) دوام و بە هەڵەیەکی مێژوویی گەورەم دانا. بە ئەو شێوەیە، ڕاپۆرتی یەکەمم پێشکەشکرد و لە زۆربەی بەشەکاندا، دەمەتەقێی توندوتیژ، لەنێوان من و (ئازاد)دا دەسپێکرد. هێندێ جار بڕوای پێ دەهێنام و منیش، لە بۆچوونەکانی خۆم پەشیمانەبوومەوە. هێندێ جاری دیکەش، بە پێچەوانەوە بەڵگەکانی لاوازبوون، بەلام هەر لەسەر بۆچوونەکانی خۆی سووربوو!
بۆ نموونە:

باسی (شێرکۆی هەژار) و (جەمال نەبەز) کرا، (ئازاد) گوتی: پێویستە، هەردووکیان لە سەرکردایەتیدا دابنرێنەوە. من زۆر بە توندی، دژی پێشنیازەکەی ڕاوەستام و گوتم: ئەندامانی سەرکردایەتی دەبێ، لە (کوردستان) بن. جگە لە ئەوەی خۆیان لێرە نین، کێ دەڵێ، بە ئەوە قایلدەبن، پێکەوە کاربکەین؟! یا بە ئەوە ڕازیدەبن، وەک ئەندامێکی سەرکردایەتی (پاسۆک) کاربکەن؟! با گەر ئەوان دەیانەوێ، لە (ئەورووپا) ڕێکخراوی خوێندکاران دامەزرێنن و بە ئەو ناوەوە کاربکەن، تا بۆ (کوردستان) دەگەڕێنەوە. باش بوو، دەمەتەقێیەکی زۆر، لەسەر ئەو بابەتە کرا و لە ئەنجامدا، هەموویان بە پێشنیازەکەی من ڕازیبوون. ئیدی (ئازاد) بێدەنگبوو.

هەروەها باسی گرتنی هێڵی چەماوە و ڕێکخستنی (پاراستن)، لەنێو (پاسۆک)دا کرا. من ڕەخنەم لە (ئازاد) گرت، چونکە دوای کۆبوونەوەکەی ماڵی (سەروەت)، لەگەڵ (سەباح

یاسین)دا، ئەو هەنگاوەی نابوو. هەموو بە یەک دەنگ بریارماندا، بە هیچ شێوەیە، لاسایی (پارتی) نەکەینەوە، ئەو جۆرە دەزگایانە دامەزرێنین و لە بڕوای هاوبیران کەمکەینەوە.

دانیشتنەکە زۆری کێشا، چاوم لێبوو، (مەنسوور) هەر خێراخێرا تەماشای کاتژمێرەکەی دەستی دەکرد، دیاربوو، کارێکی تایبەتی هەبوو. چونکە لە (ناسریی)ەوە هاتبووەوە. بۆیە گوتی: ئەو راپۆرتە زۆر درێژە، هەر کەسی مانگێ دانیشێ و چەن پەرتووکێ بخوێنێتەوە، دەتوانێ، راپۆرتێکی وا بنووسێ، ناویشی نابوو: (ئەتروحەکەی شێخ حوسێن!)، منیش کە گوێم لە ئەو قسانە بوو، بەزەیم بە خۆمدا دەهاتەوە، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: خۆم بۆ کێ ماندوودەکەم؟! بەڵام وەڵامم نەدایەوە!

مامۆستا (شێرزاد)یش دەمێبوو، پرخەیدەهات، جارجار رادەچڵەکێ و دەیگوت: کاک (حوسێن) راپۆرتێکی باشی نووسیوە، بەڵام کاتەکەمان درەنگکرد، ترۆمبێل بۆ (کەرکووک) نامێنێ و دەبێ، ئەم ئێوارەیە بگەرێمەوە! ئاخر ئەمە چ قسەیەکە؟ وەک لە کۆنفرانسەکەدا، یەک وشەی باش و خراپی، لەدەم دەرنەهات، نازانم، ئێستە بۆ پەلەیەتی، ئەدی بۆچی هاتووە؟! ئایا دەیویست، بە چ شێوەیە، گرفتەکانی (پاسۆک) یەکلایکاتەوە؟! پیاوێ ئامادەنەبێ، لەپێناوی باوەڕ و رێکخراوەکەیدا، قوربانی بە کاتی خۆی بدا، ئایا چۆن دەتوانێ، رازەی بیروباوەڕ و گەلەکەی بکا؟!

بەراستی سەیرم لێدەهات، دوای (20) ساڵ، (کاژیک) هەوڵی بۆ بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی لە (کوردستان) داوە، ئەوانەش کادیرەکانی بن! سەرکردەکانی (کاژیک)، نەک کاری رامیاری، بەڵکوو کەر تەنیا هەر، پیازیشیان پاککردایە، هەرگیز وەک ئەو رۆژە و بە ئەو شێوەیە، مایەپووچ دەرنەدەچوون!

## دووەمین وازهێنانی ئازاد

(ئازاد)، دوای ئەوەی گوێی لە هەموو راپۆرت و دەمەتەقێکان بوو، زانی، ئەو پلانەی داینــاوە، سەرناگرێ، هەستا و گوتی: من وازدێنم و چیدیکە کارناکەم، گوتم: بۆ؟ هۆکانیمان بۆ روونکەرەوە. گوتی: باوکم سوێندیخواردووە، گەر کاری پارتایەتی بکەم، دایکم دەردەکا و لێی جیادەبێتەوە. منیش نامەوێ، ماڵ لە باوکم و خوشکەکانم تێکبدەم. ئیدی کەس قسەی پێ نەما. بەراستی من دەمزانی، ئەوە تەنیا بیانووە، چونکە لەلایەکەوە، هەرچەندە (ئازاد)، کوڕە تاقانەی دایک و باوکی بوو، بەڵام ئەو لەپێناوی کوردایەتیدا، هەرگیز گوێی بە دایک و باوک، خوشک و خزم، ژن و منداڵ نەدەدا!

لەلایەکی دیکەشەوە وایدەزانی، من بەربەرەکانێدەکەم و دەمەوێ، پلەوپایەکەی لێ داگیرکەم. لە هەمان کاتیشدا دەیویست، بۆ هەموو هاوبیران بەگشتی و بۆ (فەرهاد) بە

تایبەتی بسەلمێنێ، بێ ئەو هیچ جۆرە کاری سەرناگرێ و ئیشی (پاسۆک) دەوەستێ! واتە گەر وازبێنێ، (پاسۆک) هەڵدەوەشێتەوە! منیش گوتم: کوردایەتی بەزۆر ناکرێ، گەر (ئازاد) وازدێنێ، فەرموون با بزانین، کێ کاردەکا و چیتان پێ دەکرێ؟! کەسی نەبوو، وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە، تەنیا (جەلال، عیرفان، قادر و مەنسوور)، زۆریان لێ کرد، وازنەهێنێ و کاربکا. بەڵام سەیر ئەوەبوو، (ئازاد) بە هیچ جۆرێ، باسی گرفتەکانی نێوان خۆی و هەردوو نەیارەکەی (فەرهاد) و (شیرزاد)ی نەکرد، کە پێشتر بە باسی ئەوانەوە، سەری ئێمە و خۆشی جەنجاڵکردبوو!

## پەشیمانبوونەوەیکی چاوەڕوانکراو

لە ئەو کاتەدا، دایکی (مەنسوور) لە دەرگەی دا و هەموومانی گوێقوڵاخکرد. (مەنسوور)ی بانگکرد. پاشان هاتەوە و گوتی: هەواڵێکی سەیر. ئەوە (سەرداری سەعید خەلەف) بوو، (ستار)ی برای لەنێوشارە و دەیەوێ، نوێنەرێکی (پاسۆک) ببینێ. منیش یەکسەر پێم گوت: پێی بڵێ، دوو کاژێری دیکە بێتەوە و وەڵامەکەی لێ دەگێرینەوە، چونکە من دانیشتنەکەم بەڕێوەدەبرد.

ئینجا باری کۆنفرانسەکە گۆڕا. (ئازاد) هەستایە سەرپێ و گوتی: من و (مەنسوور) دەچین. منیش یەکسەر لە قاقدا گرتم و گوتم: تۆ دەڵێی، من بە هیچ شێوەیە کارناکەم، ئایا وەک کێ دەچی؟! یەکسەر بایدایەوە و گوتی: ئێستە، بارودۆخێکی نوێ هاتووەتە پێشەوە و دەبێ، ئەو هەلە لەکیس خۆمان نەدەین، (ستار) و ئەوان لە (پاسۆک)دا ڕێکخەین و جێپێی خۆمان، لەنێو هێزە چەکدارەکاندا بکەینەوە. من دەزانم، کارەکان بێ من ناڕوا، بۆیە بڕیارمدا، وازنەهێنم و بەردەوامبم. منیش پێکەنینی گرتمێ، سەیرێکی هاوبیرەکانم کرد، کەسی نەبوو، پێی بڵێ: ئەی ناترسی، باوکت واز لە دایکت بێنێ؟!!

پاشان گوتم: گەر (ئازاد) پەشیمانبووەتەوە و کارمان لەگەڵ دەکا، وابزانم، ئەو گرفتە تەواوبوو. ڕاپۆرتەکان خوێنرانەوە، دەمەتەقێی تێروتەسەلیان لەسەر کرا. ئێستەش کاتی ئەوە هاتووە، دەنگیان لەسەربدەن، ئایا لاتان پەسەندن، یانا؟ بە تێکرای دەنگ هەموویان پەسەندیانکرد. گوتم: ئیدی دواقۆناغ ماوە. ئەویش ئەوەیە دەبێ، ژمارەی ئەندامانی سەرکردایەتی دیاریکرێ و سەرکردایەتییەکی کاتی هەڵبژێررێ، تا کۆنگرە دەگیرێ، کاروبارەکانی (پاسۆک) ڕاپەڕێنێ. بە مەرجێ تا ئەو کاتە، سکرتێر دەستنیشان نەکرێ، هەر بە کۆمەڵ کاربکەن و بڕیاربدەن.

(ئازاد) دەستی جلی کوردی لەبەردابوو، هەستایە سەرپێ، دەستیشی کردبوو بە بەر پشتێنەکەیدا و گوتی: هەڵبژاردنی سەرکردایەتی، هێندە کارێکی گران نییە. من و (فەرهاد،

شێرزاد، مەنسوور، جەلال و عیرفان)، ئەندامی سەرکردایەتی دەبین. کەس ڕەخنەی هەیە؟! کە ئەو قسانەیکرد و ئەو هەڵوێستە ناشیرینەی نواند، یەکسەر وەک (سەددام حوسێن) هاتەپێش چاوم و زانیم، ئەو هەموو شەرەی بۆیە دەفرۆشت، خۆی تەسکدەکردەوە و دەیگوت: نایکەم، بۆئەوەی کەسی نەبێ، قسە لە قسەیدا بکا و ڕۆڵی کەلەگایەتی خۆی ببینێ. منیش گوتم: بەڵێ، من ڕەخنەم هەیە، چونکە من لێرە، مۆمیا نەکراوم! گوتی: تۆ تەنیا کەسێکی، ڕەخنەت هەیە، ئێمە زۆربەین و زۆربەش، واتا دیمۆکراسی. منیش گوتم: تۆ جارێ دانیشە. با دەمەتەقێیەک لەسەر ئەو ئەندامانە بکەین، کە بۆ سەرکردایەتی هەڵتبژاردوون. گوتی: فەرموو.



لە (مەنسوور)ەوە پێیدا هاتم و گوتم: لە سەرکردایەتیدا، چ کارێکی پێ دەسپێری؟ گوتی: دەیکەم بە لێپرسراوی ڕۆشنبیری (پاسۆک)، گوتم: (مەنسوور) یەکەم لە (ناسریە)یە، مانگێ جارێ دێتەوە، (پاسۆک) پێویستی بە یەکێکە، هەمیشە لێرەبێ، بخوێنێتەوە و خۆی پێبگەیەنێ. دووەم: ئەو بۆ ئەو کارە ناشێ، چونکە لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە، لاوازە و کاری ئەو نییە. گەر بڵێی، دەیکەم بە لێپرسراوی پێشمەرگەی نێوشار، ئەوا من هیچ قسەیەکم نییە. گوتی: ڕاستە. بەڵام زۆر گرنگ نییە، خۆم یارمەتیدەدەم.
گوتم: ئەی (جەلال) و (عیرفان)، چییان پێ دەسپێری؟! گوتی: (عیرفان) لە سوپای (عێراق)دا عەریف بووە، شارەزای کاری سەربازی و پرینسیپەکانی سوپا هەیە، دەیکەم بە لێپرسراوی کۆمیتەی سوپایی. (جەلال)یش دەکەم بە لێپرسراوی پێشمەرگەی نێوشار. منیش گوتم: ئەمە وەک ئەوە وایە، کا لەبەردەم سەگ و ئێسک لەبەدەم ئەسپدا دانێی.

ئاخر (مەنسوور) كۆلێژی سەربازی (عیراق)ی تەواوكردووە، لە دەرەوە سەرلقبووە، لە (كاژیک)یشدا ئەندامی كۆمیتەی سوپایی بووە، تۆ تازە دەیكەی بە لێپرسراوی رۆشنبیری؟! خەریكبوو، پرسیاری (شێرزاد) و (فەرهاد)ی لێ بكەم، (مەنسوور) گوتی: من شوێنەكەی خۆم، بۆ هاوبیر (حوسێن) چۆڵدەكەم. (جەلال) و (عیرفان)یش، هەر بەهەمان شێوە هەستان و گوتیان: ئێمەش هاوبیر (حوسێن) دادەنێین. منیش گوتم: زۆر سوپاستان دەكەم. بەلام ئێوە شوێنەكانی خۆتان بۆچی بۆ من چۆڵدەكەن؟! ئاخر ئێوە كێ هەڵیبژاردوون، تا پۆستەكانی خۆتان ببەخشنەوە؟! خۆ جاری هەڵبژاردن نەكراوە و كەس ئەندامی سەركردایەتی نییە، ئەوە تەنیا رای هاوبیر (ئازاد)ە و هەر لە خۆیەوە، ئێوەی داناوە!

ئینجا (ئازاد) گوتی: ئەی تۆ دەڵێی چی و كێت لا پەسەندە؟ گوتم: من دەڵێم، پێویستە، هەموو شتێ بە شێوەیەكی رێكوپێک و دیموكراسی بەرێوەبچێ. پێشەكی دەبێ، ژمارەی ئەندامانی سەركردایەتی دیاریكەین. تا بزانین، چەن كەسمان دەوێ. پاشان دەبێ، هەڵبژاردنبكەین. هەر هاوبیرێ ئازادە، لە ئەوەی خۆی دەپاڵێوێ، یا كێ هەڵدەبژێرێ. كێ زۆربەی دەنگەكانی هێنا، ئەوە دەردەچێ. (ئازاد) هەستایەوە و گوتی: ئەوە بۆ كۆنگرە دادەنێین، ئێستە ئێمە كەمین و ناتوانین، ئەو كارەبكەین. منیش گوتم: من جارێكی دیكە، گاڵتەجارەكەی (پێنجوێن) دووبارەناكەمەوە. هەڵبژاردن نەكەین، من بە هیچ شێوەیە ئامادەنیم، گوێتان لێ بگرم. گوتی: باشە، گەر تۆ لە ئەم چەن هاوبیرە، سەركردایەتی بۆ (پاسۆک) هەڵبژێری، كێ هەڵدەبژێری؟ گوتم: پێم وایە، لەنێو ئەم هاوبیرانەدا، تەنیا (3) كەس شایانی ئەوەن، بۆ سەركردایەتی هەڵبژێررێن: من، تۆ و (فەرهاد). من بۆ رێكخستن، تۆ بۆ نووسین، (فەرهاد)یش بۆ پێوەندییەكان. ئەمە سەركردایەتییەكی ئاشكرا و مەیدانی دەبێ. بەلام (3) كەسی دیكەش هەن، كە من قسەم لەگەل كردوون، تەنیا دوای كۆنفرانس، بە ئێوەی دەناسێنم، گەر رازیبوون، ئەوا ئەوانیش وەک سەركردایەتییەكی پشت پەردە و نهێنی، كارمان لەگەڵ دەكەن. ئێوە پێویستە، تەنیا هەر بیر لە خۆتان و ئێستە نەكەنەوە، چونكە هەموو شتێ هەر تۆ بێ:

یەكەم: كارەكانت بۆ بەرێوەنابرێ،

دووەم: هەر تاقەتتچوو، ئەم جارەش وازدێنی، (پاسۆک)یش پەكیدەكەوێ و رادەوەستێ،

سێیەم: هێشتا (بەعس) زەفەری پێ نەبردووین و رێكخستنەكەمان ئاشكرا نەبووە، گەر سبەینێ ئێمە گیراین، ئەوا ئەو (3) هاوبیرەی دیكە، لەسەر كاركردن بەردەوامدەبن.

هەروەها دەبێ، بیر لە ئەوەش بكەینەوە، گریمان یەكێ لە ئەم هاوبیرانە گیران و ناوی ئێمەیان دا، ئێمەش یا دەگیرێین، یا رادەكەین. ئەو كاتە ئەو سیانەی دیكە، شوێنەكانمان

پردەکەنەوە و سەرکردایەتی (پاسۆک) دەکەن. (ئازاد) گوتی: ئەمە کۆنفرانسە و دەبێ، ناوی ئەو سیانەمان پێ بڵێی. منیش گوتم: هەموو شتەکانم بۆ ڕوونکردنەوە، ناوی ئەو سیانە، تەنیا لە ئەو کاتەدا دەڵێم. ئینجا گوتی: ئێمە تازە، سەرکردایەتیمان هەڵبژاردووە و دەمەتەقێ تەواوبوو. گوتم: گەر ئەو هاوبیرانە، بە ئەو خۆسەپاندنەی تۆ ڕازیبن، هیچ هیوایەکم پێیان نییە. هەروەها ناتوانم، لەگەڵ تۆشدا کاربکەم، گەر ئەوە ڕەفتارتبێ. ملی خۆشم بەخۆرای، لە چەقۆی کەس ناسووم، تۆش هەر جارێکم دەخەڵەتێنی. لەبەرئەوە منی تێدانیم و داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەم!

دەفتەرەکانم کۆکردەوە، ویستم، بڕۆم. (ئازاد) گوتی: ئەو نووسینانە، کۆنفرانس بڕیاری لەسەر داوە، موڵکی (پاسۆک)ە و نابێ، بیبەی. منیش گوتم: کام کۆنفرانس و کام (پاسۆک)؟! ئەمانە هەموویان خۆم نووسیوومن، شتی زۆر گرنگیان تێدا هەیە و ناوی ئاشکرای خەڵکی تێدا نووسراوە، حەزناکەم، لای ئێوە بێ. گوتی: من جارێکی دیکەی دەیخوێنمەوە و هەر کاتێ ویستت، بەدەستدەکەویتەوە. بە ناوی (پاسۆک)یشەوە ئاگادارتدەکەمەوە، پێوەندی بە هەر هاوبیرێکەوە بکەی، یا نهێنییەکانمان بدرکێنی، لێت قەبووڵ ناکەین. تەنانەت لای (سەلاح)ی براشت نابێ، هیچ باسکەی. منیش تەماشایەکمکرد و گوتم: گەر من کارتان لەگەڵ بکەم و (بەعس) بمگرێ، سزاکەی چییە؟! گوتی: کوشتنە. گوتم: کەواتە زۆر سوپاس، کە تۆ هێندە منت خۆشدەوێ، ملی منت لە پەتی سێدارە ڕزگارکرد. من جارێکی دیکە، لەگەڵ تۆدا کارناکەم، بڕواشم نییە، دوای ئەم هەموو شەڕەدنووکە، ڕێکخراو دروستکەم، سەریشتان لێ تێک نادەم، پێوەندیش بە کەسەوە ناکەم. هەر کاتێ وەک برادەر، نەک وەک هاوبیر، هەر کارێکتان بە من هەبوو، ئامادەم بۆتان جێبەجێکەم. پێویستیش ناکا، هەڕەشەبکەی، چونکە نەک هەر لێتان ناترسم و ئێستە، هیچتان پێ ناکرێ، بەڵکوو (10) ساڵی دیکەش خەباتبکەن، ئەمە کردار و ڕەفتارتانبێ، بە ئەو شێوەیە بیربکەنەوە، تا ماون، بە هیچ نابن و چۆلەکەیەکیشتان پێ ئاوەڕووت ناکرێ! ئیدی من چوومە دەرەوە و ئەوانیش بە دوامدا هاتن.

ئێوارەبوو، دونیا تاریببوویوو، (سەرداری سەعید خەلەف)، لە دەرەوە چاوەڕێیدەکرد. من و (سەروەت)، کەمێ لێیان دوورکەوتینەوە. (سەروەت) گوتی: چاوت لێبوو، هیچ کەڵکی نەبوو، ئەم پیاوە هەرگیز چاک نابێ، منیش وازدەهێنم. منیش گوتم: ئەی بۆ لە ئەوی هیچ قسەت نەکرد؟! حەزیش ناکەم، لەبەرخاتری من وازبێنی. بەڵکوو دەمەوێ، خۆت بە ئەو بڕوایە بگەی، کە (ئازاد) هەرگیز چاک نابێ، کەس لەگەڵی هەڵ ناکا و ناتوانێ، لەدەس دووڕوویی و کەلەگایی خۆی ڕزگارکا. ئەو کاتە وازبێنە. کێ دەڵێ، منیش ماوەیەکی دیکە، تێهەڵ ناچمەوە؟!

سەیر ئەوەبوو، من ئەو هەموو داکۆکییەم، لە (فەرهاد) و (شێرزاد) کرد، ئەوانیش سەریان داخستبوو، متەقیان لە خۆیان بڕیبوو، دیارە (ئازاد) باشی ناسیبوون، چۆن پیاوێکن، بۆیە لە پاشملە، بە ئەو شێوە خراپە باسیدەکردن، کەچی ئێستە، موو بە بەینیاندا ناچێ، لە ئەوە دەچێ، دوودێوی یەک دراوبن. لەبەرئەوە پەلەمەکە، ئاییندەیان باش نابێ و چەندین جاری دیکەش تێکدەچنەوە! ئیدی لە یەکدی جیابووینەوە.

منیش بەدەم ئەو داخ و پەژارە و ژانە گرانەی (پاسۆک)ەوە، خۆم گەیاندە لای مامە (شێخ عومەر)م. لەبەر خۆمەوە دەمگوت: ئەم شەو شێخەکەم، دەردی دڵەی بیمارم تیمار نەکا، بڕواناکەم، خەو لە چاوانم بکەوێ! ئیدی بە ئەو شێوەیە، گوتایم بە هەموو شتێ هێنا. بەڵام سوور دەمزانی، تا سەر کەسیان لەگەڵ (ئازاد) هەڵ ناکەن و هەر زوو وازدێنن. تەنیا لە ئەوە دەترسام، (بەعس) دەستێکیان لێ بووەشێنێ، ئەو کوڕە گەنجە چاکانە، بە خۆڕایی تیدابچن!

لە ڕاستیدا، من بە هیچ جۆرێ، هەوڵی ناکۆکی و دووبەرەکیم نەداوە، تەنانەت ئەو دەنگوباسانەم، بۆ (سەلاح)ی براشم نەگێڕایەوە، نەک لەبەر هەڕەشەکەی (ئازاد) بووبێ، بەڵکوو حەزمدەکرد، ئەو هاوبیرانە خۆیان، لە ڕاستی تێبگەن و بڕیاربدەن، کە چەن دەروونێکی نەخۆشی وێرانی هەیە و هەر تاوەناتاوێ، هەرایەک دروستدەکا و بە یەکیکەوە دەیگرێ. سووریش دەمزانی، هەموو هێزی (پاسۆک) کۆبنەوە، کە ئەو کاتە، لە (20) کەس تێپەڕی نەدەکرد، جووچکەقازێکیان پێ سەرنابڕێ!

بەڵام ئەو هێلە پچووکانەی، لەنێو کرێکارانی (پێنجوێن) و (ڕانیە) و هێلی کچانی زانکۆدا دروستکرابوون، نە ئەوان لێیان پرسییەوە، نە منیش ناوەکانیانم دانێ. هەرچەند (ئەحمەد) لە (پێنجوێن)ەوە هات و گلەییەکی زۆری کرد، گوتی: تا ئێستە، کەس پەیوەندی پێوە نەکردووم. منیش گوتم: لەبیر خۆتی بەرەوە، چونکە ئەو ڕێکخراوە نەماوە!

## سەردانێکی چاوەڕواننەکراو!

ڕۆژی دوای کۆنفرانسەکە، بەیانییەکی زووبوو، هێشتا لەنێو جێدا بووم، لە دەنگی زەنگی دەرگەکە ڕاچڵەکیم. مناڵەکان کردیانەوە و سەیرمکرد، (ئازاد) بوو، خۆی کرد بە ژووردا، سڵاویکرد و دانیشت. زۆر داوای لێبووردنی کرد و گوتی: بۆیە بە ئەم بەیانییە زووە هاتووم، یەکەم لەڕێی کارەوە هاتووم. دووەمیش گوتم، با فریایکەوم، نەبا بکەڕێیتەوە بۆ (ڕانیە). منیش بەخێرهاتنمکرد و بەرانبەری دانیشتم، گوتم: فەرموو. گوتی: با سەبارەت بە کۆنفرانسەکە، هێندێ قسەبکەین. منیش گوتم: کۆنفرانسی چی؟ تازە هەموو شتێ کۆتاییهات، باسی چی بکەین؟ گوتی: تۆ نابێ، لێم زویربی، چونکە من و تۆ، نەک هەر

هاوبیری یەکدین، بەڵکوو براین. من هەرگیز واز لە تۆ ناهێنم، کادیری لە تۆ کۆنتر و باشترمان نییە. ئەو شتانەی تۆ نووسیبووت، هەر هەموویان ڕاستن و بڕوام پێیان هەیە. هەرچیش ڕوویدا، خوا ئاگادارە، گوناهی منی تێدا نییە. مەرجی (فەرهاد) ئەوەبوو، تۆ لە سەرکردایەتیدا نەبی، ئەم شەویش ئەو پەیڕەو و پڕۆگرامەم نووسیوە، ئەمەش ڕەشنووسەکەیەتی بۆم هێناوی، بیخوێنەرەوە و بیروڕای خۆتی لەسەر دەربڕە. ماوەیەکی دیکە، هەموو شتی ئاسایی دەبێتەوە.

من ئەو قسانەم لا سەیر نەبوو، چونکە گەلی جار، گوێم لێ بووبوو. بەڵام سەرم لە ئەوە سوورمابوو، دوێنێ ئەو هەڵوێستەی بۆ نواند؟! ئێستە چی دەوێ، وا دیسانەوە یەخەم بەرنادا؟! پاشان زۆر بە هێمنی گوتم: هەرچی بوو، ڕۆیشت و برایەوە. ڕاستە، من و تۆ وەک برا واین، بەڵام جارێکی دیکە نیازم نییە، کار لەگەڵ هیچ کەسێکدا بکەم. لە ئەوانەشە (کوردستان) بەجێبێڵم و بڕۆم، چونکە نیازی خوێندنم هەیە. لەبەرئەوە تەلاری هیواکانت، لەسەر توانای من هەڵمەچنە! من هەرگیز لە تۆش زوێر نابم، بەڵام بەزەییم بە ئەو هاوبیرانەی دیکەدا دێتەوە، کە وەک مەڕ وابوون و تۆش وەک شوانێکی زۆرزان، باشت لێخوڕین. بەڕاستی لە ئەو هەڵوێستەی دوێنێت تێ ناگەم و حەزدەکەم، بۆم ڕوونکەیتەوە، بزانم، بۆ وات کرد؟ ئاخر من کە لە (پاسۆک)دا کارنەکەم، پێویست ناکا، پەیڕەو و پڕۆگرامم بۆ بێنی و بیخوێنمەوە!

ئیدی سوێندێکی زۆری بۆ خواردم، کە گوناهی ئەوی تێدا نەبوو، لەبەر بەرژەوەندی (پاسۆک) ناتوانی، ئەو شتانەم بۆ باسکا. دەبێ، هەرچی چۆنێ بێ، بێیتەوە و کارمان لەگەڵ بکەی. تۆ تەنیا پێوەندیت بە منەوە دەبێ و ماوەیەکی زۆری پێ ناچێ، دێیتە سەرکردایەتییەوە.

گوتم: من حەزناکەم، خێرم پێ بکەی. بە هیچ شێوەیەکیش ئامادەنیم، کار لەگەڵ ئەو هاوبیرانە بکەم، چونکە وەک بتێکی داتاشراو وان، نە ئاستی ڕووناکبیری و ڕامیارییان باشە، نە هەڵوێستیشیان هەیە. تۆ بەخۆڕای سەری خۆت دێشێنی، بەڵام تۆ ویژدانت، ئەو هەڵوێستەت ڕاستبوو، یا هەڵە بوو؟! چونکە تۆ لەتاو (فەرهاد)، خەریکبوو وازبێنی، ئاخر سەبارەت ئەو، چیت بۆ من و (سەروەت) باس نەکرد؟!

گوتی: من ناتوانم، بڵێم، ڕاستبوو یا هەڵە بوو، ڕۆژگار ئەوەت بۆ دەسەلمێنی. بەڵام من وا دەزانم، هیچ ڕووی نەداوە. تۆ لە ئەوە گەورەتری، لەبەر ئەو جۆرە شتانە، واز لە (پاسۆک) و بیری نەتەوەیی بێنی. گوتم: ڕاستە، من لە ئەوە گەورەترم، جارێکی دیکە بەقسەی تۆ هەڵناخەڵەتێم. چونکە ئەمە یەکەمین جارت نییە، ئەم کردەوانەت لێ دەبینم، خۆ باش بیرتە، لە (پێنجوێن)یش خۆت لە هەموو شتێ دەپەڕاندەوە، هەموو هەڵە و هۆکانت، بەسەر (شێرکۆی هەژار) و (عوسمان ڕەشید)دا ساغدەکردەوە. گوتی: بەڵێنبێ،

کارمان لەگەڵ بکەرەوە، دوایی هەموو شتێکت بۆ ڕووندەکەمەوە. چونکە ئێمە، زۆر پێویستمان بە تۆ هەیە. منیش گوتم: ئەمە تەنیا ڕای خۆتە و لە پشت ئەندامانی سەرکردایەتییەکەتەوە هاتووی؟ گوتی: بەڵێ، ئەوان نازانن، هاتووم و ناشبێ، بزانن. منیش گوتم: دە کەواتە، قسەکەی من دەرچوو، تۆ هەمیشە سەوداسەری درووستکردنی هێڵی نهێنیت و دەتەوێ، بۆ بەرژەوەندی خۆت کەڵکی لێ وەرگری. پێکەنی و گوتی: تۆ ئاوا من دەناسی؟! ئەوا (41) ساڵ بەسەر بەڵێنەکەیدا تێپەڕیوە، تا ئێستەش نەمزانی، بۆ وای کرد و هیچشی بۆ ڕوون نەکردمەوە!

گوتم: باشە، گەر کارتان لەگەڵ بکەمەوە، مەرجێکم هەیە، ئەویش ئەوەیە، بە زووترین کات، دانیشتنێکی دیکە بکرێ، لەبەرچاوی هاوبیرەکانت، داوای لێبووردنم لێ بکەی، هۆکەم بۆ ڕوونکەیتەوە، بۆچی وات کرد؟ ئەو گەمەیە چی بوو، تۆ و (فەرهاد) درووستانکرد، ئەو کاتە هەڵبژاردنێکی خاوێن و ئازاد دەکەین، هاوبیران دەنگیان بە کێ دا، من قایلم، ئامادەشم، لە شانەیەکی خوارێخوارەوە کاربکەم. گوتی: ئەوە هەر ناکرێ و ناشبێ. منیش گوتم: کەواتە ماڵاوا و وا باشترە، هەر برابین. ئیدی هەرچەندی کرد، پەیڕەو و پرۆگرامەکەشم لێ وەرنەگرت، ماڵاواییکرد و ڕۆی.

لە ڕاستیدا، (ئازاد)م زۆر خۆشدەویست. سەرەڕای ئەو هەموو هەڵە و فیلانەی دەیکرد، لەبەرچاوم نەدەکەوت و لێشی زویر نەدەبووم. چونکە دەمزانی، چەن کوردێکی ڕووناکبیر، بە توانا و دڵسۆزە. جگە لە ئەوەی، باشترین کادیری بیری نەتەوەیی ئەو ڕۆژەش بوو. بەڵام هەزار ئاخ و داخ، لە بەختی ڕەش و کەچی کورددا، کادیرە هەرە چاکەکانی ئەو ڕۆژەی بیری نەتەوەیی و (پاسۆک)، دووانی وەک من و ئەو بووین، نەدەبوو بە سێ و چوار ... هەزار!

**دواڕۆژەکانی کارکردن**

بەیانی زووبوو، پۆلۆنییەکان بە دوامدا هاتن و بەرەو (ڕانی) گەڕاینەوە. بڕیارمدا، لە (ڕانی) بمێنمەوە، ئیدی ڕۆژانی پێنجشەممە و هەینیش نەگەڕێمەوە، لە بەزم و هەرای (سولەیمانی) دوورکەومەوە. بەڵام لە بەختی ڕەشی مندا، هەمووی هەفتەیەکی نەبرد، وەڵامیان بۆ هات، کە پێشمەرگە پۆلۆنییەکانی ناوچەی (پێنجوێن)یان گرتووە. داوایان لێ کردبووین، بەپەلە بگەڕێینەوە. منیش بەیەکجاری، کەلوپەلەکانم پێچایەوە و بەرەو (سولەیمانی) گەڕامەوە. زۆریش دەترسام، لە فەرمانگەی (ئەمن)ەوە بانگمکەن و هەواڵی پۆلۆنییەکانم لێ بپرسن. چونکە هێندێ شەو، یەک دوو پۆلۆنی دەهاتن و بۆ ئوتێلەکەم بۆ فۆدگا خواردنەوە بانگیاندەکردم. پەرتووک و نووسینەکانمیان دەبینی و دەیانپرسی: خەریکی چی و چی دەنووسی؟! بەتایبەتی پەرتووکە مارکسییەکان، وێنەی (لینین)ی تێدابوو، سوور دەیانزانی، خەریکی نووسینی بابەتی ڕامیاریم.

لە (سولەیمانی) سەرۆکی کۆمپانیاکە پرۆفیسۆر (مارچنیک)، بانگیکردم و گوتی: تۆ دەزانی، ئەو برادەرانەی ئێمە بۆ کارکردن هاتوون بۆ (کوردستان)، هەموویان ژن و منالیان بەجێهێشتووە، بەڵکوو یارمەتیمانبدەی و هەواڵیکیان بزانین. گەر بە پارە دەکری، بزانە، چەندیان دەوی، ئامادەین، بیدەین. بەمەرجی بەریانبدەن و نەیانکوژن.
منیش ترسام و گوتم: بڕوابکەن، من ئاگام لە هیچ شتێ نییە و کەس ناناسم. بەڵام لە ئەوە دڵنیابن، کورد کەسی بیانی ناکوژی. ئیدی ئەوان بۆ (پۆڵەند) گەڕانەوە و منیش، ئاتبراوبووم!

## داڵدەدان

شەوی (**16. 1. 1977**)، لە دەرەوە گەڕامەوە، (کامەران)ی برام دەرگەی لی کردمەوە، گوتی: کاکە! باوکم خەریکە، هەموومان بە شەق دەردەکا. گوتم: بۆ؟ گوتی: دوو پیاو هاتوون و دانیشتوون، چاوەڕێی تۆ دەکەن. باوکم دەیانناسی و دەڵی: دەبی، هەر ئێستە بڕۆن. چونکە ئەمانە پێشمەرگەن و گەر دەسەلات پی بزانی، هەموومان دەکوژن و خانووەکەشمان، بەسەردا دەڕوخێنن.
چوومەژوورەوە، تەماشەدەکەم، هەردوو برادەر (ئەنوەری عەلی نەجار) و (خەسرەوی حەمەی محە) بوون. هەردووکیان لەناو سەرما، لەبەرعەلادینەکە بە ماتی دانیشتوون. ماچمکردن و گوتم: نانتانخواردووە؟ گوتیان: نەخێر، نان لە کوی بخۆین؟! ئیدی تێگەیشتم، لای دوژمن دەسەکەیان ئاشکرابووە و پەنایان بۆ ماڵی ئێمە هێناوە. بەپەلە (سەلاح)ی برام نارد، لە یانەی مامۆستایان، کەباب و گۆشتی برژاوی بۆ هێنان.
هەرچەندە هیچ جۆرە پێوەندییەکیشم، بە هاوبیراتی (پاسۆک)ەوە نەمابوو، بەڵام لەلایەکەوە، هەردووکیان دوو برادەری خۆشەویستم بوون. لەلایەکی دیکەشەوە، ئایا دەکری، لە ئەو ڕۆژەڕەشەدا، دوو قارەمانی جەربەزەی گەلەکەت، لە دەرگەی ماڵەکەت بدەن و پەنات بۆ بێنن، دەس بە رووویانەوە بنێی و داڵدەیان نەدەی؟! ئەو کارە ناشیرین و دزێوە، هەرگیز لە کەسانی کوردپەروەر ناوەشێتەوە!
پاشان چووم بۆ لای باوکم، خەریکبوو، لە ترساندا زارەترکەدەبوو. منیش زانیم، چۆن دەماریدەگرم و هێوریدەکەمەوە. گوتم: تۆ پیاوێکی موسوڵمان و نوێژکەری، باوەڕێکی پتەو و تەواوت، بە خوای خۆت هەیە. گەر لێقەوماوی لە دەرگەی دای و ڕووی تی کردی، بەپێی قورعان و فەرموودەکانی پەیامبەر دەبی، دەس بە ڕوویەوە بنێی، یا دەسی یارمەتی بۆ درێژکەی؟!
گوتی: من ئەم قسانە نازانم، منالم وردە، گەر ئێستە دەسەلاتدارانی میری پی بزانن، دەمودەس هەموومان دەکوژن. منیش یەکسەر فیلمە عەرەبییەکەی (فی بیتنا رجل)ی

چیرۆکەکەی (ئیحسان عەبدولقدوس)م بیرکەوتەوە و دەمزانی، لە کوێوە قسەدەکا. گوتم: ڕاستدەکەی، بەلام خۆ من بەدوایانا نەچووم، خۆیان هاتوون، ئەوانیش پێشمەرگەن و خەبات بۆ ئێمە دەکەن. بە ئەم شەوە ساردوسرە تاریکە، ڕوو لە کوێ کەن؟! ناوی خوای لێبێنە و ئەم خێرە گەورەیە، لەکیس خۆت مەدە. یا ئەم شەو لێرەبن، بەیانی ڕۆژ بووەوە، تەگبیرێکیان بۆ دەکەم. گوێ مەدەرێ و مەترسە، خوا گەورەیە. باشە گەر من بوومایە، لە دەرگەی ماڵە ناسیاوێکم بدایە و جێیان نەکردمایەتەوە، دوایی تووشی شتێ بوومایە، تۆ چیت پێ دەگوتن؟!

ئیدی باوکم، کەمێ هێوربووەوە. پاشان چووەژوورەوە و لایان دانیشت. منیش بۆئەوەی ئەم بێدەنگییە بشکێنم، گوتم: حەزتان لە دۆمینە هەیە؟! چونکە دەمزانی، باوکم چەن حەزی لێ دەکا. باوکم بەبەدەم قسەکردنەوە گوتی: ئا ئەو دۆمینەیە بێنە، یا چوارقوڵی دەستێ دۆمینە بکەین. باشبوو، هەموومان بە دۆمینکردنەوە خەریکبووین و باوکیشم، ترسەکەی لە دڵ دەرچووا!

من ناهەقی باوکمم نەدەگرت، چونکە لەلایەکەوە، ماڵی خۆی بوو. لەلایەکی دیکەشەوە، سوور دەمزانی، قسەکانی ڕاستن، لە گیانی خۆی و منالەکانی دەترسی. بەلام لە هەمان کاتیشدا، گوناهی ئەوانیش نەبوو، چونکە دەبێ، وەک ئەرکێکی نیشتمانی و نەتەوەیی، داڵدەیانبدەین و ڕاژەیانبکەین.

ئەو شەوە، لە نهۆمی دووەم لە ژوورەکەی خۆم، جێمان بۆ داخستن. کلیلی سەربانم دانێ و ڕێم پێشاندان، گەر شتێ ڕوویدا، لە سەربانەوە بۆی دەرچن. خوا کردی، بەیانی هەستاین و هیچ شتێ نەبوو. هەر زوو چوومەدەرەوە و هەواڵم زانی، (فەرهادی مەلا ڕەزا)، لە فەرمانگەی ئەمن، (یاسینە ڕەش)ی بەگرتدابوو. ئەویش لەژێر ئەشکەنجە و لەتاو ئازاری خۆی، لە ئەوە پتر نەیتوانیبوو، بەرگەبگرێ، ناوی هەموو پێشمەرگەکانی دابوو. جووتەبرا (سمە قاسم، بلە قاسم و سەلاحی مەجید) گیرابوون و باشبوو، (ئەنوەر) و (خەسرەو)، بەرنەکەتبوون و دەرچووبوون.

پاشان هەر زوو، (سەلاح)ی برام نارد بۆ لای (ئازاد). ئەویش گوتبووی: با ئەم شەویش لە ئەوێ بن، تا شوێنێکیان بۆ دەدۆزینەوە. بەڵێ، ئەو شەوەش هەر لە ماڵی باوکم مانەوە. بە قسەی خۆش و پێکەنین، بە دۆمینەکردنەوە، شەوەکەمان بەسەربرد. بەیانی من نەچوومەدەرەوە، تا مامۆستا (قادر) هات و هەر یەکێکیانی لە ماڵێ دامەزران. دوایی ئاگاداریان کردمەوە، کە بەباشی و بێگرفت، لە شار دەرچوون. بەلام (یاسین) و هاوڕێکانی دیکەیان، ڕۆژی (**15. 1. 1977**) گیران و ڕۆژی (**2. 3. 1977**)، لە گرتووخانەی (موسڵ) لە سێدارەدران و ژانێکی زۆریان، بە دڵی هەموو نیشتمانپەروەرانی کورددا کرد. هێندەش مەردبوون، تا بۆ ژووری مەرگیشیان بردبوون، کۆڵیان نەدابوو، پەلاماری سەرباز و پیاوکوژەکانی (بەعس)یان دابوو، هەر هاواریانکردبوو، بژی کورد و کوردستان!

سەیر ئەوەبوو، ئێمە وەک ئەرکێکی نیشتمانی، دالدەی ئەو دوو برادەرەمان دا، کەچی ساڵی (1988)، هەمووی چەن ڕۆژێ بوو، لە (سوید) بووم، کاکە (خەسرەو) نەک هەر لێی نەپرسیمەوە، بەڵکوو شەوێکیش لە ماڵەکەیدا، ڕۆژم نەکردەوە!



حەمە قاسم
(1957-1977)



سمە قاسم
(1947-1977)



سەلاحی مەجید
(1941-1977)

## زانکۆی سولەیمانیی

سەرەتای مانگی دووبوو، نامەیەکم لە سەرۆکایەتی زانکۆی (سولەیمانی)یەوە بۆ هات، تێیدا نووسرابوو: هەڵوێستی خۆتمان، سەبارەت بە ڕاژەی سەربازی بۆ ڕووونکەرەوە. منیش بە ئەو پێیەی پێشمەرگەبووم و دواتریش بۆ (ریزی نیشتمانی!) گەڕابوومەوە، گەڕاوەکانیش لای (بەعس)، هێندە بێ بروا و سووک بوون، بە سەربازیش رایان نەدەگرتن و ئەو ئابرووە گەورەیەشیان، پێ ڕەوانەدەبینین، کە ڕاژەی سەربازییکەین!
ئەو کاتە خوالێخۆشبوو (تەها نەجیب)، بەڕێوەبەری کاروباری خوێی زانکۆ بوو. هەم دەمناسی و هەم دراوسێیشمان بوو. جگە لە ئەوەی زۆر هاوڕێی (نوری عومەر)ی پورزاشمان بوو. نووسراوەکەم پیشاندا و گوتی: تۆ لە دەرچووانی دە کەسی یەکەمی کۆلێژەکەتانی؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: هەر ئێستە، ئەم شتانەم بۆ جێبەجێکە، تا وەک ئەندازیاری کشتوکاڵ، لە کۆلێژەکەتان دادتمەزرێنین. منیش ئەوەی پێویستبوو، لە ماوەی دوو ڕۆژدا، هەموویم ئامادەکرد.
ئەوەبوو، ڕۆژی (13. 2. 1977)، فرمانی دامەزراندنەکەم دەرچوو. هەر ئەو ڕۆژە، وێنەیەکم لە کاک (تەها) وەرگرت و بەپەلە بردم بۆ سەرۆکی بەشی بەرووبوومی ڕووەک دوکتۆر

(عەبدوڵڵا خەڵەف). گوتی: ئەمەت چۆن پچڕی، دەڵێی، لە قووڕگی شێردا دەرتهێناوە؟! گوتم: لە کاک (تەها) بپرسە. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە، وەک مامۆستا لە زانکۆ دەسم بە کارکرد، لە کۆڵ بیاکاری بوومەوە و ژیانێکی نوێم دەسپێکرد.

ئەو کۆرسە، فریای وانەگوتنەوە کەوتم، چونکە سەرەتای کۆرسی دووەمی خوێندبوو. وانەی پراکتیکی (بەروبوومی ڕیشاڵ)ی پۆلی چوارەکانیان بۆ دانام، مامۆستایەکی (میسریی) تیۆرییەکەی دەگوتەوە. خوێندکارەکان هەموویان برادەر و ئاسیاو بوون. لە وێنەی خولی دەرچووانی ئەو ساڵەشدا بەشداریمکرد.

<u>بەڵگەنامەی ژمارە (8) ل (427-429)</u>




یەکەمین خولی دەرچووانی بەشی بەروبوومی کێڵگە دوای دامەزراندم

**ڕەشبگیر**

بەعسییە فاشتەکانی (بەغدا)، هەموو ڕێ و شێوازێکیان بەکاردەهێنا، تەنیا هەر بۆئەوەی چۆک بە تێکۆشەرانی کورد دابدەن، لە کۆڕی خەبات دووریانخەنەوە و ناچاریانکەن، کڕنووش بۆ (بەعس) و دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) بەرن. بڕیارێکی نوێیان دەرکرد، بەپێی ئەو بڕیارە، هەر کوردێ ڕایبکردایە و لە شۆڕشی گەلەکەماندا بەشداریبکردایە، ژن و منداڵەکانیان دەگرت، گەر ڕەبەنیش بووایە، ئەوا دایک و باوک، خوشک و براکانیان دەگرتن، لە قوژبنە تاریکەکانی گرتووخانەکانی خوارووی (عێراق) توندیاندەکردن.

یەکەمین کاروانی گرتنی کەسوکاری پێشمەرگە، لە کۆتایی ساڵی (1976)دا، لە شاری (سولەیمانی) دەسپێکرد و ڕەوانەی گرتووخانەکانی خوارووی (عێراق)یان کردن. هەرچەندە بە ئەو کارە دڕندانەیەی (بەعس)، کۆمەڵانی خەڵک پتر تووڕەدەبوون و ڕۆژبەڕۆژیش، لەسەر تێکۆشان گەرمتردەبوون. تەنانەت یەک پێشمەرگەش نەگەڕایەوە و خۆی

بەدەسەوەنەدا. بەڵام کاریکی خراپی، لە وورەی خەڵک کرد و کوردپەروەرانیش، کەمتر دەچوونەدەرەوە، تا گرفت بۆ کەسەکانیان نەئافرێنن. (بەعس)یش بێ ئەوەی، گوێ بە هیچ جۆرە رەوشتێکی مرۆیانە و یاسایەکی نێودەوڵەتی بدا، هەر لەسەر گرتن، راوتان و رەوانەکردنی خێزانەکان بەردەوامبوو.

## دوو خونچەگوڵی نایلۆن

دەتوانم، زۆر بەراشکاوی بڵێم: لە دوای خۆشەویستی (ژیان)ەوە، هێندێ کیژی ناسک و نازدارم، لە زانکۆ ناسیوە. بەڵام هیچیانم بە دڵ خۆش نەویستووە. بەتایبەتی دوای هەرەسەکە، کاتێ لە زانکۆ دەسم بە خوێندن کردەوە، لە ژیانی تایبەتی خۆمدا، زۆر هەستم بە جێچۆڵییەکی تەواو دەکرد. دەمویست، بە هەر شێوەیە بێ، ئەو کەلێنە گەورەیە پڕکەمەوە، ژان و ئازارەکانی، لەنێو دڵ و دەروونمدا دەرکەم.

دوای ئەوەی لە بەهاری (**1975**)دا گەڕاینەوە، لە دوورەوە حەزم لە کچێکی باریکەڵانەی ناسکۆڵانەی سپیکەڵانەی نەشمیلانەی هێمنی نێسکسووکی شەرمنی بێدەنگ کرد. هەرچەندە بە زەردەخەنەکەی سەرلێوی، بە نیگای تیژی چاوە رەشەکانی، وای پیشاندەدا، مەیلێکی بۆ من هەیە. بەڵام کاتێ ویستم، هەستی ناخی پڕ ئاخی خۆشەویستی خوڕسکی خۆمی بۆ دەربڕم، قسەی لەگەڵ بکەم و تێبیگەیەنم، تازە درەنگبوو، چونکە چاپووکسوارێکی دیکەی ئەڤیندار، مەردانە هەڵی لەدەس خۆی نەدابوو، هەر زوو ئەسپی خۆشەویستی خۆی تاودابوو، لە ئاوزەنگی ئازایەتی دابوو، بووکی ئەندێشەی نەزۆکی لێ ڤڕاندم!

دوای ئەو ناسکە پەرییە، ئیدی بیرم لە خۆشەویستی نەکردەوە. تا ڕۆژێ لەناکاو، ساڵی (**1976**) بوو، لە کورسی دووی پۆلی چواری کۆلێژ بووم، تووشی کیژێکی شلوملی ناسکی مەنگ بووم و ئەم جارە، ئەو خۆی پێناساندم. هەرچەند دەمویست، تێی بگەیەنم، کە هێلانەی دڵە رەنجاوەکەم وێرانبووە و جێی مەلی خۆشەویستی تێدا نابێتەوە، کەڵکی نەبوو. ئەوە یەکەمین جاربوو، لە ژیانمدا کیژێ ببینم، دەوروخولمبدا و بیەوێ، پەلی هەستی خۆشەویستیم، بۆ لای خۆی ڕاکێشێ، تەپکە و فاقە، بۆ مەلی دڵە برینداره خێرنەدیوەکەم دانێ. هەرچەندە تا ئەندازەیە، ئامانجی پێکا، بەڵام دوایی کە زانیم، ئەو شلکەکیژە، تەنیا هەر لە سەرچاوەی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیەوە، بیر لە من دەکاتەوە، ئاوی سازگاری خۆشەویستی، لە کانیاوێکی ڕوون و بێگەردەوە ناخواتەوە، هەر زوو داوی تەپکە و فاقەی پێوەندییەکەیم پچڕاند و لە شەققەی باڵمدا، هێلانەکەیم بە چۆڵی بەجێهێشت!

پێم وایە، زۆربەی لاوانی کورد، لە ئەو تەمەنەدا، کە گیرۆدەی داوی دڵداری کیژی دەبن و پەریزادێکیان خۆشدەوێ، تەنیا هەر بە دڵ بڕیاردەدەن، مێشک و ژیری، هیچ ڕۆڵێکی گرنگ نابینێ، بۆیە زۆربەیان سەرکەوتوونابن و بە ئاکام ناگەن!

## بەهار و خۆشەویستیی

هەمووی هەفتەیە بوو، لە زانکۆ وەک مامۆستا دەوامدەکرد، تاقیکردنەوەکانی کۆرسی یەکەم دەستپێکردبوو. منیش چاودێری تاقیکردنەوەی پۆلی یەکەکانم هەبوو، بەرەو هۆڵی تاقیکردنەوەکە بەپەلە دەڕۆیشتم. بە پیپلکانەکانی بەشەکەی خۆماندا سەردەکەوتم، کیژێکی بەژنوبالا ڕێک و کەلەگەت، بە کاوەخۆ لە پێشمەوە سەردەکەوت و یەک لە دوای یەک، پلیکانەکانی لە دوای خۆی بەجێدەهێشت!
ئاوڕێکیدایەوە و گوتی: گەر بە ئەرک نەبێ، تاقیگەی مێرووزانی لە کوێیە؟! منیش گوتم: دوای من کەوە، منیش بۆ ئەوێ دەچم. بەڵام کچ چی، هێندە جوانبوو، ئەتگوت، وێنەیەکی کۆپیکراوی (حەلیمە)یە، هەموو یادگارەکانی منالیمی بیرخستمەوە و بە جاری برینی کولانمەوە! عەرەب واتەنی: (هەر چل کەس، لە یەکدی دەچن!) تو بڵێی، عەرەب لە ئەم قسەیەیاندا، ڕاستیان فەرموویی؟!
ئەز لە ئەو بڕوایەدام، هەرچی دەرمانی بێهۆشکەری ئەم جیهانە هەیە، تەنانەت تەنیا بۆ ساتێکیش ناتوانێ، ڕوخساری شیرینی ئەو پەریزادەی ڕۆژێ لە ڕۆژان، بە دڵ و بە گیان خۆشمویستووە، لە بیر و هۆشمدا بسڕێتەوە و بیرمبەرێتەوە! هەرچی دوکتۆری زانای ئەم جیهانە هەیە، بە نووکی نەشتەرە تیژەکانیان ناتوانن، نیگاری ئەو پەیکەرەی، لە دڵەی ناشادمدا هەڵکەنراوە، دەربێنن. بۆیە ئێستەش، کاتێ کیژێکی قژکاڵی سوور و سپی چاوشینی باریکەلەی باڵابەرز دەبینم، یەکسەر (حەلیمە)م بیردەکەوێتەوە!
هەردووکمان نزیکەی (10) خولەک، لە کاتی دیاریکراوی دەستپێکردنی تاقیکردنەوەکان دواکەوتبووین. پرسیارەکان خوێندرابوونەوە. لێپرسراوی هۆڵەکە خەریکبوو، لە تاقیکردنەوە بێبەشیکا. بەڵام من هەر زوو فریاکەوتم و گوتم: بە دوای شوێنەکەدا دەگەڕا، بۆیە دواکەوتووە. باشبوو، ڕێیاندا و هاتەژوورەوە. ئیدی یەکسەر زانیم، ناوی چییە و لە پۆلی چەندە. چونکە لەسەر ئەو کورسییەی دانیشتبوو، هەموو ئەو زانیارییانەی لێ نووسرابوو. تا لە تاقیکردنەوەکە بووەوە، زووزوو سەیریدەکردم و هەر شتێکیشی پێویستبووایە، هەر داوای لە من دەکرد. بەڕاستی نازانم، ئەو (3) کاژێرەی تاقیکردنەوەی ئەو ڕۆژە، بۆ وا زوو تەواوبوو؟!

لە ئەو ماوە کورتەدا، هەرچەند تاماشامدەکرد و سەرنجم لێدەدا، پتر دەچووە دڵمەوە. بە ڕەنگی پێستی ئاڵی، بە جووتی چاوی سەوزی کاڵی، بە دوو لیمۆی باخی سینەی مەرمەڕی، بە قژوپەرچەمی خاوی تێکالاوی، بە خەندەی شیرینی دوو خونچەکەی لێوی، بە نیگای جوتە چاوی پڕ تەلیسماوی، بە هەڵسوکەوتی شیرین و جوانی، بە جاری هەست و هۆشی لاوێتی خرۆشانم. نیگاری پەیکەری جوانی خۆی، لە کەلاوەی دڵە وێرانە چۆڵوهۆڵەکەمدا هەڵکەن، هەر لە یەکەمین نیگاوە، تیری خۆشەویستی ئەو پەریزادە، جەرگی بریم، هەموو هەست و هۆش، خەو و خەیاڵێکی لێ فڕاندم! تۆ بڵێی، ئەمانە هەموویان، نیشانەی لەدایکبوونی خۆشەویستییەکی بێگەرد و ڕاستەقینەی نوێی دیکە بێ؟! ئەدی نەیانگوتووە: لە بەهاردا خوێن دەجمێ و هەموو ئارەزووەکانی مرۆ نوێدەبنەوە؟!
دوای ئەوەی لە تاقیکردنەوەکە بووەوە، سوپاسیکردم، منیش لێم پرسی: خەڵکی کوێی؟ گوتی: (خانەقی). لە دڵی خۆمدا گوتم: بە خوا کورد ناهەقی نییە، لەسەر (خانەقی)، دەجەنگێ و ئەو هەموو خوێنە دەڕێژێ! من وامدەزانی، (خانەقی) هەر ئاوی (ئەلوەند) و چەن چاڵەنەوتێکی لێ هەیە، نەمدەزانی، کیژی هێندە تەڕ و ناسک، خوێنشیرین و جوانیشی هەیە! بەڵام هەرچەندە، بیرم لە تەمەنی خۆم و ئەو دەکردەوە، تازە لە پۆلی یەک دەیخوێند، پەردەیەکی ڕەشی نائومێدی، بەسەر چاوانمدا دادەدرایەوە و تروسکایم تێدا بەدی نەدەکرد!

**بەغدا**

زۆر نەبوو، لە زانکۆ دامەزرابووم، یادی **(11)**ی مارس و جەژنی (نەورۆز) تێکەڵاوبووبوون. خوێندکارەکان چالاکییەکی زۆریان نواند. هێندێکیان لێ دەسگیرکران و بەندکران. ڕۆژی سەرۆکی بەش دوکتۆر (عەبدوڵڵا خەلەف) بانگیکردم و گوتی: خولێکی مەشقپێکردن، بۆ ماوەی **(2)** مانگ لە (بەغدا) کراوەتەوە. ناوی تۆم نووسیوە، حەزدەکەم، ماوەیە لەبەرچاو ونبی، هیچ قسەی لێ مەکە، هەفتەی داهاتوو، ناوی خوای لێبێنە و بڕۆ. منیش زۆرم پێم خۆشبوو، زۆر سوپاسمکرد.
ڕۆژی **(1. 9. 1977)**، خولەکە دەسپێیکرد و **(27. 10. 1977)** تەوابوو. واتە ماوەی دوو مانگ لە بەغدا، لەماڵی پورە (نەسرین)م بووم. هەموو بەیانییە، لە گەڕەکی (ئەعزەمیە)، پاسی تایبەت ڕادەوەستا و دەیانبردین بۆ (ئەبوغرێب). لە ئەوێ سەبارەت بە تێکنۆلۆجیای داوی لۆکە، چەن وانەیەکی تیۆری و پراکتیکمان دەخوێند. لە هەموو زانکۆ و پەیمانگەکانی (عێراق)ەوە، کادیرێکی ئەکادیمییان ناردبوو. لەنێو هەموویاندا، جگە لە من کوردێکی

دیکەشی تێدابوو، ناوی (تەها ماڵەڵلا جارەڵلا) بوو، لە زانکۆی (موسڵ)ەوە هاتبوو. لە کوردەکانی (شەبەک) بوو. هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە، بووین بە برادەر. کوردییەکی پاشی دەزانی، قسەی زۆر خۆشبوو، زۆر حەزی لە گاڵتە و شۆخیکردن بوو، زۆربەی کات، لە خوێندن و نێوبازاڕیش، هەر پێکەوەبووین.

**بەڵگەنامەی ژمارە (9) ل (430)**



تاقیگەی تیکنۆلۆجیای دوای لۆکە، ڕۆژی (25. 9. 1977) گیراوە. لە ڕاستەوە: (تەها)یە.

ڕۆژێ (تەها) لەگەڵ خزمێکی خۆیدا، بە یەکدی ناساندین. ناوی (سدقی یوسف ئیدریس) بوو. تازە لە کۆلێژی پۆلیسی دەرچووبوو. هەر لە یەکەمین دانیشتنەوە دیاربوو، کوڕێکی باش و کوردپەروەرە. لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا، زۆربەی کات پێکەوەبووین. سەبارەت کێشەی کورد، گەلێ شتم بۆ باسکرد و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بیری نەتەوەییم بۆ ڕووندەکردەوە. تا وامان لێهات، دۆستایەتییەکەمان زۆر پەرەیسەند. کاتێکیش گەڕامەوە، زووزوو لە (بەغدا)وە، تێلیفۆنی بۆ دەکردم. هەموو ئاواتی ئەوەبوو، کیژێکی کوردی خەڵکی (سولەیمانی) بخوازێ، پێوەندی خزمایەتی و دۆستایەتی، لەگەڵ هاوزمانەکانی خۆیدا پتر پەیدابکا.

پاشان ڕۆژبەڕۆژ، پێوەندی نێوانمان بەهێزتربوو، وای لێهاتبوو، مانگی جارێ سەری لێدەدام و لە ماڵی ئێمە دەمایەوە. تا لە ئەنجامدا، خوشکی هاوڕێیەکم بۆ دۆزییەوە و خواستی. ئەوا ماوەی (37) ساڵە، خێزانیان پێکەوەناوە و لە (بریتانیا) بە خۆشی، پێکەوە دەژین.



لە پشتی ئەم وێنەیە، چەن وشەیەکی جوانی بۆ نووسیبووم و هەستێکی خاوێنی دڵسۆزانەی هاورێیەتی دەربڕیبوو، ڕۆژی (5. 1. 1979) پێشکەشیکردم.

## گۆڕانکاریی و بەشێکی نوێ

کاتێ لە (بەغدا) گەڕامەوە، یەکسەر لە زانکۆ، دەسم بە کارکردن کردەوە. پێش ئەوەی بڕۆم، بەشەکەمان ناوی بەشی ڕووەکی گشتی بوو. بەڵام کە هاتمەوە، هەموو شتێ گۆڕابوو، بەسەر دوو بەشی نوێی دیکەی جیاوازی باخداری و بەروبوومی کێڵگەدا دابەشکرابوو. بە ئەو پێیەی من لقی دووەمم تەواوکردبوو، هەر لە ئەو بەشە دایانتامەوە. سەرۆکی بەش دوکتۆر (هەڵکەوت) بوو، هەر لە پۆلی یەکەوە دەمناسی و مامۆستامبوو. پیاوێکی بێدەنگ، لەسەرخۆ، هێمن و زیرەک بوو. بەڵام زۆر خاووخلیچک و ترسنۆک بوو.

جگە لە مامۆستا میسرییەکان، چەن دوکتۆرێکی عەرەبی بەعسی وەک (عەزیز ڕەمۆ، خالید ئەحمەد ئیبراهیم و غەفوور) ناوێک و هێندێ دوکتۆری کوردی بێلایەنی وەک (فەرهاد ئەحمەد ئەمین، کەمال ئەحمەد و ئومێد نوری)مان هەبوو. هەروەها چەن خاوەن بڕوانامەیەکی ماستەری وەک (مەهدی بەرزنجی، دارا جاف و یوسف)ناوێکیش تازە دامەزرابوون. ئێمەش ئەندازیارەکانی کشتوکاڵ، هەموومان کوردبووین. جگە لە خۆم، (قادر بەرزنجی، حەمەقەرەداخی – حەمەدۆستان، ئاراس مستەفا، ئەحمەد نوری، فەریدە عەبدوڵڵا و بروا موحەممەد سەعید) پێکەوە کارماندەکرد و یەکیمان باش دەناسی. بەڵام (فەخرەدین عەبدولقادر) تورکمانبوو، کوردییەکی باشی دەزانی و کوڕێکی باشیش بوو.

بەشەکەمان زۆر خۆشبوو، هیچ گرفتێکمان نەبوو. تەنیا ئەوەبوو، شوێنەکەمان چەپەک و پچووک بوو، بەردەمەکەی گیرابوو. خوێندکارەکان، گەر وانە یا کارێکی تایبەتییان نەبووایە، سەریان لە بەشەکەیان نەدەدا.

## ئەزموونێکی نوێ

تازە لە (بەغدا) گەڕابوومەوە، هێندێ بابەتیان لەگەڵ پۆلی چوارەکاندا بۆ دانابووم و دەسم بە وانەگوتنەوە کرد. یەکەمین جار و یەکەمین ڕۆژم بوو، وەک مامۆستا بچمە پۆلەوە. زۆربەی خوێندکارەکان هاوڕێمبوون. زۆر شەرمم‌دەکرد. چونکە لە وڵاتی ئێمە، سەربەستی نییە و هەر لە منالییەوە، چاوترسێنیانکردووین، بە وشەی شوورەی و شەرمکردن، پەروەردەیانکردووین. کاتێ گەورەش دەبین، بەتەواوی ڕوومان نایە، لەنێو کوڕ و کۆمەڵێکی جەنجاڵدا، بەئازادی قسەبکەین.
منیش ئەوە یەکەمین جارمبوو، بەرانبەر کۆمەڵێ خوێندکار ڕابوەستم و بە زمانی عەرەبی، بابەتێکی زانستانەیان بۆ باسکەم. ڕەنگم بەتەواوی تێکچووبوو، لێوەکانم وشکبووبوون، قوڕگم نووسابوو، بەدەنگێکی نزم قسەم‌دەکرد. بڕواناکەم، ئەو ڕۆژە کەس هیچ لە من تێگەیشتبێ. تا کاژێری یەکەمم لێ ڕۆی، نازانم، خوێندکارەکان هەستیان چۆن بوو؟ چییان دەگوت؟ بەڵام دوای ئەوە وردەوردە باشتربووم، ڕەنگورووم کرایەوە. هەرچەندە خوێندکارەکان، هێندە باشبوون و بە ڕێزەوە دانیشتبوون، کارێکیان نەکرد، هەستی پێ بکەم، پێبکەنن، یا چرپەچرپ بکەن و پلاربهاوێژن. بەڵام خۆم دەمزانی، شێوارم و لە یەکەمین هەنگاودا، سەرکەوتوو نیم!

## دانپێدانێکی بوێرانە

لە ئەو ماوەیەدا، هەموو ڕۆژێ لە دوورەوە، کچەکەم دەبینی. جاروبار، بە ڕوویەکی خۆش و بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە، ڕۆژباشمان لە یەکدی دەکرد. دوای مانگێ، تاقیکردنەوەکانی کۆرسی دووەم دەسپێیکرد. ڕێککەوت وابوو، زۆربەی کات من بەسەریانەوە چاودێربووم. هەر ڕۆژە نا ڕۆژێ دەمدی و تا دەهات، پێوەندیمان پتەوتر دەبوو. ئینجا زانیم، خەریکە بەتەواوی، جێی خۆی لە دڵمدا دەکاتەوە. وام لێهات، سۆراخیبکەم و هەواڵی بپرسم. هەر زوو بیستم، هێشتا هاوڕێی کوڕی نییە و نەگیراوە! دواتاقیکردنەوە بوو، خۆی و هاوڕێکەیم، بۆ بەشەکەی خۆمان بانگکرد و داوای چام بۆ کردن. گەلێ قسەی خۆشمان کرد. دوایی زۆر بەراشکاوی پێم گوت: من تەمەنم **(27)** ساڵە و دەمەوێ، ژنبێنم. لەنێو ئەم هەموو گوڵە جوانانەی، لە ئەم باخە گەورەیەی زانکۆدا دەیانبینم، لە تۆ بۆنخۆشتر و جوانترم نەدیوە. دەڵێی چی؟!

دیارە هەستی بە شتێ کردبوو، زۆر باش تێگەیشتبوو، بۆچی ڕێزی دەگرم، بانگیدەکەم و خۆمی لێ نزیکدەکەمەوە. بەڵام بڕواناکەم، لە ئەو باوەڕەدابووبێ، هەستی خۆم بە ئەو شێوەیە دەربڕم، داوای لێ بکەم، شووم پێ بکا. چونکە داواکارییەکی کتوپڕی چاوەڕوان نەکراوبوو! بۆیە سوورسووربوویووەوە و سەری داخستبوو، پاشان سەیرێکی هاوڕێکەی کرد و گوتی: مامۆستا بەڕاستی نازانم، چی بڵێم. بەڵام دوایی وەڵامتدەدەمەوە. بۆ ڕۆژی دوایی، خۆی بەتەنیا هات و گوتی: حەزدەکەم، جارێ هەر هاوڕێبین و باشتر یەکدی بناسین. نامەیەکیشی بە عەرەبی نووسیبوو، لەنێو دەفتەرێکدا شاردبوویەوە، دایمێ و ڕۆی. لە نامەکەدا نووسیبووی: من دایک و باوکێکی هەژار و پیرم هەیە. برایەکم لە بۆردوومانەکەی (قەڵادزێ)دا شەهیدبووە. ئێستەش (7) خوشکێن و تاکە برایەکمان هەیە، ئەویش ئەندازیارە، کاردەکا و بەخێوماندەکا. هەموو هیوای من ئەوەیە، زوو خوێندنەکەم تەواوکەم و یارمەتی کەسوکارم بدەم. ئەمە باروودۆخی خێزانەکەمانە، جا خۆت بیری لێ بکەرەوە. ئایا دەتوانم، ئێستە شووبکەم، من هێشتا تازە لە پۆلی یەک، بۆ دوو دەردەچم؟!

منیش کە ئەو نامەیەم خوێندەوە، هێندەی دیکە لام خۆشەویستربوو. بڕیارمدا، خۆی چۆنی پێ خۆشبێ، هەر بە ئەو شێوەیە، پێوەندی لەگەڵ ببەستم. دوای دوو هەفتە بینیمەوە، خۆی بە تەماشاکردنی وێنەی سەردیواری داڵانەکەی بەشەکەمانەوە سەرقاڵ کردبوو، لە ئەوە دەچوو، شەرمبکا. منیش چووم بۆ لای و سڵاوم لێ کرد. گوتم: نامەکەتم خوێندەوە، سوپاس بۆ ئەو چەن دێرە جوانەی نووسیبووت. چونکە زۆر بەڕاشکاوی و ڕاستگۆیانە نووسیبووتە. منیش لە خێزانێکی دەوڵەمەند نیم، هەژاریش هەرگیز تەنگی نەبووە و نییە. حەزدەکەم، خۆت چۆنت دەوێ، هەر بە ئەو جۆرەش، پێوەندیمان بەردەوامبێ. تا گەر زانیمان، شتێکی لێ سەوزدەبێ، ئەو کاتە قسە لە هاوسەرگیری بکەین. بەڵام هێندە بزانە، من لە ئێستەوە چەپکەگوڵی خۆم دۆزیوەتەوە!

لەنێو هاوڕێکانی خۆمدا، ناوی کچانمان نەدەهێنا، بەڵکوو هەر کەسە، یاری خۆی بە (جووجە) ناودەبرد، تا کەس نەزانێ، باسی کێ دەکەین. ڕۆژێ پێم گوت: تۆ لە مێژە، لای من (جووجە)ی و لەمەودواش، هەر بە (جووجە) ناوت دەبەم. گوتی: (جووجە) چییە؟! گوتم: منداڵی ساوا، هێشتا بەتەواوی فێری قسەنەبووە و ناوی شتەکان نازانێ، کاتێ مێروویەکی چکۆلانەی بێ زیان، بە تەنیشتیدا دەڕوا و دەیبینێ، نازانێ چییە، دەیەوێ بیگرێ و یاری لەگەڵ بکا، بەڵام بۆی ناگیرێ، بە پێکەنینەوە دەقیژێنێ و دەڵێ: (جووجە)، چونکە ناوەکەی نازانێ و هەر بە ئەو شێوەیە دەتوانێ، ڕاڤە لە هەستی خۆی بکا! گوتی: جا من هێندە خۆشەویستم؟! گوتم: بڕۆ، لە ئەو منداڵە چکۆلەیە بپرسە، بزانە،

کاتێ ئەو گیانلەبەرە چکۆلانەیە دەبینێ، چۆن لە خۆشیاندا دەقیژێنێ، پێدەکەنێ و هاواردەکا: (جووجە)، گەر لەبەرئەوە نەبێ، خۆشیدەوێ، ئەگینا بۆ وا دەکا؟! گوتی: ئەو وەڵامەی ئەو وەڵامێ توشە؟! گوتم: کەی ئەو زمانی گرت و هەستی خۆی بۆ گیانلەبەرەکە دەربڕی، ئەو کاتە منیش وەڵامتدەدەمەوە! پێکەنی و هیچی دیکەی نەگوت. ئیدی کەمێ پیاسەمانکرد و پاشان جیابووینەوە. بەڵام جیابوونەوەی ئەم جارەم، بە ئومێد و هیوایەکی گەشەوە بوو. لە ئەو ڕۆژەشەوە لەگەڵ (جووجە)دا، ڕۆژبەڕۆژ پەیوەندیمان بەهێزتر دەبوو. دڵدارییەکی خاوێن و پەیوەندییەکی بێگەرد، لەنێوانماندا درووستبوو.

## ئەوەی لێی دەترسام، ڕوویدا!

دوای ئەوەی دووبەرەکی، لەنێو (کۆمەڵەی مارکسی – لینینی)دا پەیدابوو، باڵێکیان بە ناوی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)ەوە لێ جیابووەوە. کۆتایی مانگی (**4**) و سەرەتای مانگی (**5**)ی ساڵی (**1977**) بوو، بەعسییەکان ئەندامێکی ناوداریان (برایم حەسەن) گرت. ئەویش بەرگەی ئەشکەنجەی نەگرت، ناوی هەموو ئەوانەی دەیناسین و لە ڕێکخستنەکەیاندا کاریاندەکرد، درکاندی، یەکێ لە ئەوانە، (برایم خەلیل) بوو.
ئەم هاورێیە، بە پێشەوای ئەو ڕێکخستنە دادەنرا. دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر، شەهید دەبێ. (ئازاد) و (فەرهاد)یش، بە نیازی دامەزراندنی بەرەیەکی کوردستانی، پەیوەندیان لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا هەبوو. بۆیە ناوی ئەوانیش دەدەن و ڕۆژی (**4. 5. 1977**) هەردووکیان دەگیرێن. واتە دوای کۆنفرانسەکە، نزیکەی (**4**) مانگی خایاند!
بەیانییەک زوو لەماڵەوە نان و چامان دەخوارد، خاتوو (لەعلی) هاوسەری (ئازاد) و دایکی، بە گریان هاتن بۆ ماڵی ئێمە، هەواڵی گرتنی (ئازاد) و (فەرهاد)یان پێ ڕاگەیاندم. هەرچەندە ئەو کاتە، من بە هیچ جۆرێ پەیوەندیم پێیانەوە نەمابوو، تەنانەت لەسەر جادەش نەمدەدین. بەڵام ئەوان ئاگایان لە ئەوە نەبوو، هەر هێندەیان دەزانی: من هاتوچۆیاندەکەم و دۆستێکی نزیکی (ئازاد)م. لەبەرئەوە هانایان بۆ من هێناوە، وایان دەزانی، من کارێکم پێ دەکرێ و دەتوانم، یارمەتییانبدەم!
بەراستی گەلێکم پێ ناخۆشبوو، نەک هەر من، بەڵکوو هیچ کەسێ دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو، تەنانەت هەواڵێکیشیان بزانێ. ئەو کاتە (مەنسوور)، بە ڕێککەوت لە (ناسریە)وە هاتبووەوە. هەر زوو ئاگادارمکرد. پاشان زانیمان، هاورێکانی (کۆمەڵەی ڕەنجدەران)، ناوی ئەو دوو هاوبیرەشیان داوە.
(مەنسوور) تا ئەو کاتەی لە (سولەیمانی) بوو، خۆی سەری لە ماڵی (ئازاد) نەدەدا و دەیگوت: با کەس نەمناسێ! وەک خەڵکی شارەکە، من نەناسن و نەزانن، کوڕێ (کاژێک)

بووم و ئێستەش (پاسۆک)م! یا ئەو لە من پتر، بە (کاژیک) و (پاسۆک)، ناسراوتربێ! هەموو ئێوارەیە، بە ترومبێلەکەی خۆی، منی دەبردە گەڕەکی (سەرشەقام) و لایماڵی (ئازاد) دایدەبەزاندم. منیش سەرم لێدەدان، دەنگوباسم لێ وەردەگرتن و دڵنیادەکردنەوە! لە ئەو ماوەیەدا، تا چارەنووسی (ئازاد) و (فەرهاد) دەرکەوت، من و (مەنسوور)، شەو لە ماڵی خۆمان نەدەنووستین. پتر لە ئەوە دەترسام، یەکێکیان بەرگە نەگرێ، لەبەر لێدان و لەتاو ئازاردان، خۆی بۆ ڕانەگیرێ، ناوی ئێمە بڵێ و دەسەڵاتی (بەعس) بمانگرێ. بە ڕۆژیش، زۆر بە ترس و ئاگاییەوە دەوامدەکرد. کەم خۆم دەردەخست. تا لە (سولەیمانی) ڕزگاریانبوو، هەموو گیراوەکانیان ڕەوانەی دادگەی تایبەتی (کەرکووک) کرد. پاشان ئەنجامەکە دەرچوو، یەکی بە **(10)** ساڵ زیندانیکردن سزادران. بە ئەو شێوەیە لە مردن ڕزگاریانبوو! پاشان ناردیانن بۆ (بەغدا) و لە گرتووخانەی (ئەبوغرێب) بەندکران!

## دانیشتنێکی کتوپڕی

هەر ئەو دوو برادەرە گیران، ئیدی (جەلال) ترسی لێ نیشت و خۆی شاردەوە. دوای ماوەیەک، (غەریبی خولەی ئەمینی بووک) و چەن پێشمەرگەیەکی دیکەی نێوشاریش دەسگیرکران، ناوی (جەلال)یشیان دابوو. ئێوارەیەک لەگەڵ (مەنسوور)دا هاتن. ئێمەش میوانمان هەبوو، ناچاربووین، لەنێو چیمەنەکەدا بە تاریکی، سێقوڵی دانیشین. (جەلال) داوای لێ کردم، گرفتەکانی پێشووی کۆنفرانسەکە لەبیر خۆم بەرمەوە و کاریان لەگەڵ بکەم. منیش گوتم: ئامادەی هەموو هاوکاری و یارمەتییەکی برایانەم، بەڵێنیشتاندەدەمێ، پێوەندی بە (شێرزاد)ەوە بکەم و سەر لە گرتووخانەش بدەم. بۆئەوەی جەمسەری پێوەندی هەموو لاکان، پێکەوە ببەستینەوە. بەڵام بە هیچ شێوەیە ئامادەنیم، بە شێوەیەکی فەرمی، کارتان لەگەڵ بکەمەوە. (جەلال) زۆری پێ ناخۆشبوو، بەڵام دەیزانی، من لە کۆیەوە قسە دەکەم. بۆیە گوتی: جا گەر تۆ ئەوانەمان بۆ بکەی، وا دەزانم، کارمان لەگەڵ دەکەیتەوە. ئاخر (پاسۆک)، پێش ئەوەی ئەو دوو برادەرە بگیرێن، خۆی لە خۆیدا هیچ نەبوو، جا وەرە، ئەو دووانەش گیرابن، ئێستە دەبێ، باری چۆن بێ؟! بەڕاستی هیچ هیوایەکم بە (پاسۆک) نەمابوو، جگە لە ئەوەی لەبەرخۆمەوە لێکمدەدایەوە و دەمگوت: گەر ئەوان لێیان نەقەومایە، ئایا لە منیان دەپرسییەوە و داوایان لێ دەکردم، سەرلەنوێ کاریان لەگەڵ بکەمەوە؟! دوایی بڵاوەمان لێ کرد و بە هیچ ئەنجامێ نەگەیشتین. ئەوانیش پێکەوە ڕۆیشتن و ناچاربوون، پێکەوە تەگبیرێکی خۆیان و ڕێکخراوەکەیان بکەن، چونکە لە ئەو کۆنفرانسە بێسەروبەرەدا، (ئازاد) هەڵبژاردبوون و بێ ئەوەی دەنگیان بۆ بدرێ، دانرابوون!

## کەرکووک

دوای ئەو ڕووداوانە، دەنگ لە بەردەوە هاتبێ، دەنگ لە (شێرزاد)ەوە نەهاتووە، خۆی مانکردبوو، لە کەسی نەدەپرسییەوە. ناونیشانی ماڵەکەیانم، لە (جەلال) وەرگرت و هەرچی چۆنێ بوو، دۆزیمەوە. ماوەیەکی زۆر پێکەوە دانیشتین و گەلێ قسەمانکرد. خوا هەڵناگرێ، (شێرزاد) زۆر مەردانە هاتەپێشەوە و ئامادەیی خۆی پیشاندا، پێکەوە کاربکەین، هەرچی من بمەوێ و بیڵێم، ئەو پێی قایلبێ. پێشەکی بڕیارماندا، من سەردانێکی گرتووخانە بکەم، تا دید و بۆچوونی ئەو دوو برادەرە بزانم، پاشان یەکدی ببینینەوە و بڕیارێکی بنەبڕی بدەین. هەروەها ڕێککەوتین، مانگی (2)جار یەکدی ببینین، هەر جارەی بە نۆرە، سەر لە یەکدی بدەین.

## گرتووخانەی ئەبوغرێب

سەرەتای مانگی (7)ی ساڵی (1977) بوو، بەرەو (بەغدا) چووم و سەرم لە گرتووخانە دا. لە پێشدا (فەرهاد)م بینی، تەنیا هەر خێزانەکەی لابوو. یەکدیمان ماچکرد و یەکسەر گوتی: هەرچییەکت گوت، هەمووی ڕاست دەرچوو. بەس نەبوو، من لەگەڵ (ئازاد) بووم، ئەگینا زۆر کەسی تووشدەکرد! ئیدی کەمێ لای دانیشتم و هەموو دەنگوباسەکانم، بەپەلە بۆ گێڕایەوە، بڕیارەکانی خۆمانم بۆ باسکرد و داوای نووسینەکانی خۆشمم لێ کردەوە. بەڵام (فەرهاد) وەک هەمیشە، ڕای خۆی دەرنەبڕی، هەر هێندەی گوت: نووسینەکانمان هەمووی سووتاند. بۆ کارکردنیش بزانە، کاک (ئازاد) دەڵێ چی؟

ویستم، یارمەتییدەم و هێندێ پارەی بدەمێ، بەڵام قەبووڵی نەکرد و گوتی: براکانم باری ئابووریبیان باشە، هیچم ناوێ. (ئازاد) هیچی نییە و خێزانی زۆرە، یارمەتی ئەو بدەن. پاشان چوومە لای (ئازاد)، بە کەسوکار و برادەر، چواردەوری گیرابوو. خێزانەکەی و منالەکانی، دایکی و خوشکەکانی لابوون. هەر لە دوورەوە دایکی چاوی بە من کەوت، گوتی: جگە لە ئەم پیاوە، کەسی دیکە سەری لێ نەداوین! یەکدیمان ماچکرد و هەر زوو، هەموویانی بەرێکرد. لە یەکدی نزیکبووینەوە و دووقوڵی دەسمان بە ورتەورت کرد. هەموو هەواڵەکانم پێ ڕاگەیاند و گوتم: بڕیارمانداوە، من و (شێرزاد) کاربکەین. بە مەرجێ مۆر و چاپەکە، هەموو نووسینەکانمان بدەنێ. گوتی: گەر ئێوە بە ناوی (پاسۆک)ەوە کاربکەن، لە سەداسەد ئێمە لێرە هەڵدەواسن، چونکە ئێمە بە مارکسی خۆمان ناساندووە و گوتوومانە: (پاسۆک) هەر نییە و ئاگامان لێی نییە. پاشان گوتی: لەبەرئەوە بە هیچ شێوەیە ڕازی نین، کاربکەن و ئامادەش نەبوو، شتەکانمان بداتێ. تا دواجار گوتی: بە هەموو شێوەیە دەبێ، چالاکی (پاسۆک) بوەستێنرێ. گەر (جەلال)یش چووەدەرەوە،

نابێ بە ناوی (پاسۆک)ەوە کاربکا. پاشان ئەو پارەتییەی بەدەستپێشخەری خۆم، لە هێندێ برادەری وەک (برایمی حەمەعەلی، سەرۆەت، مەنسوور و دارا جاف) کۆمکردبووەوە، دامێ و ئەویش لە ناچاریدا، بە شەرمێکەوە وەریگرت.

## ماڵاوایی

دوای ئەوەی لە گرتووخانە گەڕامەوە، ئێوارەیەک (جەلال) هات و (سەرۆەر) ناوێکیشی لەگەڵ بوو. بەڕاستی، من زۆرم پێ ناخۆشبوو، بە یەکێکی دیکەم بناسێنێ. چونکە من ئاگادارمکردبوو، ئامادەنیم، کاریان لەگەڵ بکەم. ئیدی چ پێویستەکا، بە یەکێکی دیکەی نەناسیاوم بناسێنێ؟! تازە چارنەبوو. هەرسێکمان پێکەوە دانیشتین و هەموو ڕاسپاردەکانی ئەوانم بۆ باسکرد. گەلێ قسەمانکرد و گوتی: من دوو بەیانی دەچمەدەرەوە، با ئەم هاوبیرەمان لەنێوانذا بێ، بە نامە ئاگاداری یەکدی دەبین.
من دەمزانی، واز لە من ناهێنن. دووریش نییە، بە ئەو کارە هەڵەشە و هەڵانەی خۆیان، من و چەن هاوبیرێکی دیکەش، بەخۆرایی تێوەنەگلێنن! بەڵام هیچ چارم نەبوو، چونکە ئەوە ڕەوشت و ویژدانی من نەبوو، لە ئەو ڕۆژەرەش و تەنگانەیەی ئەوانی تێکەوتبوون، دەستبەرداری هاوبیرەکانی خۆم بم و لێیان دووربکەومەوە. لەبەرئەوە ناونیشانی (سەرۆەر)م وەرگرت و گوتم: تۆ مەیە بۆ ئێرە، خۆم هەفتەی دووجار، سەرت لێ دەدەم، گەر شتێکی زۆر پێویستیش هەبوو، تیلیفۆنم بۆ بکە و خێرا دەتدۆزمەوە. ئینجا (جەلال) ماڵاواییکرد و ڕۆیشتن.

## جەلال کولەکەی بێدەنگی شکاند!

ملازم (ستاری سەعید خەلەف)، لە ڕۆژی (**1. 1. 1977**)ەوە، بە شێوەیەکی نهێنی، سەرەداوێکی قرچۆکی پێوەندی، لەگەڵ (پاسۆک)دا گرێدابوو. کاتێ (جەلال) چووەدەرەوە، یەکسەر (ستار)ی دۆزیبووەوە. کورد دەڵێ: ماڵ خۆی لە خۆیدا نەبوو، میوانیش ڕووی تێکرد! هەرچەندە هاوبیرانی گرتووخانە بڕیاریان ئەوەبوو، نە لەنێو شار و نە لە شاخ، کەس بە ناوی (پاسۆک)ەوە کارنەکا، چونکە دەترسان، لەسێدارەیانبدەن. بەڵام هەر ئەو ڕۆژەی (جەلال) گەیشتبوو، خۆی بۆ نەگیرابوو، یەکسەر هەموو شتێکی ئاشکراکردبوو، بانگی (پاسۆک)ی با ئاشکردا دابوو!
پاشان لەگەڵ هاوبیر (ستار)دا، لەسەر شێوازی کارکردنی (پاسۆک) و هێندێ خاڵی دیکە، ناکۆکی لەنێوانیاندا سەریهەڵدبوو. (جەلال) مۆرەکانی پێ دەبێ و دەڵێ: من لێپرسراوی

کۆمیتەی سوپایی (پاسۆک) و نوێنەری سەرکردایەتی هەرێمی باشوورم. دەبێ، هەمووتان گوێ لە من بگرن. بە کوردییەکەی دەیەوێ، ئەوان دوایکەون و ئەمیش لێپرسراویان بێ!
(ستار) جگە لە ئەوەی دەمێبوو، لە دەرەوەبوو، کۆمەڵی پێشمەرگەی باشی لەگەڵبوو، خۆیان لە بنباڵی (پارتی)دا حەشاردابوو، وەک کادیرێکی سەربازی و ئەفسەرێکیش، نە بڕوا بە قسەکانی (جەلال) دەکا و نە وەک فەرماندەیەکیش پێی ڕازیدەبێ. ئەو شێوازە کارکردن و خۆئاشکراکردنەشی، لا ڕاست نایێ، بەڵکوو (ستار) ویستبووی، چۆن لەگەڵ (ئازاد) و (مەنسوور)دا ڕێککەوتبوو، هەر بە ئەو شێوەیە کاربکا و بەردەوامبێ. ئیدی لەسەر ئەوە تێکچووبوون، ئاکۆکی لەنێوانیاندا دروستبووبوو و لە یەکیش جیابووبوونەوە.
لەڕاستیدا، (جەلال) پیاوێکی زۆر تووڕەبوو، زوو هەڵدەچوو، بەرانبەرەکەی دەشکاند و خۆی بەسەردا دەسەپاند، ئەوەش بە ئەفسەرێکی سوپای وەک (ستار) قەبووڵ نەدەکرا و سەری بۆ کەس شۆڕنەدەکرد!

### کردنەوەی ماستەر

ساڵی (**1977**) بوو، بۆ یەکەمین جار، لە هێندێ بەشی کۆلێژەکانی زانکۆی (سولەیمانی)، خوێندنی ماستەر کرایەوە. منیش وەک مامۆستایەک لە بەشەکەی خۆمان، نووسراوێکم نووسی و داوامکرد، لە خوێندنی باڵا وەرمگرن. ئەو ساڵە نزیکەی (**20**) کەس داواکارییان پێشکەشکردبوو. تەنیا (**2**) کەسیشیان دەویست!
مانگی (**10**)، تاقیکردنەوە دەسپێیکرد و لە تاقیکردنەوەکەدا زۆر باشبووم. بەڵام لە ئەنجامدا وەرنەگیرام. هەر بە یەکەمین ساڵیشدا بۆم دەرکەوت، ڕێکخستنی (بەعس) لە زانکۆ بڕیاردەدەن، کێ وەرگیرێ. ئەوانیش یەکێکیان وەردەگرت، کە لە هەموو ژیانی خۆیدا، کاری ڕامیاری لە پارتێکی کوردی و (کوردستان)یدا نەکردبێ، یا وەک ئەو ڕۆژانە، لەنێو کورددا باوبوو، حەیەسەوزەکەی قووتدابە و لەگەڵ (بەعس) کاریبکردایە. گەر نەبووایە بە بەعسیش، دەبووایە، بەڵێننامەیەکی بنووسیایە، کە لە هیچ پارتێکدا کارناکا. ئینجا وەردەگیرا. ئەو کارەش لە کەسانێکی کوردپەروەر نەدەوەشایەوە!

### بێدەنگی

ئەو دوو هاوبیرە، لە گرتووخانەی (ئەبوغرێب) بوون و چالاکی (پاسۆک)یان وەستان. (جەلال)یش لە دەرەوەبوو، هیچ دەنگی نەبوو. بێدەنگییەکی سەیر، باڵی بەسەر هەموو شتەکاندا کێشابوو. لە زمانی خەڵکەوە، هەواڵەکانی شۆڕشم دەبیست. (سەروەر)یش بە هیچ شێوەیە، دیار نەبوو. منیش بیرمکردەوە و لەبەرخۆمەوە گوتم: با من هەنگاوبنێم.

دووکانەکەی (سەروەر)، لەبەر حەوزە وشکەکە بوو. ڕۆژی چووم، بیبینم، دەرابەکەی داخرابوو، ڕۆژی دوایش هەر چوومەوە، دیسان دووکانەکەی داخرابوو، منیش تێگەیشتم، سەردانی (بەغدا)ی کردووە و هەفتەکەی دیکە دێتەوە.

دوای هەفتەیەک، سەرم لێ دایەوە، دووکانەکەی هەر داخرابوو، ئیدی خۆم بۆ نەگیرا و لە دراوسێی دووکانەکەیم پرسی: کاک (سەروەر) لە کوێیە؟ گوتی: بۆ نەتزانیوە؟ گوتم: چی بووە؟! گوتی: لە (بەغدا) گەڕاوەتەوە، لە زاڵگەکە دایانبەزاندووە و گرتوویانە، ئەوا ماوەی دوو هەفتەیە گیراوە و بێ سەروشوێنە. ئیدی منیش یەکلاییبوومەوە، خێرا پاشەوپاش گەڕامەوە. زۆرم پێ ناخۆشبوو، بەڵام یەک تۆز نەسلەمیمەوە و نەترسام، چونکە لێکمدایەوە، گەر لە ماوەی ئەو دوو هەفتەیەدا، ناوی منی بە سیخوڕەکانی (بەعس) نەگوتبێ، تازە لە مەترسی ڕزگارمبووە!

## مژدەیەکی خۆش

ماوەیەکی زۆر، بە ئەو شێوەیە مایەوە، هیچ دەنگ و ڕەنگی کەس نەبوو، ئێوارەیەک (ئەنوەری عەلی نەجار)، لە دەرگەی دا و منیش میوانداریییەکی باشم کرد. هەموو گرفتەکانی شۆڕشی، بەدرێژی بۆ باسکردم.



( 1984 – 1946 )

پاشان هەواڵی (سەروەر)ی پێ گەیاندم و گوتی: چووە بۆ (بەغدا)، ئاوەکەی لە خاڵی پشکنینی دووڕیانەکەی نێوان (دووکان) و (کەرکووک) دەبێ، دایدەبەزێنن و دەیگرن. دوای ئەوەی لە (کەرکووک) دادگایدەکری، فرمانی خنکاندنی بەردەچی و چاوەڕێی

مەرگ بەکا. بەڵام لەگەڵ (سەلامی مەلاعەبدوڵڵا)دا پێکەوە دەبن. ڕۆژێکیان هەڵیان بۆ هەڵدەکەوێ، لەگەڵ کۆمەڵێ زیندانی دیکەدا رادەکەن و تا (سولەیمانی) ناوەستنەوە. پاشان هەر زوو دێتەدەرەوە و ئێستە، لای (پاسوک) پێشمەرگەیە.
بەڕاستی، هەواڵێکی زۆر خۆشبوو، چونکە (سەروەر)، پێشمەرگەیەکی زۆر ئازابوو. ئەو کاتەش، (ئەنوەر) لەگەڵ هاوبیر (جەلال)دا بوو، دوو شەو لای من مایەوە. منیش هەموو هەواڵەکانی گرتووخانە و دەنگوباسەکانی نێوشارم بۆ باسکرد. نامەیەکیشم بۆ (جەلال) نووسی.

## دەنگۆی گفتوگۆ

دوای ئەوەی کۆمەڵێ کادیری (کۆمەلە) و (یەکیتی)، لە دەرەوەی وڵات گەڕانەوە، دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە، گفتوگۆ لەنێوان (یەکیتی) و (بەعس)دا هەیە. ئەوەی ئەو کاتە من بیستم، ئەوەبوو، بەعسییەکان بە سەرانی (یەکیتی)یان گوتبوو: ئیمە نازانین، لەگەڵ کێ دانیشین و گفتوگۆبکەین. ئێوە لەنێوخۆتاندا ڕێککەون، ئەو کاتە وەرن، قسەدەکەین و ڕێکدەکەوین. سەرانی (یەکیتی)ش بڕیاریاندا، ئەو هێزانەی لە نێوچەی (شاربازێڕ) هەبوون، بەلایەکیاندا بخەن. ئەوەبوو، (نەوشیروان مستەفا) و ملازم (عومەر)، چەن نامەیەکیان بۆ (ستار) و (عەبدولمەلیک) نووسیبوو، داوایان لێ کردبوون، لەگەڵ ئەواندا بن. یا لە ئەو ناوە نەمێنن. چونکە ئەوان لە (کوردستان)، ڕێ بە دوو لەشکری و چەن کوێخایەک نادەن. ئەو کاتە (جەلال)یش بە ناوی (پاسوک)ەوە، لەنێو ڕیزەکانی (یەکیتی)دا بوو.
دیارە، (ستار) و ئەوانیش نەیانویستبوو، لەگەڵ (یەکیتی) تێکەڵاوبن. بۆئەوەی خوێنیش نەڕژێ، وازیانهێنا و لە کۆتایی ساڵی (**1977**)دا، هەموویان گەڕانەوە و خۆیان بەدەستەوەدا. بەڕاستی کاتێ ئەو هەواڵەم بیست، زۆر زۆرم پێ ناخۆشبوو، ئیدی هیچ هیوایەکم، بە ئەو جۆرە کەسانە نەما، تەنانەت بەخێرهاتنەوەی هاوڕێ نزیکەکانی وەک (ئەنوەری عەلی نەجار، کەریمی دادەمەنە ...)شم نەکرد. چونکە لەنێوان هێزی پێشمەرگە و شۆڕش، (بەعس) و دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)دا، دوژمنیان هەڵبژارد! بەڵام با بەوێژدانەوە بڵێم: لە هەموو ئەو ماوەیەی (ستار) گەڕابووەوە، خراپەیەکی بەرانبەر کورد نەکرد و دژی شۆڕش نەبوو. بەڵکوو بەپێچەوانەوە، یارمەتی هاوڕێکانی خۆی دەدا. زۆربەی ئەفسەرەکانی سوپا و مفەوەزەکانی پۆلیسی، وەک (مەنسووری شێخ کەریمی حەفید، کەریم سەلام، شێرکۆی عەبدوڵڵا دەرویش، حەمەشەوقی، عەلی حاجی سەعەرەش، فەرەیدونی حەمەی شێخەلی، حیکمەتی عەبەپاشا، نەجاتی عومەرە گۆج ...)، لە نێوەڕاست و خوارووی (عێراق)ەوە، بۆ (سولەیمانی) گەڕاندەوە. جگە لە ئەوەی زۆربەی کات، چەندین پێشمەرگەی برینداری وەک (بابەتایەر)، یا هێندێ کادیری دیکەی

بە کارێکی تایبەتیی شۆڕش، سەردانی شاریان دەکرد، یا بۆ خەواندنەوە و کارێکی تایبەتی خۆیان دەهاتنەوە، وەک (ملازم مەنسوور، ملازم عومەر و جەلالی حاجی حوسێن)، لە ماڵی ئەوان خۆیان دەشاردەوە و بە باشترین شێوە ڕاژەیدەکردن، پاشان بەرێیدەکردن.

## هەواڵێکی جەرگبڕ

ڕۆژی (**31. 1. 1978**) بوو، لە زانکۆ لە جێگەکەی خۆم دانیشتبووم، سەرمایەکی سەیربوو، بەفرێکی زۆر باریبوو، لەپڕ خاتوو (شەونم ئەسعەد بابان)، لە پەنجەرەکەوە بانگیکردم و بەدەم هەنسکی گریانەوە گوتی: (ئارام)یان کوشت. وا بزانم، خزمی خاتوو (شەونم)یش بوو.

ئەو ڕۆژەم هەرگیز لە یادناچی، بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆشبوو، چونکە (ئارام) کوڕێکی هەڵکەوتووبوو، گەنجێکی ڕووناکبیر و نووسەرێکی باشبوو، لەسەرخۆ و هێمن بوو، جگە لە ئەوەی، لە هەموو کادیرەکانی دیکەی (کۆمەڵە) پتر، (کوردستان)یانە بیری دەکردەوە. دواتر بۆمان ڕوونبووەوە، کە جاشە خۆفرۆشەکانی (تەحسین شاوەیس) لە بەری (قەرەداغ)، پەلاماری گوندی (تەنگیسەر)یان داوە و (ئارام)یان شەهیدکردووە.

سەیر ئەوەبوو، کاتی (پارتی) بە هاوکاری (بەعس)، ڕۆژیی (**12. 9. 1996**)، شاری (سولەیمانی)یان داگیرکرد، ئەو جاشە ڕووڕەشانە، زۆر بێشەرمانە، لە پەیکەرە بەردینە بێگیانەکەی (ئارام) بەربوون و شکاندیان! ئاخر ئەو خۆفرۆشە ترسنۆکانە، نەک هەر بە زیندوویی، لە (ئارام) و بیروباوەڕەکەی دەترسان، بەڵکوو دوای مردنیشی، سڵیان لە پەیکەرەکەی دەکردەوە!

بەڵام دوای (**21**) ساڵ و ڕۆژی (**31. 1. 2018**)، پەیکەرێکی دیکەی نوێی جوانتریان، بۆ (شاسوار جەلال – ئارام) دروستکردەوە و لەنێو چەقی دەروازە گەورەکەی (باخی گشتی) شاردا دایاننا. بەڕاستی ئەو ڕەوانشادە نەمرە لەخۆبووردووە، شایستەی زۆر لە ئەوە زیاترە!

## ملازم جوامێر

ڕۆژی (**16. 5. 1977**)، کۆمەڵی لاوی کوردی نیشتمانپەروەر، لە (بەغدا) تەقەیان لە خۆفرۆشی ناوبار (عوسمان فایەق)ی بەڕێوەبەری (دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی) کرد و کوشتیان. سەرەتا کەس نەیدەزانی، ئەم کارە قارەمانانەیە، لەنێوجەرگەی دوژمنی داگیرکەردا، کێ کردوویەتی! بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، خەڵک زۆریان پێ

خۆشبوو، چونکە خۆی بە دوژمن فرۆشتبوو. پاشان ئاشکرابوو، ڕێکخراوی (هەڵۆی سوور)، ئەو کارەیان کردووە. لەسەر ئەوە خەڵکێکی زۆریان گرت. یەکێ لە ئەوانە هاوڕێم (بێستووتی مەلاعومەر) بوو.
بە داخەوە دوای ماوەیە، هێڵێکی ڕێکخستنی نهێنی (ی. ن. ک.)، بەهۆی سیخوڕێکی خۆفرۆشی زۆڵەکوردێکەوە ئاشکرابوو. ڕۆژی (**21. 8. 1977**)، چەن ئەندامێکی ڕێکخراوەکە وەک (سەلمان داود، شێرۆ قادر عەبدولڕەزاق و ملازم جوامێر ...) دەسگیرکران. دوای ئەوەی ئەشکەنجەیەکی زۆریان دان، هەوڵی ڕاکردنیان دا. بەڵام هەموویان گیرانەوە و ڕۆژی (**10. 4. 1978**)، لەسێدارەدران!
دوای ماوەیە (بێستوون) بەربوو، بە ڕێککەوت لەبەردەرکیسەرا بینیم، یەکدیمان تێر ماچکرد و گوتی: با پێکەوە سەرێ لە (عەلەخرە) بدەین. تەقەیان لێ کردووە و لە ماڵەوە کەوتووە. سواری ترومبیلەکەم بووین و چووین. (بێستوون) لە ڕێ بۆی باسکردم، پیاوکوژەکانی (ئەمنی عامە)، چەن ئازاریانداون، تا ئەندامانی ڕێکخراوەکەش گیران و درندەکانی (بەعس)، بۆیان ساغبووەوە، ئەمانە بێتاوانن و ئاگایان لە ئەو کارە نییە، بەریان ئەدایین.
(بێستوون) کوڕێکی ئازا و چالاک، نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز و پاک بوو، هەر لە ساڵی (**1964**)ەوە و لە تەمەنی (**16**) ساڵییەوە، لە ڕیزەکانی شۆڕشی (**11. 9. 1961**)دا پێشمەرگە بوو. کاتێ ساڵی (**1974**)یش، جەنگ لە (کوردستان) دەسپێکردەوە، سەرەتا لە دەزگەی (پاراستن) و پاشان لە هێزی (خەبات) پێشمەرگەبوو. لە شەڕە قوورسەکانی بەرەی سەرکردایەتی، زۆر خراپ بریندار بوو. لە شۆڕشی نوێی گەلەکەشماندا، بەشداریکردووە. بە کورتی، چەندین ساڵ پێشمەرگەبووە و چەن جارێکیش بریندارکراوە، تا ڕۆژی (**23. 11. 1987**) شەهیدبوو.



(**1948 – 1987**)

## کارەساتی هەکاری

ئەوەی چەن جاری، (جەلالی حاجی حوسێن) بۆی گێڕاومەتەوە، ئەوەبوو، لەلایەکەوە مەترسییەکی گەورە هەبوو، سوپای دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، هێرش بۆ سەر بارەگەی سەرکردایەتی شۆڕش بکا. لەلایەکی دیکەشەوە، سەرکردایەتی (یەکێتی) ویستبوویان، بۆ ماوەیە بارەگەی سەرکردایەتی، بۆ ناوچەکانی نزیک سنوورەکانی (توورکیا) و (سووریا) بگوێزنەوە، تا پێوەندییەکانیان بە جیهانی دەرەوە ئاسان و پتربێ، ڕێی هاتوچۆ، هێنانی چەک و پارە و پێویستییەکانی شۆڕشیش، باشتر مسۆگەربکەن.

وەک هێندێ لە کادیرەکانی (یەکێتی)ش دەیگێڕنەوە، سەرکردایەتی (یەکێتی)، پێشەکی (ئیدریس بارزانی)یان ئاگادارکردبوو، بۆ چ مەبەستێ دەچن. بەڵام ئەوان وەڵامیان لێ نەگێڕابوونەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئەو نێوە و لەسەر سنوورەکانی (توورکیا)، هێزێکی سەرکردایەتی کاتی (پ. د. ک.)، بە سەرکردایەتی (سامی عەبدولڕەحمان)ی لێ دەبێ. هێندێ لە هۆزە کوردەکانی باکووری (کوردستان)یش کۆدەکەنەوە، تا یارمەتییانبدەن.

هێزەکەی (یەکێتی)، دەوروبەری (**1000**) پێشمەرگە دەبن و بەڕێدەکەون. هێزەکانی (پارتی) و هۆزە کوردەکانی باکوور، سنوورەکانیان لێ دەتەنن و خۆیان قایمدەکەن. ڕۆژی (**1. 6. 1978**) لە هەموو لایەکەوە، پەلاماری هێزەکەی (یەکێتی) دەدەن و شەڕ دەسپێدەکا. ئەم گەمارۆدان و شەڕە گەورەیە، تا ڕۆژی (**19. 6. 1978**) بەردەوامدەبێ. لە ئەنجامدا گەلێکیان لێ بریندارەدەکەن و دەکوژن. هێندێکیان دەگیرێن. هێندێکی دیکەیان هەر لە سەرمان و برساندا ڕەقدەبنەوە. هێندێکی دیکەیان، بە دیوی (ئێران)دا هەڵدێن و خۆیان بەدەستەوەدەدەن. هێندێکی دیکەشیان بەرەو (عێراق) دەگەڕێنەوە. بە کورتییەکەی هەموو هێزەکەیان پەرتوبڵاودەکەنەوە.

پاشان (پارتی) بە ئەوە تاوانباریکردن و پاساوی ئەو هێرشەی بە ئەوە دایەوە، گوایە پێوەندییان بە (بەعس)ەوە هەبووە و هاتوون، ئەو نێوچانە پاککەنەوە. بۆیە هەموو سنوورەکانیان لێ گرتوون و دەسیان لێ وەشاندوون!

بەڕاستی ئەوە کارەساتێکیماڵوێرانکەرانە و دڵتەزێن بوو. کارەساتێکی هێندە گەورەی نەتەوەیی بوو، لە شۆڕشی نوێماندا ڕوویدا، ئاگرێکی گەورەی یەکەمین جەنگی نێوخۆی، لەنێوان (پارتی) و (یەکێتی)دا هەڵگیرسان و هەر نەکوژایەوە، تا ساڵی (**1986**) بەرەی کوردستانی درووستبوو.

هەر کەسێ کەمێ بە وردی، هەردوو نووسینەکانی (سەییدکاکە - بیرەوەری پێشمەرگەیەک) و نامیلکەکەی (نەوشیروان مستەفا – کارەساتی هەکاری) بخوێنێتەوە، زۆر بەباشی، لە ڕاستی هەموو ڕووداوەکان تێدەگا! ئەوەی لە هەمووی ناخۆش و ناشیرینتر بوو،

ئەوەبوو، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی نوێماندا، کورد دەسی لە دیلە کوردەکانی برای خۆی وەشاند، چەندین سەرکردە و پێشمەرگەی ئازای وەک (عەلی عەسکەری، دوکتۆر خالید، شێخ حوسێن بابەشێخ)یان، بە چەکی قورس خەڵتانی خوێنکرد. لەبەرئەوە زامێکی گەلی گەورە و قووڵیان، لە دڵ و دەروونی کۆمەڵانی خەڵکی نیشتمانپەروەرانی کورددا بەجێهێشت و هەرگیز ساڕێژنابێتەوە! لە ئەو بارەیەوە لە رەوانشاد (جەوهەر نامیق)م پرسی، بۆ ئەمەیان کرد و کێ پێی کردن؟ گوتی: فرمانی سەرکردایەتی بوو، ئێمە تەنیا فرمانەکەمان جێبەجێکرد!

**دەربازبوون**

دەمێبوو، خوالێخۆشبوو (سەروەت)ی هاوڕێم، هەوای خوێندن و (ئەورووپا)، لە کەللەی دابوو. ساڵی (**1974**) ویستی، لەرێی شۆڕشەوە بڕوا بۆ خوێندن، بەڵام هەوڵەکەی سەری نەگرت. کاتێ دوای هەرەسەکە گەڕاینەوە، هەمیشە ڕۆژی دەژمارد، بۆئەوەی رۆژێ زووتر، خوێندنی زانکۆ تەواوکا، بەرەوە دەرەوەی وڵات بڕوی دەرچێ و بە ئاواتە دێرینەکەی خۆی بگا. مانگی (**6**)ی ساڵی (**1978**)، خوێندنی بە پلەیەکی باش تەواوکرد. لە نیوەڕاستی مانگی (**7**)دا بوو، بەرەو (بەغدا) رۆی، تا ڤیزەی وڵاتەکانی (توورکیا، بولگاریا و نەمسا) وەرگری.

ئێوارەیەکی درەنگ، لە یانەی فەرمانبەران من و (شوانی عوسمان قایەق)ی هاوڕێم دانیشتبووین. (رەفیقی ئەحەکەچەڵ) هات و گوتی: ئەورۆ لە زانکۆ، سیخوڕەکانی (بەعس) هاتن، (کامەران موکری)یان گرت و هەواڵی (سەروەت)یشیان پرسی.

منیش کە ئەو هەواڵەم بیست، زۆر سەیرم لێهات، چونکە (سەروەت) لە دوای هەرەسەوە، هیچ جۆرە چالاکییەکی نەبوو! هەر لە دوای کۆنفرانسەکەی سەرەتای ساڵی (**1977**)یشەوە، هیچ پێوەندییەکی رامیاری، بە هیچ ڕێکخراو و پارتێکەوە نەبوو. دوای ئەوەی (ئازاد) و (فەرهاد)یش گیران، ڕێکخستنی (پاسوک) وەستا و پەکیکەوت. ئاخۆ دەبێ، بۆچی بە دوایدا بگەڕێن؟! چی ڕوویداوە؟! خۆ گەر (سەروەت) کارێبکردبایە، من دەمزانی، یا گەر شتێکی لەسەر بووایە، بە هەموو لێکدانەوەیەک دەبووایە، منیش تێوەگلامایە. چونکە هەمیشە پێکەوەبووین و ئاگامان لە کاروباری یەکدی بوو!

هەر ئەو کاتە، من و (شوان) یەکسەر چووین بۆ ماڵی (سەروەت). بەڵام (رەفیق) پێشتر ئاگاداری باوکی کردبوو. کە چووین، هەموو لەرزیان لێهاتبوو، نەیاندەزانی، چی بکەن. ئێمەش بڕیارماندا، هەر ئەو شەوە، بەرەو (بەغدا) بڕۆین و ئاگاداریکەینەوە. ئەوەبوو، من و (شوان) سواربووین و کاژێری (5)ی بەیانی گەیشتین. هەر زوو لە سەربانی

ئوتێل (عەلی) دۆزیمەوە و گەیشتمەسەری، لە دوورەوە بینیم، بەدەم خەوەوە زەردەخەنە گرتبووی، دیاربوو، خەوی خۆشی بە (ئەورووپا)وە دەبینی! بەڵام وەک دەڵێن: ئاگای لە مەحموودی بێ زەوا نەبوو! بە هێواشی، لەسەر قەراغی قەرەوێڵەکەی دانیشتم و ماچمکرد، ئەویش یەکسەر چاوی هەڵێنا، ماچیکردم و گوتی: کاکە گیان! ئەوە هاتی؟ گوتم: تا زووە هەستە، با بچینەخوارەوە. ئیدی هیچمان دەنگمان نەکرد و بە هێواشی، لە سەرپانەکە دابەزین. لە ژوورەوە پێم گوت: بەپەلە خۆت کۆکەرەوە، (شوان) لە خوارەوە چاوەڕێمانەدەکا. گوتی: بۆچی؟ چی بووە؟ گوتم: لەنێو ترومبیلەکەدا، هەموو شتێکت تێدەگەیەنم. پارەی ئوتێلەکەی دا و بەپەلە ڕۆیشتین.
لەگەڵ (شوان) سواربووین و هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە و گوتم: بڕواناکەم، بەعسییەکان بزانن، تۆ لە کوێی؟ لەبەرئەوە ئێستە لە ماڵی ئەو خزمەتان، لە (گریعات) دانادەنێین. ئەم ماوەیە لە ئەوێ بمێنەرەوە و ئیشەکانی خۆت تەواوکە. گوتی: باشە و هەموو ڤیزەکانیشم وەرگرتووە. بەڵام ئەو شتانەم لە ماڵەوە بۆ بێنە. لەگەڵ دوو وێنە لە ژوورەکەی خۆم هەڵواسراوە، یەکێکیان هی خۆم و خۆتە، ئەوی دیکەشیان هی من و (شێرکۆ بێکەس)ە. ئیدی ئەومان لە ئەو ماڵە دامەزراند. لەگەڵ (شوان) نانی بەیانیمان خوارد و یەکسەر بۆ (سولەیمانی) گەڕاینەوە.
بەڕاستی، هەردووکمان زۆر ماندووبووبووین. هێندەمان خەوەهات، چاومان بە ئاستەم هەڵدەهات، بەتایبەتی (شوان)، چونکە شەو و ڕۆژی بوو، بەردەوام ترومبیلی لێدەخوڕی. گەرمای هاوینیش، هێندەی دیکە بێزاریکردبووین. هەرچی چۆنێ بوو، گەیشتینەوە. یەکسەر چووین بۆ ماڵی (سەروەت) و لە دەنگوباسەکان ئاگادارمانکردنەوە. ئەوانیش هەر ئەو ڕۆژە بۆ ماڵاوایکردن، بۆ (بەغدا) بەڕێکەوتن.
ئیدی هەموو ئەو نیشانەی لە (سولەیمانی) مابووی، لە ماوەی ڕۆژێکدا تەواومکرد. سەرم لە (کەرکووک)یش دا، پەڕلەی نێوان سەرکردایەتی (پاسۆک) و (جەمال نەبەز)یشم، لە (شێرزاد فاتیح) وەرگرت، تا لە (ئەورووپا) یارمەتییدا.

## جارێکی دیکە بەرەو بەغدا

بۆ ڕۆژی دوایی، من و برادەران (برایمی حەمەعەلی، کاوسی عەزیز بەگ)، لەگەڵ (شوان)دا سواربووین، هەمدیسان بەرەو (بەغدا) ڕۆیشتینەوە. کەمێ لە ئەو ماڵە دانیشتین، تا تاریکبوو، پاشان ماڵاوایمان لێ کردن و ڕۆیشتین. لەنێوبازاڕ هێندێ بیرە و خواردنمان بۆ ڕێ کڕی، لە کەناری (دیجلە) کەمێ دانیشتین و سەرو بیرەمان خواردەوە. بە هەڵم زانی، هەرچی پێویستبوو، بە (سەروەت)م گوت. ئەویش دڵی پڕبووبوو، گوتی: لە ئەم بارە ناسکەی گەلەکەمانی پێدا تێپەڕدەبێ، دەبووایە، ئێستە من بەرەو (ئەورووپا) ڕام

نەکردایە و ببوومایە بە پێشمەرگە. بەلام بلێم چی؟ تازە شتەکان وای لێهاتووە. منیش کەمێ دلخۆشیمدایەوە و گوتم: چوونەدەرەوە هیچ کەلکێکی نییە. پاشان هەموومان سواربووین و بەرەو (موسل) بەڕێکەوتین.

لە ڕێ هەموومان بەدەم خەوەوە وەنەوزماندەدا. لەپڕ ناڵەیەکی گەورە هات، هەموومانی ڕاچلەکان. بەراستی من وامزانی، هێزەکانی دوژمن بە دوامانەوەن، بە ئاربیجی لێمان دەدەن. باشبوو، (شوان) خۆی تێک نەدا، یەکسەر ترومبێلەکەی ڕاگرت و گوتی: هیچ نییە، بەردێکی چکۆلانە، لەژێر تایەی ترومبێلەکەی پێشمانەوە دەرچووە، بەر جامی ترومبێلەکەم کەوتووە. جامەکەی وردوخاش کردبوو، نێو ترومبێلەکەش هەمووی وردە شووشە بوو. بەلام باشبوو، کەسمان بریندار نەبووین، چونکە هەر ناڵەیهات، هەموو خۆمان دانەواند!

نزیکی نیوەڕۆبوو، بە ماندووی و بە جامی شکاوەوە، گەیشتینە (موسل). یەکسەر جامەکەمان چاککردەوە، نانێکی باشمان خوارد و ئینجا، بەرەو (زاخۆ) ڕۆیشتین. دابەزین و چاوەڕێبووین، ناوەکان بخوێننەوە. گوتم: من لەبری تۆ دەچم، گەر گرتیانم، دەڵێم: من ئێم و بەهەڵە هاتووم، تۆش یەکسەر سواربە و خۆت ونکە. گەر زانیم، هیچ نییە، تۆش بە دوای مندا وەرەژوورەوە. سویچگەرچییەک لە تەنیشتمانەوە بوو، نەمانزانی، گوێی لە قسەکانمان بووە، پیاوی بوو، لە خەڵکی (زاخۆ) دەچوو، هات و گوتی: گەر هەر گرفتێکتان هەیە، مەترسن، یارمەتیتاندەدەم. منیش زۆر سوپاسمکرد و گوتم: جارێ با بزانین. هەرگیز هەڵویستی ئەو پیاوە مەریدم بیرناچێتەوە. جا نازانم ، هەستی نەتەوەیی پاڵپێوەنابوو، یا دەلالبوو، دەیتوانی، بە پارە و بەرتیل، کارەکەمان بۆ جێبەجێکا و ڕزگارمانکا؟!



سەروەت موحەممەد ئەمین – دوکتۆر کوردۆ (1950 – 2016 )

باشبوو، دوای ماوەیە، ناوی (سەروەت)ی خوێندەوە و هەردووکمان چووین. بەڵام ئەو چووەژوورەوە و من لەبەر دەرگەی ژوورەکە ڕاوەستام، زۆری پێ نەچوو، دەم بەپێکەنین هاتەدەرەوە. هەر لە (بەغدا)شەوە، جێیەکمان لە پاسەکەدا بۆ گرتبوو، بە شۆفێرەکەمان گوتبوو، لە (برایم خەلیل) سواردەبێ. ئیدی ئەومان سوارکرد و خۆشمان گەڕاینەوە. کاتێ گەیشتینەوە، (کامەران موکری) بەریبووبوو. لێم پرسی: چی بوو؟ گوتی: شتێکی وانەبوو، لەسەر کوڕێکی ویژەیی بوو، هێندێ پرسیاریان لێ کردم و بەریاندام!

**زاخۆ**

ماڵاوایمان لە (سەروەت) کرد و بڕیارماندا، پەلەنەکەین و لەسەرخۆ بگەڕێینەوە. لە زانکۆی (سولەیمانی)، برادەرێکی خەڵکی (زاخۆ)مان هەبوو، ناوی (عومەر) بوو. هەر زوو ماڵەکەیمان دۆزییەوە، ئەو ڕۆژە تا درەنگانێ، نێو (زاخۆ) و دەوروبەرەکەی گێڕاین. پردی (دەلال)یشمان بینی، کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریای (عەبباسی)دا دروستکرابوو. پردێکی زۆر بەرز، قایم و جوان بوو. ئاوێکی زۆر ڕوون و خاوێن، بە بنیدا دەڕۆی و هەردوو بەری پردەکە، لەبەر خەڵک بەرنەدەکەوت.

شەو لە ماڵی (عومەر) ماینەوە. بەڵام لەبەر مێشوولە و پێکەنین، تا بەرەبەیان خەومان لێ نەکەوت. باوکی (عومەر)، پیاوێکی پیری بەساڵاچووی گوڕ بوو، لە ئەوە دەچوو، گرفتەکانی ژیان، پشتی چەماندبێتەوە. ڕیشێکی درێژی سپی بەربابووەوە، کڵاوێکی ڕەنگاوڕەنگی قوچی لەسەرکردبوو، کڵاوەکەی هەر لە قوچەهەڵچووەکانی (میسر) دەچوو! دەرپێیەکی سپی درێژی لەبەردابوو، مراخانی و پەستەکێکی زەردباوی بەسەرداکردبوو. پشتێنێکی زلیشی لەسەر بەستبوو. دیمەنێکی زۆر سەیری هەبوو، لەگەڵ ئەو تەمەنەشدا، پیرەپیاوێکی زۆر بە گوڕ و چالاک بوو.

درەختێکی گەورە، لە حەوشەکەیاندا بوو، بە تەختە شوێنێکی بۆ خۆی سازکردبوو، شەوانی هاوین لەسەر درەختەکە دەنووست. ئێمەش شەوێکی درەنگ، لە یانەی فەرمانبەران گەڕاینەوە، چاومان بە ئەو دیمەنە کەوت، لەبەر پێکەنین خۆمان بۆ ڕانەدەگیرا. جا وەرە، چەن کەسێکی خەڵکی (سولەیمانی) بن و خواردبێتیشیانەوە، چاویان بە دیمەنێکی وا سەیر بکەوێ، دەبێ، چی بڵێن و چۆن پێبکەنن؟!! تەنانەت (عومەر)ی کوڕیشی وای لێهاتبوو، لە ئێمە پتر پێدەکەنی، وەک ئەوەی ئەوە یەکەمین جاربێ، باوکی بە ئەو شێوەیە ببینێ!

باوکی (عومەر) شەوباشی لێ کردین، بەسەر دارەکەدا سەرکەوت و لەسەر تەختەکە، لێی پاڵکەوت. (شوان) دەیگوت: ئەم برادەرە، دەڵێی (تەڕەزان)ە و (کاوس)یش دەیگوت: مەیموون شەو لەسەردار دەنوێ!

جێیان بۆ داخستین، من بەر ژێردرەختەکە کەوتم. خێرا لە ترساندا، جێگەکەی خۆم گواستەوە. کاتێ پالکەوتین و خەریکبوو، بنووین، باوکی (عومەر) تەپاوتل کەوتەخوارەوە، هەر زوو هەستایەوە و خۆی بە ژووردا کرد. ئیدی بە ئەو نیوەشەوە، پێکەنین دەسپێکردەوە. منیش بە (عومەر)م گوت: باشبوو، خوا سوزی نواند، (تەرەزان)ی باوک، هیچی لێ نەهات و بە ساغی دەرچوو!

بەیانی دوای نانخواردن، مالاوایمان لێ کردن، بەرەو هاوینەهەوارەکانی (سولاڤ) و (سوارەتووکە) بەرێکەوتین. ماوەیەکیش لە ئەو ناوەماینەوە، پاشان دەمەوئێوارە، گەیشتینەوە (سولەیمانی). هەرچەندە ئێمە بۆ رەوانەکردنی (سەرۆەت) چووین، بەلام گەشتێکی خۆشیشمان کرد و لەبیرناچێتەوە!

**کانیسارد**

رۆژێکی خۆرەتاوی خۆشی، سەرەتای مانگی (8)ی سالی (1978) بوو، (مەنسوور) هات بۆ لام و گوتی: کاک (جەلال) پیاوێکی بە دواماندا ناردووە و لە (کانیسارد) چاوەڕێمان دەکا، بەلکوو ترومبیلی پەیداکەین و سەرێکی لێ بدەین.

(مەنسوور) سوور دەیزانی، من چارێکی دیکە، کار لەگەل (پاسۆک) ناکەمەوە. بەلام هەر وازی لێ نەدەهێنام و هیچ شتێکیشی، بێ من نەدەکرد. منیش هەرگیز دەسم بە ڕوویەوە نەدەنا و هەمیشە یارمەتیمدەدا.

ئەوەم بۆ (شوانی عوسمان قایەق)ی هاورێیم باسکرد و داوام لێ کرد، یارمەتیماندا و بە ترومبیلەکەی خۆی بمانگەیەنێ. چونکە بڕوام بە کەسی دیکە نەبوو، ئەو داواکارییە پڕ مەترسییەی لێ بکەم. هێندێ مەزە و عەرەقمان کڕی، هەرسێکمان کەوتینەڕێ. کاتێ تەتەرەکە هات و بینیم، یەکسەر ناسیمەوە، ڕەوانشاد (عوسمان حەمەساڵح) بوو، ساڵی (1974) لە بەتالیۆنی (4) سەرپەل بوو. کوڕێکی زۆر باش، ئازا و جێی بڕوا بوو. هەرچوارمان سواربووین و لەڕێی گوندی (سیتەک)ەوە، بەرەوخواربووینەوە. لەپڕ ترومبیلەکەمان وەستا، کاتێکی زۆری ویست، تا (شوان) چارەسەریکرد.

نزیکبووبووینەوە، لەسەر گردێ لاماندا و دابەزین، مەزەمان دروستکرد، سەرووپێک عەرەقمان تێکرد و دانیشتین، تا گەر پێیان زانین، بە فڕۆکەی هێلیکۆپتەر بۆمان دابەزین، بلێین: بۆ سەیران هاتووین و دەخۆینەوە.

سەرەتا (عوسمان) چوو بۆ نێوئاوایی، دوای ماوەیە هاتەوە و گوتی: هەموو شتێ ئاساییە، نێوئاوایی زۆر بێدەنگە و کەسی لێ نییە، با بڕۆین، کاک (جەلال) چاوەڕێتاندەکا. ئیدی شتەکانمان پێچایەوە و چووین بۆ مالی (کەریم کانیساردی). لە ئەوێ چاومان بە (جەلال) کەوت. (شەریفی خالەی کانیساردی)شی لەگەل بوو. من (شەریف)م باش

دەناسی، چونکە کاتی خۆی، لە بەتالیۆنی (4) سەرلق بوو، کوڕێکی تا بڵێی، باش و ئازابوو، (عوسمان حەمەساڵح)یش، هەم خزم و هەم لای ئەو سەرپەل بوو، ئەو کاتەش هەردووکیان (پاسۆک) بوون.

ئەوەتەی (جەلال) ڕۆیشتبوو، ئەوە یەکەمین جاربوو، چاومان پێی بکەوێ. ڕێزێکی زۆری لێ گرتین و هێندێ قسەی خۆشمان کرد. پاشان نانمانخوارد و ژوورەکەیان بۆ چۆڵکردین، تەنیا من و (مەنسوور) و (جەلال) ماینەوە، دەستمان بە قسەکردن کرد.

(جەلال) لە ئەو ڕۆژەوە چووبووەدەرەوە، تا ئەو کاتەی ئێمە چووین، بەدوورودرێژی، باسی هەموو بەسەرهات و ڕووداوەکانی بۆ کردین. لە باسی (هەکاری)دا، زۆر بە توندی دژی (پارتی) و بنەماڵەی (بارزانی) دوا، بە بەکرێگیراوی هەردوو دەزگەی ساواکی (ئێران) و میتی (توورکیا) تاوانباریکردن و بە ناپاک ناویبردن. زۆر بە شانوبازووی (یەکێتی) و هێزی پێشمەرگەدا هەڵیدا. ئەو کاتە (پاسۆک) لەنێو (یەکێتی)دا ئەندام بوو، (جەلال)یش هەم ئەندامی سەرکردایەتی (یەکێتی) و هەم فەرماندەی هەرێمی (شارباژێر) بوو!

چەن ڕۆژێ پێش ئەوەی پێکبگەین، بە کوپتەر بۆیان دابەزیبوون، داکۆکییەکی قارەمانانەیان کردبوو. بەڵام سەیرم لە ئەوە دەهات، ئەم جارەیان (جەلال)، نە داوای لە من کرد، کاریان لەگەڵ بکەمەوە، نە داوای لە (مەنسوور)یش کرد، بچینەدەرەوە! هەر هێندەی گوت: بیرم دەکردن، حەزمکرد، چاوم پێتان بکەوێ. تەنانەت گوتی: گەر پارەشتان پێویستە، با هێندێکتان بدەمێ. پاشان هەواڵی هاوبیرانی نێوشار و گرتووخانەی لێ پرسین، ئیدی دەمەوئێوارە بوو، لە یەکدی جیابووینەوە. مەزە و خواردنەوەکەمان بۆ بەجێهێشت و ئێمەش، بە ڕێی (دووکانیان)دا گەڕاینەوە.



( 1994 – 1946 )

## کارەساتێکی دڵتەزێن

ڕۆژی پێنجشەممەی ڕێککەوتی (**5. 10. 1978**) بوو، (کەریمە فەندی مەلا حەمەئاغا)، لەگەڵ کچە چکۆلەکەی (ئاوات)، کوڕە گەورەکەی (سامی) و خێزانەکەی خاتوو (فایزە) و هەردوو منداڵەکەی (ئاماتج) و (ئالان)، ترومبێلی دەگرن و هەموو پێکەوە، بۆ سەردانی (بەشارەت)ی کچی، بە خۆشیخۆشی بەرەو (بەغدا) دەڕۆن. لە (خورماتوو) لادەدەن، تا کەمێ بحەوێنەوە و نانی نیوەڕۆ بخۆن. بەڵام فریاناکەون، دابەزن و پشوویەکبدەن، لە ئەو کاتەدا و لەناکاو، تەنکەرێکی گەورەی نەوت دێ، زۆر بە خێرایی دەڕوا و وەردەگەڕێ، پێشەکەی دەردەچێ، دواکەشی بەسەر ترومبێلەکەی ئەواندا دەکەوێ. لە ئەنجامدا، هەر یەکسەر (کەریمە فەندی) و (سامی) کوڕی، گیانی پاکیان دەردەچێ، تەرمی باوک و کوڕ، بۆ شاری (سولەیمانی) دێننەوە.

بۆ بەیانی ڕۆژی هەینی، تەرمی هەردووکیان لە گردی (شەهیدان) بە خاک سپاردن. ناشتن و پرسەکەیان، هێندە جەنجاڵبوو، تا ئەو ڕۆژە شاری (سولەیمانی)، پرسەی وای بە خۆیەوە نەدیبوو. خەڵکی زۆر بۆیان بە داخبوون. بەڵام (ئاوات) و (فایزە) و منداڵەکانی، زۆر بە شێوەیەکی خراپ بریندارببووبوون و لە هۆش خۆیان چووبوون. هەر ئەو ڕۆژە، خێرا بردبوویانن بۆ نەخۆشخانەی (کەرکووک) و ماوەی دوو ڕۆژ لە ئەوێ کەوتبوون، تا هۆشیان بەبەرخۆیاندا هاتبووەوە، پاشان بە ترومبێلی نەخۆشخانە، هێنابوویانەوە بۆ (سولەیمانی). ئەو داماوانە، دوای مانگێ پێیان زانی، کە (کەریمە فەندی) و کوڕەکەی شەهیدبوون، ئیدی سەرەڕای ئەو کارەساتە دڵتەزێنە و ئازاری خۆشیان، پرسە و ناخۆشییەکەیان بۆ تازەبووەوە.



کەریمە فەندی مەلا حەمەئاغا (**1911–1978**)



سامی کەریمە فەندی (**1940–1978**)

جگە لە ئەوەی، من بنەماڵەی (کەریمە فەندی)م، ماوەی (**7**) ساڵ بوو، دەناسی و ئاگام لە هەموو رووداوەکان بوو، چونکە مامە (ساڵح)م، ساڵی (**1971**) خاتوو (گەلاوێژ)ی کچی هێنابوو.

خاتوو (ئاڤتاو)ی خێزانی (کەریمە فەندی)، بۆی گێرامەوە و گوتی: ئەو بەیانییەی دەڕۆیشتن، (کەریم) گوتی: (ئاڤتاو) خەونم دیوە، لە خەومدا باوکم بانگیکردم. گەر لە رێ شتێکمان بەسەرهات، ئەوا ئەم راسپاردانەم بۆ جێبەجێکە. ئەوەبوو، خەونەکەی راست دەرچوو، خۆی و کوڕە تاقانەکەی، بۆ لای باوکی گەڕانەوە، (کەریمە فەندی)ش، ژنەکەی و (**7**) کچی لە پاش خۆی بەجێهێشت. ئەمەش نموونەیەکی ئەو جۆرە خەونانەیە، کە هێندێ کەس بڕوایان پێی نییە! ئاخر کێ دەیزانێ، یەزدانی مەزن، (ئاوات) لە مردن رزگاردەکا و دوای (**3**) ساڵ، منیش پێوەندی خۆشەویستی لەگەڵ دەبەستم و خێزانێکی بەختیار پێکەوەدەنێن؟!!

## شۆڕشی ئیسلامیی ئێران

رۆژی (**10. 2. 1979**) بوو، ئاخوندە شیعەکانی (ئێران)، بە رابەرایەتی ئیمام (خومێنی)، شۆڕشێکی ئیسلامی گەورەی سەرتاسەرییان بەرپاکرد و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، دەسەڵاتی (**2 .500**) ساڵەی رژێمی شاهەنشاییان، لە بنوبیخەوە هەڵکێشا. گەلی کورد لە هەردوو بەشەکەی خۆرهەڵات و باشووری (کوردستان)، ئاهێکی پێداهاتەوە و بۆ ماوەیەکی کەم بوژایەوە. سەرانی رژێمی (بەعس)ی (عێراق)یش، هەر لە سەرەتاوە لەرزیان لێهات و زانیان، چ جۆرە مەترسییەکی گەورەی، بۆ سەر ئایندەی رژێمی (بەعس) بەتایبەتی و دەوڵەتی (عێراق) بەگشتی دەبێ. چونکە پتر لە نیوسەدە دەبوو، عەرەبە سوونەکان دەسەڵاتیان بەدەستەوەبوو، فەرمانڕەوایی (عێراق)یان دەکرد، بە هەموو شێوەیە، دژی شیعەکان بوون، دەیانچەوساندنەوە و بە هەزارانیان لێ کوشتبوون. (ئێران)یش وەک دەوڵەتێکی شیعەئایینزا، لە ئایندەیەکی نزیکدا، خۆی دەگرێ و پاڵپشتێکی گەورەی شیعەکانی (عێراق) دەبێ، (سەددام)یش ئەوەی لەبیر نەچووبووەوە. چونکە فارسە شیعەکان هەر لە سەرەتاوە، بەرنامەی مانگی شیعیان هەبوو، (عێراق)یشیان، بە بەشێ لە وڵاتی ئیسلامی شیعستان دەزانی!

ئەوەبوو، شۆڕش لە (ئێران) سەرکەوت، رەگی داکوتا و دەسەڵاتێکی پۆلایینی پەیداکرد. شۆڕشی گەلی باشووری (کوردستان)یش، پێی نایە قۆناغێکی نوێوە. هەر زوو سەرکردەی پارتەکان، برووسکەی پیرۆزبایییان بۆ (خومێنی) نارد. کۆمەڵانی خەڵک بە لەنێوچوونی بنەماڵەی (حەمەرەزاشا)، زۆر دڵخۆشبوون، وایاندەزانی، یەزدانی مەزن تۆڵەی هەرەسی شۆڕشی (**11**)ی سێپتێمبەری، لە خودی شا و بنەماڵە و دەسوپێوەندەکانی کردووەتەوە.

ڕەشبینی و گەمارۆدان، بە گەشبینی و ڕێکردنەوە گۆڕرایەوە، گوڵی هیوای بڕواکان، لە ئینجانەی دڵ و مێشکەکاندا گەشایەوە، خەڵکێکی زۆر، دەسیان بە کوردایەتی کردەوە و تێهەڵچوونەوە، یارمەتی شۆڕشیان دەدا، گەنجێکی زۆر لە هەردوو بەشەکەی (کوردستان)، چەکیان هەڵگرت و وەک پێشمەرگەیەک، ڕاژەی کوردیان دەکرد.
ئێوارەیەک، لەنێوباخەکەی یانەی بازرگانی دانیشتبووین، لە دوورەوە خوالێخۆشبوو (حەمەسالحی عەبە پشی)م بینی. لەگەڵ خوالێخۆشبوو مامۆستا (حەسەن حوسێن) و کۆمەڵێکی دیکەدا هاتن. چاوی بە من کەوت، هات بۆ لام و گوتی: با تا بەرەوە بچین. گوتی: بەیانی دەچمەدەرەوە و دەمەوێ، ماڵاوایت لێ بکەم. منیش گوتم: بەرەو کوێ؟! گوتی: بۆ لای کاک (جەلال). بەراستی نەمزانی، چی پێ بڵێم، هەر هێندە داوای سەرکەوتنم بۆ کرد، یەکدیمان ماچکرد و بە خوام سپارد.

## پێکەنین و گریان

ڕۆژی (**1. 3. 1979**)، ڕێککەوتی هەینی بوو، برادەران (نیهاد، شوان، برایم و دارا جاف)، بە دوامدا هاتن و گوتیان: دەچین بۆ (هەڵەبجە) و سەری لە (حەمەعەلی) دەدەین. لە ئەو سەریشەوە، لە (سەرای سوبحان ئاغا) لادەدەین. ماوەیە لای (حەمەعەلی) دانیشتین، پاشان گەڕاینەوە و لە (سەرا) گیرساینەوە.
ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی زۆر خۆش و گەرم بوو. ئاووهەوایەکی زۆر سازگار و خۆشی هەبوو. ئەو دەشتی (شارەزوور)ە، هەر هەمووی سەوزی دەکردەوە، دەتگوت، چیمەنێکی قەدیفەی سەوزیان لێ ڕاخستووە و بە گوڵاڵەسوورە ڕازاندوویانەتەوە. دیمەنی بوو، وێنەی نەبوو، زۆر دڵفڕێنبوو. ئێمەش دانیشتین و دەسمانکرد بە خواردنەوە. دوای ماوەیە (نیهاد)، لەسەر دەمەتەقێی جەلالی و مەلای، لەگەڵ (برایم)دا لێیان بوو بە دەنگە دەنگ، گوێیان لە کەس نەدەگرت و کەڵکی نەبوو. منیش هەر هێندەم پێکرا، شتەکانم هەموو ڕشت و کۆتاییمان بە سەیرانەکەمان هێنا. گەیشتینەوە (سولەیمانی) و هەر کەسێ چووەوە ماڵی خۆی.
لە ماڵەوە دانیشتبووم، لەپڕ زەنگی تێلیفۆن لێیدا. هەڵمگرت، (برایم) بوو، دەگریا و قسەی بۆ نەدەکرا. گوتم: چییە؟! گوتی: سەرۆک (بارزانی) مرد! ئیدی کەمێ هێورمکردەوە و باسەکەم پێ گۆڕی. چەندم لا سەیربوو، هەمووی دوو سێ کاژێر لەوەوپێش بوو، لەسەر ئەو باسە، لەگەڵ (نیهاد)دا خەریکبوو، پەلاماری یەکدی بدەن، کەچی سەرەڕای ئەوەش، بێ ئەوەی گوێ بە هیچ شتێ بدا، لە ئەو ڕۆژەڕەشەدا، بە تێلیفۆن ئەو هەواڵە بە من ڕادەگەێنێ و دەگری. بۆ ڕۆژی دوایی دیمەوە و سەرزەنشتمکرد. گوتی: چی بکەم، سەرخۆشبووم و لە داخاندا، ئاگام لە خۆم نەبوو!

## جیابوونەوە

ڕۆژی نەورۆزی ساڵی (**1979**) بوو، هەر سێ پارتی (بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان – ڕەسووڵ مەمەند، کۆمیتەی ئامادەکردن – دوکتۆر مەحموود عوسمان و پاسۆک – جەلالی حاجی حوسێن)، بە فەرمی لە (یەکێتی نیشتمانیی کوردستان) جیابوونەوە و سووکە بەردیەکیان پێکەوە کردەوە. پاشان زۆری نەخایان، هەردوو کۆمەڵەکەی (ڕەسووڵ مەمەند) و دوکتۆر (مەحموود عوسمان)، ڕۆژی (**8. 8. 1979**) یەکیانگرت و (حیزبی سوسیالیستی یەکگرتووی کوردستان – حسیک)یان دامەزران. دواتریش ناوەکەیان گۆڕی، (یەکگرتوو)ەکەیان لابرد، بوو بە (حیزبی سوسیالیستی کوردستان - حسک). کۆمەڵێ کادیری ناسراو و کاریگەری وەک (دوکتۆر مەحموود عوسمان، ڕەسووڵ مەمەند، ملازم تایەری عەلی والی بەگ، قادر جەباری، قادر عەزیز، عەدنان موفتی ...) و پتر لە (**200**) پێشمەرگەشیان لەگەڵ بوو.

بەڵام (پاسۆک)، بە ئەو ژمارە کەمەی خۆیەوە، لە گۆڕەپانەکەدا بەتەنیا مایەوە، نە زیادیکرد و نە پێشیشکەوت! ئیدی لە ئەو کاتەوە، ئەم دوو ڕێکخراوە، لەنێوان (پارتی) و (یەکێتی)دا چەقین و بە هیچ شێوەیە پێش نەکەوتن، چونکە ڕۆژی بەلای (پارتی) و ڕۆژێکی دیکە، بەلای (یەکێتی)دا دایانەشکان و بەپێی بەرژەوەندیيە تایبەتییەکانی خۆیان، هەڵوێستیان وەردەگرت!

## ناشتبوونەوەی نێوخۆی هاوبیرانی پاسۆک

ڕۆژی (**7. 6. 1979**) بوو، ئێوارەیەکی درەنگ، لە ژوورەکەی خۆم پاڵکەوتبووم، (مەنسوور) بە دوامدا هات و گوتی: برادەران لە دەرەوە هاتوون و دەیانەوێ، چاویان پێت بکەوێ. منیش بەپەلە خۆم گۆڕی و پێکەوە ڕۆیشتین. ماڵەکەیان زۆر نزیکبوو، هەر لەسەرروو ماڵی خۆمانەوە بوو، زوو گەیشتین.

چووبمەژوورەوە، هەر لە دوورەوە (شێرکۆی هەژار)م بینی و هات بەپیرمەوە. هەرچەندە نەک هەر هەق نەبوو، ماچیکەم، بەڵکوو دەبووایە، هەر سەرم لێ نەدایە. بەڵام لەلایەکەوە، لەبەرئەوەی دوایی نەڵێن: لە ترساندا نەهات. لەلایەکی دیکەوە حەزمکرد، لەبەرچاوی ئەو کەسانەی لە ئەوێ بوون، هێندێ قسەی پێ بڵێم. لەلایەکی دیکەشەوە لەبەر دڵی (مەنسوور) چووم!

هەرچی چۆنێ بوو، یەکدیمان ماچکرد. ئینجا زۆر بەپەرۆشەوە، باوەشم بۆ (فەرهاد عەبدولحەمید) و ڕەوانشاد (سەروەر – هاوبیر دەرویش) کردەوە، تێرتێر ماچمکردن. پاشان دەمەتەقێ دەسپێکرد. وەک پیشەی خۆی، تەنیا هەر (شێرکۆ) قسەیدەکرد و لە هەموو باسەکاندا هەڵیدەدایە.

پێشەکی سڵاوی (فەتاح ئاغا)ی پێ گەیاندم و گوتی: کاک (فەتاح) زۆر بیرتدەکا. زۆر جار باسی دەمەتەقێکانی نێوانتان و جەسارەتی قسەکردن، پاکی و دڵسۆزی تۆ دەکا.
منیش گوتم: سوپاسیدەکەم، بەڵام پێی بڵێن: تفەنگە دزراوەکانی ناوی، بۆی بنێرمەوە؟!
دوایی دەسی بە باسە سەرەکییەکە کرد و گوتی: زۆر بە کورتی شتەکانت بۆ باسدەکەم، چونکە کاتمان نییە. ڕێکخراوی هەیە، ناوی (پاسۆک)ە، بنکەی سەربازی، بارەگەی سەرکردایەتی و پێشمەرگەی چەکداری هەیە، داوات لێ دەکەین، کارمان لەگەڵ بکەی و بیێتەدەرەوە.



( فەرهاد عەبدولحەمید) و (شێرکۆی هەژار) لە ( بلەکی ) گیراوە، کاتی بەرەو (سولەیمانی) دێن.

منیش لەبەرخۆمەوە هەر بۆڵەم دەهات، هەرچەندە بیرم لە هەڵسوکەوتەکانی (پێنجوێن)ی دەکردەوە، بیری ئەو دوو نامەیەم دەکەوتەوە، دوای هەرەس لە (ئێرانە)وە بە (مەنسوور) و (حەمەشەقی) دا ناردبووی، شێوەکەی دوای هەرەسیم دەهاتەوە پێش چاو، بە ئەو جادانەی (مەریوان)دا، وەک گای گێژ بە تەنیا دەسوورایەوە و نەیدەزانی، چی بکا و چی بڵێ، پێکەنینم بە قسە درۆکانی دەهات!
سەیر ئەوەبوو، ئاگای لە هیچ نەبوو، دوای (4) ساڵ تازە لە (هۆڵەند)ەوە هاتبووەوە، باسی (پاسۆک)ی بۆ من دەکرد، کە هەر لە سەرەتاوە، ئێمە خۆمان پێوە ماندووکردبوو، ئەویش ئاگای لە هیچ شتێ نەبوو! ئەدی ئەو ماوەیە، لە کوێ بووی و چیت کردووە، وا ئەم قسە زلانەم بۆ دەکەی؟! جگە لە ئەوەی ئەو پیاوە، لە ڕووی ڕووناکبیری، زانیاری گشتی و شێوازی قسەکردنەوە، لە ماوەی ئەو (4) ساڵەدا، نەک هەر هیچ نەگۆڕابوو، یەک هەنگاو پێش نەکەوتبوو، بەڵکوو ئەوەی دەشیزانی، بیریچووبووەوە!

 

ڕەوانشاد هاوبیر دەرویش لەگەڵ (مام جەلال) و (نەوشیروان مستەفا)

ئەو شەوە، هەر لە ئەو ڕۆژەی لە دانیشتنەکانی کۆنفرانسەکەی (کاژیک) لە (بناوەسووتە) ناسیبووم، تا دوا جار، ڕۆژی هەرەسەکە لە (مەریوان) بینیم، چی لە دڵمدا بوو، چی بەدەممدا هات، دریغیم نەکرد و هەموویم پێ گوت. گرنگ ئەوەبوو، گوتم: پێم خۆشە، ئێوەی کادیرانی نەتەوەیی پێکەوە دەبینم، چونکە من لە (پێنجوێن)، هەوڵێکی زۆرم دا، پێکەوە دانیشین و گرفتەکانی (کاژیک) چارەسەرکەین، بەڵام تۆ دژبووی و لەسەر ئەوە دەتویست، تۆڵەم لێ بکەیتەوە و لە ڕیزەکانی ڕێکخستندا، منتان بە تێکدەر و ناپاک دانا. ئەدی ئێستە چی گۆڕاوە، وا لەگەڵ (فەرهاد)دا یەکتانگرتووە و هاتوون، کادیرە نەتەوەییە کۆنەکانی (کاژیک) کۆکەنەوە؟!! پاشان زۆر بە ڕاشکاوی گوتم: جارێکی دیکە، بە هیچ شێوەیە ئامادەنیم، کار لەگەڵ تۆدا بکەم. ئەویش سەری داخستبوو، ورتەی لە خۆی بڕیبوو، لە ئەو ماوەیەی ناسیبووم، هەرگیز ئەو پیاوە دەروون نەخۆشە ڕەفتار دیکتاتۆرەم، بە ئەو شێوە ماتومەلوولی و داماوییە نەدیبوو!

هەرچەندە (فەرهاد) گوتی: وا زوو بڕیارمەدە و بیری لێ بکەرەوە، پاشان وەڵاممان لێ بگێڕەرەوە. هاوبیر (دەرویش)یش زۆر تکای لێ کردم، هیچ کەڵکی نەبوو. ئینجا وەک خورەوشتی پێشووی، دەنگ لە بەردەوە هاتبێ، دەنگ لە (شێرکۆ)وە نەهات. پاشان ئەو ماوەیەی لایان مامەوە، هەر لەگەڵ (فەرهاد) و (دەرویش)دا قسەمدەکرد، ئەوم بەتەواوی پشگوێخستبوو. کازیری یەکی شەو، ماڵاوایم لێ کردن و بەپێ گەڕامەوە.

هاتمەدەرەوە، لە پردەکەی سەرجادەکەی پشتی زانکۆ پەڕیمەوە، دوو سەربازی عەرەب دەنگیاندام. منیش لە شوێنی خۆم وشکبووم و چەقیم، هەردوو دەسم بەرزکردەوە. یەکێکیان هاتەپێشەوە، گیرفان و باخەڵ و گۆرەوییەکانم گەڕا، هیچی نەدۆزییەوە. ئینجا

گوتی: لە کوێ بووی؟ گوتم: لە ماڵی خوشکمبووم. باشبوو، ماڵی (شەونم)ی خوشکم، کەمێ لەسەرووی ماڵی (مەنسوور)ەوە بوو. گەر بیانگوتایە، با بچین، بزانین، ڕاستدەکەی، بە درۆنەدەکەوتمەوە. داوای ناسنامەی لێ کردم، کەمێ تەماشایکرد و گوتی: بڕۆ، جارێکی دیکە وا درەنگ لە ئەم ناوە نەتبینین. ئیدی ڕێک بە جادەکەدا بەرەوخواربوومەوە، لە کۆڵانەکانیدا هەر سەربازبوو، خۆیان پاڵخستبوو، تا بەپەلە خۆم ڕزگارکرد و چوومەوە ماڵەوە. بەیانی کاژێری (9)، تێلیفۆنم بۆ (مەنسوور) کرد، کە گوێم لە دەنگی بوو، ئیدی دڵم ئاویخواردەوە و تێگەیشتم، هیچ شتێ ڕووی نەداوە!

هەر ئەو جارە، ئەو برادەرانەم بینی، ئیدی نەمبینینەوە و هەوڵیشم نەدا، چاوم پێیان بکەوێتەوە. چونکە ئەوە بڕیاربوو، دابووم، تازە بڕابووەوە و گەڕانەوەی نەبوو. <u>ئەز پێم وایە، گەر هەر کوردێ، بڕوای بە باوەڕێ، بە یەکێ یا چەن کەسانێ نەبوو، ئیدی پێویست ناکا، خۆی و خەڵکی دیکەش بخەڵەتێنێ. چونکە لە ئەنجامدا، هەر پەشیمانیی لە دوایە. ئاخر گوناح نییە، دوای ئەو هەموو ئەزموونە زۆرانەی، لە ژیانی ڕامیاریی تایبەتی خۆمدا، لەگەڵ (کاژیک) و (پاسۆک)دا کەڵەکەبووبوو، جارێکی دیکە لەگەڵ (شێرکۆ)دا تێهەڵچمەوە؟!! گوناح نییە، هەموو جارێ پیاو، بە ناوی کوردایەتییەوە بخەڵەتێنێ؟! کورد دەڵێ: گەر جارێکیان خەڵەتاندی، خوا بیانگرێ. دوو جاریان خەڵەتاندی، خوا خۆت بگرێ!</u>

هەرچەندە ئەو برادەرانەم نەبینییەوە، بەڵام ڕۆژانە بەهۆی (مەنسوور)ەوە دەمزانی، لە کوێن، چی دەکەن و کێ دەبینن، خەڵکێکی زۆری وەک (شێرکۆ بێکەس، عوسمان ڕەشید، نوری حەمەعەلی، مژدە تاپەر، کەریم سەلام، حەمەشەوقی ...)، زۆربەی کۆنە کاژیک و نەتەوەییەکانیان بینیبوو، بەشێکی زۆریان ئامادەنەبوون، کاریان لەگەڵ بکەن. هێندێکیشیان بەڵێنی هاوکارییان دابوو، وەک (نوری حەمەعەلی) بەڵێنیدا، ئەو چەکانەی ڕۆژی هەرەسەکە شاردبوویەوە، بۆیان بنێرێ، کەچی دوایی لە هەموو بەڵێنەکانی خۆیان پەشیمانبوونەوە و (نوری)ش، چەکەکانی بۆ (پارتی) نارد!

(عەبدوڵلائاگرین) بە هیچ شێوەیە نەیویستبوو، چاوی بە چارەی (شێرکۆ) بکەوێ، (عوسمان ڕەشید)یان دیبوو، (شێرکۆ) داوای لێ کردبوو، کاریان لەگەڵ بکا و بچێتە دەرەوە، ئەویش گوتبووی: دوای چەن ڕۆژێکی دیکە وەڵامتدەدەمەوە. پاشان لەسەر پارچە کاغەزێ بۆی نووسیبوون: من کوردێکی کۆمۆنیستم و بڕوام، بە ئەو باوەڕەی ئێوە نەماوە. بەکورتی: لە (4) ئەفسەرەکە (مەنسوور، کەریم، حەمەشەوقی و شوان) پتر، (شێرکۆ) کەسی دیکەی بۆ هەڵ نەخەڵەتابوو!

## کارەساتێکی خوێناویی

ڕۆژی (27. 6. 1979)، لە دەوروبەری شارۆچکەی (پێنجوێن)، لەسەر سنووری نێوان هەردوو بەشە داگیرکراوەکەی خۆرهەلات و باشووری (کوردستان)، لە گوندی (باشماخ)، کۆمەلێ پێشمەرگەی (پاسۆک) و (حسک) لە ئەو ناوە بارەگە دادەنێن. (جەلالی حسە کەلوش) لێپرسراویان دەبێ. ئەو ڕۆژە، خێزانەکەی لە شارەوە سەردانی کردبوو، (جەلال) سەرقالی خێزانەکەی بووبوو.

(حەمەسالحی عەبەپشی) و هێندێ هاوبیری دیکە، لەنێوخۆیاندا تێکدەچن و لێیان دەبێ بە هەرا. ڕاستییەکەی تا ئێستە، بەتەواوی بۆم ڕوون نەبووەتەوە، لەسەرچی پەلاماری یەکدیان دابوو!

(حەمەسالح) کلاشینکوفێکی (75)ی پێ دەبێ. پەلاماری هەردوو هاوبیری پێشمەرگە (عوسمانی دەروێش قادر) و (سەروەر عەلی حوسێن) ناسراو بە هاوبیر (دەروێش) دەدا و هەردووکیان دەکوژێ. (زەردەشت) ناوێکیش بریندار دەبێ. (ئەنوەری مەجید سولتان) ویستبووی، دەسی (حەمەسالح) بگرێ، خەریکبوو، ئەویش بکوژێ. بەلام کەمێ هۆشی بە بەرخۆیدا هاتبووەوە و بە (ئەنوەر)ی گوتبوو: لە خوام خۆشترنەوێی، نەیەیتە پێشەوە، ئەگینا تۆش دەکوژم. ئیدی (حەمەسالح) ڕایکردبوو. کاتێ (جەلال) پێی زانیبوو، زۆر درەنگبوو. هەرچەندە دوای کەوتبوو، تەقەیەکی زۆری لێ کردبوو، بەلام هیچ کەلکی نەبووبوو. (حەمەسالح) پەنای بۆ ڕەبایەیەک بردبوو، خۆی بەدەسەوەدابوو.



( 1979 – 1950 )

بەڕاستی، کاتێ (ناسر حەفید – ناڵە)، ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاندم، هێزی ئەژنۆم نەما. زۆر مەراقمخوارد و لە ناواندا، ڕانکۆم بەجێهێشت و چوومەوە بۆ ماڵەوە. جگە لەوەی، چەن کادیرێکی سەربازی ئازا، شارەزا و چاک، بە دەسی یەکێی کوژران، لەکیس (پاسۆک) و شۆڕش چوون، ڕووداوێکی تا خوا حەزکا، خراپ و نابڕووبەرانەش بوو. زیانێکی زۆری، بە ناو و ناوبانگی (پاسۆک)یش گەیاند.
ئاخر نازانم، چ چارەنووسێکی ڕەشبوو، (سەروەر)ی لە ژووری لەسێدارەداندا، چاوەڕێی مەرگ بکا، لە گرتووخانەی (کەرکووک) ڕابکا، لەدەس پەتی سێدارە ڕزگاریبێ، خۆی بگەیەنێتەوە نێو ڕیزەکانی شۆڕش، ببێ بە ئەو کوڕە ئازا و دڵسۆزەی، چەندین سوپاسنامە، لە سەرکردایەتی (یەکێتی)ەوە وەرگرێ، کەچی بە ئەو شێوەیە، کۆتایی بە ژیانی بێ؟!! تۆ بڵێی، کاتێ لەگەڵ (شێرکۆ) و (فەرهاد) هاتبوو، لە (سولەیمانی) دیم، تەنیا هەر بۆ ماڵاوایکردن لە من و کەسوکارەکەی گەڕابێتەوە، وا دوای ئەو سەردانە کورتە، لە ماوەیەکی کەمدا کوژرا؟!



عوسمانی دەرویش قادر (1948–1979)



سەروەر عەلی حوسێن (1955–1979)

لە ماڵەوە دانیشتبووم، ژانی ئەو ڕووداوە خوێناوییە، کسپەی لە جەرگم هەڵدەستان و خوێناوی جگەرمی دەخواردەوە. دەمزانی، (مەنسوور) دێ و چاوەڕێمدەکرد، چونکە بێ من، هیچ شتێکی نەدەکرد. خوا کردی، لەپڕهات و گوتی: ئەو بەزمەت بیستووە؟! گوتم: نابینی، هێزم لەبەربڕاوە. گوتی: (حەمەساڵح) ئاگای لە هەموو شتێکە و هەموومان دەناسێ، دەزانێ، (شێرکۆ) و ئەوان هاتوون، کێیان بینیوە و چییان کردووە. دەترسم، ناوی ئێمەش بڵێ و بەگرتنماندا.

گوتم: بڕواناکەم. چونکە ئەوان لەنێوخۆیاندا شەڕیانبووە، هیچ پێوەندی بە ناکۆکی نێوان (پاسۆک) و لایەنەکانی دیکەوە نییە. خۆ ئەو ناپاکی لە شۆڕش نەکردووە، یا لەژێرەوە پێوەندی بە (بەعس)ەوە نەبووە، تا ناوی خەڵک بڵێ و بەگرتیانبدا. گوتی: ئێستە لە ماڵەوەیە، تۆ ماڵەکەیان دەزانی، باشی دەناسی و دەبێ، هەر ئێستە بچی، هەڕەشەی لێ بکەی، ناوی کەس نەبا و لێرەدا بیوەستێنی.

منیش لەلایەکەوە زۆر حەزمدەکرد، (حەمەسالح) ببینم، لە زمانی خۆیەوە، بەسەرهاتەکە ببیستم. لەلایەکی دیکەشەوە، لەبەر دڵی (مەنسوور) چووم. (مەنسوور) لەبەردەم ماڵەکەیاندا دایبەزاندم. لە دەرگەمدا، دایکی لێی کردمەوە. چۆنی و چاکیم لەگەڵ کرد و خۆم پێ ناساند، چونکە سووکە خزمایەتییەکیشمان هەبوو. پاشان هەواڵی (حەمەسالح)م لێ پرسی، گوتی: لە ماڵ نییە و ڕۆیشتووە. گوتم: بۆکوێ؟ گوتی: نازانم. گوتم: باشە کەی دێتەوە؟ گوتی: نایەتەوە! دوایی زانیم، تەنیا یەک شەو لە (سولەیمانی) مابووەوە و پاشان لە (قەڵادزێ)وە دەریانکردبوو، یەکسەر پەنای بۆ (یەکێتی) بردبوو.

ئیدی بە گوشاری (پاسۆک)، دادگەیەکی فەرمییان لە نوێنەری (پاسۆک، حسک و یەکێتی) بۆ دانابوو، ڕۆژی (**9. 8. 1979**) گوللەبارانیانکردبوو. بە ئەو شێوەیە، (**3**) کادیری ڕامیاری و سەربازی کارامە، لەکیس (پاسۆک) و کورد چوون!

## من و مەنسوور

(مەنسوور)، کوڕە کوردێکی ئازا و دڵسۆز بوو. وەک ئەفسەرێکی سوپا، کادیرێکی باش بوو. بەڵام ئاستی ڕووناکبیری نزمبوو. زۆر خۆشباوەڕ و دەمشڕیش بوو. لە دوای هەرەسەوە، لەسەر کاری ڕامیاری و هێندێ هەڵسوکەوتی تایبەتی خۆی، زۆر نێوانمان باش نەبوو. گەلێ جار خۆم لێ دووردەخستەوە، بەڵام هەر ئەو لە من باشتربوو، زوو دەهاتەوە و نێوانمان باشدەبووەوە. کاتێ هەردوو هاوبیر (ئازاد) و (فەرهاد)یش گیران، هەموو پشتوپەنایەکی هەر من بووم. لە هەموو شتێ ئاگاداریدەکردم و بێ من هیچی نەدەکرد. بەڵام دوای ئەوەی (شێرکۆی هەژار)ی بینی، زۆر گۆڕا. بڕوایەکی کوێرانەی پێی هەبوو، هێندەی لێ ڕادەبینی، وایدەزانی، کە (شێرکۆ) گەڕایەوە، هەموو کورد دوای دەکەون و (پاسۆک) لە (کوردستان) پێشدەکەوێ. تەنانەت دەیگوت: (شێرکۆ) وەک (ماوتسی تونگ)ی کورد وایە!

لەسەر ئەم کێشە و باسانە، هەمیشە دەمەتەقێمان بوو. من دەمگوت: بڕوا بە (شێرکۆ) ناکەم، هەر ئەوە پیاوەی (پێنجوێن)ە، هیچ نەگۆڕاوە و هەرگیز ناشگۆڕێ. ئەو دەیگوت: تۆ بە هەڵەداچوووی و لە کورددا، لە ئەو دڵسۆزتری تێدا نییە. منیش دەمگوت: پیرۆز بە

تۆ بی و من ناتوانم، جارێکی دیکە بڕوای خۆمی بدەمێ و کاری لەگەڵ بکەم. بەڵام ئەو شەو و ڕۆژ، لەگەڵ مندا خەریکبووو، دەیگوت: دەبێ، هەرچی چۆنێ بێ، لەگەڵمان بێیتەدەرەوە. چونکە تۆ ئەو ڕێگەیەت پیشانی ئێمە داوە و ئەو بیروباوەڕەت بە ئێمە ناساندووە. ئێستە ئێمە هەموومان دەچینەدەرەوە، کەچی تۆ لەگەڵمان نایەی! منیش هەموو جاری بۆم ڕوونەدەکردەوە و دەمگوت: تەنیا چوونەدەرەوە مەرج نییە، دەبێ، پێش ئەوەی ئێمە ڕابکەین، بیر لە ئەوە بکەینەوە و بزانین، لەگەڵ کێدا کاردەکەین؟ ئەو کادیرانەی ئەوان بۆ منیان باسدەکرد، وەک مامۆستا (هەردی، فەتاح ئاغا و شێرکۆی هەژار)، زۆر دەمیبوو، بڕوام بە هیچیان نەمابوو. کەسێکیش بڕوای بە (3) ئەندامی سەرکردایەتی پارتی نەبێ، مەگەر خۆی بخەڵەتێنێ، ئەگینا چۆن دەتوانێ، کاریان لەگەڵ بکا؟!

لە ئەو بارەیەوە، زۆر شتم بۆ باسدەکرد، بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو. ئەو وایدەزانی، گەر ڕۆژێ لە ڕۆژان، من ئەوم بە ڕێکخستنی (کاژیک) ناساندبێ، ئیدی دەبێ، تا سەر لەگەڵ ئەو ڕێکخستن و باوەڕەدا بم، هەرچییەکیان پێ گوتم، کوێرانە جێبەجێیکەم!

بەکورتییەکەی، تا ئەو ڕۆژەی چووەدەرەوە، هەموو ڕۆژێ یەکدیمان دەبینی، ئەو دەمەتەقێ و هەرایەمان هەر هەبوو. من هەر لەسەر هەڵوێست و بڕیاری خۆم سووربووم. ئەویش هەر کۆڵی نەدەدا و دەیویست، قایلمکا و لەگەڵی بڕۆم. هەرچەندە هێندێ جار، زۆری بۆ دەهێنام، بەڵام تەنانەت بە دەمیشمدا نەدەهات، پێی بڵێم: ئێوەش مەچنە دەرەوە و بڕوایان پێ مەکەن. کاتێ لێشی دەپرسیم: چی بکەین؟ من تەنیا هەر هێندەم پێ دەگوت: هەر کەسێ بۆ خۆی ئازادە، من نە کەس بۆ دەرەوە دەنێرم و نە بە کەسیش دەڵێم: لەگەڵیان مەچۆ!

**سەردانی گرتووخانە**

(مەنسوور) منی بۆ گرتووخانە نارد و گوتی: هەموو دەنگوباسەکان بە (ئازاد) و (فەرهاد) بگەیەنە و پێیان بڵێ: بە ئەم زووانە، سەرەتا (3) ئەفسەر دەچنەدەرەوە، پارەیەکی باشیش دەفرێتن و لەگەڵ خۆیان دەیبەن.

ڕۆژی (**1. 7. 1979**) چووم بۆ (بەغدا) و لە گرتووخانە، چاوم بە هەردووکیان کەوت. هەموو هەواڵەکانم بەدرێژی، بۆ (ئازاد) باسکرد. ئەویش لە خۆشیاندا خەریکبوو، باڵبگرێ و بەرەو (سولەیمانی) بفڕێ. گوتی: مادام (شێرکۆ) هاتووەتەوە، ئیدی (پاسۆک) پێدەگرێ، پێشدەکەوێ و (کوردستان)یش ڕزگاریدەبێ!

ئاخر نازانم، ئەو پیاوە بە ئەو هەموو توانا و زیرەکییەوە، چ دڵێکی بە ئەو پیاوە تەڵەکەبازە خۆشبوو؟! ئینجا ڕووی دەمی لە من کرد و گوتی: من جارێکی دیکەش،

داوای لێبووردنت لێ دەکەم. ئەوەی لە کۆنفرانسەکەدا ڕوویدا، خەتای منی تێدا نەبوو. تکات لێ دەکەم، لەبیر خۆتی بەرەوە. تۆ کوڕێکی باش و بەتوانای، کوردێکی دڵسۆز و زیرەکی، پێویستە بچیتەدەرەوە. چونکە ئەوان بێ تۆ هەڵ ناکەن و هیچیان پێ ناکرێ. ئیدی زۆر بە شانوبازوویدا هەڵدام و پاڕایەوە. بەڵام لای من هیچ کەڵکێکی نەبوو، چونکە بە هیچ جۆرێ، بڕوام بە (شێرکۆ) و هەڵوێستی ئەو کاتەی (پاسۆک) نەبوو. چەن جارێ بۆ هەموویانم ڕوون و دووبارەکردەوە، ئەوەی من بۆیان دەکەم، تەنیا وەک دۆست و برادەرێ، بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم، ئەگینا من (پاسۆک) نیم. بەڵام ئەوان لە ئەوە تێ نەدەگەیشتن، لە ناو بێکەسی و بێکادیری، هەمیشە منیان لەسەر خۆیان حسێبدەکرد!

## هەڵخەڵەتاندنی سێ ئەفسەرەکە!

کاتێ ئەوە هاتبوو، (مەنسوور) شار بەجێبێڵێ و بچێتەدەرەوە. دووقۆڵیماڵەکەیمان بۆ ماڵی پوری گواستەوە و هەموو شتێکی تەواوکرد. ئەو کاتە (مەنسوور)، لە بەشی دارایی فەرمانگەی (ئیشغال)ی (سولەیمانی) کاریدەکرد. هەموو ڕۆژێ لە پلانەکانی خۆیان، ئاگاداریدەکردمەوە. بڕیاربوو، پێش ئەوەی ڕابکا، مووچەی ئەو مانگەی، ئەو نیوچەیەی لای ئەو بوو، کە نزیکەی (**60**) هەزار دینارببوو، لەگەڵ خۆی ببیا. بەڵام دوایی پەشیمانبووەوە و گوتی: دایکم و خوشکەکانم تووشی چەرمەسەری دەبن. لە ڕاستیدا ناهەقی نەبوو، چونکە (مەنسوور)، کوڕی تاقانەی خێزانەکە بوو. هەرچەندە پارەکەشی نەفڕاند، کەچی بەعسییەکان، دایک و خوشکەکانیان هەر گرت!

ڕۆژی (**15. 7. 1979**) بڕیاربوو، هەر سێ ئەفسەرەکە (مەنسوور، شوان و کەریم) پێکەوە بچنە دەرەوە. من و (ناسر حەفید، حەمە حەفید و حەمەشەوقی)، هەموومان لە ماڵی (مەنسوور) دانیشتبووین و قسەماندەکرد. (شێخ سەلام)ی باوکی (کەریم)، هەستی بە شتێ کردبوو، لەپڕ هات و بە (کەریم)ی گوت: هەستە سەگباب، پێشمکەوە بۆ ماڵەوە. ئەویش لە ناچاریدا، لەگەڵی ڕۆی و دوای ماوەیە گەڕایەوە. گوتی: باوکم خڵافاندووە و بەپەلە هاتوومەتەوە، با یەکسەر سواربین و بڕۆین، بە خوا پێیزانی، ئێستە دەگاتەوە سەرمان و هەموومان بەرشەقدەدا. ئیدی بەپەلە خۆیان پێچایەوە، تەرمۆزێکی تەپەدۆریان پڕکرد لە بیرە و هێندێ مەزەیان لەگەڵ خۆیان برد، تا گەر سەربازگەکانی سەرڕێی (ئەزمڕ) و (شارباژێڕ) لێیان پرسین، بۆ کوێ دەچن، بڵێن، دەچین بۆ سەیران. (مەنسوور) بە (حەمەشەوقی) گوت: تۆ لەڕێی هاوبیر (حوسێن)ەوە، پێوەندی بە ئێمەوە دەکەی. منیش حەزم نەکرد، لەبەردەمی هەردووکیاندا بڵێم: من بۆ؟! خۆ من (پاسۆک) نیم و وەک هاوڕێیەک هاتووم، خواحافیزیتان لێ بکەم!

  

عەبدوڵئیلا (ملازم شوان)    مەنسووری شێخ کەریم    کەریمی شێخ سەلام (1949 – 1995)

پاشان (حەمەشەوقی)، بە ترومبێلەکەی خۆی، لەگەڵ (حەمەحەفید)دا رەوانەیانکردن و رۆیشتن. من و (ناسر)یش ماڵاواییمان لێ کردن و بەجێماین! هەرچەندە من دوا بڕیاری خۆم دابوو، بەڵام کاتێ بەڕێمکردن و رۆیشتن، من بەتەنیا مامەوە، زۆر بێ تاقەتبووم و دڵم لە خۆم داما. لەگەڵ ئەوەشدا، نە (پاسۆک) و نە شۆڕشەکەش، هی ئەوە نەبوون، هیچ هیوایەکیان لەسەر هەڵچنم!

لە راستیدا، ملازم (کەریم سەلام) تا ئەو کاتە، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە (پاسۆک)ەوە نەبوو، بەڵکوو دوای ئەوەی (شێرکۆ)ی بینی، بەڵێنیدا، بچێتەدەرەوە. ئیدی لە ئەو رۆژەوە بوو بە (پاسۆک)، نەک وەک دوای کوشتنەکەی لە رۆژی (3/4. 8. 1995)دا، (پارتی) و هێندێ کەس بڵاقۆکێکیان لەسەر دەکرد و نووسیبوویان: یەکێ لە دامەزێنەرانی (پاسۆک) بوو!

### بەزمی شێخ سەلام

ئەو شەوە تا بەیانی، خەو لە چاوانم نەکەوت. هەر خواخوامبوو، زوو رۆژبێتەوە، تا هەواڵێکیان بزانم. هەر لە کۆنەوە ئەوە پیشەمبوو، گەر لەگەڵ هاوڕێیەکمدا تێکەڵاوبووبێم و ماڵەوەیانم ناسیبێ، کاتێ لە ئەوێ نەبووبێ، یا شتێکیان لێ قەومابێ، سەرم لە دایک و باوکی داوە، بیرم لە ئەوە کردەوە، سەرێ لە (شێخ سەلام) و دایکی (مەنسوور) بدەم، هێندێ دڵنەواییانبکەم و هەواڵێکیش بزانم. رۆژی دوایی کاتێ نیوەڕۆ بوو، چووم بۆ دووکانەکەی (شێخ سەلام). کوڕانێ گەڕەک هەموویان لە ئەوێ وەستابوون. منیش چووم و سڵاوم لێ کردن. کاتێ (شێخ سەلام) منی بینی، خۆی چاوشین و سووروسپی بوو، هێندەی دیکە سووربووەوە. هەمیشەش تووڕەبوو، هێندەی دیکە تووڕەبوو، چاوی

لێ بزکردمەوە، بە پەنجە درێژەکانی، هەڕەشەی لێ کردم و گوتی: نەعلەیکەسەلام و بەخێرنەیەی، ئەوە بۆ کوێت ڕەوانەکردن؟ وەڵڵای حیزباب، هەمووی خەتای تۆیە، هەر ئێستە شکاتت لێ دەکەم. ئیدی هەر نەیهێشت، دەمبکەمەوە و وەڵامییدەمەوە، خێرا مامۆستا (دارای حەمەرەشی بەقاڵ)ی هاوڕێم، چاوێکی لێ داگرتم و گوتی: تا زووە برۆ و خۆت دەربازکە. منیش لەتاواندا، یەکسەر ڕۆیشتم بۆ ماڵی (مەنسوور). خاتوو (ئاسکە)ی دایکی، بە ئەو بێوەژنییەی خۆیەوە، سەد قاتی (شێخ سەلام)، ئازا و هێمنتر بوو. گوتی: سوپاس بۆ خوا، دەرچوون و گەیشتن.

## یەکەمین سەردانی مەنسوور

زۆری پێ نەچوو، بەیانییەک زوو، خاتوو (ئاسکە) هات بە دوامدا و گوتی: (مەنسوور) لە ماڵەوەیە و داواتدەکا. منیش سەرمسووڕما و لە دڵی خۆمدا، هەر لێکمدەدایەوە و دەمگوت: هەمووی مانگی نابێ، ڕۆیشتووە، بۆ وا زوو گەڕاوەتەوە؟! ئاخۆ چی ڕوویدا بێ؟! لەبەرئەوە هەر زوو خۆم گەیاندێ. کە چووم، (مەنسوور) چاوەڕێیدەکردم. یەکدیمان ماچکرد و دانیشتین. پێشمەرگەیەکی ڕیش درێژی لەگەڵبوو، بە جل و مەخزەنەکانی کلاشینکۆفەکەیەوە، لەسەر عەرزەکە نووستبوو. هێشتا هەڵ نەستابوو، بەئاسپایی پێی گوتم: ئەوە پێشمەرگەی (حسک)ە، ناوی (مام ئاراس)ە. (شێخ مەنسوور) لەگەڵی ناردووم. قسەمەکە، نەوەک بەخەبەربێ و گوێی لێ بێ. یا بچینە ژوورێکی دیکە. (مەنسوور) هەردوو چاوەکانی خەمێکی ئەستووریان لێ دەباری، بە کەساسی و نائومێدییەکی بێ وێنەوە، یەکسەر گوتی: <u>(شێرکۆ) دەسبیڕین و بەجێیهێشتین!</u>

منیش ئەو هەواڵەم لا سەیر نەبوو، چونکە دەمزانی، ڕێوی چ کونێکە، نە (شێرکۆ) ئەو پیاوە بوو، بەتەنیا سەرکردایەتی ڕێکخراوێکی ڕامیاری پێ بکرێ، نە کەسیشیان پێکەوە ڕێک دەکەوێن. بەتایبەتی (شێرکۆ)، وەک مرۆڤێکی بچووەدیکتاتۆر و ڕەفتارفاشی وابوو، هەمیشە دەیویست، کەس قسە لە قسەیدا نەکا و هەموو گوێ لە مستی ئەو بن.

(جەلالی حاجی حوسێن)یش، خۆی بە یەکەمین پیاوی (پاسۆک)ی ئەو ڕۆژە دەزانی و دوو ساڵیوو لە دەرەوە بوو. هەر ئەویش بەناوی (پاسۆک)ەوە قسەیدەکرد و بە یەکەمین دەمڕاستی (پاسۆک)یش ناسرابوو. لەبەرئەوە ئامادە نەبوو، گوێ بۆ یەکێکی وەک (شێرکۆ) شلکا، کە هیچی لەباردا نەبوو!

ئیدی کاتی ئەوە نەبوو، سەبارەت بە (شێرکۆ)، هێندێ قسەبکەم، حەزیشم نەکرد، هێندەی دیکە دەردی گرانکەم و پێی بڵێم: ئەوە (مارتسی تونگ)ەکەی کوردبوو، کە تۆ بڕوات پێی بوو! بەڵام بەتەواوی گوێم بۆ ڕاگرت و ئەویش، هەموو ڕووداوەکانی بۆ گێڕامەوە.

گوتی: کاتی چووینەدەرەوە، (پاسۆک)ی چی؟! هەمووی تەنیا هەر (جەلال) و (8-9) پێشمەرگە بوون. (بزووتنەوە) و (کۆمیتەی ئامادەکاری) یەکیانگرت و داواشیان لە ئێمە کرد، خۆمان هەڵوەشێنینەوە و لەگەڵیان تێکەڵبین. بەڵام (جەلال) ڕازی نەبوو. بە (ڕەسووڵ مەمەند) و (دوکتۆر مەحموود)ی گوت: دەبێ، ئێوە خۆتان هەڵوەشێننەوە و لەگەڵ ئێمە یەکبگرن، چونکە ئێمە خاوەنی بیروباوەڕین!

مامۆستا (هەردی)، لە (تاران)ەوە هاتبوو بۆ (مهاباد). ئێمەش هەموومان بەرەو ئەوێ ڕۆیشتین. لە ئەوێ دەستمان بە کۆبوونەوە کرد. جگە لە ئێمە (هەر سێ ئەفسەرەکە)، هاوبیران (هەردی، جەلال و شێرکۆ) ئامادەبوون. یەکەمین ڕۆژ، سەرەتا مامۆستا (هەردی)، بە دووروودرێژی، باسی (کاژیک)، شۆڕشی چەکداری، خەباتی پارتایەتی، ڕەخنە و ڕەخنەلەخۆگرتنی بۆ کردین. پاشان کارەکانمان، لەنێوخۆماندا دابەشکرد. مامۆستا (هەردی) بە سکرتێری (پاسۆک) هەڵبژێررا. (شێرکۆ) وەک ئەندامێکی سەرکردایەتی، بە نوێنەری (پاسۆک) لای (حسک) دەستنیشانکرا. بەڵام (شێرکۆ) گوتی: بەمەرجێ ئەو کارەدەکەم، هاوبیر (مەنسوور) لێپرسراوی کۆمیتەی سوپایی بێ. هەموو هاوبیرانیش، بە داواکارییەکەی ڕازیبوون.

دووەمین ڕۆژ، کۆبوونەوەکانمان دەستپێکردەوە. (شێرکۆ) یەکسەر گوتی: داوای لێبووردن دەکەم، من ناتوانم، ئەو کارەبکەم. ماوەم زۆر نەماوە و دەبێ، بۆ (ئەورووپا) بگەڕێمەوە. گەر ئێوە بە پەسەندی بزانن، من لە ئەوێ بیرۆیەکی ڕاگەیاندنتان بۆ دەکەمەوە و کاردەکەم، پڕوپاگەندە بۆ (پاسۆک) و شۆڕشی کورد دەکەم. ئیدی کاتێ گوێمان لە ئەو قسانە بوو، زۆر سەیرمان لێهات! هەموو بە جارێ گوتمان: ئێمە تۆمان لێرە دەوێ، لە (ئەورووپا) خەڵکمان هەیە. گوتی: من وازدێنم. چونکە ناتوانم، لێرە بمێنمەوە و بژیم. ئینجا (جەلال) ڕووی تێ کرد و گوتی: ئێمە پارەمان بۆ قەرزکردی، بلیتی فڕۆکەمان بۆ کڕیت و هێنامانیتەوە بۆ (کوردستان). لە (سولەیمانی)ش کۆمەڵێ هاوبیرت بینی و بەڵێنی کارکردنت دانێ. ئێستە بۆ بە خۆڕای، بەجێماندێڵی؟! پەلاماریدا و پێی گوت: هەر ئێستە، سەرەوخوار لە ئەو ئاودەستخانەیەدا هەڵتدەواسم.

ئیدی (شێرکۆ) لە ترساندا نەیدەزانی، چی بڵێ و چی بکا. مامۆستا (هەردی)ش، کە ئەو بەزمەی بینی، لەتاواندا هەناسەی سواربوو، خەریکبوو، بخنکێ. بەپەلە پەمپەکەیان بۆ هێنا و هاتەوە سەرخۆی. چونکە هەر لە کۆنەوە، نەخۆشیی هەناسەتەنگی هەبوو!

ئێمەش دەستی (جەلال)مان گرت و گوتمان: مامەکەی (سادقی شەرەفکەندی)، لێپرسراوی شاری (مهاباد)ە، گەر بیشو شتێ لە (شێرکۆ) بکەین، نایەڵن یە ساغی دەرچین و هەموومان دەکوژن. بەزۆر لە بندەستی (جەلال) دەرمانهێنا و گوتمان: هەستە بڕۆدەرەوە، بۆ کوێ دەچی، بچۆ.

ڕۆژی دوایی، لەسەر جادە (شێرکۆ)م بینی و بانگیکردم، پارچە کاغەزێکی دامێ و گوتی: ئەو ناوانە بگرە، لە (سولەیمانی) پێوەندیم پێوەکردوون. هەر هێندەی گوت و ئیدی ڕۆی.
پاشان مامۆستا (هەردی)ش بۆ (تاران) گەڕایەوە و بە هیچ شێوەیە، دەنگی نەما!
کاتێ (مەنسوور)، ئەو کارەساتەی کەلەپیاوەکانی بیری نەتەوەیی و (پاسۆک)ی بۆ گێڕامەوە، هێندەی دیکە لەبەرچاوم کەوتن. تفم لە ئەو ڕۆژەڕەشەش کرد، کە ئەو کۆمەلە کوردە هیچوپووچ و ئەو ڕێکخراوە پالەواتیفەم، تێدا ناسی. ئینجا ڕووم تێ کرد و گوتم: ئەی ئێستە نیازی چیتان هەیە؟! گوتی: نازانم. دەبێ، من و تۆ لە ئەو بارەیەوە قسەبکەین. بەلام ئەم نهێنیانە، لای کەس مەدرکێنە و نابێ، بە هیچ شێوەیە، (حەمەشەوقی)ش بزانێ. نازانم (مەنسوور) بۆ حەزی نەدەکرد، ئەو بزانێ؟! دەبووایە، هەر خۆی هەموو گرفت و ڕووداوەکانی بۆ باسکردایە و پێی بگوتایە: وەک ئێمە تووش بووین، تۆش خۆت تووشمەکە و چارێ، هەر لەنێوشاردا بمێنەرەوە، تا وەلامت لێ دەگێڕینەوە.
بەلام (مەنسوور) لە هەموو کەسێ باشتر، ئەو ڕەوشەی دەرەوەی دەزانی، کەچی بە هەموو توانایەوە هەولیدەدا، من و (حەمەشەوقی)ش پەلکێشکا. وا دیاربوو، بیری لە ئەوە کردبووەوە، وەک خۆی تووشبووە، ئێمەش تووشکا و لەگەل ئەودا سەری تێنێین. چونکە باش دەیزانی، ئەو گێژاوەی ئەوانی تێکەوتوون، بە دەیانی وەک من و (شەوقی)ش چارەسەر ناکرێ و ئەوە پیساییەکە، تا چیلکەی تێوەردەی، پتر بۆنیدێ!
دوایی کاتێکی دیکەمان دیاریکرد، یەکدی ببینین و ئیدی من ڕۆیشتم بۆ ژانکۆ. (مەنسوور)، چەن ڕۆژێ لە مالی خۆیان مایەوە. لەبەرئەوەی تازە ڕایکردبوو، شوێنەکەی زۆر جێی گومان نەبوو. (مام ئاراس)یش هەر ئەو شەوە، لە ئەوێ بووبوو، پاشان ڕۆیشتبوو، سەری لە کەسوکاری دابوو. (مەنسوور) وەلامی بۆ (پەخشان)ی خێزانی و (کوچە)ی کچی ناردبوو، تا بیانبینێ. ئەوانیش هەر زوو، لە (کۆیە)وە هاتن. پاشان (حەمەشەوقی)، بۆ مالی خۆیان گواستبوویەوە. ئەو ماوەیە پتر لە مالاتبوو، نە ئەو بە شوێن مندا دەینارد و نە منیش حەزمدەکرد، بۆ ئەو جۆرە شوێنانە بچم و سەری لێ بدەم، تا لەنێوشاردا لە ئەوە زیاتر، کەسی دیکە نەمناسێ. دواجار هەر لە مالی خۆیان، یەکدیمان بینییەوە. داوای لێ کردم، یارمەتییدەم و کاریان لەگەل بکەمەوە.
بەلام دوای چی؟! پاشان مالاوایيم لێ کرد، بەدلشکاوی و نائومێدی گەڕایەوە.
من پێم وایە، ئەو سەردانەی، پتر بۆ بینینی هاوسەرەکەی بوو، تا پێکەوە چارەسەری بدۆزنەوە و بڕیاربدەن، چی بکەن؟ لە هەمان کاتیشدا، هەوالەکان بە ئێمە بگەیەنێ و دەمودوومان تاقیکاتەوە. ئیدی بە ئەو شێوەیە، (شێرکۆ) دەسی ئەو سێ ئەفەسەرە لاوەی بڕی، لە جێوڕێی خۆیان هەلیکەندن، خۆشی بۆ باوەشی پڕ لە ناز و خۆشی

(ئەورووپا) گەڕایەوە، بۆ تاهەتایە، بروا و متمانەی هاوبیر و دۆستەکانی خۆی لەدەسدا، لە ئەنجامیشدا رووی راستەقینەی، ئەو مرۆ دەروون نەخۆشەیان بۆ دەرکەوت، بەڵام پاش چی و تازە درەنگبوو!

## حەمەشەوقی

ئەم کورە گەنجە جوانە رەوشتبەرز و تێگەیشتووەم، لە ساڵی (**1962**)وەوە دەناسی، ئەو کاتە مێردمناڵێکی (**12**) ساڵان بوو. لەگەڵ (رووناکی) خوشکیدا، بۆ لای (سوعاد)ی کچی خاوەن خانووەکەمان دەهات، پێکەوە لە خوێندنگەی مامۆستایان دەیانخوێند و هاوڕێی بوون. بەڵام دوای رێککەوتنامەی (**11**)ی مارسی (**1970**)، لە نزیکەوە ناسیم و بوو بە هاوڕێم. کوڕێکی رێکوپێک، زیرەک و ئازا بوو. پیاوی ئەوە نەبوو، لە ئەو قاوغە تەسکە تەنگەبەرەی (کاژیک) و (پاسۆک)دا ئیشبکا، بەڵکوو هی ئەوەبوو، لەشکرێکی گەورەی لەبەردەسدابێ، رێکیخا و سەرکردایەتیبکا!

کاتێ (مەنسوور) رۆیشتەوە، هەموو ئێوارەیە لەگەڵ (شەوقی)دا پێکەوەبووین. زۆربەی کات، بۆئەوەی کەس گومانمان لێ نەکا، لە (سەرچنار) یەکدیمان دەبینی و دووقۆڵی، لەسەر ئاوەکە دادەنیشتین. یا شەو لە ماڵی خۆیان دەمامەوە و تا درەنگانێ، دەمەتەقێمان دەکرد. من دەمویست، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تێبگەیەنم، من لەگەڵ (پاسۆک) کارناکەم و <u>مرۆ دەبێ، هەمیشە کاربکا، بروای پێی هەبێ، نەک لەبەرخاتری دۆستایەتی و برایەتی بیکا، دوایش کاڵەکی پەشیمانی، بە ئەژنۆ بشکێنێ!</u> بەڵام ئەو لە ئەو قسانە تێ نەدەگەیشت، مەبەستم چییە. بەڵکوو زۆر بەکوڵودڵ و پەرۆشەوە، گوێی بۆ رادەگرتم و وایدەزانی، بەشێوەیەکی گشتی، ئەو شتانەی بۆ باسدەکەم و مەبەستم لە ئەو نییە! لەبەر (مەنسوور)یش نەمدەتوانی، راستی پێ بڵێم، لە هەموو شتێ ئاگاداریکەمەوە و پێی بڵێم: فەرموو ئەوە باروودۆخەکەیە، خۆت سەرپشکبە و بڕیاربدە. هەرچەندە ملازم (کەریم) ساڵی (**1991**) لە (سوید)، بۆی گێرامەوە و گوتی: کاتێ چوویەنەدەرەوە و ئەو گاڵتەبازارەمان بینی، بۆم دەرکەوت، دەسیانبڕیوین و هیچمان پێ ناکرێ، هەر زوو وەڵامم بۆ (حەمەشەوقی) نارد و رامسپارد، سەر لە خۆی تێک نەدا و نەیەتەدەرەوە. بەڵام ئەو زووتر رایکرد و وەڵامەکەی منی پێ نەگەیشتبوو!

دوای ئەوەی (حەمەشەوقی)، لە خوارووی (عێراق) بۆ (سولەیمانی) گەڕایەوە، لەگەڵ چەن ناسیاوێکی خۆیدا، ئیشی بەڵێندەری دەکرد و باری ئابووری زۆر باشبوو. لە ماوەیەکی کەمدا، هەموو شتەکانی فرۆشت و لە هاوبەشەکانی جیابووەوە. پاشان چوو بۆ (بەغدا)، سەری لە گرتووخانە دا و هێندێ پارمەتی (ئازاد)یشی دابوو. کاتێ لە

(بەغدا) گەڕایەوە، هات بۆ لام و گوتی: دوو بەیانی دەڕۆم و (شێخ مەنسووری حەفید)، لە چەوولمەکەی (قەڵاچوالان) چاوەڕێمدەکا. منیش گوتم: حەزدەکەم، لە ماڵی ئێمەوە برۆی و نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین.
ڕۆژی دوایی هات، پێشمەرگەیەکی میرمنداڵی کوتی لای خۆی لەگەڵ بوو. پێشمەرگەکەی لەنێو ترومبیلەکەدا دانا و گوتی: با تۆ نەناسی. کە هاتەژوورەوە، یاری ناپلیۆنم دەکرد، یەکسەر گوتی: ئەو یارییە بۆ ئەوە دەکەی، تا لەگەڵ من بیبەیتەوە، یا دوایی بێی؟! ئیدی هەردووکمان پێکەنین و بەپەلە نانەکەیخوارد. پاشان گوتی: بۆ لەگەڵ من نایەیتە دەرەوە؟! گوتم: هێشتا بۆ هاتنەدەرەوەی من، زۆری ماوە. گوتی: وەک بزانی، کەی دێی؟! گوتم: لە کاتی خۆیدا دەیزانی. پاشان کەمێ ڕاما و گوتی: هیچ هەیە؟ لە ئەوە دەچی، کارەکان ئاسایی نەبن و تۆ هێندێ شتت لێ شاردبمەوە. منیش گوتم: چیت پێ بڵێم، لە ئەوانەیە کە چوویتەدەرەوە، (مەنسوور) هەموو شتێکت بۆ باسکا. ئیدی تێرتێر، یەکدیمان ماچکرد و گوتی: زۆر بڕوام پێت هەیە و چاوەڕێتم. منیش دڵم قوڵپیدەدا، دووجار خەریکبوو، هەموو شتێکی بۆ ڕوونکەمەوە، بەڵام خۆم گرت. لە هەمان کاتیشدا، خۆم بە تاوانبار دەزانی، کە ڕاستیم لێ شاردبووەوە!



## لێبووردنی گشتیی

ڕۆژی (21. 8. 1979)، بە بۆنەی جێژنی قوربانەوە، (سەددام) لێبووردنێکی گشتی، بۆ هەموو گیراوە ڕامیارییەکانی (عێراق) دەرکرد. سەیر ئەوەبوو، (بەعس) کادیرە کوردەکانی، بە چەن کەسانێکی گێرەشێوێن، ئاژاوەچی و تێکدەر دادەنا. هەر کەسێ لە گرتووخانەی

(ئەبوغریب) بیگوتایە: فلان کەس، لەسەر کاری رامیاری گیراوە، پۆلیسەکان لێی توورەدەبوون و خێرا دەیانگوت: بلێ، تێکدەر! کەچی بە ئەو شێوەیەش ئازادیکردن، چونکە دەیویست، خۆی لای خەڵک خۆشەویستکا!
هەموو کادیرەکانی کۆمەڵە، هەردوو هاوبیر (ئازاد) و (فەرهاد)یش بەرکەوتن و بەربوون. هەرچەندە (سەددام) بە ئەو کارەی، هیچی لە کێشەی کورد نەگۆڕی، بەلام لە راستیدا، کۆمەلانی خەڵک، زۆریان پێخۆشبوو. جێژنەکە بوو بە دوو جێژن و هێندێ خەڵکی ساویلکەش دەیانگوت: (سەددام) خۆی کرد بە شەکر!

## هەڵوێستی فەرهاد و ئازاد

هەر ئەو رۆژەی، گیراوەکان گەیشتنەوە (سولەیمانی)، لە پێشدا سەرم لە (فەرهاد) دا. لە حەوشە قوولە چکۆلانەکەیاندا، دووقۆلی دانیشتین و ئەوەی دەمزانی، بۆم باسکرد. ئەویش وەک رەوشتی کۆنی خۆی، هیچ خۆی تێک نەدا، بۆچوونی خۆی نەگوت و زۆر بە هێمنی گوتی: حەزدەکەم، سەری لە کاک (ئازاد)یش بدەی، بزانە، ئەو دەڵێ چی؟!
هەر ئەو ئێوارەیە، هەرچی چۆنی بوو، لە گەرەکی (جوولەکان)، ماڵی (ئازاد)م دۆزییەوە. کاتێ هەواڵەکانم پێ گەیاند، زۆری پێ ناخۆشبوو، بە جارێ قەڵەمی دەسونەژنۆی شکا. دیسانەوە جارێکی دیکە ورەی ڕوخا و گوتی: کاک (شێرکۆ) پیاوی ئەوە نییە، بە ئەو شێوەیە رەفتاربکا، دیارە ئەو هاوبیرانە زوێریانکردووە و رێزیان لێ نەگرتووە، بۆیە وازیهێناوە و گەراوەتەوە!
زۆر سەیرم لێهات، (ئازاد) وەک دەرویشی وابوو، کە لەسەر دەسی شێخ (شێرکۆ)دا، تۆبەی کردبێ و وەک شێخێکی گەورەی رێبازی (قادری)، لێی دەروانی. بڕوای بە کەس نەدەکرد و بێ ئەوەی ئاگای لە ڕووداوەکان بێ، هەر لە خۆیەوە و لە دوورەوە، داکۆکی لێ دەکرد. جا ئیدی من چۆن دەتوانم، تێبیگەیەنم و بڕوای پێ بێنم، کە (مەنسوور) هەرچی بۆ گێراومەتەوە، راستە؟!
پاشان (ئازاد)، لە تاقیگەی نەخۆشخانەی نێوەندی دامەزرایەوە. بەلام بە هیچ شێوەیە، هەواڵی منی نەدەپرسی و سەری لێ نەدەدلم. منیش مەگەر بە رێککەوت، لە رێوبان بمدیایە، ئەگینا بە دوایدا نەدەگەڕام. چونکە لەلایەکەوە دەمزانی، حەز بە هاتوچۆی کەس ناکا و دەیەوێ، ماوەیە بحەوێتەوە. لەلایەکی دیکەوە، زۆر دەترسا، جارێکی دیکە بیگرنەوە. بۆیە دەیگوت: کاتێ بەریاندایت، کۆیانکردینەوە و گوتیان: گەر بەدەردی خۆتانەوە دانەنیشن، هەموو کاتێ دەبێ، چاوەڕێی ئەوە بکەن، بتانگرینەوە. گەر ئەم جارەش بتانگرینەوە، یەکسەر بێ دادگاییکردن هەڵتانئەدەواسین. بە قسەکانیشیدا دیاربوو، تاقەتی هیچی نەمابێ. لەلایەکی دیکەشەوە، من نە (پاسۆک) بووم و نە هیچ کارێکیشم پێی بوو. لەبەرئەوە هەوڵم نەدەدا، ببینم.

بەڵام من بە (سەلاح)ی برامدا، هەردوو پەرتووکی (ئەیام سەعبە)کەی (بەهادین نووری) و (شەرق ئەلمتەوەست)ەکەی، (عەبدولرەحمان مونیف)م بۆ نارد، بەدەمیش ڕامسپارد، ئەو دوو بەرهەمە بخوێنێتەوە و ڕای خۆیم بۆ بنووسێ، بەڵکوو کەمێ لە ئەو گومان و ڕاڕاییە، ڕزگاربیم!

## ئەنوەری مەجید سوڵتان

کاتێ شۆڕشی نوێ دەسپێیکرد، کاکە (ئەنوەر)ی جوانەمەرگ، ڕۆژی (**24. 6. 1976**)، بەهۆی ڕەوانشاد (ئارام)ەوە چووەدەرەوە و لە ناوچەی (شارباژێڕ) جێگیربوو. لەبەرئەوەی پێشمەرگە و فەرماندەیەکی زۆر ئازا و خۆشەویست بوو، دەزگە سیخوڕییەکانی دەوڵەتی (بەعس)ی داگیرکەر، (**27**) جار هەوڵی کوشتنیان دا.

بە داخێکی زۆرەوە، ڕۆژی (**2. 9. 1979**) بوو، هەواڵی جەرگبڕی شەهیدبوونی هاوڕێی خۆشەویستم، ملازم (ئەنوەر)م بیست. بەڕاستی، کاریکی زۆر خراپی تێکردم. (ئەنوەر)م لە ساڵی (**1970**)وە دەناسی. تا بڵێی، گەنجێکی جوان و قۆز، کوڕێکی خۆشەویست، کوردپەروەر و تێکۆشەر، ئازا و بێدەنگ بوو. داخێکی زۆری بە دڵمانا کرد، هەموو نیشتمانپەروەرانی شاری (سولەیمانی) بەتایبەتی و (کوردستان) بەگشتی، زۆر بۆی بە داخبوون. (بیستوونی مەلاعومەر)، هاوڕێیەکی نزیک و دراوسێی بوو، لەگەڵ چەن برادەرێکی دیکەدا چوون و تەرمەکەیان هێنایەوە. خەڵکێکی زۆر دوای تەرمەکەی کەوتن و لە گۆڕستانی (شەهیدان) ناشتیان، پرسەیەکی زۆر جوانیشیان بۆ دانا و جەماوەرێکی زۆر، بەشدارییانتێداکرد.



( **1979 - 1944** )

---

سەبارەت بە ژیانی تایبەتی، خەباتی ڕامیاری و سەربازی ڕەوانشاد ملازم (ئەنوەر)، گوتارێکم لە گۆڤاری (سلێمانی)ی ژمارە (**162**)ی ساڵی (**2014**)ی لاپەڕە (**28-32**) بڵاوکردووەتەوە، پاشان لە پەرتووکی (بارانی خوێن و بای مەرگ)یشدا، لاپەڕە (**129-139**)، جارێکی دیکە گوتارەکەم بڵاوکردووەتەوە.

## دووەمین سەردانی مەنسوور

سەرەتای مانگی (10) بوو، ڕۆژی (مەنسوور) وەڵامی بۆ ناردم و گوتی: دوو ڕۆژی دیکە، لەگەڵ دوو پێشمەرگەدا دێمەوە. لەنێودارەبەڕووەکانی دامێنی چیای (گۆیژە)، چاوەڕێماکە. منیش دەمزانی، دەمەوئێوارە ئەو ناوە، بەهێزی سوپا و پۆلیس دەگیرێ، مەترسییەکی زۆر گەورەی هەیە. ناچاربووم و دەبووایە، هەر بچوومایە، چونکە تازە وەڵامی بۆ ناردبووم و چاوەڕێی دەکردم. لەبەرئەوە هیچ شوێنێکی باشترم، لە ماڵی (شێخ کەریمی حەفید) نەدۆزییەوە، سەرەتا لە ئەوێ دایانمەزرێنم. چونکە هەم خزم بوون، هەم لە داربەڕووەکانیشەوە زۆر نزیکبوو. بۆیە داواکارییەکەم زۆر ئاساییبوو. پەنام بۆ (شێخ ناسر) برد و پێم گوت: شتێکی وا هەیە، ماڵی ئێوە نزیکە و بێگومانە، ئێوارە دەیانهێنم و پاشان کە تاریکبوو، یەکەیەکە دەیانگوێزمەوە. ئەویش زۆر پیاوانە گوتی: باشە. من لە ماڵەوە چاوەڕێتاندەکەم. ئەو کاتە ترومبێلم نەبوو، لەگەڵ (سەردار)ی برای (سەروەت)دا قسەمکرد، ترومبێلەکەم بداتێ و کارێکی وای پێ بکەم. ئەویش گوتی: باشتروایە، خۆم لەگەڵت بێم، چونکە خوانەخواستە، گەر بگیرێی، بە ژمارەکەیدا هەر دەزانن، ترومبێلەکە هی منە. منیش گوتم: باشتر.

دوانیوەڕۆیەکی درەنگ، دووقۆڵی لەگەڵ (سەردار)دا، بۆ شوێنی دیاریکراو چووین. مێز و کورسیمان دانا و مەزەمان ڕازاندەوە. سەرو پێک عەرەقی زەحلاویمان تێکرد و بۆ تامی دەم، سەرو قوومان خواردەوە. وا بزانم، فریای قوومی دووەم نەکەوتین، لەنێو دار و دەوەنەکانی بناری چیاکەوە، فیکەهوڕ دەستییێکرد. دیاربوو، دەمێبوو، گەیشتبوون و چاوەڕێیاندەکرد. منیش وەڵامدانەوە و چەن فیکەیەکم بۆ کێشان. هێندەی نەبرد، یەکێکیان سەریدەرهێنا و گوتم: یەکەیەکە، بەهێواشی وەرن و بچنە نێو ترومبێلەکە دانیشن، تا ئێمە خۆمان کۆدەکەینەوە. بەڵام ئێمە لە شوێنی خۆمان نەجووڵاین، تا هەرسێکیان یەکەیەکە، لەنێو لاداکەی (سەردار)دا دانیشتن و چاوەڕێی ئێمەیان دەکرد. پاشان کەمی ماینەوە و پێکەکانمان فڕکرد، تەماشایەکی دەوروبەرم کرد، کاتێ دڵنیا بووم، هەموو شتێ ئاساییە، هیچ دەنگ و ڕەنگ نییە، بەپەلە سواربووین و لە ماڵی (شێخ کەریم) دابەزین. هەرسێکیان (مەنسوور، فەرهاد خەفاف و عومەری مام توفیق)، ڕیشیان هێشتبووەوە، چلکنوپلکن، ماندوو و برسی بوون. گوتم: ئەم ڕیشە چییە، باشتر وابوو، بتاشتاشیایە، (مەنسوور) گوتی: زۆربەی پێشمەرگە، ڕیشیان بۆ شەهید (ئەنوەری مەجید سوڵتان) هێشتووەتەوە!

ئەو ئێوارەیە، خوالێخۆشبوو خاتوو (سەلمە)ی دایکی (شێخ ناسر)، خواردنێکی زۆر و بەتامی لێنابوو. بوتڵی ویسکیشیان دانابوو. برادەران نانێکی باشیان خوارد و بوتڵەکەشیان

نۆشکرد. پاشان چووینە ژووری سەرەوە و گوتم: با کەمێ بێدەنگ دانیشین، تا بزانین، رەوشەکە چۆنە. زۆر هێمنبوو، دەنگی هیچ نەدەهات. دوایی هێندێ قسەمانکرد، پاشان لەگەڵ (سەردار)دا، سەرەتا (عومەر) و (فەرهاد)مان، بۆ ماڵەکانی خۆیان گەیاند. پاشان گەراینەوە و (مەنسوور)یشمان، بۆ ماڵی دایکی بردەوە. گوتی: بەیانی زوو دەبێ، پێوەندی بە (ئازاد)ەوە بکەی و یەکەمین کەس ئەو ببینم. منیش هیچم پێ نەگوت و لە دڵی خۆمدا گوتم: بەیانی هەموو شتێ ئاشکرادەبێ! ئەو شەوە (مەنسوور)م لە ماڵی خۆیان بەجێهێشت، هاوسەر و کچەکەشی لە ئەوێ بوون. من و (سەردار)یش رۆیشتینەوە.

## ئـــازاد لە نیشەکەی

بەیانی زوو، چووم بۆ نەخۆشخانە، (ئازاد) ببینم. دیارە، لە پەنجەرەکەوە منی بینیبوو، بۆیە هەر چوومە نێوهۆڵی نەخۆشخانەکەوە، لە دوورەوە بە پارچە کاغەزێکەوە هات و هاواریکرد: (حوسێن موحەممەد عەزیز). منیش گوتم: بەڵێ. دوایکەوتم و چووینە ژوورەوە. خێرا دەرزییەکی تیژی دەرهێنا و لەسەری پەنجەگەورەی چەقاندم. گوایە، خوێنم لێ وەردەگری و تاقیدەکاتەوە، تا بزانێ، چ گرووپێکە! بەدەم کارەکەیەوە پێم گوت: (مەنسوور) هاتووەتەوە و لە ماڵی خۆیان، چاوەڕێتدەکا. ئیدی من رۆیشتم.
ئێوارە (مەنسوور)م بینی، گوتی: (ئازاد) هات و هەموو دەنگوباسەکانم بۆ گێرایەوە. هیچ قسەی نەکرد. هەستا و گوتی: دوایی سەرت لێ دەدەمەوە و بەپەلە رۆی. لەگەڵ ئەوەشدا، من لە هەموو شتێ ئاگاداربووم، بەڵام هیچ شتێکم بۆ (مەنسوور) باس نەکرد، وام پێ باشتربوو، لە زمانی (ئازاد) خۆیەوە، هەموو شتێکی بۆ دەرکەوێ.
چەن رۆژێکی پێ چوو، (ئازاد) دەنگی نەبوو. (مەنسوور) گوتی: هەرچی چۆنێ بێ، بیدۆزەرەوە، با سەرێکم لێ بدا. (سەلاح)ی برامم نارد بۆ ماڵەوەیان، چونکە پێی راگەیاندبووین، کەس لە نەخۆشخانە سەرم لێ نەدا، سیخوورەکانی (بەعس) بەشێوەیەکی بەردەوام چاودێریم دەکەن. دوای ماوەیە (سەلاح) هاتەوە و پەرتووکی (شەرق ئەلمتەوەستە)ەکەی بۆ هێنامەوە و گوتی: بیکەرەوە، نامەیەک و پارچەیە کاغەزی تێدا هەیە. نامەکەی لەسەر پەرتووکەکە بۆ من نووسیبوو. بەڵام پارچە کاغەزەکەی بۆ (مەنسوور) ناردبوو، تەنیا یەک دێربوو: (تۆز لە ئاو هەڵناسێ، مەردایەتی لەدەس نامەرد نایە، منیش ئەمرۆ ئەو نامەردەم!)
کوتەکاغەزەکەم دا بە (مەنسوور) و ئەویش خوێندییەوە، بەڵام هێندە توورەببووبوو، لە باخەڵدا ئاگرپیدەکردەوە. گوتی: ئەوە مەبەستی چییە؟ گوتم: دەڵێ، بە تەمای من مەبن و کارتان لەگەڵ ناکەم. هێڵێکیشم بەژێر وشەی (ئەمرۆ)کەدا هێنا و گوتم: دەڵێ ئەمرۆ، جا

گەر سبەینێ، وەک جاران پەشیمانبووەوە، وردەی بەرزبووەوە، دیسانەوە بە ئەو گەرموگوڕییەی پێشوو تێهەڵچووەوە، ئەوا ئەو (ئەمڕۆ)یەتان لەسەر دەکا بە ماڵ و پێتان دەفرۆشێتەوە، خۆی لە پردی (سیرات)ی رەخنە و گلەییەکانتان، پێ دەپەڕێنێتەوە!

(مەنسوور)یش گوتی: باش دەسیانبرین، بە خوا بزانم، بە ئەو شێوەیە وەڵامماندەدەنەوە، تا هەردووکیان نەکوژم، ناگەڕێمەوە. ئیدی هەر ئەو جارەبوو، (ئازاد) و (مەنسوور)، یەکدیان بینی و سەری لێ نەدایەوە!

ئێوارەی دوایی، (مەنسوور)م بۆ ماڵی (ستاری سەعید خەلەف) گواستەوە. ماڵەکەیان لە سەر گردەکەی (سەرچنار) بوو. لە سەربانەکەیان، دووقۆڵی پیاسەماندەکرد. گوتی: گوێ بگرە، کاتی ئەوە هاتووە، ئێستە دەبێ، بۆمبێ بتەقێتەوە. زۆری پێ نەچوو، ناڵەیەکی گەورە هات. پاشان (ستار) لە دەرەوەهاتەوە و گوتی: بۆمبێ لە بارەگەی (پارتی شۆڕشگێڕان)ی (شێخ ستار) تەقیوەتەوە، بە ڕێککەوت تەنیا پاسەوانی بەردەرگەکەی لێبووە، ئەویشی کوشتووە.

شەوی چوارقۆڵی: من، (مەنسوور، ستار و فایەقی شەفیق)، لە سەربانەکە دانیشتبووین و دەمانخواردەوە. تا درەنگانێ باسی کورد و شۆڕشمان دەکرد. جارجاریش تەماشایەکی سەرجادەکەمان دەکرد، هەر ترۆمبیلی هێزی تایبەتی سەربازی بوو، وەک کوڵە بە ئەو ناوەدا دەسووڕانەوە، منیش لە دڵی خۆمدا دەمگوت: خۆزگە دەمزانی، بە دوای کێدا دەگەڕێن؟ ئاخر ئەوەی ئێوە بۆی دەگەڕێن، ئەوەتا لێرە بێ خەم دانیشتووە، پشتێنی لێ کردووەتەوە و دەخواتەوە، شا بە سەپان ڕاناگرێ!

کاتێ شەو درەنگبوو، (مەنسوور) گوتی: هەرچی چۆنێ بێ، بەیانی دەبێ، سەری لە (فەرهاد) بدەی و بۆم بانگکەی. ئیدی من لەگەڵ دایکی (مەنسوور) و خوشکەکانیدا ڕۆیشتینەوە، (خەلەف)ی برای (ستار)یش گەیاندنی.

**ستاری سەعید خەڵەف**

ڕەوانشاد (ستار)، خەڵکی (هەڵەبجە) بوو. ساڵی (**1970**)، لقی چواری (پارتی)، ناوی کۆمەڵێ ئەندامی بۆ کۆلێژی سەربازی لە (بەغدا) پاڵاوت. من و (ستار)یش، لەنێو ناوەکاندا بووین. ئیدی هەر ئەو کاتە یەکدیمان ناسی. ساڵی (**1973**) کۆلێژی سەربازی تەواوکرد. هەر لە کۆتایی ئەو ساڵەشدا، دەرچووەوە و لە (زوزک) فەرماندەی بەتالیۆن بوو . پاشان بۆ ناوچەی دەسەڵاتی سنووری هێزی (زمناکو) گوێزرایەوە و فەرماندەی بەتالیۆنی شەشی (خانەقی) بوو. دوای هەرەسە گەورەکەش، بۆ پارێزگەی (ڕومادی) دوورخرایەوە. هێندەی پێ نەچوو، بەرگەی ئەو ڕەوشە خراپەی نەگرت و بە دوای

ترووسکاییەکدا دەگەڕا، تا لەدەس ژێردەسی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی خۆی و گەلەکەی ڕزگارکا. لەبەرئەوە هەر لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی نوێ و دروستبوونی یەکەمین دەستە چەکدارەکان، لەگەڵ کۆمەڵی کوردپەروەردا چوونەدەروە، بۆ دووەمین جار چەکی کوردایەتی و مەردایەتی هەڵگرتەوە.
بەڵام دوای ماوەیە، لەگەڵ هێندێ کادیری (یەکێتی)دا تێکهوون و پێوەندی بە سەرکردایەتی کاتی (پارتی)ەوە کرد. ماوەیە بە ئەو شێوەیە مایەوە. کۆمەڵی پێشمەرگەی ئازا و خاوەن ئەزموونی لە خۆی کۆکردەوە. بەڵام سەرکردایەتی (یەکێتی) نەیانهێشت، لە نێوچەی (شاربازێر) بمێننەوە و داوایان لێ کردن، یا چەک دانێن، یا لە ڕیزەکانی (یەکێتی)دا خەباتبکەن. ئەوانیش ئەو پێشنیازانەیان پەسەندنەکرد و بۆئەوەی خوێنیش نەڕژێ، مانگی (7) ساڵی (1978)، خۆیان ڕادەسی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) کردەوە. کاتێ گەڕاشەوە، لە (سولەیمانی) پۆستی بەڕێوەبەری فەرمانگەی هاتووچۆی وەرگرت و لەژێرپشەوە، سووکە پێوەندییەکی بە شۆڕشەوە هەبوو، تا لە ئەنجامدا ئاشکرابوو، دەزگەی سیخووڕی (بەعس)ی داگیرکەر، ڕۆژی (6. 11. 1980) کوشتیان.



( 1950 – 1980 )

خەڵک وایاندەزانی، پیاوێکی وەک (ستار)، ناپاکی لە گەلەکەی کردووە و پیاوی (بەعس)ە. بەڵام خۆزگە هەموو (کوردستان)، سەد کوڕی وا ئازا و پاکی تێدا بووایە، لە پاڵ دەسەڵاتدا بووایە، ڕاژەی گەلەکەی خۆی بکردایە. نەک وەک هێندێ کەسی گومانلێکراو، بە ناو لە دەرەوە پێشمەرگە بوون، هەرچی شتی خراپ و ناشیرین بوو، دەیانکرد، زیانیان لە قازانجیان زیاتربوو. کەچی ئەوان بە نیشتمانپەروەر و ڕەوانشاد (ستار)یش، بە ناپاک دەژمێرران!

## چیرۆکی فەرهاد عەبدولقادر

هەرچەندە خوا ئاگای لێ هەیە، من لە هیچ شتێکدا نەبووم، هیچ پێوەندییەکم بە کەس و هیچ لایەنێکی رامیارییەوە نەبوو. بەڵام وەک پێشتر روونمکردەوە، هەرچیم بۆ دەکردن، تەنیا هەر بە هاوڕێیەتی بوو، چونکە هەموویانم دەناسی، ئەوانیش زۆر باش منیان دەناسی و خۆشمدەویستن. سووریش دەمزانی، چەن کوردێکی پاک و دڵسۆزن، هەرگیز ناپاکی بەرانبەر من ناکەن و تووشی هیچ جۆرە گرفتێکیشم ناکەن. لەبەرئەوە هیچ چار نەبوو، هەر دەبووایە، یارمەتیمبدانایە.

جگە لە ئەوەی من باشتربووم، ئەو دوو هاوبیرە (ئازاد) و (فەرهاد) بدۆزمەوە و راسپاردەکەی (مەنسوور)یان پێ بگەیەنم، وەک لە ئەوەی یەکێکی نەناسیاو بچێ و قسەیان لەگەڵ بکا. خۆ گەر ئاشکراشبووومایە، بەهۆی ئەوانەوە تووشی کارەساتێ بوومایە، (بەعس) هێندە بەویژدان نەبوو، مەر بەپێی خۆی و بزن بەپێی خۆی هەڵواسێ، یا ئەوەم بۆ بسەلمێنێ، کە من (پاسۆک) نیم و تەنیا دۆستیانم. بەڵکوو وەک یەک ڕێزیان لێ دەگرتین و ڕاژەیەکی باشیان دەکردین! بەڵام (ئازاد) و (فەرهاد)، لە ئەوە تێ نەدەگەیشتن، بە تایبەتی خێزانەکەی (فەرهاد) وایدەزانی، هەمووی خەتای من بووە، گیراون و ئێستەش، وازی لێ ناهێنم!



## بەزمی خاتوو شوکری

ئێوارەبوو، لە دەرگەی ماڵی (فەرهاد)م دا. سوور دەمزانی، لە ماڵەوە دانیشتووە، چونکە گوێم لە دەنگی بوو. بەڵام یەکسەر هاوسەرەکەی (شوکری)، وەک زانیبێتی، کێ لە دەرگە دەدا و لە چ کاتێکدا دەچم، لەگەڵ (پەری) خوشکی (فەرهاد)، دەرگەیان لێ کردەوە،

هەردووکیان هاتنە دەرەوە و لە دوای خۆیانەوە، دەرگەکەیان داخست. لەبەردەممدا چەقین و گوتیان: فەرموو. گوتم: مامۆستا (فەرهاد) لە ماڵە؟ ژنەکەی بە چرووچاوێکی ناشیرینەوە، بە دەنگێکی بەرز و بە ئاوازێکی سەیرەوە گوتی: نەخێر. بۆ چیتە؟ گوتم: ئیشم پێی هەیە. گوتی: ئیشی چی؟ بۆ وازی لێ ناهێنن؟ کاتی ئەو گیرابوو، تۆ لە کوێ بووی؟! گوتم: لە ئەم شارە بووم. ئیدی بە هەردووکیان دەنگیان لێ بەرزکردەوە و دەسیان بە شاتەشاتی ژنانە کرد. منیش گوتم: گوێبگرن، من خۆم هەرگیز ئیشم پێی نەبووە و ئێستەش، هیچ جۆرە ئیشێکم پێی نییە. بەڵام هاوبیرەکانی لە دەرەوە هاتوون و دەیانەوێ، ببینن. باشتر وایە، بیانبینێ. چونکە گەر نەچێ، تووشی زیان دەبێ. ئیدی بێ ئەوەی خواحافیزییان لێ بکەم، بە دڵشکاوی ڕۆیشتم. بەڵام لە ئەو کاتەدا، فیلمی (لا وقت للحب)م بیرکەوتەوە، چۆن (ڕوشدی ئەباژە) لە دەرگەی ماڵی هاوڕێیەکی دەدا، ژنەکەی بۆی دەردەپەڕی، گەلێ قسەی ناشیرینی پێ دەڵێ و ئەویش لە تاواندا بەپەلە دەڕوا!

من سوور دەمزانی، (ئازاد) هەموو شتێکی بۆ (فەرهاد) گێڕاوەتەوە. بۆیە لە ترساندا، لە کونی ژوورەوە، خۆی شاردووەتەوە و (شوکری) نەیهێشتووە، بێتەدەرەوە و خۆی هاتووە، ئەو قسە زلانە دەکا! ئاخر وەنەبێ، ژنەکەی و خوشکەکەی، منیان نەناسیبێ، بۆیە بە ئەو شێوە ناشیرینە وەڵامیاندامەوە. بەڵکوو هەر چەن جارێ، لە گرتووخانە و ماڵی خۆشیان منیان دیوە. خوشکەکەشی لە زانکۆی (سولەیمانی) دەیخوێند و هەمیشە هەواڵی (فەرهاد)م لێ پرسیوە. کەچی ئێنجا بە ئەو شێوەیە، ڕەفتاریان لەگەڵ کردم! دیارە (ئازاد) ڕاستیدەکرد، دەیگوت: (فەرهاد) لەبەر ژنەکەی ناوێرێ، بجوڵێتەوە. جا گەر هێندە لێی دەترسا، چی لە کاری ڕامیاری دابوو؟!

ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە (فەرهاد)م دەبینی، لە هەر شوێنێ منی دیبێ، خۆی خەریکردووە و ڕووی وەرگێڕاوە، وەک باوکیم کوشتووبێ، وابوو. لە ترساندا نەیدەزانی، چی بکا، هەر هێندەی پێ دەکرا، بەپەلە خۆی دەربازکا و بڕوا. جا نازانم، گوناهی من چی بوو، بە ئەو شێوە خراپە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردم. ئەو دوو (جوند لئیسلامە) دەمهەڕاشەی ژن و خوشکەکەی، بۆ ناردمەدەرەوە، دیارە هێشتا ئەو داوای باقی دەکرد!

گەڕامەوە و بۆ (مەنسوور)م گێڕایەوە. ئەویش لە داخی دڵی خۆی، گوتی: لە سبەی زووتر نییە، دەنێرم، هەردووکیان بکوژن. منیش زانیم، زۆر تووڕەبووە و نازانێ، چی لەگەڵ ئەم پیاوە ترسنۆکانەدا بکا. کەمێ هێورمکردەوە و گوتم: کوردایەتی بەزۆر نییە و وازیان لێ بێنە. من لە ئەو بڕوایەدام، ئەوان ناتوانن، هەروا بەئاسانی لەنێوشاردا دانیشن و دەسەڵات وازیان لێ ناهێنێ. لەبەرئەوە کەمێ چاوەڕێبکەن، تا لایەبەلایەکدا دەکەوێ.

ئاخر گەر (ئازاد) یا (فەرهاد) بیانگوتایە، جاری بارەکەمان نالەبارە و کەمێ چاوەڕێمان بکەن، تا کەمێ دەحەوێینەوە، ڕێوجێیەک بۆ خۆمان و خێزانەکانمان دادەنێین، هەڵبەتە هیچ شتێکی ناخۆش، لەنێوان هیچ لایەکدا ڕووی نەدەدا و ئەو هاوبیرانەی دەرەوەش، بە ئەو شێوەیە دڵیان نەدەرەنجا!

## مژدە تایەر

چووم بۆ لای (مژدە) و گوتم: (مەنسوور) لێرەیە و دەیەوێ، بتبینێ، ئەویش زۆر مەردانە گوتی: لە هەر کوێیە بێ، دەچین و دەیهێنین. بەیانی زوو پێکەوە، (مەنسوور)مان گواستەوە. ئەو کاتە ماڵی (مژدە)، لەسەرجادەکەی پشتی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی (سولەیمانی) ئێستە بوو. لە پەنجەرەی ژوورەکەیانەوە، سەرجادەکە دیاربوو. شوێنەکەی زۆر ڕووتەنی بوو، بەلام جێی گومان نەبوو.
(مەنسوور) داوای لە(مژدە) کرد، (عەبدوڵلائاگرین) ببینێ و بانگیکا. پاشان (مژدە) ئێمەی بەجێهێشت و چوو بۆ ئیش. ئیدی هەردووکمان بەتەنیا ماینەوە. (مەنسوور) گوتی: دەمەوێ، هێندێ درووشمم بۆ بنووسی، ڕێکخستنی نێوشار، لەسەر دیوارەکانی شار دەینووسن. منیش دانیشتم، ئەو درووشمانەی بۆ ئەو ڕۆژە چاکبوو، ڕاژەی یەکێتی ڕیزەکانی گەلی کورد و شۆڕشی دەکرد، بۆم نووسین. ئێستەش هێندێ لە ئەو درووشمانەم هەر لە بیرە، وەک (بژی پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان، مردن و سەرشۆڕی بۆ جاشە خۆفرۆشەکان. بمرێ دوژمنانی نێوخۆ و داگیرکەرانی کوردستان. ئامانجمان دامەزراندنی بەرەیەکی کوردستانییە ...) جەماوەری گەلەکەمان، زۆریان پێ باشبووا!

## عەبدوڵلا ئاگرین

لە کۆتایی ساڵی (**1973**)وە، تا مانگی (**10**)ی (**1979**)، هیچ جۆرە پێوەندییەکم، لەگەڵ (ئاگرین) نەمابوو. تەنانەت دوای هەرەسیش، جاری بە ڕێککەوت، لە کۆڵانەکەی پشت مزگەوتی گەورەوە بینیم، سڵاومان لە یەکدی نەکرد.
(مەنسوور) داوای لێ کردم، لە ئەو دیدارەدا ئامادەبم و قسەی لەگەڵ بکەم. چونکە خۆی (ئاگرین)ی نەدەناسی و ئەوە یەکەمین جاریشبوو، لەگەڵی دانیشێ. وایدەزانی، خۆی دەرەقەتی دەمەتەقێکان نایە! هەرچەندە من زۆرم پێ ناخۆشبوو، لەگەڵ (ئاگرین) دانیشم، چونکە تا ئەو کاتە، بە ناپاکم دەزانی و هەموو تاوانەکانم، بە هی ئەو دەزانی.

هەروەها لێکمدەدایەوە، ئاخر من هیچ نیم، بۆچی دەبێ، بە ناوی (پاسۆک)ەوە، قسەی لەگەڵ بکەم؟! بەڵام لە ئەو ڕۆژەدا، هیچ چارێکی دیکە نەبوو، نەشمدەویست، (مەنسوور) بەتەنیا بەجێبێڵم.

هەر لە دوورەوە (ئاگرین) هات، دەموچاوی تێکترشابوو، خۆی بە زوێر و بێتاوان پیشاندەدا. دوای ماوەیە بێدەنگی، (مەنسوور) تەماشایەکی منی کرد، تا قسەبکەم. منیش ڕووی دەمم لە (مژدە) کرد و زۆر بە کورتی گوتم: (شێرکۆی هەژار)، دەسی ئەم کۆمەڵە ئەفسەرە لاوەی بڕیوە و بەجێیهێشتوون. تازە (ئازاد) و (فەرهاد)یش بەربوون، هێشتا هەڵوێستی خۆیان، بەتەواوی دیاری نەکردووە، ئایا کاردەکەنەوە یا وازدێنن. ئێستەش وەک دەزانن، کۆمەڵێ گەنج لە ئەو شاخانە، چەکیان هەڵگرتووە و بە ناوی (پاسۆک)ەوە کاردەکەن. بەڵام پێویستیان بە نووسەرێکە و بتوانێ، ئەو کەلێنە گەورە ڕووناکبیرییە پڕکاتەوە. بۆیە هاوبیر (مەنسوور) هاتووە و ڕووی دەمی دڵسۆزی لە بەڕێزتان دەکا، ئەو ئەرکە گرنگە پیرۆزە، لە ئەستۆی خۆتان بگرن.

من هێشتا قسەکانم تەواونەکردبوو، (ئاگرین) وەک قیشەکەشێتە تەقییەوە و گوتی: ئەی باشە، بۆ خۆی قسەناکا؟ گوتم: لە خۆی بپرسە. (مەنسوور)یش گوتی: من و ئەو، هیچ جیاوازییەکمان نییە. پاشان (ئاگرین) گوتی: ئەی خۆت بۆ ناچیتەدەرەوە؟ گوتم: من ئەو پیاوە نیم، کە ئەوان بە دوایدا دەگەڕێن. چونکە ئەوان قەڵەم بەدەسیان دەوێ. ئیدی بە دەسی ئانقەست، بۆئەوەی خۆی بپەڕێنێتەوە و وەڵامێکی ڕاستەوخۆ بەدەسەوەنەدا، هێرشێکی توندی کردە سەر ئەو هاوبیرانەی، ساڵی (**1973**) ئەو کارە ناڕەوایانەیان کرد و ویستی، خۆی وا پیشانبدا، هێندە فریشتەیەکی بێ هەڵە و بێتاوانە، تۆزێ لەسەر دامێنی دەکرێ!

دوایی من ئارامم لێ بڕا، وەڵامێکی پڕ بە پێستی خۆیم دایەوە و هێرشێکی توندم، بۆ سەر سەرکردە کۆنە ترسنۆکەکانی (کاژیک) کرد و کەمێ بێدەنگمکرد. پاشان گوتم: ئێوە دەتوانن، بێ من دانیشن، لەسەر ئەو دەمەتەقێیە بەردەوامبن. بەڵام ئەوان پێیان باشبوو، بمێنمەوە. هەرچەندە دانیشتنەکەمان، هیچ کەڵکێکی نەبوو، بەڵام ناکۆکییەکەی نێوان ئێمە و (ئاگرین)، کەمێ خاوبووەوە، سووکە پێوەندییەکی دۆستانەش لەنێوانماندا دروستبووەوە!

دوای چەن ڕۆژێکی دیکە، (مەنسوور) لە ماڵی (ستار) دامەزرایەوە. ئەو ئێوارەیە، هێشتا نەهاتبوونەوە، دووقۆڵی لەسەربان پیاسەماندەکرد. گوتی: سەردانەکەم زۆر سەرکەوتوو نەبوو. چونکە کەس بە دەنگمەوە نەهات و بە هەموویان، ئێمەیان بەرەڵاکرد. گەر تەنیا ئومێدێکمان مابێ، هەر تۆمان بەدەسەوە ماوە. بۆ واز لە ئەو کەلەڕەقییەی خۆت ناهێنی، کارمان لەگەڵ بکەیتەوە و بێیتەدەرەوە.

منیش گوتم: لە سەدا چەن، بڕوات بە (پاسۆک) و ئەو شۆڕشە هەیە؟ گوتی: لە خوار (50)وە. گوتم: جا کەواتە تۆ دەتەوێ، هەر من تووشکەی، ئەگینا من بۆ لای کێ و بۆچی بێمەدەرەوە؟! ئیدی بێدەنگبوو.
دوایی گوتم: من بەیانی زوو، لەگەڵ خوێندکارەکانی زانکۆدا، دەچم بۆ (بەغدا)، ماوەی هەفتەیەکمان پێ دەچێ. دوور نییە، تا دەگەڕێمەوە، تۆ لێرە بمێنی. پێش ئەوەی جیابینەوە، دەمەوێ پێت بڵێم: من وەک هاوڕێیەک، ئامادەی هەموو کار و ڕاژەیەکم. بەڵام وەک (پاسۆک)، بەتەمای من مەبە. ئیدی ماڵاوایم لێ کرد و ڕۆیشتم.

## گەشتێکی زانستیی

بەیانی زوو، هەموو خوێندکارەکانی پۆلی سێی بەشی بەرهەموومی کێڵگە، لەبەردەمی زانکۆدا کۆبوونەوە. پاسێکی گەورەمان بۆ تەرخانکرابوو. من و مامۆستا (فەریدە عەبدوڵڵا) و دوکتۆر (کامیل) ناوێکی میسریی، سەرپەرشتی خوێندکارەکانمان دەکرد و لێپرسراوی گەشتە زانستییەکە بووین. هەر لە دوورەوە (جووجە)م بینی، وەک دەڵێن، خۆی لەتەل دابوو، دیاربوو، زۆر دڵی خۆشبوو. چونکە بە هەزار ناوی خوا، پۆلی دووی بڕی و بۆ پۆلی (3) دەرچووبوو. دوای ئەوەی هەموو خوێندکارەکان ئامادە بوون، سواربووین و بەرەو (بەغدا) بەڕێکەوتین. خوێندکارەکان لە ڕێگە، ئاهەنگێکی زۆر خۆشی گۆرانی و چەپڵەڕێزانیان بۆ گێڕاین. ژیانی خوێندکاری خۆمم بیرکەوتەوە، ئاخر ئێمەش کاتێ بۆ کێڵگە، یا بۆ گەشتێکی زانستی یا سەیران دەچووین، لە هەردووسەر، ئەو بەزمەمانەدەکرد، هەموو گرفتێکی ژیانی ڕۆژانەمان بیردەچووەوە. ئەو کارەش، وەک خوویەکی لێهاتبوو، ئەوە دوای ئەوە پێڕەویاندەکرد!
دوای ئەوەی گەیشتینە (بەغدا)، کچان و کوڕان بە جیا، لە بەشی نێوخۆیی خوێندکاران دابەزین. من و دوکتۆر (کامیل)یش، لە ئوتێل دامەزراین. بەیانی زوو کۆبووینەوە، سەرمان لە کارگەی چنین و ڕستنی لۆکەی (کازمیە) دا. ئەو ڕۆژەمان، لە ئەو کارگەیە بەسەربرد. ئێوارەکەی خوێندکارەکانمان برد بۆ شاری یاری. خاڵی (جووجە)شمان لەگەڵ بوو. ئەو شەوە تا درەنگانێ، لە ئەو باخە گەورەیە، خوێندکارەکان بە خۆشی ڕایانبوارد، بەڵام من دڵم، هەر لای (مەنسوور) بوو! ڕۆژی دوایی، سەردانی لابۆر و کێڵگەکانی (ئەبوغریب)مان کرد. بەهەڵمزانی، دۆست و ئاسیاوەکانی خۆمم بەسەرکردەوە، زۆر ڕێزیان لێ گرتم!
بۆ بەیانی، بەرەو (عەمارە) سواربووین. باشبوو، دوای ماندووبوونێکی زۆر، لە بەشی نێوخۆیی خوێندکاران، جێی خۆمان کردەوە. ئێوارە دابەزین و لەنێوبازارەکەدا، کەمێ

سوڕاینەوە. پاشان یانەی مامۆستایانم دۆزییەوە و هەموو پێکەوە نانمانخوارد. دوایش تا نزیک کاژێری (12)ی شەو، لە باخەکانی نێوشار، لە تەنیشت حەوز و فوارەکانەوە دانیشتین، خوێندکارەکانیش دیسانەوە، دەسیان بە گۆرانیگوتن کردەوە. وایان لێهاتبوو، حەزیان نەدەکرد، بۆ بەشی نێوخۆیی بڕۆنەوە و بنوون، بەزۆر بردمنەوە، چونکە درەنگبوو، دەبووایە، بەیانیش زوو هەستن و سەر لە کارگەی شەکر بدەن، پاشان بچین بۆ کێلگە، تا خوێندکارەکان بۆ یەکەمین جار لە ژیانیاندا، قامیشی شەکر ببینن، چۆن دەڕوێ.

لە کارگە و کێلگەکە، پسپۆرەکان باسێکی زانستانەیان، لەسەر چاندنی قامیشی شەکر و دەرهێنانی شەکر پێشکەشکردین. دوکتۆر (کامیل)، قامیشێکی هەلکێشا، پاکیکرد و قرمەقرم خواردی. خوێندکارەکانیش شتی وایان نەدیبوو، بە ئەو دیمەنە پێدەکەنین. دوکتۆریش دەیگوت: ئێمە لە (میسر) دەیخۆین، زۆر بە کەلک و بە تامە، بۆ بەهێزکردنی ددان باشە!

هەرچەندە سەرەتای مانگی (10) بوو، بەلام زۆر گەرمبوو، بەڕۆژ هەوا گەرمەکەی، بێزاریکردبووین، بە شەویش مێشوولە هارەکانی هەراسانیانکردبووین. هەر ئەو ڕۆژە، هەموو سەردانەکانمان تەواوکرد و پاشان بەرەو (بەغدا) گەڕاینەوە. ئێوارەکەشی خاڵە (نیزار)، من و (جووجە)ی داوەتکرد و لە ماڵەوە نانیان بۆ درووستکردبووین. ئەو شەوە تا درەنگانی، لایان دانیشتم، گەلێ قسەی خۆشمان کرد، هێندێ ڕازوگلەیش کرا، پاشان گەڕامەوە بۆ ئوتێلەکە. دوکتۆر (کامیل) پرخەیدەهات. ئەوە یەکەمین جاربوو، لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی (جووجە)م دەناسی، لە دەرەوەی زانکۆ پێکەوەبین!

دواڕۆژی گەشتەکەمان، بۆ گەڕان و پیاسەکردنی نێو (بەغدا) تەرخانکرد. ئێوارەش هەموو خوێندکارەکانم، بۆ (پێشانگەی نێودەوڵەتی بەغدا) برد. بەڕاستی گەشتێکی زۆر خۆشمان کرد، بەلام لە ئەو سەردانەماندا، هێندێ ڕووی ڕاستینەی، خوو و ڕەوشتی (جووجە)م بۆ دەرکەوت، زۆر بە دڵم نەبوو. پەڵەیەکی لەنێودڵمدا بەجێهێشت!

کاتێ بەرەو (سولەیمانی) گەڕاینەوە، (شێخ ناسر) باسی گەڕانەوەکەی (مەنسوور)ی بۆ کردم و گوتی: لە دواڕۆژدا، (فەرهاد عەبدولقادر) هات و لە ماڵی ئێمە بیبنی. دوای ئەوەی (مەنسوور) گەڕایەوە، بیستم (ئازاد) خۆی لەدەس (سولەیمانی) ڕزگارکرد و لەسەر داوای خۆی، کارەکەی بۆ (هەولێر) گواستەوە، تا لە ئەوە پتر، کەس پێوەندی پێوە نەکا و زۆر بەدەگمەنیش نەبووایە، لە (سولەیمانی) نەدەبینرا!

## پرۆژەیەکی ڕووناکبیریی

هەرچەندە لە ساڵەکانی شەستەوە، وردەوردە دەمخوێندەوە، لە دوای حەفتاکانیشەوە، بە تەواوی دەسم بە خوێندنەوە کردبوو. بەڵام لە کۆتایی ساڵی (**1979**) و سەرەتا ساڵی (**1980**)وە، بەرنامەیەکی تایبەتیم بۆ خۆم دانا و زۆربەی کاتی خۆم، بۆ خوێندنەوە و نووسین تەرخانکرد. ئەو بابەتانەی هەڵیشمبژاردبوون، پتر پێوەندییان بە مێژوو، بەرهەمەکانی (لینین) و فەلسەفەی مارکسیزمەوە هەبوو. زۆربەی ئەو بەرهەمە مێژووییانەی، نووسەرە کورد و بیانییەکان، لەسەر کورد نووسیبوویان، زۆر بەوردی دەمخوێندنەوە. زۆربەی بەرهەمەکانی (مارکس، ئینگلز و لینین)شم خوێندەوە. لە پاڵیشەوە و بەشێوەیەکی بەردەوامیش، باری سەرنجی تایبەتی خۆم، لە دەفتەرێکدا تۆماردەکرد. بەتایبەتی لە هەردوو پشووی نیوەی ساڵ و سەری ساڵدا، هەمیشە لە ماڵەوە بووم، خۆم بە خوێندنەوە و نووسینەوە خەریکدەکرد.

## پێوەندییەکی سنووردار

لە ئەو ماوەیەشدا، تەنیا بە نامە و لە ڕێی ماڵی (مەنسوور)ەوە، بە شێوەیەکی بەردەوام، پێوەندیم بە برادەرانی شاخەوە هەبوو. گەلێ جار سەبارەت ڕەوشی (کوردستان)، نامەیان بۆ دەناردم و منیش، لەبەر ڕۆشنای دەنگوباس و هەواڵەکانی خۆیاندا، وەڵامم دەدانەوە و هێندی تێبینی خەلکیشم، سەبارەت (پاسۆک) بۆ دەنووسین.

لە یەکێ لە ئەو نامانەی (مەنسوور) بۆی نووسیبووم، ئەوەبوو، کاتێ من لە (بەغدا) بووم و لە دوارۆژی سەربانەکەیدا بۆ شار، (فەرهاد عەبدولقادر)ی دیوە و داوایکردبوو، ماوەیەکیان بدەنێ، تا بە خۆیاندا دەچنەوە و کارە تایبەتییەکانیان تەواودەکەن. منیش یەکسەر قسەکانی خۆم بیرکەوتەوە، کە لە ئەو بارەیەوە، کاتێ خۆی بۆ (مەنسوور)م باسکردبوو. دیارە (مەنسوور)یش، بە ئەو بەڵێنەی (فەرهاد)، زۆر دڵی خۆشبووبوو، بۆیە وەک مژدەیەک، پێی ڕاگەیاندم!

ڕۆژی دوو نامە بۆ (فەرهاد) و (شێرزاد) هات. منیش هەردووکیانم گەیاند. بەڵام ئەم جارە نەموێرا، لەبەر (شوکری) هاوسەری، لە دەرگەی ماڵیان بدەم! بەڵکوو بەیانی زوو، لە ئیشەکەی بینیم. (فەرهاد) دوای ئەوەی بەربووبوو، لە پیشەکەی خۆی (مامۆستا) لابرابوو، لە شارەوانییە کۆنەکەی نێوبازاڕ، لە یەکێ لە بەشەکانی کاریدەکرد. دۆزیمەوە و لە ژوورەکەی خۆی، نامەکەم دایە. ئەو ڕۆژە زۆر ڕووی خۆشبوو، باسی هیچ شتێکی کۆنی نەکرد.

## دوکتۆر خالید

کۆتایی ساڵی (1979) بوو، گۆڕانکارییەکی خێرا، لە بەشەکەمان، لەنێو کۆلێژ و زانکۆدا ڕوویدا. دوکتۆر (تاریق عەمادی) لە سەرۆکی زانکۆ لابرا، دوکتۆر (خەسرەوە شاڵی) دانرا، پێشتر ڕاگری کۆلێژی کشتوکاڵ بوو، هەر خۆشی ڕاگربوو. لە بەشەکەی ئێمەش، دوکتۆر (هەلکوت)یان لابرد و دوکتۆر (خالید ئەحمەد ئیبراهیم)یان دانا. وادیاربوو، ڕێژەی کادیرە بەعسییەکانی نێو زانکۆ، ڕۆژبەڕۆژ لە هەموو کۆلێژەکاندا، ڕووی لە زیادبوونبوو. بۆیە هەموو کادیرە ئەکادیمیکە کۆنەکانیان لابرد و دەزگە گرنگەکانی زانکۆیان، بە کادیری ئەکادیمی بەعسی پڕکردەوە.

هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە، دوکتۆر (خالید) لە زانکۆی (سولەیمانی) دامەزرا، مێزەکەی لە ژوورەکەی ئێمە و لە تەنیشت مێزەکەی منەوە بوو. دوکتۆر (خالید) خەڵکی (بەغدا) بوو. خوێندنی باڵای لە (بولگاریا) تەواوکردبوو. پیاوێکی بێدەنگ و کەمدوویبوو. زۆر ڕێزی خۆی و خەڵکی دەگرت. نێوانمان زۆر باشبوو. هەمیشە خەریکی خواردنەوە بوو، بەیانیان زۆر درەنگ بۆ کارەکەی دەهات، گێژوویژ، ئاگای لە هیچ شتێ نەبوو. زۆربەی ڕۆژ دەهات و دەیگوت: زۆر ماندووم، دەرگەی ژوورەکەی دادەخست و لێی دەنووست. لە هەمان کاتیشدا، ئەندامێکی پێشکەوتووی (بەعس) بوو، دەسی زۆر دەڕۆی. بەڵام تا بڵێی، پیاوێکی باشبوو، هەرگیز ئەو باسانەی لەگەڵ ئێمەدا نەدەکردەوە و زۆر کەمیش دەوامیدەکرد.

سەیر ئەوەبوو، مارسیدسەکەی لەبەردەم بەشەکەی خۆماندا ڕادەگرت، دەرگەکەشی دانەدەخست، کلاشینکۆفێکیشی هەبوو، هەرگیز لەنێو ترومبیلەکەیدا دای نەدەگرت! من و (حەمە قەراخی - حەمەدۆستان)یش، هەموو ڕۆژی لە ئەو ناوەدا پیاسەماندەکرد، زۆر جار لە ئەوە دەترساین، ڕۆژی یەکێ بیفڕێنێ و دوایی، بەسەر ئێمەیدا بێنێ!

دوکتۆر (خالید) حەزی لە کچێکی عەرەبی باڵابەرزی جوانی ڕەشتاڵەی (بەغدایی) کردبوو، لە کۆلێژی پەروەردە دەیخوێند، زۆر جار دەهات و کچەکەشی لەگەڵ بوو، پێکەوە لە ژوورەکەی خۆی دادەنیشتن، دەرگەیان دادەخست و قسەیاندەکرد. ئیدی هەر بە جاری، ئاگای لە ئیشوکاری بەشەکەمان نەدەما. ئاخر ناهەقی نەبوو، کچەکە زۆر شلومل و بە نازبوو، (خالید)ی شێتوشەیداکردبوو!

سیستەمی کارکردن لە زانکۆ، بۆ مامۆستایان زۆر لەبار و خۆش بوو، بەیانیان گەر وانەمان هەبووایە، زوو دەچووین، گەر هیچیشمان نەبووایە، ئەوا بە ئارەزووی خۆمان، لە خەو هەڵدەستاین و دەچووین بۆ کار. وەک فەرمانگەکانی دیکە نەبوو، واژۆبکەین و لێپرسینەوە هەبێ. ئەوەتەی لە ئەو بەشە کارمدەکرد، زۆر حەسابوومەوە، کاتێ (خالید)یش بوو بە سەرۆک بەش، هێندەی دیکە بەرەڵایی دروستبوو، کەس لە کەسی نەدەپرسییەوە!

## جەلالی حاجی حوسێن

کۆتایی مانگی (**11**)ی ساڵی (**1979**) بوو، هەردوو ڕەوانشاد (جەلال) و (فەرهاد خەفاف)، سەریکیان لە شار دایەوە. هەر زوو بە (سەلاح)ی برامدا، وەڵامیان بۆ ناردم، (ئاگرین) بدۆزمەوە و پێکەوە سەریانبدەین. ڕۆژی دوایی چووم بۆ ماڵەوە و هەواڵەکەم پێ گەیاند. ئێوارەیەکی تاریکی زستانبوو، (سەلاح) پێشمانکەوت و ئێمەش پێکەوە، دووربەدوور دوایکەوتین. لە گردەکەی (سەرچنار) و لە ماڵی (فەرهاد خەفاف) دابەزیبوون. ماڵەکەیان لە تەنیشت ماڵی ملازم (ستار)ەوە بوو، لە ژێرزەمینەکەیاندا جێیان داخستبوو. هەرچوارمان پێکەوە دانیشتین.

(جەلال)، باسی هێزەکانی نێو شۆڕش، ڕەوشی (کوردستان) و پێوەندییەکانی دەرەوەی شۆڕشی بۆ کردین. پاشان هاتە سەر باسی (پاسۆک) و گوتی: داواتان لێ دەکەین، کارمان لەگەڵ بکەن و جێی شیاوی خۆتان، لە شاخ بگرن. لە ئەو ڕووەوە، گەلی قسە و دەمەتەقێمان کرد. من زۆر بەراشکاوی گوتم: بە هیچ جۆری ئامادەنیم، لە ئەو شۆڕشەدا بەشداربیکەم، چونکە هیچی بەسەر هیچەوە نییە. هەر کەس و پارتی، بۆ خۆی کاردەکا و خەمی کوردیان نییە. ئەو هەموو لایەنانە، هەرگیز پێکەوە هەڵ ناکەن و ئەنجامێکی باشیشی نابێ. ئێوەش ئەوەتەی لە دەرەوەن، هیچتان بە هیچ نەکردووە و هیچیش بە هیچ ناکەن. لە کۆتاییشدا، لەنێوان (یەکێتی) و (پارتی)دا دەپلیشێنەوە. بڕواش ناکەم، خۆشتان زۆر باوەڕتان بە ئەو شۆڕشە هەبێ.

(جەلال) گوتی: بەڵگەت بۆ ئەو قسانە چییە؟ گوتم: کاتێ (مەنسوور) لێرەبوو، داوای لێ کردم، لەگەڵی بچمەدەرەوە. لێم پرسی: لە سەدا چەن، بڕوات بە ئەو پارت و شۆڕشە هەیە؟ گوتی: لە (**50**%) کەمتر. ئینجا بێدەنگبوو. ڕووی دەمی لە (ئاگرین) کرد و داوایان لێ کرد، یارمەتییانبدا. ئەویش تۆزێ منجەمنجێکرد و گوتی: من جارێ بەڵێنی هیچ شتێ نادەم. بەڵام لەنێوشاردا لە ڕێی کاک (حوسێن)ەوە، پێوەندیتان پێوە دەکەم. دوای ماوەیەکی کورت بەجێمانهێشتن.

ئاخر لەبەرئەوەی، خۆیان چەن کەسێکی دیاریکراوبوون، زیادیان نەدەکرد، کەسێکیان نەبوو، سەرپەرشتیانبکا و شتیان بۆ بنووسێ، بۆیە چەندین جار، پەنایان بۆ من و کەسانی نەتەوەیی دیکە دەبرد، بەڵام هەرچەن لێکمندەدایەوە، نە بە ئێمە بارەلارەکەی (پاسۆک) و شۆڕش ڕاستدەکرایەوە، نە چوونەدەرەوەشمان، هیچ کەڵکێکی هەبوو!

کاتێ گەڕاینەوە، (ئاگرین) باسی (جەلال)ی کرد و گوتی: هێندە لەگەڵ سەرکردەکانی (یەکێتی) هەستاوە و دانیشتووە، فێری هێندێ شت بووە، هەر لە خۆیەوە دەیڵێتەوە، بەڵام هێندێکیان بە هەڵە بەکاردێنێ. منیش گوتم: جا ئێستە کاتی ئەوەیە، تۆ ڕەخنە لە

ئەو پیاوە بگری، ئەو هەر هێندەی لێ دەزانێ. ئەدی ئەوان بۆچی، پەنایان بۆ ئێمە هێناوە، هەر لەبەرئەوە نییە، کە کادیری رامیاری هوشیار، نووسەر و رووناکبیری باشیان نییە؟!

## جووجە نەبوو، جووجەڵە بوو!

لە یەکەمین رۆژەوە، ئەو کچە جوانەم دیبوو، هەمیشە دڵم بۆی لێدەدا. کاتێ پێوەندی خۆشەویستیش، لەنێوانماندا دروستبوو، زۆرم خۆشویست، تەنانەت داوای هەر شتێکی بکردایە، یەکسەر بۆم جێبەجێدەکرد. هەر لە پۆلی دووشەوە فێرمکردبوو، گەر کۆرسی بە سەرکەوتووی ببڕێ و دەرچێ، دیاریم پێشکەشدەکرد. هێندێ جاریش، بە عەرەبی گوتارێکم لەسەر هێندێ بابەت بۆ دەنووسی، کە لای هەردووکمان گرنگبوو. لەبەرئەوە لە زانکۆش بڕیارماندابوو، یەکدی نەبینین، بەڵام هەموو رۆژێکی یەکشەممە، کاژێری (**11**)ی سەرلەبەیانی، بەتێلیفۆن ماوەی یەک کاژێر، پێکەوە قسەماندەکرد. هەرچی دەنگوباسی ئەو هەفتەیە هەبوو، هەرچی پێوەندی بە زانکۆ، خوێندن، خۆمان و گرفتەکانی ماڵی هەردوولامانەوە هەبوو، بۆ یەکێیمان باسدەکرد. ئەو کاتەشمان بۆیە هەڵبژاردبوو، چونکە هەردووکمان وانەمان نەبوو، باوک و براگەورەکەشی، لە ماڵ نەبوون، ئیدی بە ئارەزووی دڵی خۆمان، درێژەمان بە قسەکردن دەدا. هێندێ جاریش، دوای ئەوەی وانەکانی تەواودەبوو، بەشەکەی خۆمان چۆڵ دەبوو، دەهات و ماوەیە پێکەوە دادەنیشتین، تێرتێر قسەماندەکرد.
ماوەی دوو ساڵی پۆلی دوو و سێمان، بێ گرفت و بە خۆشی، بە ئەو شێوەیە بەڕێکرد. بەڵام دوای ئەوەی لە خولی پراکتیکی هاوینە، لە (بەغدا) گەڕایەوە، نازانم، چی روویدابوو، رۆژبەرۆژ، پێوەندی نێوانمان بەرەو کزی و لاوازی دەڕۆی، بەتەواوی گۆڕابوو، زۆر لە خۆی بایبووبوو، بە پێچەوانەی جارانەوە، بێدەنگی و شەرمنێکەی نەمابوو، چاو و رووی زۆر کرابووەوە، زۆربەی کات لە زانکۆ، لەگەڵ هاوڕێکانیدا دەمایەوە، خەریکی قسەکردن و شۆخی بوو، منیش بەپێی هەڵکەوتی سرووشتی خۆم، ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانەم پێ ناخۆشبوو، هێندێ جار سەرنجم بۆ ئەو جۆرە شتانە رادەکێشا، بەڵام ئەو زۆر بایەخی پێ نەدەدا! هەستمدەکرد، لەگەڵ چەن کەسێکی رەوشت نزمدا دەگەڕێ و هاتوچۆی ماڵیان دەکا. چەن جارێ ئاگادارمکردەوە، بەڵام کەڵکی نەبوو. چەن جارێ خاڵیشی هات بۆ (سولەیمانی)، هەموو ئەو شتانەم بۆ گێڕایەوە، ئەو لایەنی منی دەگرت. بەڵام (جووجە) مێش میوانی نەبوو! لەبەرئەوە بڕیارمدا، کەمێ جڵەوەکەی بۆ توندکەمەوە، ئیدی وردەوردە، تێلیفۆنی نێوانیشمان برا.

مەگەر بە ڕێککەوت، لە زانکۆ تووشیبوومایە، ئەگینا نە من بە دوایدا دەگەڕام و نە ئەویش وەک جاران، زووزوو سەری لە بەشەکەمان دەدا. پێم وابوو، ئەو ماستە بێ موو نییە، شتێکی پەیداکردووە!

ئەوەبوو، دواجار بۆم دەرکەوت، کچێکی زۆر هەلپەرست و درۆزن بوو، ئەو ماوەیەی پێوەندی لەگەڵ من هەبوو، تەنیا هەر بۆ ئەوەبوو، لە زانکۆ یەکێ بناسێ و یارمەتیبدا. بەتایبەتی زۆربەی مامۆستاکان، لەبەر من یارمەتییاندەدا و دەریاندەچاند. چونکە خۆی لە خوێندنەکەیدا، زۆر زیرەک نەبوو. تەنانەت لە کۆرسی دووی پۆلی سێدا، لە (3) وانەدا کەوتبوو، داوام لە دوکتۆر (لوئەی ناجی) کرد، کە جێگری ڕاگر و سەرۆکی لیژنەی تاقیکردنەوەکان بوو، یارمەتیبدا، چونکە لە ماڵەوە گرفتیان هەیە. ئەویش تکاکەی پەسەندکردم، یەکێکیان بۆ چاککرد و ئەو کۆرسە دوو وانەی مابوو، دەبووایە، مانگی (9)ی ساڵی نوێی خوێندن، تاقیکردنەوەی تێدا بکردایەتەوە. ئەگینا ئەو ساڵە، لە پۆلی سێدا دەمایەوە و دەرنەدەچوو. تەنانەت دوکتۆر (لوئەی)ش بە خۆی گوتبوو: لەبەر خاتری کاکە (حوسێن) دەرمانهاندی.

خوشکێکی قەڵەوی تەپۆی هەبوو، کچی ماڵبوو. لە ئەو گەورەتربوو، تەنیا پۆلی شەشی سەرەتایی تەواوکردبوو. هیچ ئیشێکی دەس نەدەکەوت و بەسەر کەسوکارەکەیەوە باربوو. داوای لێ کردم، یارمەتییدەم و لە زانکۆ دایمەزرێنم. منیش داوام لە دوکتۆر (خەسرەو شاڵی) کرد، یارمەتییدا. ئەویش لە بەشی کێلگە لە (بەکرەجۆ) لە زانکۆ. بە مەڕدوش دایمەزراند. بەڵام من بەهۆی کاک (کەماڵی ڕەشەی موختار)ەوە ئەمهێشت، لە (بەکرەجۆ) دەوامبکا. هەر لە کۆلێژەکەی خۆمان، لەسەر ئامێری فۆتۆکۆپی داینا. کەچی لە ئەو ماوەیەی لە زانکۆ کاریدەکرد، هەڵسوکەوتی زۆر سەیربوو، دوایی دەرکەوت، کچێکی بەرەڵابوو!

لە هەمووشی سەیرتر ئەوەبوو، ئەو کچە سوور دەیزانی، من خەریکی چیم و چەن دژی دەسەڵاتی بەعسییەکانم. چونکە هەمیشە، باسی کوردایەتیم بۆ دەکرد. جگە لە ئەوەی، برایەکیشی لە بۆردوومانەکەی شارۆچکەی (قەڵادزێ)دا، ڕۆژی (**24 .4 .1974**) بەرکەوتبوو، گیانی بە خاکی (کوردستان) سپاردبوو. کەچی ڕۆژێ هات و گوتی: پێیان گوتووم، بەبۆنەی دامەزراندنی (بەعس)ەوە، کێک درووستکەم. منیش گوتم: شتی وا نەکەی. گوتی: ئاخر دەرم ئاچێنن. گوتم: من دەرتدەچێنم، وەک لە پۆلی دوودا یارمەتیم دای. ئیدی ڕۆیشت و هیچ قسەی نەکرد. کەچی ڕۆژی (**7**)ی مانگی (**4**)ی ساڵی (**1981**)، بەبەردەمی مندا هات و قاڵبی کێکی گەورەی بەدەسەوەبوو، تەنانەت سڵاویشی نەکرد. ئەوەش لای من هێڵی سووربوو، هەرگیز قابیلی بەزاندن نەبوو. ئیدی کە ئەوەم بینی،

یەکسەر بڕیاری تەواوەتی خۆم دا و نەفرەتم لە ئەو ڕۆژەش کرد، کە ناسیبووم و وەک کچێکی بێڕەوشتی خۆفرۆش، هاتە پێش چاوم و تێگەیشتم، جووجە نەبوو، جووجەڵە بوو!

ئەو کارە چەپەڵە خراپەی، هێندە کاری لە هەست و هۆشم کرد، هەر بەیەکجاری گێژیکردم، وەڕسبووم و ئاگام لە خۆم نەما. ڕۆژی دوایی هێندە ماندووبووم و مەراقم هەبوو، درەنگانی لە زانکۆ دەگەڕامەوە، ئاگام لێ نەبوو، خەریکبوو، بە ترومبێلەکەم لێی بدەم. سەرەتا نەمزانی ئەوە، بەلام دوایی کە زانیم ئەوە، ڕانەوەستام و یەکسەر ڕۆیشتم.

بەیانی هات بۆ لام و گوتی: هەر چاوەڕێی تێلیفۆن بووم، داوای لێبووردنم لی بکەی، کەچی هیچ دەنگت نەبوو، بۆ؟! منیش گوتم: کەی من لە ژیانی خۆمدا، تێلیفۆنم بۆ تۆ کردووە، تا ئێستە بۆت بکەم، هەر تۆ نەتکردووە؟ کوڕێکی پورم شەهیدبوو، هاوڕێ کچەکانی زانکۆ، هەموویان هاتن و سەرەخۆشییان لی کردم، تۆ تەنانەت تێلیفۆنێکت بۆ نەکردم. لە ئەخۆشخانە (3) ڕۆژ کەوتم، تۆ بە هیچ شێوەیە، دەنگ و ڕەنگت نەبوو. کەچی هێشتا تۆ هاتووی و گلەیی دەکەی. ئیدی ڕۆیشت و جارێکی دیکە نەگەڕایەوە!

### فەرهاد خەفاف

کێ دەیزانی، (فەرهاد خەفاف) بۆ دواجار هاتووەتەوە و ماڵاوایی، لە (سولەیمانی) بکا؟! کێ دەیزانی، مەرگ وا زوو، لە دەرگەی ئەو کادێرە لاوە چالاکە کارامە زرنگە دەدا و لێمان دەشارێتەوە؟! کێ دەیزانی، ژوانی لەگەڵ شەهادەتدا هەیە؟ ئاخر هەر دوای ئەوەی (جەلال) و (فەرهاد) گەڕانەوە، زۆری پێ نەچوو، هەواڵی جەرگبڕی شەهیدبوونی، (فەرهاد)ی کورد و مەدری جوانەمەرگمان پێگەیشت.

(فەرهاد)، ڕۆژی (16. 3. 1980)، مەشقی بە پۆلی پێشمەرگەی (پاسۆک) کردبوو، بە هەڵە ئاربیجییەکی بەکارهێنابوو، بەدەسییەوە تەقیبووە و دەمودەس، گیانی دەرچووبوو. لەنێو ئەو کۆمەڵە کادێرە لاوە تازەپێگەیشتووەی (پاسۆک)دا، (فەرهاد) یەکێ لە هەرە کادێرە چالاک و ڕووناکبیرەکان بوو. گەر مەرگ مەودای بدایە، لە ئەو بڕوایەدام، کادێرێکی زۆر باشی بیری نەتەوەیی لێ دەردەچوو. بەلام لەگەڵ چارەنووس و مەرگی لەناکاودا، هیچ ناکرێ و دەسەلات نییە!

بەڕاستی، کاتێ ئەو هەواڵەم پێگەیشت، لە شوێنی خۆم سستبووم. چونکە (فەرهاد)، هەر هاوبیرمان نەبوو، بەڵکوو هەر لە منالییەوە دەمناسی و هاوڕێیەکی گیابەگیانی، (سەلاح)ی براشم بوو. زۆربەی کات پێکەوەبوون و زۆر تێکەڵمانبوو. گەنجێکی زۆر بەتوانا، ئازا، خۆڕاگر و ڕووناکبیر بوو. زۆر حەزی لە خوێندنەوە و نووسین دەکرد. جاروبار

هۆنراوەشی دەهۆنییەوە. دۆستایەتی لەگەڵ نووسەران و ڕووناکبیرانی شارەکە زۆر بەتینبوو، کاتی سەردانی (بەغدا)شی دەکرد، دەبووایە، مامۆستا (مەسعوود موحەممەد)ی ببینیایە، گوێی بۆ قسەخۆش و ئامۆژگارییە پڕ بایەخەکانی ڕاگرتایە. تەنانەت هێندە بەتەنگ نووسینەکانی مامۆستاوە بوو، کاتی پەرتووکخانەیەکی لەسەرجادەی (مەولەوی) دانابوو، زۆربەی بەرهەمەکانی لا دەستدەکەوت.
ڕۆژێ پێی گوتم: کۆمۆنیستەکان بەکۆمەڵ دێن و بەرهەمەکانی مامۆستا (مەسعوود) دەکڕن. لە ئەوەدەچی، نەیانەوێ، دەس خەڵک بکەوێ، خۆیان بیکڕن و بیسووتێنن. دوایی کە تاقیمانکرد، هەر وادەرچوو. هەر کۆمۆنیستێ، بەرهەمێکی (حاجی قادری کۆیی) دەکڕی و دەیسووتاند. ئێمەش هەرزوو، لەرێی (فەرهاد)ەوە وەڵامان بۆ مامۆستا نارد، ژمارەیەکی زیاتر چاپکا، زۆرتری بۆ (سولەیمانی) بنێرێ، تا هەر ئەوان بیکڕن و پارەیان پێ نەمێنێ. ئەوەش بیرکردنەوە و شێوازێ هەرزانەی ئیشکردنی کاری ڕامیاری، ئەو سەردەمەی کۆمۆنیستەکان بوو، وایاندەزانی، گەر بەرهەمەکانی مامۆستا بسووتێنن، ئیدی دەتوانن، بەر بە بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕەکانی بگرن، ئاخر کەی بەری خۆری ڕاستی، بە بێژنگی کونکونکراوی لە دەرەوەهێنراو گیراوە؟!!



( 1980 – 1957 )

## نەورۆزی ساڵی ( 1980 )

ڕۆژی (19. 3. 1980) بوو، لە ماڵەوە دانیشتبووم، هەر هێندەم زانی، (ئازاد) بێ ئەوەی لە دەرگە بدا، خۆی بە ژووردا کرد، دەمیبوو، نەمدیبوو، تازە لە (هەولێر) هاتبووەوە. دانیشت و گوتی: بەیانی زوو دەچمەدەرەوە. بەڕاستی سەیرم لێهات، ئەم بڕیارە کتوپڕییە چی بوو، دای؟! چی ڕوویداوە؟! تۆ بڵێی، گێچی چانسی بیری نەتەوەیی و (پاسۆک) بەزیووبێتەوە؟! لە هەمان کاتدا، زۆرم پێخۆشبوو، لە ئەوانەیە لە ژیانی ڕامیاری خۆمدا، مژدەی لە ئەوە خۆشترم نەبیستبێ! گوتم: هەر خۆتی؟ گوتی: نەخێر، (فەرهاد)یشم لەگەڵ دایە. بەڵام پێی گوتم: لای تۆ قسەنەکەم، بۆیە پێشت دەڵێم، چونکە ناتوانم، هیچ شتێ لە تۆ بشارمەوە. منیش هیچ قسەم نەکرد، چونکە بەلامەوە زۆر گرنگ نەبوو، (فەرهاد) بچێتەدەرەوە یا نەچێ، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ، لەبەرئەوەی هەرگیز هیچ نەبووە، ئێستەش هەر هیچ نییە و هیچیشی پێ ناکرێ!

پاشان گوتم: لە کوێوە دەڕۆن؟ گوتی: (فەرەیدوون)ی برای، بە ترومبێلەکەی فەرمانگەی کشتوکاڵ، تا (قەڵادزێ)مان دەبا، لە ئەوێشەوە شارەزامان پەیداکردووە، تا بارەگەی (پاسۆک)، لەگەڵمان دێ.

لە ئەم قسانەدا بووین، خاتوو (ئاسکە)ی دایکی (مەنسوور) هات. هاتەژوورەوە، چاوی بە (ئازاد) کەوت، دەرگەکەی داخست و پاشەوپاش گەڕایەوە. منیش بانگمکرد فەرموو، وەرەژوورەوە، ئەوە کاکە (ئازاد)ەکەی جارانی خۆمانە. ئەویش هات، لێ کرد و گوتی: نەزانم کاک (ئازاد)ە، بەڵام دەسی ئەو منداڵانەی بڕیوە و ئێستەش خۆی، بە خاوەنیان نازانێ! منیش گوتم: بڕواناکەم وابێ، گەر ئیشێکت بە (مەنسوور) هەیە، زوو پێم بڵێ، لە ئەم ڕۆژانەدا برادەری دەڕوا. پاشان دایە (ئاسکە)، کۆمەڵێ نامە و بڵاوکراوەی دامێ. بڵاوکراوەکە بە یادی جێژنی نەورۆزەوە نووسرابوو، هەردووکمان خوێندمانەوە و زۆرمان بە دڵبوو!

(شوان)ی هاوڕێم لە (ڕۆمانیا) گەڕابووەوە، جووتێ پێڵاوی بەدیاری بۆ (مەنسوور) هێنا بوو. ویستم، بە (ئازاد)دا بۆی بنێرم، کردیەپێی و گوتی: بەخوا چاکبوو، گرفتی پێڵاوم هەبوو، پڕ بەپێمە، تا ئەوی لەپێی دەکەم و لە ئەوێش، خۆم لەگەڵ (مەنسوور)دا ڕێکدەکەوم.

پێش ئەوەی بڕوا، گوتی: چاکەی تۆم زۆر بەسەرەوەیە. غەدرێکی گەورەم لێ کردی، گەر بمێنم، ڕۆژێ لە ڕۆژان دەسمبڕوا و یەکدی بیبینەوە، بە زیادەوە هەقت بۆ دەکەمەوە. منیش گوتم: خۆت دەزانی، من دڵم زۆر پاکە، جێی ڕقوکینەی تێدا نابێتەوە، هیچ شتێکیشم بەرانبەر کەس نییە، گەر من و تۆ لە یەکیش زویربووبین، لەسەر کاری ڕامیاری و کێشەی پارتایەتی بووە، ئەگینا هیچ شتێکی تاکەکەسی، لەنێوامانیدا ڕووی

نەداوە. تۆ هەر برا و هاوبیرەکەی جارانی منی و شانازیت پێوە دەکەم. بەڵام وا دەچیتە دەرەوە، بۆ ئاگاداریت، من کاریان لەگەڵ ناکەم، بەڵکوو وەک دۆستێ، یارمەتییاندەدەم.
گوتی: دوایی ئەوەش باسدەکەین و هەموو شتێ چاکدەبێ.
ئیدی بۆ دواجار، باوەشی بۆ کردمەوە و یەکدیمان ماچکرد. ماڵاوایکرد و هەر هێندەی گوت: تۆخوا ئاگات لە خۆت بێ، من کە لە نێوشار، لە دوورەوە تۆم دەبینی، لە ترساندا هەموو جەستەم موچرکی پێدادەهات و زیرەمکردبوو. چۆن دەوێری، کاریکەی و تا ئێستەش، هەر لە بندەسی ئەم خوێنڕێژانەدا ماویتەتەوە، ئاخر منالی شارەکەش دەزانێ، تۆ (کاژیک) بوویت و ئێستەش (پاسۆک)یت؟!

## دایە ئاسکە!

(ئاسکە قادر ئەحمەد)، خەڵکی نێوچەی (قەرەداغ) بوو، لە (سولەیمانی) شووی بە (شێخ کەریمی حەفید) کردبوو. ژنێکی زیرەک و بەڕێز، چاوقایم و سەرڕاست بوو. هەرچەندە ئەم ژنە قارەمانە ئازایەم دەبینی، ڕۆمانە بەناوبانگەکەی (دایک)ی (مەکسیم گۆرکی)م بیردەکەوتەوە! بەڕاستی ئەوەندەی ناسیبووم، هێندەم خۆشدەویست، لەگەڵ دایکە بەسۆزەکەی خۆمدا، جیام نەدەکردنەوە! ئاخر ژنی بە ئەو تەمەنەوە، سەرەڕای ئەوەی بە بێوەژنی ژیاوە، (6) کچ و کوڕێکی پەروەردە و گەورە کردبێ، هەمیشە دڵی لای جگەرگۆشەکانی بێ، ئامادەشبێ، سەری خۆی دانێ، بەڵام منالێکی پەنجەی گەرم نەبێ. جگە لە ئەوەی، لەسەر کوڕەکەی بگیرێ و دوورخرێتەوە، تووشی ئازار و داخێکی زۆر بێ، هێشتا هێندە ئازا و کوردپەروەر بێ، وەک تەتەرێ لەنێوان من و (مەنسوور)دا کاربکا، بە ئەو ڕۆژە پڕ مەترسییە، نامە و بڵاوکراوەکانی (پاسۆک) بێنێ و بەرێ، ئیدی چۆن جێگەی ڕێزێکی گەورە و شایستەی خۆشەویستییەکی بێ سنوور نییە؟!



(2006 – 1935 )

هەرگیز ئەوەم بیرناچێتەوە، کاتێ هێزەکانی پۆلیس، بە دوای دایک و خوشکەکانی (مەنسوور)دا دەگەڕێن و دەیانەوێ، لەبری کوڕەکەی بیانگرن. بەڵام خۆی و (3) کچی و کچە ساواکەی (مەنسوور)، لە ماڵی (شێخ قادر)ی شووبرای دەبن، پۆلیسەکان دەیانەوێ، ئەوان بگرن. ئەم ژنە گەورەیە دەڵێ: ئەوان نین و ئێمەین! یا سەربازەکان دەیانەوێ، تەنیا کچەکانی بگرن و خۆی بەرەڵلاکەن، کەچی قایل نابێ، وەک دایکێکی دڵسۆز دوایان دەکەوێ و ڕۆژی (17. 12. 1980) هەر پێنجیان دەگرن و بۆ گوندی (شەحات)ی سەر سنووری (سعوودیە) دووریاندەخەنەوە!

پاشان ڕۆژی (25. 3. 1982) ئازاددەکرێن و (مەنسوور) بە دوایاندا دەنێرێ، بۆئەوەی بیانبینێ، بە دایکی دەڵێ: بڕیارمداوە، واز لە شۆڕش بێنم و بەرەو دەرەوەی وڵات بڕۆم. دایکیشی دەڵێ: <u>بە خوا یەک گوللەت بە سەری دڵمەوە بنایە، هەر هێندەم پێ خۆشبوو!</u>

هەزار سڵاو لە گیانی پاکی ئەو ژنە کوردە مەزنە بێ!

## ڕقۆکینە و درۆیەکی سووک!

دوای ئەوەی ئەو دوو برادەرە چوونەدەرەوە، (شوان)ی هاوڕێم هات و گوتی: (فەرهاد عەبدولقادر) بۆ هێندە بە خراپە، باسی تۆ دەکا؟! منیش گوتم: باسی چی بۆ کردووی؟ گوتی: (حوسێن) لە کۆنفرانسەکەی ساڵی (1977)دا، خۆی هەڵبژاردووە و دەرنەچووە، ئێستەش هیچ نییە و خۆی بە (پاسۆک)دا هەڵواسیوە. منیش کۆڵی پێکەنیم و هیچ وەڵامم نەدایەوە. بەڵام لە دڵی خۆمدا، هەر لێکمدەدایەوە و دەمگوت: من لەگەڵ (ئازاد) و ئەواندا، چیم لەسەر ئەم پیاوە سپلەیە نەکرد، کەچی ئەویش لای خەڵک، ئەو درۆیانەدەکا. گەر یەک تۆز، ئازایەتی و پیاوەتی تێدا بووایە، ئەمەک و ڕەوشت بەرز بووایە، هەڵبەتە ئەو درۆ گەورەیەی نەدەکرد و لە پاشملە، قسەی نەدەکرد و هەرچییەکی هەبووایە، بەرەوڕوو بە خۆمی دەگوت!

## جێی داخبوو

هاوڕێیەکی خوێندنم هەبوو، لە تورکمانەکانی (کەرکووک) بوو، ناوی (فەخرەدین عەبدولقادر) بوو. لە پۆلی یەکەوە پێکەوەبووین، پێکیشەوە خوێندنمان تەواوکرد و هەر لە یەک بەشیشدا، پێکەوە مامۆستابووین. ڕۆژێ گوتی: باوکم ترومبێلێکی (نەسر)ی لە کۆمپانیای گشتی ترومبێل بۆ دەرچووە، هەمووی دووهەزار کیلۆمەتر ڕۆیشتووە، هەر بۆ تۆ جوانە، تازەیە و پاکە، گەر دەتەوێ، با تێلیفۆنی بۆ بکەم، نەیفرۆشێ. منیش کەمێ شۆفێریم دەزانی، هەوای ترومبێلکڕینیش لە کەللەی دابووم، ئەو چەن ساڵەی کاریشم کردبوو، هێندێ پارەم کۆکردبووەوە، ویستم، ترومبێلێکی هەرزان بکڕم. گوتم: زۆر باشە، بەڵام با بیبینم، ئەو کاتە قسەی لێ دەکەین.

کۆتایی مانگی مارسی ساڵی (**1978**) بوو، بەیانی من و (شوان) و (فەخرەدین)، چووین بۆ (کەرکووک)، نانی بەیانیمان لە ماڵی باوکی خوارد. هەر ترومبیلەکەم بینی، زۆرم بە دڵبوو. (شوان) سواریکردین و بەنێو (کەرکووک)دا، پیاسەیەکی زۆری پێ کردین و زۆر بە دڵیبوو، ئیدی یەکسەر کریمان و دەمەوئێوارە گەڕاینەوە.
کاتێ گەڕامەوە، دایکم گوتی: دایکی (مەنسوور)، دوو جار هاتووە و ئیشی پێت هەیە. منیش بەیانی زوو چووم. گوتی: لە کوێ بووی؟ گوتم: لە (کەرکووک) بووم. گوتی: دوێنێ (کەریمی شێخ سەلام)، پێشمەرگەیەکی بە دواتدا ناردبوو، دەبووایە، لەگەڵیدا بڕۆشتیتایە بۆ دەرەوە. منیش گوتم: لە کوێیە؟ گوتی: گەڕاوەتەوە. ئیدی هەرچەندە بیرم لێ دەکردەوە، هیچ پێویستی نەدەکرد، پێشمەرگە بە دوای مندا بنێرن. جگە لە ئەوەش، تازە (مەنسوور) نامەی ناردبوو، هیچی لە ئەو بارەیەوە نەنووسیبوو. منیش تەنیا هەر، پێوەندییەکی دۆستانەم، لەگەڵ (مەنسوور)دا هەبوو. نەک پێوەندیم لەگەڵ هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی (پاسۆک)دا هەبێ! ئەوەم زۆر پێ ناخۆشبوو، هەر کەسێ بە بیریدابێ، وەلامم بۆ بنێرێ، تا بمبینێ. لەبەرئەوە نامەیەکم بۆ (مەنسوور) نووسی و ئاگادارمکردەوە، کە جگە لە خۆت نامەوێ، کەسی دیکە ببینم و کەسیش بناسم، هەموو پێوەندییەکیشم تەنیاوتەنیا هەر دەبێ، لە ڕێی خاتوو (ئاسکە)وە بێ. ناوی نهێنی خۆشم گۆڕی و یەکسەر ناوی ملازم (جوامێر)م بە بیرداهات. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە، بە یادی ئەو ڕەوانشادەوە، ناوی نهێنیم (جوامێر) بوو.
بەلام زۆر بەداخەوە، من نەمزانی، ئەو ڕۆژە بە ئەو بەفر و سەرمایە، بە دەمانچەیەکی شڕەوە، (کەریم) لەگەڵ پێشمەرگەیەکدا، ئەو هەموو ڕێ دوورەی بڕیوە، تا درەنگاتێ چاوەڕێیکردووم! ئەگینا گەر لە (سولەیمانی) بوومایە، نەک لەبەرخاتری (پاسۆک)، بەڵکوو هەر لەبەرخاتری برایەتی و دۆستایەتی نێوانمان، دەچووم و سەرم لێ دەدا!

## دوا پێکگەیشتن

شەوێکی درەنگی هاوینی ساڵی (**1980**) بوو. لە ماڵەوە دانیشتبووم و دەمخوێندەوە. لەپڕ (شێخ نەورۆزی سەییدبرایمی حەفید) تێلیفۆنیکرد و گوتی: لەگەڵ (شێخ ناسر)دا لە ماڵەوە دانیشتووین و دەخۆینەوە، حەزدەکەین، بێی. منیش تەکسییەکم گرت و چووم. تاوێ دانیشتین و هێندێ قسەمانکرد، ئینجا (شێخ کاوە) زرەی لە تێلیفۆن هەڵسان و گوتی: چی دەکەن؟ (شێخ نەورۆز) گوتی: هەر خۆمانین و (شێخ حوسێن)یشمان لایە. گوتی: هەر ئێستە دێم، ئیشم بە (شێخ حوسێن) هەیە.

دوای ئەوەی سەرلەئێوارەی (**11**)ی مارسی ساڵی (**1974**)، لەگەڵ (شێخ ناسر)دا رامانکرد و ئەو شەوە، لەماڵی (شێخ لەتیف) لە (سیتەک) نووستین و بۆ بەیانی جیابووینەوە، ئیدی لە ئەو کاتەوە، قسەم لەگەڵ (کاوە) نەبوو، بە هیچ جۆری، هاتوچۆشمان نەبوو، زۆر جار لە (سولەیمانی) و (بەغدا)ش، بە دوایدا دەگەڕام، چنگم نەدەکەوت. زۆرم پێ خۆشبوو، کە ئێستە دی و دەیبینم. دوای ماوەیە، بەتەنیا خۆی بە ژووردا کرد، هەر هات و لە دوورەوە، باوەشی بە مندا کرد، ئەملاو ئەولای ماچکردم. کەوتە گلەیکردن و هەواڵپرسین. منیش گوتم: من لە بن عەرز بۆ تۆ دەگەڕام، هێشتا تۆ گلەیدەکەی؟! خێرا قسەکەی پێ بڕیم و گوتی: دوایی باسی هەموو شتێ دەکەین. ئیدی کەمێ دانیشتین و پاشان بلاوەمان لێ کرد. هەرچەندە (شێخ نەورەز) و (شێخ ناسر)، زۆریان لێ کردم، شەو لای ئەوان بمێنمەوە. بەڵام (کاوە) گوتی: من دەیبەمەوە و ئیشم پێی هەیە.

سەیرم لێهات، بە ئەو شەوە درەنگە، تەنیابوو، کەسی لەگەڵ نەبوو. سواری ترومبێلەکە بووم. پیاسەیەکی نێوشارمان کرد. یەکسەر باسی کورد و شۆڕشی دامەزراند. منیش خۆم لێ کەڕکرد و وەڵامم نەدایەوە.

ئیدی خۆی تێگەیشت و باسەکەی گۆڕی. گوتی: ماوەیەکە دیارنیت و لە ئەوەدەچی، لێم زویربوویی. ئیدی منیش، هەرچی لە دڵمدابوو، چەندین ساڵبوو، پۆنگی خواردبووەوە، هەموویم بۆ هەڵڕشت. سەبارەت ئەو جنێوانەی پێی دابووم و لە (بەغدا) بوختانی بۆ هەڵبەستبووم، گلەییەکی زۆرم لێ کرد و گوتم: تۆ خەڵکی دیکە، لەسەر کورد هێرش دەکەنە سەرت، دەرەقەتی دەمی ئەوان نایەی، داخی دڵی خۆت بە من دەڕێژی و قسەی ناشیرینم پێ دەڵێی، وا دەزانی، من رایاندەسپێرم، هەڵوێستیان بەرانبەر تۆ واخراپیی. ئەمەیە دەڵێ، بە کەر ناوێری، بە کورتان رەپەرەپێتی؟!

ئیدی چەن سوێندێکی بە گۆڕی باوکی و (شێخ مەحموود) خوارد، گوتی: هەرگیز شتی خراپم بە تۆ نەگوتووە، هەرچییەکیان بۆ گێراویتەتەوە، بۆیان هەڵبەستووم و ویستویانە، نێوانمان تێکدەن. پاشان تا بەرماڵەوەی گەیاندم و دابەزی، جارێکی دیکە، ئەملاو ئەولای ماچکردم و گوتی: تۆ هەر براکەی جارانمی، لەمەودوا دەبێ، سەرم لێ بدەی و ڕۆیشت. ئیدی هەر ئەو ڕۆیشتنە بوو، بۆ تاهەتایە هەر نەمدیەوە. چونکە دوای یەک دوو ڕۆژ چووەدەرەوە.

دوای دوو ڕۆژ، (عەبدوڵاناگرین) هات و گوتی: ڕاستە، (کاوەی شێخ لەتیف) پێوەندی بە (پاسۆکە)ەوە کردووە؟ گوتم: نەمبیستووە. گوتی: لەنێوخەڵکدا بلاوبووەتەوە. تا زووە وەلام بۆ هاوبیران بنێرە، کاری لەگەڵ نەکەن. چونکە ناپاکیکردووە و جاشبووە، جاشیش چۆن لەنێو پارتێکی نەتەوەییدا جێی دەبێتەوە؟!

هەرچەندە ئێمە لەگەڵ ماڵی (شێخ لەتیف)دا، زۆر تێکەڵاوبووین، لەگەڵ (کاوە)شدا، پێکەوە سەرمان لە هێلکە جوقابوو، بەڵام ئەو پیاوە، خزم و هاوڕێی دڵسۆزی نەبوو. بۆیە وای بەسەرهات. خۆشی تا سەر دۆستی ڕاستەقینەی کەس نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا خوا هەڵناگری، ڕێزی من و باوکمی زۆر دەگرت، زۆر جار هێندێ پرسوڕاشی پێ دەکردم، بەڵام هەر پرس و ڕابوو، بە قسەی کەسی نەدەکرد! ڕۆژێ لە ڕۆژانیش، بەرەوڕوو قسەیەکی خراپی پێ نەگوتووم و دڵی نەیەشاندووم. جا گەر لە پاشملەش، هەرچییەکی گوتبێ، گوێی لێ ناگرم و هیچ نییە!

**نامەیە لە لیبیاوە**

ڕۆژێ لە بەشی نێوخۆی کاروباری فەرمانبەرانی زانکۆوە، تێلێفۆنیان بۆ کردم و گوتیان: تا ئێرە وەرە. کە چووم، گوتیان: کەس لە (لیبیا) دەناسی؟ گوتم: نەخێر. گوتیان: نامەیەکت لە ئەوێوە بۆ هاتووە، منیش نامەکەم کردەوە، یەکسەر زانیم، (مەنسوور) نووسیویتی. چونکە ئەو لە (کوردستان)ەوە، بە کارێکی تایبەتی (پاسۆک)، چووبوو بۆ (نەمسا). لە فڕۆکەکەدا نامەیەکی بۆ من نووسیبوو، هەر لە ئەوێوە ڕەوانەیکردبوو. لەسەر زەرفەکە هەر ئێندە نووسرابوو: (عێراق، جامعە السلیمانیە، حسین عزیز). ئیدی ئەو پیاوە، چەن دێڕێکی بۆ نووسیبووم و بۆی ڕەوانەکردبووم. لە نامەکەدا (مەنسوور) نووسیبووی: لەگەڵ (پەخشان)دا دەچین بۆ لای چاوشین (مەبەستی سەروەتی هاوڕێم بوو). ماوەی سێ ساڵ دەبێ، نەمدیوە. زۆر بیرتدەکەم و زۆر بروام پێت هەیە. بەتەمای خوا، هەموو شتێ بەرەو باشی دەڕوا. منیش گوتم: ڕاستە، ناوی منی لەسەر نووسراوە، بەڵام نازانم، کێ نووسیویتی و هی من نییە. باشبوو، زۆری لەسەر نەڕۆیشتن و لە کۆڵمبوونەوە.
ئاخر من نازانم، بە چ مەبەستێ، ئەو نامەیەی بۆ من ناردبوو؟ ئایا نەیدەزانی، پێوەندی نێوان (عێراق) و (لیبیا) زۆر خراپە؟! تۆ بڵێی، مەبەستی ئەوەبووبێ، تووشی شتێکم بکا و بچمەدەرەوە؟! بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆشبوو، بە کارێکی دوژمنکارانەم زانی!
هاوینی ساڵی (**1980**)، کاتێ دوکتۆر (فەرهاد ئەحمەد ئەمین) لە (ئەڵمان)ەوە گەڕایەوە، بۆی گێڕامەوە و گوتی: (جەمال نەبەز) داوای لێ کردم، (مەنسوور) و (پەخشان)ی هاوسەری، لە ئەڵمانیای خۆرهەڵاتەوە بۆ (بەرلین) دەرکەم. لە ڕێ لەگەڵ (مەنسوور)دا، یەکدیمان ناسی، هەواڵی تۆی لێ پرسیم. گوتی: ئەو پیاوە، زۆر دەمیشرە، بێ ئەوەی من بناسێ، هەر لە خۆیەوە شتێ بۆ باسدەکردم!

## کۆچێکی ناوادە

بە شێوەیەکی بەردەوام، ئاگام لە (حەمەشەوقی) بوو. وەک کادیرێکی چالاکی بیری نەتەوەیی، ڕۆژبەڕۆژ لە پێشکەوتندا بوو. بەڵام لە ئەو ڕۆژەوە چووبووەدەرەوە، هیچ پێوەندییەکمان نەمابوو. لە ئەوەدەچوو، لێم زویربووبێ، چونکە پێش ئەوەی ڕابکا، من هەموو ڕاستییەکانم دەزانی و لێم شاردبووەوە. بڕواناکەم، (مەنسوور)یش هێندە سەرڕاستبووبێ، هەمووی لە (حەمەشەوقی) گەیاندبێ، کە لەسەر ناوای خۆی، هیچم بۆ باس نەکردووە. لە ئەوەدەچوو، (مەنسوور) ویستبێتی، (حەمەشەوقی) بۆ دەرەوە ڕاکێشێ، خۆی لە دەس گلەییەکانی ئەو ڕزگارکردبێ و وەک هەموو شتەکانی دیکە، خۆی دەربازکردبێ، هەموو گلەیی و ڕەخنەکەشی، لە ملی منەوە ئاڵاندبێ!

لە کۆتایی مانگی (**4**)دا، (حەمەشەوقی) لەگەڵ (کەریمی عەبووش)دا، بە سەردان هاتبوون بۆ (سولەیمانی)، چەن ڕۆژێ مابوونەوە، پاشان گەڕابوونەوە. لە گەڕانەوەدا، دەنگیان دەبڕێ و شوێنەواریان ونەبێ. (شێخ ناسر)م لە زانکۆ بینی، هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاندم. خێرا یەکێکیان بۆ (سیتەک) و (گەرەدێ) نارد. وەڵام هاتەوە، کە هەر زوو لە ئەو دوو گوندە دەرچوون. دوایی بەپەلە وەڵاممان بۆ سەرکردایەتی (پاسۆک) نارد، تا لە دوای گوندی (سیتەک) و (گەرەدێ)وە، هەواڵێکی بزانن.

ئەوەبوو، دوایی زانیمان، ڕۆژی (**5. 6. 1980**)، نزیک گوندێکی سەرسنووری نێوان هەردوو بەشەکەی خۆرهەڵات و باشووری (کوردستان)، فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەری ئێرانی، پڕبووە لە پاسدار، وایان زانیوە، ئەو دووانە پێشمەرگەی (حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)ن، بۆیان دابەزیوون و دەسڕێژیان لێ کردوون. هەرچەندە (حەمەشەوقی) بەرگریکردبوو، بەڵام بێ کەڵبوو، هەر زوو شەهیدبووبوو، (کەریم)یش بە بریندارێ گیرابوو و بردبوویان بۆ (تاران).

کاتێ ئەو هەواڵە ناخۆشەمان بیست، من و (شوان، برایم و وریا براخاس)، بەڕێی (ئەزمڕ)دا، بەرەو (پێنجوێن) سواربووین. تا هیچ نەبێ، بەرەو پیری تەرمەکەی بچین. بەڵام کاتێ گەیشتینە (ناوپارێز) و پرسیمان، گوتیان: دەمێکە بیرەدا تێپەڕبوون، لە ڕێی (شانەدەری – سەییدسادق)ەوە بردوویانەتەوە بۆ (سولەیمانی). ئیدی ئێمەش بە ئەو ڕێیەدا گەڕاینەوە و دوایانکەوتین.

بەڵام بە داخێکی زۆرەوە، کاتێ گەیشتین، تەنیا فریای ناشتنەکەی کەوتین. پرسەیەکی زۆر جەنجاڵی هەبوو، خەڵکێکی زۆر بۆی بە داخبوون، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ گیانبازی و مەرگدا هیچ ناکرێ و دەڵێی چی؟! سەرکردایەتی (پاسۆک)یش بەبۆنەی شەهیدبوونییەوە،

بڵاوکراوەیەکیان دەرکردبوو، لە زۆربەی نێوچەکانی (کوردستان)یش بڵاویانکردبووەوە. چەن پۆستەریکیشیان بۆ دروووستکردبوو، هاوبیرەکانی ڕێکخستنەکانی نێو شاریش، شەو بە دیوارەکانی شاری (سولەیمانی)دا هەڵیانواسیبوو!

بە ڕاستی، زۆرم پێ ناخۆشبوو، ویژدانم ئازاری دەدام و خۆم بە تاوانبار دەزانی، چونکە ڕاستیم لێ شاردبووەوە. بەڵام ئەوە داواکاری (مەنسوور) بوو، وای دەزانی، گەر (حەمەشەوقی) یا من بچینەدەرەوە، ئیدی بارەتالەبارە خوارەکەی (پاسۆک) ڕاستدەبێتەوە و پێشدەکەوێ. ئەو، ئەوە تێ نەدەگەیی، کە ئاوەکەی (پاسۆک) هەر لە سەرچاوەوە لێڵ بووە، بۆیە بە هیچ شێوەیە چاک نابێ و سەرپێی خۆی ناگەوێ!



(1980 – 1952 )

**کۆمەڵێ نامەی سەیر**

دوای ئەوەی (ئازاد)، لە دەرەوە شوێنپێی خۆی قایمکرد و جێگیربوو، هەستیکرد، کەموکوورییەکی زۆر هەیە، لەبەرئەوە ڕووی دەمی، لە کۆنە (کاژیک)ەکان و هەڵگرانی بیری نەتەوەیی کرد. ویستی، کۆمەڵێ خوێندەوار، ڕووناکبیر و نووسەر، لە دەوری (پاسۆک) کۆکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستەش، کۆمەڵێ نامەی بۆ چەن کوردپەروەرێکی وەک (فەرەیدوون عەلی ئەمین، شێرکۆ بێکەس، حەمەی حەمەباقی، ڕەووف بێگەرد، سەباح غالب، ناسر حەقید و برایمی حەمەعەلی) نووسی و بۆی ناردم، تا بیانگەیەنم. نامەکان هەموویان بە کراوەیی هاتبوون. نامەیەکی درێژیشی بۆ خۆم نووسیبوو، داوای لێ کردبووم، نامەکان بخوێنمەوە و لەسەر نێوەرۆکی نامەکانیش، بیروڕای تایبەتی خۆمی بۆ بنووسم. پاشان بیانگەیەنم، قسەیان لەگەڵ بکەم و هانیانبدەم، کار لەگەڵ (پاسۆک)دا بکەن.

منیش تێدا مابووم و هەر بیرم لێ دەکردەوە، نەمدەزانی، چی بکەم. چونکە تا ئەو کاتە، جگە لە پێوەندی دۆستایەتی، هیچ جۆرە پێوەندییەکی دیکەم، بە (پاسۆک)ەوە نەبوو! جگە لە ئەوەی پێم وابوو، ئەم پیاوە لەسەر ئەندێشە دەژی، ئەگینا چۆن بە ئەو شێوەیە، یەکسەر داوا لە ئەو جۆرە کەسانە دەکا، کار لەگەڵ (پاسۆک) بکەن؟

ناچار بڕیارمدا، نامەکان بگەیەنم، بەڵام هیچ جۆرە دەمەتەقێیەک، لەسەر ناوەڕۆکی نامەکان نەکەم، بەڵکوو وا خۆم پیشاندەم، کە لەگەڵ (پاسۆک)دا کارناکەم و تەنیا هەر ئەو نامانەیان، بۆ من ناردووە، تا بیانگەیەنم!

(حەمەی حەمەباقی)، تازە لە گرتووخانە بەربووبوو، وەک نیشتمانپەروەر و نووسەری، ناوبانگێکی جوان و خاوێنی هەبوو. لەنێوخەڵکدا خۆشەویستبوو، زۆر هاوڕێشمبوو، کاتی خۆشی لە (پارتی)دا، ماوەیە لێپرسراوی بووم. بەڵام کاتی نامەکەم بۆ برد، ڕازی نەبوو، کارمان لەگەڵ بکا!

ئەو کەسانەی لە (سولەیمانی)ش بوون و لەبەردەسدا بوون، هەر زوو نامەکانم بۆ بردن. بەڵام نەک هەر ئامادە نەبوون، هاوکاری لەگەڵ (پاسۆک)دا بکەن، بەڵکوو تەنانەت کەسیشیان، وەڵامیان نەدایەوە!

بەڵام کاتی نامەکەی (برایم)م خوێندەوە، زۆرم پێ ناخۆشبوو، چونکە ساڵی **(1976)**، هەر (ئازاد) خۆی بوو، (برایم)ی لە (پاسۆک) دوورخستەوە و پاڵییوەنا، پەنا بۆ (کۆمەڵە) بەرێ! سووریش دەمزانی، (برایم) لە کۆتایی ساڵی **(1977)**وە، لەگەڵ (کۆمەڵە)دا کاردەکا، کادیرێکی چالاکیانە و بیروباوەڕیشی، وەک جاران نەماوە و مارکسییانە بیردەکاتەوە. بەڵام نامەکەم هەر بۆ برد. کاتی نامەکەی خوێندەوە، پێکەنی و گوتی: ئەمە یەکەمین جار نییە، (ئازاد) نامەم بۆ دەنێری. پێشتریش نامەیەکی دیکەی، بە (ئومێدی شێخ جەلال)دا بۆ ناردم و وەڵاممدایەوە، کە من بڕوام بە باوەڕی پێشووی خۆم نەماوە. داوای لێبووردن دەکەم و ناتوانم، کارتان لەگەڵ بکەم. بەڕاستی، کە گوێم لە ئەو قسانەی (برایم) بوو، لە شوێنی خۆم تەرقیبوومەوە و ئارەقەی شەرمەزاریم دەڕشت!

نازانم، دوای ئەوەی (ئازاد)، ساڵی **(1976)**، ئەو هەڵوێستە خراپەی، بەرانبەر (برایم) نواند، ئیدی بە چ ڕوویەکەوە، ئەو قسانەی بۆ نووسیبوو؟! چۆن توانی، بۆی بنووسی: گەر بڕیارتدا، کارمان لەگەڵ بکەی، داوات لێ دەکەم، هەر لەنێو (کۆمەڵە)دا بمێنیتەوە، لە دەنگوباس و پلانەکانیان ئاگادارمانکەیتەوە؟! ئەو قسانە لە ئەوەدەچوون، (ئازاد) بیەوێ، (برایم) وەک سیخوڕێکی (پاسۆک)، دژی ڕێکخستنەکەی خۆی هەڵسووڕێنێ، ئەگینا هیچ حسێبێکی دیکەی بۆ نەکردبوو! منیش بە عەرەبی، هەر ئەوەندەم پێ گوت: (وما علی الرسول الا البلاغ!)

## فەرەیدوون عەلی ئەمین

(شوان) و (سەروەر عیزەت) لە (بەغدا) بوون. من و (کاوس) و (نیهاد)یش ڕێککەوتین، سەردانێکی (بەغدا) بکەین و کاتێکی خۆش، لەگەڵ هاوڕێکانماندا بەسەربەرین. هەر لەوێشەوە، سەری لە هاوڕێ گیراوەکانی (ئەبوغرێب) بدەین. (سەردار)ی برای (سەروەت)یش لەگەڵمان هات و بە ترومبێلەکەی ئەو ڕۆیشتین. ڕۆژی هەینی بوو، چووم بۆ (ئەبوغرێب) و چاوم بە هاوڕێم (سەلامی مەلاعەبدولڕەحمان) کەوت و ماوەیە، لای مامەوە.

مامۆستا (فەرەیدوون عەلی ئەمین)، لە ساڵی (**1970**)وە، سەرەتا لە خوارووی (عێراق) و پاشان لە (بەغدا) دەژیا. لەبەرئەوەی یەکدیمان نەدەناسی، ناچاربووم، لەگەڵ (نیهاد)ی ئامۆزای، سەری لێ بدەم، تا بەهۆی ئەوەوە، خۆمی پێ بناسێنم و بڕوام پێ بکا! بەڵام هیچ شتێکم، بە (نیهاد) نەگوتبوو.

ئێوارە (نیهاد)، تێلیفۆنی بۆ مامۆستا کرد و چووین بۆ لای بۆماڵەوە. ماڵەکیان لە (عامریە) بوو، لە ئێمەوە زۆر دووربوو. پێشوازییەکی زۆر گەرمی لێ کردین و دانیشتین. پاشان سەبارەت بارودۆخی (کوردستان)، جەنگی نێوان (عێراق) و (ئێران)، گەلێ قسەمان بەبادا. دوایی کەمێ باسی وێژە و چاپەمەنی کوردیشمان کرد.

(نیهاد) گوتی: من تا دەرەوە دەچم و جگەرەیەک دەکێشم. ئیدی منیش یەکسەر، هەڵم قوستەوە و نامەکەم دایە. گوتی: (نیهاد) دەزانێ؟ گوتم: نەخێر. گوتی: باشتروایە، کەس نەزانێ. ئەو شەوە لە ئەوە زیاتر ماوەمان نەبوو، قسەبکەین. بەڵام ژمارەی تێلیفۆنەکەیم لێ وەرگرت. ماوەیەکی دیکە دانیشتین و دوایی ماڵاوایمان لێ کرد و گەڕاینەوە. کاتێ گەڕاینەوە بۆ (سولەیمانی)، سەبارەت بە سەردانەکەم بۆ (بەغدا) و باری سەرنجەکانی خۆم، نامەیەکم بۆ (ئازاد) نووسی. باسێکی کورتی ژیان و کاری ئەو کاتەی، مامۆستا و خێزانەکەیم بۆ کرد. نووسیبووم: بڕواناکەم، هەروا بە ئاسانی، واز لە ئەو ژیانە بێنێ و کارتان لەگەڵ بکا. دوای ماوەیە (ئازاد) نامەیەکی دیکەی، بۆ مامۆستا (فەرەیدوون) ناردەوە. ئەم جارەیان ناچاربووم، خۆم بەتەنیا بچم، تا کاتمان هەبێ و بە درێژی، باسی هەموو شتێ بکەین.

دووەمین سەردانم، لە ماڵی خۆیان دووقۆڵی پێکەوە دانیشتین. سەبارەت بە (کاژیک)، شۆڕشی کورد، پێوەندی نێوان خۆی و (مەلامستەفا)، گەلێ شتی گرنگی بۆ باسکردم. گوتی: سەرەتای شۆڕشبوو، لەگەڵ (مام جەلال، حیلمی عەلی شەریف و نەوشیراون مستەفا)، لە (چەمی ڕێزان) بووین. ئەو کاتە ئەوان هەموویان (پارتی) و منیش (کاژیک) بووم. بەڵام بیروباوەڕی (نەوشیروان)، لە هەموویان کوردانەتر و لە ئێمەوە نزیکتربوو. قسەم لەگەڵ کرد و گوتی: تازە من بەڵێنم بە (برایم ئەحمەد) و سەرکردایەتی (پارتی) داوە، کاریان لەگەڵ بکەم. ئەگینا بیرەکەی ئێوە، بە خراپ نازانم.

پاشان مامۆستا، زۆر بێزاری خۆی، لە دەس بنەماڵەی (بارزانی)، سەرانی (پارتی)، هێندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی کۆنی (کاژیک)، وەک (شێخ موحەممەدی هەرسین، حەمەی عەزیز و جەمال نەبەز) دەربڕی. گوتی: ڕۆژێ لەگەڵ (مەلامستەفا) دانیشتبووین، باسی شۆڕشی کورد و ڕەوشی (کوردستان)مان دەکرد. داوام لێ کرد، وەک چۆن ڕێی هەردوو باڵەکەی (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)ی داوە، بنکە و بارەگەی خۆیان، لە (کوردستان) دامەزرێنن، هەر بە ئەو شێوەیەش، ماوە بە ئێمەی نەتەوەییش بدا، لە ناوچەیەکی ئازادکراوی (کوردستان)، بەئاشکرا بارەگەی (کاژیک) بکەینەوە. بەڵام (مەلامستەفا) هیچی نەگوت و بەڵێنی نەدا. کەچی دوای چەن ڕۆژێ، (دوکتور مەحموود، سامی عەبدولرەحمان و نووری شاوەیس) هاتن و پێیان گوتم: (مەلامستەفا) لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا گوتی: (فەرەیدوون عەلی ئەمین) داوای لێ کردووم، واز لە (پارتی) بێنم و بیم بە سکرتێری (کاژیک). منیش گوتم: جا شتی وا بووە؟! گوتی: نەخێر. پێم گوتن، ئەوە (مەلامستەفا)، هەڕەشەی لە ئێوە کردووە، بۆیە ئەو قسەیەی، بە ناوی منەوە کردووە!
سەبارەت (حەمەی عەزیز) گوتی: کاتێ جێی خۆی لە شۆڕشدا کردەوە و شوێنپێی خۆی، لای بنەماڵەی (بارزانی) قایمکرد، وردەوردە، لە ئێمە دوورکەوتەوە. تا وای لێهات، داوای لێ کردین، بڵاوکراوەیەکی لەسەر دەرکەین و بە فەرمی، لە (کاژیک) دەریکەین. منیش پێم گوت: (**50**) هەزار دینارمان بەرێ، بڵاوکراوەکەت لەسەر دەردەکەین. ئەویش گوتی: (**50**) هەزار بۆ؟! گوتم: لەبەرئەوەی خێزانی شەهیدمان بەسەرداکەوتووە، پێشمەرگەمان هەیە و نەبێ، مانگانە یارمەتییانبدەین. (کاژیک)یش توانا و پارەی نییە. بەڵام تۆ بەهۆی شۆڕشەوە، پارەیەکی زۆرت دەسکەوتووە!
گوتی: هێندە لە ئەو شۆڕشە بێسەروبەرە بێزاربووم، ڕۆژم بەپەنجە دەبژارد، تا لایە بە لایەکدا بکەوێ، گفتوگۆیەک لەنێوان (بارزانی) و دەوڵەتی (عێراق)دا بێ، بگەڕێمەوە و بە دەردی خۆمەوە دانیشم. ویژدانیشم قەبووڵی نەدەکرد، وەک مامۆستا (هەردی)، چۆن بێزاردەبوو، دەگەڕایەوە و دادەنیشت، لە کاتی جەنگدا بگەڕێمەوە و پەنا بۆ کۆمەڵەکەی (برایم ئەحمەد) یا دەسەڵاتدارانی (عێراق) بەرم. باشبوو، ڕێککەوتننامەی (**11**)ی مارسی بەسەرداهات، ئەو گرفتەی بۆ چارەسەرکردم و هەر زوو گەڕامەوە. ئیدی تۆبەمکرد و گوتم: جارێکی دیکە لە شۆڕشی (بارزانی)دا، بەشداری ناکەم.
گوتی: دوای (**11. 3. 1974**)یش، جەنگ لە (کوردستان) دەسپێکردەوە، هەر لە (بەغدا) مامەوە و نەچووومەدەرەوە. هەرچەندە هێندێ لێپرسراوی شۆڕش، نامەیان بۆ ناردم و گلەییان لێ کردبووم، کە لە (بەغدا) ماومەتەوە، بەڵام من وەڵامم نەدانەوە!

دوای ئەوەی گەڕاشمەوە، منیش وەک ئەو هەموو خەڵکە ئاساییە، وەک مامۆستایەکی سەرەتایی دامەزرامەوە و بۆ (ناسریە) هەڵیاندام. لە کاتێکدا دوای ڕێککەوتنەکە، لێپرسراوانی شۆڕش و (پارتی)، لەسەر کورسی و پلەوپایە، شەڕیانبوو! هەر یەکێکیان پلەوپایەی باشیان وەرگرت و هەمووشیان، لەسەرحسابی کورد، دەوڵەمەندبوون. کەچی منیش سەرەڕای ئەوەی، (10) ساڵ لە شۆڕشی کوردا بەشداریمکرد و لە دەرەوەبووم، ئەوە هەموو پاداشتەکەیان بوو، تەنانەت لە (کوردستان)یش دایان نەنامەوە!
ماوەی (2) ساڵی، لە (ناسریە) رامکێشا. تا ڕۆژی (سامی)، بەپێی ئەو دۆستایەتییەی لەنێوانماندا بوو، هەوڵی بۆ دام و لە (بەغدا)، لە فەرمانگەی (دراسات کوردیە) لای خۆی، لە شالیارگە دایمەزراندم، لەدەس ئوتێل و گەرمای (ناسریە) رزگارمبوو!
سەبارەت (کاژیک)یش گوتی: بەداخەوە تێکیاندا. ئەگینا باشترین ڕێکخستن و ڕێکخراوی نەتەوەیی بوو. چونکە هەر زوو (جەمال نەبەز، عەبدوڵلا جەوهەر و ئەحمەد هەردی)، لەنێوخۆیاندا تێکچوون. (عەبدوڵلا جەوهەر) وازیهێنا. (جەمال نەبەز)یش بە ناوی خوێندنەوە، (کوردستان)ی بەجێهێشت و لە (ئەڵمانیا) گیرسایەوە. (نەبەز) کادیرێکی زیرەک و بە توانایە، خوا هەر بۆ نووسینی ئەفراندووە. بەڵام تا سەر لەگەڵ کەس هەڵ ناکا!
دوای ساڵی (1970)، هەوڵێکی زۆرم دا، سەرلەنوێ ڕێکخستنی (کاژیک) نوێکەمەوە، تەکانێکی پێ بدەم و هێندێ گۆڕانکاریش، لە بیر و بۆچوونەکانیدا بکەم. دان بە هەڵەکانی پێشوودا بنێم و لەگەڵ سەردەمەکەدا بیگونجێنم. بەڵام هێندێ لە ئەندامانی (کاژیک)، بە تایبەتی (شێخ موحەممەدی هەرسین) و (حەمەی عەزیز)، دژایەتییەکی زۆریان کردم. ئەوان لە ئەو بڕوایەدا بوون و دەیانگوت: لە ئەم کاتەدا نابێ، بەناوی (کاژیک)ەوە کاربکەین، بەڵکوو دەبێ، لەپێناوی بەهێزکردن و پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕشدا، هەموو توانایەکمان یەکخەین، لە دەوری بنەماڵەی (بارزانی) کۆبینەوە. منیش دەمبینی، بڕوام بە ئەو قسانە نەمابوو. لەبەرئەوە ساڵی (1972)، بەتەواوی وازم لە (کاژیک) هێنا.
سەبارەت ئەو دوو نامەیەی بۆم هێنابوو، گوتی: تۆ دەزانی، چییان بۆ نووسیووم؟ گوتم: بەڵێ. پێش ئەوەی بۆت بێنم، هەر لە (سولەیمانی) هەردووکیانم خوێندەوە. گوتی: ئەو برادەرانە، سوور دەیانزانی، من لە ساڵی (1972)وەوە، وازم لە (کاژیک) هێناوە، بەتایبەتی (شێرکۆی هەژار)، لە منەوە نزیکبوو، نازانم، بۆچی لە بڵاوکراوەکەی ساڵی (1975)ی (پێنجوێن)دا، ناوی منیان هێناوە و لە (کاژیک) دەریانکردووم؟!
ئیدی منیش هەموو شتێکم، بە دوورودرێژی بۆ ڕوونکردەوە و تێمگەیاند، کە ئەوە هەڵەیەکی گەورە بوو، گەر خۆشیان دانیان، بە ئەو هەڵەیەدا نەنایە، هەڵبەتە ئێستە،

داوایان لە بەڕێزت نەدەکرد و بۆیان نەدەنووسی: (سەرکردایەتیمان بە تێکڕای دەنگ، بڕیاریداوە، داوا لە بەڕێزتان بکەین، کارمان لەگەڵ بکەی. وەک برایەکی گەورە و سکرتێری گشتی پاسۆک، باڵی میهرەبانیمان بەسەردا بکێشی.)

گوتی: ڕاستە. بەڵام هەر هێندەیان پێ بڵێ: (فەرەیدوون) ئایەتە سەر خوانی حازرا من تازە پارتایەتی ناکەم و هەموو ژیانی خۆم، بۆ کۆڵینەوە و نووسین لەسەر تیۆری بیری نەتەوەیی تەرخاندەکەم. هەرچەندە من زۆری لەگەڵ خەریکبووم، چونکە دەمزانی، لەنێو خەڵکدا، چەن ڕێزی هەیە، چەن ڕووناکبیر و بەتوانایە، چەن کوردێکی نیشتمانپەروەر و بەهەڵوێستە. بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو.

لە دوایشدا، هەر هێندەی گوت: گەر من کاریان لەگەڵ بکەم، تۆ چی دەکەی؟ گوتم: واز لە هەموو شتێ دێنم و دوادەکەوم. ئیدی هیچ قسەی نەکرد و پێش ئەوەی لە یەکدی جیابینەوە، گوتی: تۆ نیازی چیت هەیە؟! گوتم: سەری لە دەرەوەی وڵات دەدەم و (جەمال نەبەز) دەبینم. گوتی: گەر ڕۆیشتی، بڕوانامەکەت لەگەڵ خۆت بەرە، ئەوەک پێویستت پێی بێ!



( 1933 – 1991

سەبارەت بە ئەم باسە، بۆ زانیاری زیاتر، تەماشای گۆتاری (بۆ مامۆستایەکی کورد و مەردی نیشتمانپەروەر) لە پەرتووکی (باران ڕەنگاورەنگ) ل (394-405)، هەروەها لە پەرتووکی (هێندێ بابەتی زمانەوانیی و وێژەیی)، لاپەرە (56 – 77)ی ساڵی (2015) بکە.

جارێکی دیکە، لە (سولەیمانیی) لە پرسەی خزمێکیدا بینیمەوە. کاتێ ئێوارە هەستان، هەر هێندە توانیم، بە ناوی سەرەخۆشییەوە پێم گوت: هاوبیران ڕێز و سڵاویان هەیە، ئێستەش هەر لەسەر پێشنیازە کۆنەکەی خۆیان سوورن، چی دەڵێی؟ گوتی: کاتێ خۆی، لە ئەو بارەیەوە قسمان زۆر کرد. ئیدی تێگەیشتم، بە هیچ جۆری ئامادە نییە، کار لەگەڵ (پاسۆک)دا بکا!

## نەخۆشیی

لە مانگی (8)ی (1980)دا، تووشی نەخۆشی ناسۆر بووم و ئارامی لێ بڕیبووم. بە شێوەیە نەمدەتوانی، دانیشم و ترومبێل لێخوڕم. بە شێوەیەکی بەردەوامیش، ئاوی پیسی لەبەرنەڕۆی. چەندین دەرمانم بەکارهێنا، وشکی نەکرد. ناچاربووم، پەنا بۆ دوکتۆر (نەوزاد عەتار) بەرم. ئەوەبوو، هەر لە نۆرینگە تایبەتەکەی خۆی، نەشتەرگەری بۆ کردم، بۆی تەقاندم و تیماریکرد. ماوەیە لە ماڵەوە کەوتم، بەڵام هێشتا هەر، ئاوی لەبەردەڕۆی و برینەکە خۆش نەبووبووەوە!

## جەنگی نێوان عێراق و ئێران

ڕۆژی (22. 9. 1980)، سوپا دڕندەکەی (بەعس) لە خوارووی (عێراق)ەوە، لەناکاو پەلاماری خاکی (ئێران)ی دا و لە ماوەیەکی کەمدا، بەشێکی زۆری لە ناوچە جیاوازەکانی خاکی (ئێران) داگیرکرد. لە ئەنجامدا، جەنگ لەنێوان هەردوولا، بە قووڵایی (150) کم و بە درێژایی (1000)کم، دەستپێکرد و پەتەواوی گەرمبوو.

(بەعس) هێزێکی زۆری، لە (کوردستان) کێشایەوە و ڕەوانەی بەرەکانی جەنگی کردن. خەڵکێکی زۆری، ڕاپێچی ڕاژەی سەربازی کرد، لە مەڵبەندە جیاوازەکانی (عێراق)، مەشقی پێ دەکردن و پاشان بۆ بەرەکانی جەنگ ڕەوانەیدەکردن. هێندێکیش نەدەچوون و هەڵدەهاتن. هێزی پێشمەرگەی (کوردستان)یش، وردەوردە دەبوژایەوە و زیادیدەکرد. کەم ڕۆژ هەبوو، فڕۆکە جەنگییە مەرگهێنەکانی (ئێران)، بەسەر شاری (سولەیمانی)دا نەسووڕێنەوە، بۆمبارانی کارگە و دەوروپشتی شارەکە نەکەن. هەر زوو کارگەکانی چیمەنتۆ، شەکر و ئالیکیان وێرانکرد و لە کاریانخستن. خەڵکی شارەکە ترسێکی زۆریان لێ نیشتبوو، کونەفڕۆکە و ژێرزەمینی ماڵان بەرنەدەکەوتن. لە ترساندا خۆیان دەشاردەوە.
لە ئەو ماوەیەدا، نرخی خواردەمەنی و کەلوپەلە پێویستەکانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵک، ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، گرانتردەبوو. خەڵکەکە تووشی نیگەرانییەکی زۆر و تەنگەتاو بووبوون. لەنێوشارەکاندا، بەشەو کارەبا نەبوو. ئاویش زووزوو دەبڕا. ئەوەی لای من جێی سەرسووڕمانبوو، ئەوەبوو، زۆربەی کات لێکدەدایەوە و دەمگوت: هەڵگیرساندنی

جەنگ، پتر لە دەوڵەتە هەژار و برسییەکان دەوەشێتەوە، دەوڵەتێکی دەوڵەمەندی تێروپڕی خاوەن توانای پارە و نەوتی وەک (عێراق)، بۆچی پەلاماری (ئێران)ی داوە، ئەو جەنگە نارەوایەی بەرپاکردووە، سەری لە خۆی و گەلانی (عێراق)یش تێکداوە؟!

### چوار چۆلەکەی بەهەشت

بەعسییەکان وەک شێتیان لێهاتبوو، لەلایەکەوە لەگەل (ئێران)، سەرقاڵی جەنگە چەپەلە رەشەکەیان بوون، لەلایەکی دیکەشەوە، بەدەس پێشمەرگەوە وڕببووبوون، لەتاواندا دەسیان لە منال، ژن، پیر و پەککەوتەکانی خەلکی (کوردستان) نەدەپاراست، هەرچی لەگەل (بەعس) نەبووایە، ئەوان بە دوژمنی خۆیان دەزانی.
رۆژی (14. 8. 1980) بوو، چەن مێردمناڵێکی خوێندکاری خوێندنگەی ناوەندییان گرت، تەمەنی هیچ یەکێکیان، لە (14) سال تێپەری نەدەکرد، دوای لێدان و ئازارێکی زۆر، بە شێوەیەکی کاتی بەریاندان، یەکی لە ئەو منالانە، (شادمان)ی پورە (مەلیح)ی خێزانی (شێخ عوسمان باراوی) بوو، ئەو کاتە مالیان لە (سەرچنار) بوو، کاتی بەربوو، سەرم لێدا، ئەو منالە جوانە بەسزمانە، هەر هاواری کومی دەکرد و دەیگوت: کارەبایان لێداوم!



شادمان شێخ عوسمان باراوی ( **1966 – 1980** )

دوای ماوەیە، دیسانەوە گرتیاننەوە، رەوانەی دادگەی تایبەتی (کەرکووک)یان کردن و رۆژی (**15. 9. 1980**) شەهیدبوون، ماوەیەکی پێچوو، بە هیچ شێوەیە دەنگیان نەبوو، ئەو ئێوارەیە من لە مالەوە نووستبووم، کاتی هەستام، زەنگێکیان بۆ لێدام و گوتیان: (شادمان) شەهیدبووە، ئیدی یەکسەر خۆم کۆکردەوە و هەر بە ئەو شەوە، بە ترومبێلەکەی خۆم، لەگەل (بەرزان)ی برام و مامە (سالح)مدا، چووین بۆ (کەرکووک)، درەنگانی گەیشتین، خزمان و کەسوکاری شەهیدەکانی دیکەش، لە ئەوێ ئامادەبوون، تا بەیانی لەبەردەم دەرگەی نەخۆشخانەکەدا چاوەرێمانکرد.

بەیانی دەرگەی نەخۆشخانە کرایەوە، هەموو خەڵکەکە بەپەرۆشەوە، بەرەو ژووری تەرمەکان ڕۆیشتن. ژوورەکە فریزەرێکی گەورەبوو، تەرمی منداڵەکانیان تیدا هەڵگرتبوو، تا خاوەنەکانیان دێن و دەیانبەنەوە، بۆئەوەی بۆن نەکەن.

بڕیارماندا، لە هەر خێزانی شەهیدێ، دوو کەس بچنەژوورەوە. من و مامە (بەکر)م چووین، بۆ (شادمان) بگەڕێین. بەڵام کاتێ چووینەژوورەوە، چوار جەستەی بەستووی بێگیان کەوتبوون، یەک پارچە سووتابوون، ڕەشڕەش بووبوون، بە هیچ شیوەیە کەس نەیدەناسینەوە. ئێمەش نەماندەزانی، چی بکەین. هەر کەسە چۆن تەرمی ڕۆڵنشادی خۆی بناسێتەوە. تا مامم هاوارێکرد و گوتی: ئێمە هیچ چارێکمان نییە، با لە ئەوە پتر، خۆمان دوانەخەین، ئەم شەهیدانەش لێرەدا بێکەس بمێننەوە، هەر کەسێ تەرمی شەهیدێ بپێچێتەوە، بیخاتە تابووتەکەوە و هەڵیگرێ. لە (سولەیمانی) هەموویان پێکەوە دەنێژین.

بەڕاستی، کارەساتێکی ناخۆشبوو، ئەو منداڵە جوانە خاوێنە بێتاوانانە، ئەو چوار چۆلەکەی بەهەشتە، بە ئەو شێوەیە گیان لەدەسبدەن و کەسوکاریشیان، تەرمەکانیان نەناسنەوە. ڕۆژی (**24 9 1980**) بوو، تەرمی هەر چوار شەهیدەکەمان وەرگرتەوە و بەرەو (سولەیمانی) گەڕاینەوە.

دوای ئەوەی گەیشتینەوە، لە مزگەوتەکەی (سەرچنار) تەرمەکانمان دانا. کەسوکاری شەهیدەکان هاتن و تەماشای تەرمەکانیان کرد، کەسیان بەتەواوی، تەرمی شەهیدی خۆیان نەناسییەوە. هەر چوار باوک و دایکەکە، سەرو شەهیدیان لێ هەڵبژارد و وەک جەرگی سووتاوی خۆیان، لە ئامێزیانگرتن. لە ئەوە زیاتر، هیچ جۆرە چارێکی دیکە نەبوو. هەر خێزانێکی کوڕە شەهیدی دەبووایە، تەرمی شەهیدێکی بۆ خۆی هەڵبژاردایە و چاڵێکی سەربەخۆی بۆ هەڵکەندایە، تا جگەرگۆشە خێرنەدیوە جوانەمەرگەکەیان، گۆڕێکی دیاریکراوی هەبێ، سەری لێ بدەن و کەمێ سەبووریبیان، بە گۆڕ و ناوی سەر کێلەکانیان بێ!

لە ژیانی خۆمدا، گەلێ جار بەسەرهاتی مردنی جۆراوجۆری خەڵکم دیوە. گەلێ باوکی کوڕ کوژراوم دیوە، جەرگیان سووتاوە و ڕۆڵەکانیان لەدەسداوە. بەڵام هەرگیز پیاوی وا خۆڕاگر، باوکی وا بەهێز و ئازای، وەک (شێخ عوسمان باراوی)م نەدیوە. هێندە جەرگی قایم و وورەی بەرزبێ. چونکە کاتێ هێنایان بۆ مزگەوتەکە و سەری تەرمەکانی لابرد، بێ ئەوەی یەک دڵۆپ فرمێسک، لە چاوانی بڕژێ، وەک باوکی منداڵەکانی دیکە بگری و بقیژێنێ، هەر هێندە سەیرێکی کردن و گوتی: کاتێ هاتنەسەرمان و (شادە)یان برد، بەڵێنیاندامێ و گوتیان: هیچی لەسەر نییە، دوو ڕۆژی دیکە، بۆتان دێنینەوە. ئاخر بە ئەو شیوەیە بردیان و ئاواش بۆیان هێنامەوە؟! ئیدی کە خەڵکەکە، چاویان بە تەرمی سووتاوی ئەو منداڵانە کەوت، کاکە (شێخ عوسمان)یش ئەو قسانەیکرد، کەس نەبوو، لە ئەو ناوەدا خۆی بۆ بگیرێ!

دوایی چۆنیتی ڕووداوەکەیان بۆ باسکردین و گوتیان: دوای ئەوەی لە (کەرکووک) دادگایکران، بەتاوانی ئەوەی گوایە، لە قوتابخانە جنێویان بە (سەددام) داوە و تفیان لە وێنەکەی کردووە، هەریەکێکیان ماوەی (6) ساڵ، بڕیاری بەندکردنیان بەسەردا سەپاندوون. پاشان ویستبوویان، ڕەوانەی گرتووخانەی (ئەبوغرێب)یان کەن، دوای کەمێ ڕۆیشتن، لە (کەرکووک) دەردەچن، لە ڕێگە لە نزیک پردێکەوە، ترومبیلەکەیان لەگەڵ لۆرییەکدا تامپۆندەکا، ترومبیلی پۆلیسەکان دەکەوێتەخوارەوە و گڕی تێبەردەبێ. ئیدی هەرچی تێدادەبێ: شۆفێر، پۆلیسەکان، مفەوەز و هەر چوار منداڵەکەش، هەموویان دەسووتێن و کەسیان لێ دەرناچێ!

ئاخر هەموومان، ترومبیلی گواستنەوەی گرتووخانەمان دیوە و دەزانین، چەن توندوتۆڵ درووستکراوە و چۆنیش دادەخرێ. هەر چوار منداڵە گیراوەکەشیان، لە دواوە لە قەفەزێکی ئاسنیندا دانابوو، دەسیشیان بەکەلەپچە بەستبوون. کاتێ کارەساتەکە ڕوودەدا، ترومبیلەکە دەکەوێ و گردەگرێ، ئەوان لەنێوقەفەزە ئاسنەکەدا، بێ ئەوەی کەس بە هانایانەوە بچێ و فریایانکەوێ، بەهێواشی دەبرژێن و دەسووتێن، جگە لە هاوارهاوار و قیژەقیژی خۆیان، گوێیان لە دەنگی کەسی دیکە نابێ، بەدەم گریان و ژانەوە، گیانی پاکیان دەردەچێ. جا دەبێ، ئەو منداڵە بێتاوانانە، گوناهیان چی بێ و چۆن ئازارێکیان چێشتبێ، تا گیانیان دەرچووە؟!

پرسەکەیان لە مزگەوتی (سەرچنار) بۆ دانان و زۆر جەنجاڵبوو. زۆربەی هاوڕێکانم لە پرسەکەدا بەشدارییانکرد. هێندێ لە ئاسیاوە کوڕ و کچەکانی هاوڕێی زانکۆشم، بەسەریانکردینەوە. ئەو ماوەیەش باری دەروونی ماڵی پوورە (مەلیح)م زۆر خراپبوو، شەهیدبوونی (شادە)، کارێکی زۆر خراپی تێکردبوون. زۆربەی کات، سەرم لێدەدان و هێندێ شەویش، لایان دەمامەوە و دەورم چۆڵ نەدەکردن، تا وردەوردە ئازارەکانیان، کەمێ سارێژبوو، ئاساییوونەوە!

### تێهەڵچوونەوە

کاری ڕامیاری، وەک جگەرەکێشان وایە. یەکێ فێربیوو، هەروا بەئاسانی ناتوانێ، وازیلێبێنێ. مرۆڤ کە فێری پارتایەتی و کاری ڕامیاری بوو، هەر ماوەیە دەتوانێ، خۆی ڕاگرێ و دوورەپەرێز بووەستێ، پاشان تێهەڵدەچێتەوە، بەتایبەتی گەر نیشتمانەکەی داگیرکرابێ و گەلەکەی بچەوسێنرێتەوە، دوژمنی داگیرکەر بە هەموو شێوەیە هەوڵبدا، نەتەوەکەی بتوێنێتەوە. وەک گوڵەبەرۆژەخواردن وایە، هەر دەست لێدا، تا لەبەردەسدابێ و دوادەنکی لێ نەبڕێ، وازی لێ ناهێنێ، مەگەر لەبەردەسدا لایبەرن!

(وینستۆن چەرچڵ)، ماوەی (7) ساڵ لە کاری ڕامیاری دوورکەوتەوە، لە ئەنجامدا هەر بایدایەوە و دەستپێکردەوە. هێندێ کەس کاری ڕامیاری، وەک قومار سەیردەکەن، بەتایبەتی ئەوانەی دەیکەن بە پیشە، گەر بردیانەوە، ئەوا دەوڵەمەنددەبن و ناوبانگ دەردەکەن، گەر دۆڕانیشیان، ئەوا گەر نەڵێن، بە گونمانەوە، دڵیان دەتەقێ!

لە ژیانی تایبەتی خۆمدا، هەگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان، کاری ڕامیاریم، بۆ ئەو مەبەستە نەکردووە، بە چاوی قومارچیش، لێم نەڕوانیوە. هەرگیز نەمویستووە، بیکەم بە پیشە و ژیانی خۆمی پێ دابینکەم. بەڵکوو هەمیشە هەوڵمداوە، لە ئەو ڕێیەوە بەڕاستی، ڕاژەی نەتەوە و نیشتمانەکەم بکەم. بۆیە هەر کاتێ زانیبێتم، ئەو ڕێیەی لەسەریم، ئەو ڕێکخراوەی کاری تێدا دەکەم، ڕاژەی نەتەوەکەم ناکا و ئاسنی سارد دەکوتم، یەکسەر وازمهێناوە و کشاومەتەوە. تا بەخۆرای خۆم و هاوڕێکانیشم، تووشی سەریەشە و بەلا نەکەم. هەر کاتێکیش زانیبێتم، زۆر پێویستە و کاروانەکە، بە ڕێیەکی ڕاست و درووستدا دەڕوا، خۆم دەستپێشخەریمکردووە و تێهەڵچوومەتەوە. هەرگیز داوای پلە و پایەشم نەکردووە و هەموو جارەکانیش، هەر لە نووکەوە دەستمپێکردووەتەوە، چاوەڕوانی دەستی کەس نەبووم، لە بەنهەنگلم بنەوێ، پارمەتیمبدا و پێشمخا، بەڵکوو هەمیشە، بە هەوڵ و توانا و چالاکی خۆم، پلەبەپلە سەرکەوتووم، لە دەزگەکانی ئەو ڕێکخراو و پارتەدا، جێی شیاوی خۆمم کردووەتەوە.

دوای ئەوەی (ئازاد) و (فەرهاد) چوونەدەرەوە، بە ڕووکەش و لە دوورەوە، هێندێ گۆڕانکاریم لە شێوازی کارکردن، بیر و بۆچوونەکانی (پاسۆک)دا بەدیکرد. جگە لە ئەوەی، لە ئەو ڕۆژەوە (پاسۆک) دامەزرابوو، کارم لەگەڵ کردبێ، یا نەکردبێ، هەمیشە دەستم پێیانەوە بووە، بە هەموو شتێکی ئەوانم زانیوە. لەبەرئەوەی من ئەوانم، بە خۆم زانیوە و ئەوانیش، منیان لە خۆیان جیا نەکردووەتەوە. چونکە <u>من و (کاژیک) و (پاسۆک)، تازە یەک دڵی زیندووی یەکێ بووین و نەماندەتوانی، هەرگیز لە یەکێ جیابینەوە. ئەوانەی منیشیان دەناسی، کەم کەسیان هەبوو، نەزانن، من (پاسۆک)م. بۆیە نەمدەتوانی، باوەڕ و پارتەکەم بگۆڕم، بە شێوەیەکی دیکە بیربکەمەوە، لە پارتێکی دیکەدا کاربکەم، دوای زۆروبۆر بکەوم و کاریان لەگەڵ بکەم، وەک زۆربەی ڕۆڵەکانی کورد، بەگوێرەی ڕۆژ و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان، گوڵەبەڕۆژە ئاسا، ڕوویان لە خۆری بیر و کاری پارتێکی دیکە دەکرد!</u>

لەبەرئەوە، لە کۆتایی مانی (11)ی ساڵی (1980)دا، بە ویست و ئارەزووی خۆم، دەستپێشخەریم کرد، نامەیەکم بۆ نووسین و داوام لێ کردن، لە (پاسۆک)دا وەرمبگرنەوە و ئامادەیی خۆم، بۆ هەموو کاری پیشاندا!

## مەلاشوان

دوای ماوەیە، خاتوو (ئاسکە) و کوڕێکی منالکار هاتن، کوڕەکەی پێ ناساندم. ناوی (کەمال موحەممەد) بوو، بەلام هەر بەناوی نهێنی (مەلاشوان)ەوە ناسرابوو. کوڕێکی گەنجی خوێندکاری قۆناغی ئامادەیی بوو. لە بنەڕەتدا خەلکی (پێنجوێن) بوو، بەلام دەمێبوو، لە (سولەیمانی) نیشتەجێبووبوون. دایکی (مەنسوور) گوتی: لەمەودوا (مەلاشوان)، ڕاستەوخۆ نامە و شتت بۆ دێنێ. بە ئەو شێوەیە ڕۆلی دایک، لەنێوان من و (پاسۆک)دا تەواوبوو!

(مەلاشوان)، وەلامی نامەکەی بۆ هێنامەوە. هاوبیرانی سەرکردایەتی، دەسپێشخەرییەکەی منیان زۆر پێخۆشبوو. هەر یەکسەر، مۆری سەرکردایەتی هەرێمی باشووریان بۆ ناردم و داوایان لێ کردم، لقی (سولەیمانی) لە دوو هاوبیر دروستکەم. هاوبیرەکانیش یەکێکیان (مەلاشوان) و ئەوی دیکەشیان، مامۆستا (هادی) بوو. ئەو کاتە (هادی)، لە شارۆچکەی (هەلەبجە) کاریدەکرد. چەن هاوبیرێکمان لە ئەوی هەبوو، ئەو سەرپەرشتی دەکردن. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە، هەرسێکمان پێکەوە دەسمان بە کارکردن کرد. مانگانە کۆبوونەوەی خۆمان دەکرد، هێندێ چالاکی ڕێکخستنمان جێبەجێکرد، پێوەندیم بە هەموو هاوبیرە کۆنەکانەوە کرد و لە ڕیزەکانی (پاسۆک)دا ڕێکمخستنەوە. بە ئەو شێوەیە جارێکی دیکە، بە ویست و ئارەزووی خۆم، لەگەل (پاسۆک)دا تێهەلچوومەوە!



کەمال موحەممەد (مەلا شوان)



موحەممەد هادی ئەحمەد قادر (**1950 – 1996**)

## شێوازی کارکردنی نوێم

بیرمکردەوە، هەرچی چۆنێ بێ، پێویستە خۆم و ڕێکخستنەکە بپارێزم، گەر تووشی شتێ بووم و گیرام، کەمترین زیان بەر ڕێکخستنەکە بکەوێ. لەبەرئەوە هەرچی مۆر، نووسین، بڵاوکراوە و هەموو ئەو شتانەی پێوەندی بە ڕێکخستنەوە هەبوو، لە زانکۆ لە بنی مێزەکەی خۆمدا قایمکردن و هیچ شتێکم، لە ماڵەوە دانەنا. لە ئەو ڕۆژەشەوە، دەسم بە کارکردن کردەوە، ئەو دوو هاوبیرەم ناسی، بەدەگمەن نەبووایە، بەشەو لە ماڵی خۆمان نەدەنووستم.

کچێکی زۆر باش و کوردپەروەریش، لە بەشەکەی خۆمان سکرتێربوو، ناوی خاتوو (دلشاد) بوو، دوستایەتیمان زۆر خۆشبوو، دەتوانم بڵێم: لە خوشکەکانی خۆم، پتر بەتەنگمەوە دەهات، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، لە هێندێ شت ئاگادارمکردبوو، پەرلەیەکمان لەنێواندابوو، بەیانیان پێش ئەوەی بڕۆم بۆ کار، یا نیوەڕوان بۆ ماڵەوە دەچوومەوە، نانبخۆم، پێش ئەوەی بگەڕێمەوە، تێلیفۆنم بۆ دەکرد و لێم دەپرسی: دوکتور (خەلەف)، هەواڵی نەپرسیم؟ ئەویش دەیگوت: نەخێر. ئیدی دەمزانی، هیچ نییە و بێ سڵکردنەوە، دەچوومەوە بۆ زانکۆ. دوکتور (خەلەف)، عەرەبێکی ناشیرین، پیاوێکی خراپ و بەعسییەکی بێ ڕەوشت بوو، سەرۆکی بەشی ڕێنمایی کشتوکاڵ و جێگری ڕاگریش بوو.

## بەڵگەنامەیەکی گرنگ

یەکێ لە ئەو بەڵگەنامانەی، لە فەرمانگەی (ئەمن)ی (سولەیمانی) دەسمانکەوت، ڕاپۆرتی ئەو کۆبوونەوە گەورەیە بوو، کە (عیززەت دووری) و هەموو کاربەدەساتی (بەعس، ئەمن، ئیستیخبارات و سوپای سولەیمانی) بەشدارییان تێدا کردبوو.

لە ڕاپۆرتەکەدا، بە درێژی باسی هەموو ڕێکخراوەکانی باشووری (کوردستان) کرابوو، ناوی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتەکانی تێدابوو، لەسەر (پاسۆک)یش، هێندێ زانیاری هەڵە نووسرابوو.

لە دوا لاپەڕەشدا، ناوی (25) نیشتمانپەروەری کوردی خەڵکی شاری (سولەیمانی) تێدابوو، کە بڕیاریاندابوو، بیانگرن. وەک بیرم مابێ، هێندێ لە ئەو ناوانە ئەمانە بوون: (حەسەن حوسێن، حەمەی مام ئەورەحمان، مەحموودی مەلا عیززەت ...) بەڵام بەداخەوە، کاتێ ئێمە بەهۆی بارکی هاوبیرێکەوە، ئەو بەڵگەنامەیەمان دەسکەوت، زۆر درەنگبوو، هەموویان گیرابوون!

## جەلال و فەرهاد

هەر زوو (ئازاد)، نامەیەکی بۆ ناردم و نووسیبووی: (جەلال) و (فەرهاد) وازیانهێناوە، نامەیە بۆ (کوردۆ عەلی) واتە (سەروەت) بنێرە و ئاگادارییکەرەوە، کە هەردووکیان بەزیبوون و لە ترساندا، (کوردستان)یان بەجێهێشتووە. نەبا خۆیان بگەیەننە (کوردۆ)، درۆی بۆ هەڵرێژن و کاری تێ بکەن!

منیش لە راستی رووداوەکان ئاگادار نەبووم، لەسەر چی وازیانهێناوە، هەر هێندەم بۆ (کوردۆ) نووسی: ئەو دووانە وازیانهێناوە و هەڵاتوون، هەرشتێکیشیان بۆ باسکردی، بڕوایان پێ مەکە!

لە راستیدا (فەرهاد)، پیاوی ئەوە نەبوو، خۆی لە دەرەوە بگری و ئەندامی سەرکردایەتی پارتێکی نەتەوەیی بێ. بەڵام دوای ئەوەی، لە گرتووخانە بەربوو، لەلایەکەوە (ئازاد) بێ ئەو نەدەچووەدەرەوە. لەلایەکی دیکەشەوە، هاوبیرانی دەرەوە وازیان لێ نەدەهێنا. ئەگینا هەر زوو، وازی لە هەموو شتێ هێنابوو، بە دەردی خۆیەوە دانیشتبوو. پێش ئەوەی بشروا، هەموو شتێکی خۆی، لەنێوشاردا پاکتاوکردبوو. (شوان) بۆی گێرامەوە و گوتی: پارچە زەوییەکیشی لە من کڕی.

رۆژی (شوان) بەپەلە هات بۆماڵەوە و گوتی: (فەرهاد) کوردێکی ئێرانی ناردووە، تا پەساپۆرتەکەی بۆ بنێرم. بەڵام من فریانەکەوتم و پیاوەکە گەڕابووەوە. گەر کەسی دەناسی، با بۆی بەری. ئەو کاتە (فەرهاد) ئەندامی سەرکردایەتی (پاسۆک) و لێپرسراوی پێوەندییەکانی دەرەوە بوو. منیش وامزانی، بۆیە داوای پەسپۆرتی کردووە، تا بەکارێکی تایبەتی (پاسۆک)، سەردانی دەرەوەی وڵات بکا. لەبەرئەوە لە نامەیەکدا، بۆ (ئازاد)م نووسی و ئەو هەواڵەم پێ گەیاند. داوام لێ کردبوو، گەر (فەرهاد) پەسپۆرتەکەی پێویستە، ئەوا زوو وەڵامم لێ بگێڕنەوە، تا بەزووترین کات، بۆی بنێرم. ئیدی من نەمزانی، لەسەر ئەوە لەنێوانیاندا، چی روویداوە؟!

## فەتاح ئاغا

کاتێ (ئازاد) و (فەرهاد) چوونەدەرەوە، پاش ماوەیە، هاوبیرانی (پاسۆک) لە شاری (مهاباد)، کۆبوونەوەیەکی فراوانیان سازکردبوو. لە کۆبوونەوەکەدا، (ئازاد) بەزۆربەی دەنگ، بە سکرتێری گشتی (پاسۆک) هەڵبژێررابوو. بەڵام (ئازاد) زۆر مەردانە، وازی لە ئەو پۆستە هێنابوو، پێشنیازیکردبوو، (فەتاح ئاغا) بە سکرتێر دانێن. ئەویش پێشنیازەکەی پەسەندکردبوو، بڕیاریشیدابوو، بۆ (تاران) نەگەڕێتەوە و پێوەندی خۆشی، لەگەڵ (پارتی) بپچڕێ. هەرچەندە (جەلال) دەیویست، خۆی بە سکرتێر هەڵبژێرن!

ئەو کاتە (فەتاح ئاغا)، لە پۆلی چواری کۆلێژی مافناسی بوو، لە زانکۆی (تاران) دەیخوێند. (حەمەشەوقی) گوتبووی: با واز لە خوێندنەکەی نەهێنێ و هەر لە (تاران) بمێنێتەوە، کاتێ تەواویکرد، ئینجا بگەڕێتەوە. هەموو بەشدارانی کۆبوونەوەکەش، پێشنیازەکەیان پەسەندکرد بوو.

دوای ماوەیەکی کەم، بنەماڵەی (بارزانی) بەهەموو نهێنی و بڕیارەکانی کۆبوونەوەکەی (مهاباد)یان زانیبوو. (ئیدریس بارزانی) کاک (فەتاح)ی بانگکردبوو. ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، دەیانگێڕایەوە، گوایە (فەتاح ئاغا) زۆر بەڕاشکاوی، بە (ئیدریس)ی گوتبوو: لەمەودا هیچ پێوەندییەکم بە (پارتی)ەوە نامێنێ و لەگەڵ هاوبیرانی (پاسۆک) کاردەکەم. ئەویش گوتبووی: ئێوە کاتی خۆشی (کاژیک) بوون، لە ریزەکانی (پارتی) و شۆڕشدا خەباتتان دەکرد، ئێستەش هەر (پاسۆک)بە و لەگەڵ ئێمەش کاربکە. هەرچی چۆنێ بوو، (ئیدریس) ڕازیکردبوو. پاشان لەگەڵ هێزێکی گەورەی پێشمەرگەدا، بۆ بەرەکانی جەنگی دەوروبەری ناوچەی (حاجی هۆمەران) ڕەوانەیکردبوو.

کاتێ ڕۆیشتبوو، سەری لە بارەگەی (پاسۆک) دابوو، هەموو ئەو قسانەی، بۆ ئەندامانی سەرکردایەتی (پاسۆک) گێڕابووەوە. چەن تفەنگ و سندووقە فیشەکێکیشی، لە بارەگەی (پاسۆک) گلدابووەوە و بەڵێنیشی پێ دابوون، دوای ئەو جەنگە، بەیەکجاری بگەڕێتەوە، واز لە (پارتی) و بنەماڵەی (بارزانی) بێنێ.

(ئازاد) دوو پێشمەرگەی لەگەڵ ناردبوو. یەکێکیان ناوی (بەرزانی حەمەی سابیر) بوو، تا ئاگایان لە کاک (فەتاح) بێ. (بەرزان) لە دایکەوە، پورزازامان بوو، کوڕێکی زۆر ئازابوو، چەندین کاری گەورەی، بۆ (پاسۆک) کردبوو.

بەڵام بەداخەوە، ئەوە دوامالاوایی خوالێخۆشبوو (فەتاح ئاغا) بوو، لە هاوبیرەکانی خۆی کردبوو، ڕۆیشت و نەگەڕایەوە، هێشتا چل بەهاری تەمەنی پڕنەکردبووەوە، ڕۆژی (**17/18. 11. 1980**)، لە ئەو ڕێگە پیرۆزەدا شەهیدبوو!

هەرچەندە دەنگۆیەک هەیە و دەڵێن: دوای ئەوەی جەنگەکە تەواوبووە و دانیشتوون، کوژراوە. بەڵام تا ئێستە، چۆنێتی کوشتنەکەی بەتەواوی، ڕوون نەبووەتەوە. هەر دوای ئەوەی شەهیدیشبوو، (پارتی) و (پاسۆک) کاسبییەکی باشیان، بە گیانی پاکی کاکە (فەتاح)ەوە کرد، هەردوولایان، خۆیان بە خاوەنی ڕاستەقینەی ئەو شەهیدە دەزانی.

(پارتی) لە ئێزگەکەیانەوە، بە شەهیدی خۆیانیان دانا، بەدوورودرێژی، باسی ژیان و تێکۆشانیان کرد. (پاسۆک)یش بڵاوکراوەیەکیان لەسەر دەرکرد و پۆستەرێکیشیان بۆ کرد، بە شەهیدی ڕابەر و سکرتێری گشتی (پاسۆک) ناویانبردبوو!



( 1980 – 1940 )

## بلاڤۆكەكەی پاسۆك

لە راستیدا، من كاك (فەتاح)م خۆشدەویست. هەرچەندە بە خوێنی خۆی، ئەمەك و دلسۆزی بۆ گەلەكەی سەلماند، وەك خۆشی دەیگوت: (شەهادەی شەهیدی) وەرگرت! بەلام لە دوای هەرەسەوە، بڕوام پێی نەمابوو. چونكە هەر كەسێ لە شوێنی ئەو بووایە، لە ئەو ڕۆژەڕەشەدا، شۆڕشێكی نوێی بەرپادەكرد. یا گەر ئەو ڕۆژە نەیتوانی، ئەو كارە مەزنە بكا، خۆ دواتر دەیتوانی، لەگەل ئەو كوڕە گەنجە لەخۆبووردووانەی، لە دەوری (پاسۆك) كۆبوو‌بوونەوە، لەسەر خوانی ئامادەكراو دانیشێ، لەگەل هاوبیرەكانی خۆی خەباتبكا و بیروباوەڕەكانی بلاوكاتەوە!

هەر ئەو ڕۆژەی (مەلاشوان) هات و بلاڤۆكەكانی بۆ هێنام، دانەیەكم لێ خوێندەوە، زۆر بەجوانی لەسەریان نووسیبوو. بەلام ئەوانی دیكەم بلاونەكردەوە و هەموویم، لە تونی گەرماوەكەی مالەوەدا سووتاند! چونكە بڕوام پێ نەبوو، گەر پیاوێ لە سەنگەری پارتێكی دیكەدا شەهیدبووبێ، بۆچی دەبێ، (پاسۆك) پۆستەری بۆ دروستكا و بلاوكراوەی لەسەر دەركا؟!!

گریمان لەبنەوە، سكرتێری (پاسۆك)یش بووبێ، خۆ تازە لەڕێی كورد و (كوردستان)دا شەهیدبوو، ئیدی چ پێویستیدەكرد، لەنێوخەلكدا ناوی بزڕێنن و بە دووسەرە باسبكرێ! لەبەرئەوە هەر زوو، نامەیەكم بۆ سەركردایەتی نووسی، لە دید و بۆچوونی خۆم و خەلك ئاگادارمكردن. چونكە زۆربەی خەلكی دەیانگوت: (پاسۆك) بازرگانی بە جەستەی شەهیدەكانەوە دەكا! ئاخر لەسەرێكەوە ئاهەقیان نەبوو، وابیربكەنەوە، چونكە ئەو جۆرە كەسانە، لە ڕاستی ڕووداوەكان ئاگادارنەبوون.

لە (سولەیمانی)ش، مامۆستا (هەردی، عەبدوڵڵائاگرین) و هێندێ لە هاوبیرانی کۆنی (کاژیک)، بە نهێنی لە ماڵی (سوارئاغا)ی برای، پرسەیان بۆ دانابوو. من لەبەرئەوەی، تازە مامۆستا (هەردی)، لە (ئەورووپا)وە بۆ (عێراق) گەڕابووەوە و هاوبیرەکانی بەجێهێشتبوو، خۆی ڕادەسی (بەعس) کردبووەوە، بەشداری پرسەکەم نەکرد. هەرچەندە (ئاگرین) گلەیی لێ کردم، بەڵام من گوێم نەدایە!

ساڵی (**1988**) بوو، لە شاری (ستۆکهۆڵم)، چاوم بە (ئازاد) کەوت، لە ئەو بارەیەوە قسەمانکرد. ئەویش گوتی: هەڵەبوو. ساڵی (**1990**) لەگەڵ ملازم (کەریم)یش، باسی ئەو بابەتەمان کرد، گوتی: کاتی بڵاوکراوەکە دەرچوو، من لە ئەوی نەبووم و لە گوندی (چۆخماخ) بووم. پێشمەرگەکان هێنایان، هەموویم لێ وەرگرتن و دڕاندمن!

## کامیلی شەفیق

(کامیل)، یەکێ لە ئەو کوڕە ئازا و بەجەرگانەی (سولەیمانی) بوو. هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە، پێشمەرگە بوو. کوڕێکی باشبوو، لە گرتووخانەی (ئەبوغرێب)، لەگەڵ (ئازاد) یەکدیان ناسیبوو. (ئازاد) قسەیەکی زۆری بۆ کردبوو، تا وای لێ کردبوو، بڕوای بە (پاسۆک) هێنابوو. کاتی بەربووبوو، لە یەکێ لە مەفرەزەکانی (پاسۆک)، لەنێوشاردا پێشمەرگە بوو، هێندێ کاری باشیشی کرد. بەڵام بەداخەوە، زۆری نەخایاند و ڕۆژی (**25. 11. 1981**)، چەن کەسێکی سەر بە (پارتی کۆمونیستی عێراق)، تەقەیان لە (مچەی بابەگەورە) کرد و (کامیل)یشی لەگەڵ بووبوو، ئەویش بەرکەوتبوو و هەردووکیان کوژرابوون. هەواڵێکی زۆر ناخۆش و زیانێکی گەورە بوو، لە (پاسۆک) کەوت!



( **1981 – 1946** )

### پیتاککۆکردنەوە

(پاسۆک) زۆر بێ توانا و پارە بوو. خۆم دەستپێشخەریمکرد و مانگی (**2**)ی ساڵی (**1981**) بوو، بڕیارمدا، لەنێو دۆست و خزمەکانمدا، هێندێ پارەیان بۆ کۆکەمەوە. سەرەتا لە هاوڕێ نزیکەکانم، کەسوکاری خۆم و مامۆستاکانی زانکۆوە دەستمپێکرد.

بۆ پیتاککۆکردنەوەکەش، نامەیەکم بۆ سەرکردایەتی نارد، ئەو پێشنیازەم بۆ نووسین و داوام لێ کردن، گەر پێیان باشە، نامەیەکی جوان بنووسن و (**100**) دانەیەکم بۆ بنێرن. پاشان وەڵامیاندامەوە و پێشنیازەکەیان پەسەندکرد.

کاتی خۆشی، بەبۆنەی کۆچیدوایی دوکتۆر (ئومێد نوری)ەوە، ئەم باسەم لە گۆڤاری (چەرمۆ)ی ژمارە (**8–9**)ی ساڵی (**2009**)، لە لاپەڕە (**65**)دا باسکردووە، ناوی ئەو بەڕێزانەشم بڵاوکردووەتەوە. هێندێ لە ئەوانەی نامەم بۆ بردن، نەک هەر پارەیان نەدا، بەڵکوو هێندێ قسەی ناشیرینیان کرد و دەسیان بە ڕوومەوە نا، بەڵام من هەر کۆڵم نەدا. لەگەڵ ئەوەشدا، چەن برادەرێکی دڵسۆزی وەک (عەبدوڵلاناگرین، مژدە تایەر، شوانی عوسمان فایەق، ڕەفیقی حەلواچی، ئازادی حاجی ساڵح، ئەنوەری عەلی نەجار) و لە زانکۆش (د. کەمال ئەحمەد، د. ئومێد نوری، د. فەرهاد ئەحمەد ئەمین، د. لاوچاک حسامەددین، د. کاوس عەزیز فەرەج، کەمال شالی و خالید خاڵ)، چەن لە توانایاندا بوو، دەسی یارمەتیان بۆ درێژکردین. بۆ نموونە: (شوان)ی هاوڕێم، یەکێ لە ئەو کەسانەبوو، نامەم بۆ برد، لە هەموو کەسێ زیاتر و (**200**) دیناری ئەو ڕۆژەی دا!

### پەرتووکۆکردنەوە

(ئازاد) داوای کۆمەڵێ پەرتووکی لێ کردم، زۆربەی ئەو پەرتووکانەش لە بازاڕدا نەبوون. بەڵام فەرمانبەرە ناسیاوەکانی پەرتووخانەی زانکۆم، هێندێکیان بۆ هێنام. (شوان)ی هاوڕێشم، بڕێکی زۆری پێشکەشکردین. نزیکەی (**500**) پەرتووکێکم کۆکردەوە و بە (مەلاشوان)دا بۆم ناردن.

دەبێ ئەوەش بڵێم، کەس وەک هاوڕێی خۆشەویستم، ڕەوانشاد دوکتۆر (فازیل قەفتان) نەهاتەپێشەوە. چونکە نەک هەر یارمەتیداین و هێندێ پەرتووکی زیادەشی پێشکەش کردین، بەڵکوو بڕیاریشیدا، سەبارەت بە ئابووری (کوردستان)، چەن گوتاریمان بۆ بنووسێ. ئەوەبوو، یەکەمین گوتاری بۆ نووسین، پێش ئەوەی (کوردستان) بەجێبێڵم، لای (کەمالی جەمالی موختار) دامنا، تا پاکنووسیکا و بۆ دەرەوەی بنێرێ!



لە ڕاستەوە (مەریوان شوان، حوسێن موحەممەد عەزیز، دارەوان شوان و دوکتۆر فازیل قەفتان**1943 – 1996**)، مانگی (**11**)ی ساڵی (**1979**)، لە ژووری بەڕێوەبەری پەرتووکخانەی زانکۆی سولەیمانی گیراوە.

**دووەمین نەشتەرگەری**

نەخۆشی ناسۆر، بۆ دووەمین جار تەنگی پێ هەڵچنیمەوە. ڕۆژبەڕۆژ زیادیدەکرد و زۆر ئازاریدەدام. پەنام بۆ دوکتۆر (نەوزاد عەتار) بردەوە. گوتی: ئەم جارە دەبێ، لە نەخۆشخانە بکەوی و نەشتەرگەرییەکی گەورەت بۆ بکەم. کۆتایی مانگی مارسی ساڵی (**1981**) بوو، لە نەخۆشخانەی سەرەوە کەوتم، ڕەگی ناسۆرەکەی لە بنوبێخەوە دەرهێنا، قووڵاییەکەی پتر لە (**10**) سم دەبوو. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە، ئەو پەتایەم لە کۆڵبووەوە و حەوامەوە.

ماوەی دوو مانگ (**1. 4 – 1. 6**) مۆڵەتی بۆ نووسیم و دەمویست، لە زانکۆ کارنەکەم و لە ماڵەوە، خەریکی کاری خۆم بم. خەڵکێکی زۆر، خزم و برادەر لە نەخۆشخانە و ماڵەوە، سەریان لێ دام. مامۆستاکانی بەشەکەمان، زۆریان هاتن بۆ ماڵەوە و گوتیان: تازە ئەم کۆرسە دەوام مەکە و وانەکانی تۆمان، بەسەر مامۆستاکانی دیکەدا دابەشکردووە. ڕەوانشاد (نیهاد)ی هاوڕێم، ئەو دوو ڕۆژە، دەوری چۆڵ نەکردم، شەو و ڕۆژ لە خەستەخانە لەگەڵم بوو.

بەڵام (جووجە) بە هیچ شێوەیە، دەنگ و ڕەنگی نەبوو. ئیدی یەکسەر زانیم، لە دوا قۆناغی خوێندن دایە و پێویستی بە یارمەتی من نەماوە. بۆیە وردەوردە دەیەوێ، خۆی دوورخاتەوە. جگە لە ئەوەی ماوەیەبوو، لەگەڵ کوڕێکی هاوپۆلی خۆیدا دەمبینی و زۆر جار، پێکەوە لە زانکۆ دەمانەوە. هەر پێکیشەوە بەرەوخواردەبوونەوە!

## شەوێ لە ڕەزڵە

تازە لە دەس نەشتەرگەرییەکە ڕزگارمبووبوو، بەلام هێشتا بەتەواوی، شوێنەکەی ساڕێژ نەبووبووەوە، هەر ئازارم مابوو. چونکە نەمدەتوانی، ماوەیەکی زۆر لەسەری دانیشم و ترومبێلیشم لێ نەدەخوڕی. دایە (ئاسکە) هات و گوتی: (مەنسوور) لە گوندی (ڕەزڵە)ەوە، پیاوێکی ناردووە و چاوەڕێماندەکا! منیش خێرا گوتم: کەی بڕۆین؟! گوتی: بەیانی پاش نیوەڕۆ.

سەرەتای مانگی (5) بوو، جیپێکمان گرت و هەموو پێکەوە و لەڕێی (ئاوپارێز)ەوە ڕۆیشتین، دەمەونێوارەیەکی درەنگ گەیشتین. (مەنسوور) لەگەڵ پێشمەرگەکاندا، لەنێو گوندەکە چاوەڕێی دەکردین. هەر لە ترومبێلەکە دابەزیم و یەکدیمان ماچکرد، یەکسەر جامانەیەکی دامێ و گوتی: خێرا دەماخبکە، با کەس دەموچاوت نەبینێ و نەتناسێ. پاشان ڕەوانەی ماڵی مەلای گوندەکەی کردم.

ئەو ئێوارەیە لە ماڵی مەلا، پێکەوە ساوەرێکی وشکمان خوارد و دوایش، دەسمان بە قسەکردن کرد. مەلا وایدەزانی، من (حسک)م، چونکە تا ئەو کاتە، ناوی (پاسۆک)ی نەبیستبوو، ڕەنگە لای ئەو (حسک) و (پاسۆک) هەر یەک شت بووبێ! ئینجا هێرشێکی زۆر توندی، کردە سەر (کۆمەڵە) و گوتی: ئەو بەچکە ئەهریمەنانە، لە ئەم ناوە کوفر بلاودەکەنەوە و بەختوخۆرای، کوڕی خەلکی بەکوشتدەدەن! هەروەها گوتی: دوێنێ (ئەبوشەهاب) ناوی، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی زۆر لێرە بوون، بە دوای (حەمەی حاجی مەحموود)دا دەگەڕان و دەیانویست، چەکیکەن.

منیش لەبەرئەوەی نەمدەناسی، پتر گوێم لێ گرتبوو، هیچم نەدرکاند. بەلام هێندە تێگەیشتم، ئەم مەلایانە گوێز لە هەمبانەی پووچی باوەڕی ئایینەکەی خۆیانەوە دەژمێرن، هیچ لێکدانەوەیەک، بۆ باری ژێردەسی و داگیرکردنی نیشتمانەکەیان ناکەن، (یەکێتی) بەگشتی و (کۆمەڵە) بەتایبەتی، ئەو هەموو نەبەردانەیان تواندبوو، ئەو هەموو شەهیدەیان دابوو، کەچی تازە مەلای مشەخۆر، بە بێچووی ئەهریمەن ناویدەبردن!

کاژێری (9)ی شەوبوو. (مەنسوور) دوو پێشمەرگەی بەدوامدا نارد. ماڵاوایم لە مەلا کرد، جارێکی دیکە دەماخمکردەوە و لەگەڵیان ڕۆیشتم. لەگەڵ پێشمەرگەکاندا، لە قەراغ گوندەکە، چاوەڕێی (مەنسوور)مان دەکرد، دوای ماوەیە هات و گوتی: وەلاممان بۆ هاتووە، لە ئەوانەیە ئەم شەو، هێزەکانی دوژمن جاش و سوپا، پەلاماری ئەم ناوە بدەن، لەبەرئەوە دەبێ، بە ئەم چیایەدا هەلگەڕێین و خۆمان دامەزرێنین. ئیدی ڕانەوەستاین و هەرچی چۆنێ بوو، یەکسەر هەموومان پێکەوە سەرکەوتین.

چیاکە زۆر بەرزبوو، تا سەرکەوتین، بەتەواوی ماندووبووم. هەر خرەبەردی لەژێرپێی یەکێکمانەوە دەردەچوو، تلدەبووەوە، یەکسەر پێشمەرگەکان گوێقوڵاخدەبوون و خۆیان مات دەکرد، تا بزانن چییە؟ پاشان کە بۆیان دەردەکەوت، هیچ نییە، جارێکی دیکە هەڵدەسانەوە، بەرەو لووتکەی چیاکە بەردەوامدەبوون و دەڕۆیشتن.
ئەو شەوە (مەنسوور)، نزیکەی (**60**) پێشمەرگەی لەگەڵ بوو، بەلام خۆی گوتی: هەموویان (پاسۆک) نین و (**30**) پێشمەرگەیەکی لە (شێخ کاوە) خواستبوو! من دەم و چاوم بەستبوو، تا کەس نەمناسی. هەرچەندە چاویشم دەگێڕا، کەسم لە پێشمەرگەکان نەدەناسی. دوای ئەوەی پێشمەرگەکان بڵاوبوونەوە و بنکەی نیشکەکانیان دانا، ئەوانی دیکە هەر یەکەیان، لەلایەکەوە لاڵوپاڵ لیی کەوتن. وەک هەمیشە، زەویان ڕاخست و ئاسمانیان بە خۆیاندا دا، هێندە ماندووبوون، هەر زوو خەویان لێ کەوت، ئیدی منیش دەمامکەکەم لابرد. ئینجا من و (مەنسوور)، دووقۆڵی مایەوە، پێکەوە دانیشتبووین، گوتی: بۆیە بۆ ماڵی (شێخ موحەممەد) بانگم نەکردی، چونکە (حەمەی حاجی مەحموود) لە ئەوێ بوو، بۆئەوەی نەتبینێ. پاشان لەگەڵ پێشمەرگەکانیدا، لە ترسی (یەکێتی) بەرەو (شارەزوور) ڕۆیشتن. ئیدی دوای دووەمین سەردانی بۆ (سولەیمانی)، لە کوێدا وەستا بووین، زۆر بەوردی و هەر لە ئەوێوە، لە نووکەوە دەسپێکردەوە و باسی هەموو ڕووداوەکانی بۆ گێڕامەوە.

### فەرهاد هەڵات!

سەبارەت بە وازهێنانەکەی (فەرهاد) گوتی: هەر نامەکەی تۆ گەیشت و خوێندمانەوە، ئینجا بەتەواوی، نیازی (فەرهاد)مان بۆ دەرکەوت و دەسەکەی ئاشکرابوو. چونکە دەیویست، بەدزی ئێمەوە (کوردستان) بەجێبێڵێ و بەرەو (ئەورووپا) بیقوچێنێ! لەسەر ئەوە (ئازاد) بانگیکرد و لیی توورەبوو. ئەویش زویربوو، وازی لە (پاسۆک) هێنا، بەرەو (ئێران) ملینا و ئێمەی بەجێهێشت. (جەلال) تا (تاران)یش بە دوایدا ڕۆی، بەلام فریای نەکەوت و بۆی دەرچوو!
لە ڕاستیدا، من ئاگاداری ئەو بەزمە نەبووم. نەمدەزانی، (فەرهاد) پەسپۆرتی بۆ چییە، زۆر بە دڵپاکییەوە، ئەو پێشنیازەمکردبوو. وامدەزانی، بۆ کاروباری (پاسۆک)، داوای پەسپۆرتی کردووە. کەچی ئەو پیاوە باشە، وای لێکدابووەوە، من بەدەسی ئانقەسەت، ئەو نامەیەم نووسیوە و دژایەتیدەکەم!
ڕاستییەکەی ئەوەبوو، لەگەڵ ژنەکەیدا ڕێککەوتبوون، دوای ماوەیە بەرەو (ئەورووپا) بڕوا و پاشان، ئەوانیش بە دوای خۆیدا ڕاکێشێ. چونکە وەک دواتر لە (ئازاد)م بیست، نامەی ژنەکەشی گیرابوو، بۆی نووسیبوو: ئێمە لەسەر چی ڕێککەوتین؟

دوای ئەوەی خێزانەکەشی گیرا، (فەرهاد) پتر لەسەر ئەو پلانە سووربوو، تا زووە هەڵبێ، چونکە بڕیاری (بەعس) وابوو، گەر یەکێ واز لە کاری پێشمەرگایەتی و کوردایەتی بێنێ، ئەوا ژن و منداڵ و کەسوکارەکەی بەرەڵادەکەن. ئەوەبوو، (فەرهاد) وازیهێنا و هەڵات، پاش ماوەیە خێزانەکەیان بەردا.
سەیر ئەوەبوو، من هەواڵی وازهێنان و ڕاکردنەکەی (فەرهاد)م پێگەیشتبوو، کەچی (فەرەیدون)ی برای، گلەیی لێ دەکردم و دەیگوت: خێزانەکەی (فەرهاد)ی برام گیراوە، تۆ سەرت لێ نەداوە. نەیدەزانی، براکەی لە (تاران)یش نەگیرسابووەوە و خێزانەکەشی چ بەزمێکی بە من کردووە!

## وازهێنانی جەلال

سەبارەت بە (جەلالی حاجی حوسێن) گوتی: (جەلال) زۆر خراپ گۆڕابوو، ئێمەی بە پیاوی خۆی دەزانی و ڕێزی لێ نەدەگرتین. ئێوارەیەک ناردی بە دوامدا. کە چووم (فەرهاد عەبدولحەمید) و (فەرهاد خەفاف) دانیشتبوون. هەرچوارەورمان بە پێشمەرگەکانی خۆی کورانی (مام توفیق، بەکری مەلاچۆلەکە ...) گیرابوو. بەچەکەوە ڕاوەستابوون و چاوەڕێی فرمانی (جەلال)یان دەکرد، پەلامارمبدەن. گەلێ قسەی ناشیرینی پێ گوتم. منیش هیچ وەڵامم نەدایەوە، بۆئەوەی خوێن لەنێوانماندا نەڕژێ و ئابڕوومان نەچێ.
(فەرهاد خەفاف) هەڵیدایە و گوتی: کاک (جەلال)، ئێمە هەموو هاوبیری یەکدین، چۆن بە ئەو شێوەیە، قسە لەگەڵ ملازم (مەنسوور) دەکەی؟ (جەلال)یش لەسەر ئەو قسەیە، لێی توورەبوو، سووکایەتییەکی زۆری پێ کرد و دەریکردەدەرەوە. ( فەرهاد)یش بە دڵشکاوییەوە هەستا و ڕۆیشت. (فەرهاد عەبدولحەمید)یش زۆر لە (جەلال) پاڕایەوە، تا وازبێنێ و لە ئەوە پتر، لەسەر ئەو قسانە بەردەوام نەبێ. دوای ئەوە (جەلال)، هەموو چەکەکانی (پاسۆک)ی برد و گوتی: چەکی خۆمە و خۆم پەیدامکردوون. پاشان هەمووی فرۆشت، خۆی و پێشمەرگەکانی (کوردستان)یان بەجێهێشت و بەرەو (سووریا) ڕۆیشتن.

## دمەتەقێیەکی ڕاشکاوانە

ئینجا سەبارەت بە هەموو ڕێکخراو و پارتەکانی خۆرهەڵات و باشووری (کوردستان)، باسێکی درێژی بۆ کردم. هەموو گرفتەکانیان و ڕەوشی شۆڕشی بۆ ڕوونکردمەوە. منیش هەر گوێم گرتبوو، هیچ قسەم پێ نەدەبڕی. تا لە هەموو قسەکانی خۆی بووەوە و بەتەواوی، دەردی دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتم. پاشان کە تەواوبوو، یەکەبەیەکە، وەڵامی قسەکانیم دایەوە و هێندێ پرسیاریشم لێ کرد. ئینجا ڕەخنەیەکی زۆرم لێ گرتن و گوتم: ئێوە هەرگیز چاک نابن و پێش ناکەون. هەر لەسەر شێوە کۆنەکەی (کاژیک)

بەڕێوەدەرۆن و کاردەکەن. گەر (فەتاح ئاغا) سکرتێری (پاسۆک) بێ، بۆچی دەبێ، لە ڕیزەکانی (پارتی)دا کاربکا و هەر لە سەنگەری ئەوانیشدا، شەهیدبکرێ؟! چۆن دەبێ، پارتێکی نەتەوەیی بڕوای بە سۆسیالیزم هەبێ، پیاوێکی ئاغا و خاوەن موڵک سکرتێری بێ؟! دوای ئەوەی لای (پارتی)ش شەهیدبوو، بۆ بڵاوکراوەتان لەسەر دەرکرد؟!

گوتی: من لەسەر ئەو شتانە، ڕازی نەبووم، (ئازاد) بێ ئەوەی پرس بە کەس بکا، هەمووی خۆی دەیکرد. کاتێ کۆبوونەوەشکرا، (فەتاح ئاغا) بەشداریتێداکرد، نەیویست، خۆی ئاشکرابکا و سەر لە بارەگەی (پاسۆک) بدا. بەڵکوو داوایکردبوو، ئێمە هەموومان بچین بۆ لای. بەڵام من نەچووم. جگە لە ئەوەی دەیویست، هەر وەک سەردەمی شۆڕشی (بارزانی)، بە ئاشکرا لەگەڵ (پارتی) کاربکا و لە بنیشەوە، لەگەڵ ئێمە بێ، بەڵام ئێمە داواکارییەکەیمان پەسەندنەکرد. ئیدی هەموو شتێکی بەتەواوی بۆ گێڕامەوە. سەبارەت بە (ئازاد)یش، گەلێ گلەییکرد و گوتی: خۆی هەموو شتێکە، زۆر توندوتیژە و شتی سەیر دەنووسێ، دڵی هەموو لایەنەکانی لێ یەشاندووین.

بەقسەکانیدا بۆم دەرکەوت، ئەمیش گەلێ بێزارە، بڕوای بە هیچ شتێ نەماوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی (حەمەشەوقی) شەهیدبووبوو. (فەرهاد عەبدولقادر) هەڵاتبوو، لە (سوید) دەژیا. لەگەڵ (جەلال) تێکچووبوون و وازی لێ هێنابوون. (فەرهاد خەفاف)یش شەهید بووبوو. ئیدی بەیەکجاری بێ هیوابووبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەر وازی لە من نەدەهێنا و داوای لێ کردم، بچمەدەرەوە و بە هەموومان هەوڵبدەین، باری (پاسۆک) چاکبکەین. منیش زۆر بەڕاشکاوی گوتم: گەر بارودۆخەکە وابێ و خۆشت بە دڵت نەبێ، من بۆ کوێ بێم؟! جگە لە ئەوەی بە هیچ شێوەیە، بڕوام بە ئەو شۆڕشە نییە. تا لەسەر ئەم باوەڕەشبم، بە هیچ جۆرێ بیر لە ئەوە ناکەمەوە و نیازیشم نییە، بێمەدەرەوە. چاکترین چارەسەریش ئەوەیە، واز لە خەباتی چەکداریی بێنن و خەباتی ڕامیاریی دەستپێبکەن.

گوتی: ئێمە تازە تووشبووین، لەبەر خوێنی دوو شەهیدی وەک (حەمەشەوقی) و (فەرهاد خەفاف) نەبێ، خۆمان هەڵدەوەشێنینەوە و هەموومان دەچین بۆ (ئەورووپا). ئەوە یەکەمین جاربوو، شتێکی وا لە دەمی (مەنسوور) ببیستم. ئینجا تێگەیشتم، ڕەوشی (پاسۆک) و کادیرەکانی بیری نەتەوەیی چۆنە. گەر بە دەیانی وەک منیش بچینەدەرەوە، تازە نە چاکەیی و نە بە هیچیش دەبێ! خوری (پاسۆک)یش، بەرەو ئاوابووندەڕوا!

(مەنسوور) زۆر ماندووبوو، بە دەم قسەکردنەوە، هەر باوێشکیدەدا و وەنەوزدەیبردەوە. ئیدی سەری کردە سەر ڕانی من و خەوی لێ کەوت. ئەو پرخەی دەهات و منیش تا بەیانی، خەو لە چاوانم نەکەوت. بەڵام زۆرم لا خۆشبوو، لەنێو ئەو پێشمەرگانەدا بووم!

ئەو شەوە، مانگەشەویکی زۆر خۆشبوو، سارد نەبوو، هەوایەکی زۆر سازگار و فێنکی هەبوو. ئاسمان ڕوون و خاوێن بوو، دونیا کشومات و بێدەنگ بوو. تا بەرەبەیان سەیری ئەستێرەگەشە ورشەدارەکانم دەکرد. هەر بیرم لە پاشەرۆژی ئەو کوڕە گەنجانە و چارەنووسی شۆڕشەکە دەکردەوە. بەڵام لە هەموو لایەکەوە وا شێوابوو، هەرچەندە سەرمدەهێنا و سەرمدەبرد، بە هیچ شێوەیە ترووسکاییم تێدا بەدی نەدەکرد. جاروبارێش وەنەوز دەیبردمەوە و شوێنی ئەشتەرگەرییەکەشم ئازاریدەدام!

بەیانی ڕۆژبووەوە و خۆرهەڵات، هەمووومان بۆ نێوگوندەکە گەڕاینەوە. من و (مەنسوور)، لە ماڵی (شێخ موحەممەد) دامەزراین و نانی بەیانیمان خوارد. ماوەیەکی دیکە ماینەوە. پاشان لەگەڵ دایە (ئاسکە) و خوشکەکانیدا، ماڵاواییمان لێ کردن و بێ گرفت، بەرەو (سولەیمانی) گەڕاینەوە.

## دەسوەشاندن

هێندێ مامۆستای زانکۆمان هەبوو، زۆر خراپ بیریاندەکردەوە، لە بێڕەوشتی و دژایەتی کورددا، شۆڵیان لێ هەڵکێشابوو. دوکتۆر (عەبدولغەفوور)، لای خۆی لە (ئەمێریکا) خوێندنی تەواوکردبوو، لەنێو زانکۆدا، عەگالی لەسەردەکرد و وەک سەرسەرییەکانی فیلمی (کابۆی)، بەئاشکرا دەمانچەی هەڵدەگرت و لە پۆلدا، سووکایەتی بە کورد دەکرد. بەعسییەکی زۆر بێ ئابڕوو، خراپ و شۆڤێنی بوو، زۆر ناشیرین و پیسیش بوو.

لە سەرەتای کۆرسی یەکەمی پۆلی (3)دا، پێکەوە وانەی بۆماوەزانیمان وەرگرتبوو. لە دوو ڕۆژ پتر نەمتوانی، لەگەڵیدا هەڵکەم. هەر زوو لای دوکتۆر (خالید) شکاتم لێ کرد، خۆم لە بەڵا و دەنگەدەنگی (غەفوور) ڕزگارکرد. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە، قسەی لەگەڵ نەدەکردم و لە هەر شوێنێ منی دەبینی، لێم مۆڕدەبووەوە. کەم مامۆستا و خوێندکار هەبوون، لە دەس (غەفوور) دادوبێدادیان نەبێ.

لە بەشەکەمان، کچێکی خوێندکار هەبوو، ناوی (ن) بوو، زۆر هاوڕێی (جووجە) بوو. گەلێ جار بە (جووجە)م دەگوت: پێویستە، واز لە هاوڕێیەتی ئەو کچە بێنی، بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو. دیارە من باش نەمناسیبوو، لە ناسینی ئەو کچەدا، زۆر بەهەڵدا چووبووم، چونکە وەک رووس دەڵێ: پێم بڵێ، هاوڕێکەت کێیە، پێت دەڵێم، تۆ کێی!

لە کۆتایی ساڵی (1980)دا، (ن) پێوەندییەکی گەرمی، لەگەڵ (غەفوور)دا پەیداکرد. هەمیشە سواری مارسێدسەکەی دەبوو، بەنێوشاردا دەیگێڕا و لە (سەرچنار) پیاسەیان دەکرد. هێندێ جاریش، لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری زانکۆ، پێکەوە نانیاندەخوارد. بڕواناکەم، (غەفوور) ئەو کچەی بە دڵ خۆشویستبێ، بەڵکوو تەنیا هەر سووکایەتی بە کورد دەکرد.

کچەکە خۆی خراپبوو، لەنێو خەڵکدا ناسرابوو. بووبوو بە بەعسی و بە ئاشکرا، داکۆکی لێ دەکردن و سڵی لە کەس نەدەکردەوە. وەک بیەوێ، ڕکەبەرایەتی خوێندکارە کوردە نیشتمانپەروەرەکان بکا!
باشبوو، لە چەن لایەکەوە، لەسەر (غەفوور) ڕاپۆرتیان بۆ شۆڕش نووسیبوو. مانگی (5) بوو، نزیک مەڵبەندی ڕۆشنبیری زانکۆ، بەر دەسڕێژی گوللەیان دا و زۆر بە باشی برینداریانکرد. وایان پێوە نابوو، زمانی زگماکی خۆی بیرچووبووەوە و لە نەخۆشخانە، هەر بە ئینگلیزی قسەیدەکرد. بەعسییەکان بەپەلە، بە فڕۆکەی هالیکۆپتەر بردیان بۆ (بەغدا) و دوای دوو ڕۆژ، گیانی پۆخڵی، بە دۆزەخی ئامورادی شادبوو!
کاتێ (ن) ئەو هەواڵەی بیست، لە بەشەکەمان دەسیکرد بە گریان و مامۆستاکانیش سەرەخۆشییان لێ دەکرد. تا ماوەیەکیش (ن) خان، جلی ڕەشی بۆ لەبەرکرد، وەک باوکی مردبێ، وابوو. لە ئەوە دەچوو، ئەو ماوەیەی لەگەڵ (غەفوور)دا بووبێ، کاتێ خۆی بەفیڕۆ نەدابێ، خۆشی لە پێوەندی بێڕەوشتی بینیبێ! (ئەحمەد شەوقی) ڕاستی فەرمووە، کاتێ گوتوویەتی:

إنما الأمم الاخلاق ما بقيت     فإن هم ذهبت أخلاقهم ذهبوا

دوکتۆر (خەلەف)یش، یەکێ لە ئەو بەعسییە خراپانە بوو، زۆر ئازاری خوێندکار و فەرمانبەرە کوردە نیشتمانپەروەرەکانی دەدا. لێپرسراوی (جەیشی شەعبی) زانکۆ بوو. هەمیشە بە جلی سەربازییەوە دەوامیدەکرد. لەبری پێنووس، کلاشینکۆفی هەڵگرتبوو، هەرگیز چەکەکەی لە خۆی جیانەدەکردەوە! ماڵەکەیان لە جادەی (کانیسکان)، لە تەلاری مزگەوتی (قامیشان) بوو. سەرلەبەیانییەکی زوو، پێشمەرگە ئازاکانی تێوشار، بۆی دانیشتن، هەر هاتبووەدەرەوە، دەسڕێژێکی باشیان لێ کردبوو، دوو مامۆستای بەعسی دیکەی لەگەڵ بوو، هەرسێکیان وەک سەگ توپاندن! یەکێکیان ناوی (عەبدولجەبار سەماک) بوو، ماستەری هەبوو، لە کۆلێژی زانستبوو، لەسەر بێڕەوشتی، لە زانکۆی (موسڵ) دەریانکردبوو، لە زانکۆی (سولەیمانی) دامەزرابووەوە.
کاتێ ئەو هەواڵە لە زانکۆ بڵاوبووەوە، بەعسییەکان بەتەواوی زراویانچوو، ترسیان لێ نیشت و تۆقین. زۆربەی مامۆستا بەعسییەکان، بەرەو (بەغدا) و خوارووی (عێراق) هەڵاتن. لە ماوەی (2) ڕۆژدا، زانکۆیان چۆلکرد. ئەوانەی مابوونەوە، لە ترساندا، ڕێزێکی زۆریان لە کوردەکان دەگرت، وڕەی مامۆستا نیشتمانپەروەرەکانیش بەرزبووەوە و لەبنەوە، پیرۆزباییان لە یەکدی دەکرد. مامۆستا میسرییەکانیش، بۆ کوشتنی ئەو کۆمەڵە بەعسییە چەپەڵە، لە مامۆستا کوردەکان زیاتر پێیان خۆشبوو!

## کێشەی خوێندکارە عەرەبەکانی زانکۆ

دەزگە داپڵۆسینەرەکانی (بەعس)، لەنێو شاری (سولەیمانی)، بە تەواوی کۆمەڵانی خەلکیان هەراسانکردبوو. کەسوکاریکی زۆری پێشمەرگەیان، بە بارمتە گرتبوو، ڕەوانەی گرتووخانەکانی نێوەڕاست و خوارووی (عیراق)یان کردبوون. جگە لە ئەوەی سوپای (ئوردوون)یش هاتبوون و دەیانویست، لە جەنگی (کوردستان)دا بەشداربن و دژی هێزی پێشمەرگە بجەنگن.

لەبەرئەوە سەرکردایەتی (پاسوک)، بیریان لە ئەوە کردەوە، کاریکی گرنگ و کاریگەر، لەنێو شاردا دژی ڕژیم بکەن. ملازم (شوان) لێپرسراوی دەستەی پێشمەرگەکانی نێوشار بوو، چەن شەوی بۆسەی بۆ ملازم (موحسین) و سەربازەکانی دانابوو، بەڵام بۆیان ڕێک نەکەوتبوو، دەسیان لێ بووەشێنن. پاشان بیر لە ئەوە دەکاتەوە، کۆمەڵی خوێندکاری عەرەب بگرن و بیانفرێنن، بۆئەوەی هێندێ لە مەرجەکانی خۆیانیان بەسەردا بسەپێنن.

ئێوارەی ڕۆژی (**15. 3. 1981**)، ملازم (شوان) هەلیقوازتبووەوە، بە (**7**) پێشمەرگەوە، سەریان لە بەشی نێوخۆیی خوێندکارە عەرەبەکانی گەڕەکی (سابوونکەران) دابوو، وەک بەشێ لە هێزی تایبەتی سوپای (عیراق)، خۆیان بە خوێندکارەکان ناساندبوو، بە ناوی کۆبوونەوەی (بەعس)ەوە کۆیانکردبوونەوە و قسەیان بۆ کردبوون.

ملازم (شوان) خەلکی (کەرکووک)ە و زمانی عەرەبی باش دەزانێ، بە شێوە زمانێکی زۆر ڕەوان، قسەی بۆ کردبوون. داوای لێ کردبوون، دژی یاخیبووە کوردەکان پارمەتییدەن و چەک هەلگرن. پاشان پرسیاری لە خوێنداکارەکان کردبوو، کێ لە پارتی (بەعس)دا کاردەکا و پلەکانیان چییە؟ ئەوانەی ئەندامبوون و پلەی بەرزیان هەبوو، هەموویان دەسیان هەڵبڕیبوو، ئامادەیی خۆیان پیشاندابوو، چەک هەلگرن. ئەویش ئەو خوێندکارانەی جیاکردبووە و لە ژوورێکدا کۆیکردبوونەوە، (**30**) کەسی پلە بەرزی لێ هەڵبژاردبوون و پێش خۆیانی دابوو. هەر زوو بە چیای (گۆیژە)دا سەریخستبوون و لە شار دەریکردبوون. زۆربەی هەرە زۆریان خوێندکاری (ئوردوون)ی بوون و چەن عەرەبێکی بەعسی (عیراق)یشیان تێدابوو.

بەیانی ڕۆژبووەوە، ئەم پرۆسە گەورەیەی پێشمەرگە کردی، لەنێو شار بە گشتی و زانکۆ بە تایبەتی دەنگیدایەوە. ترس و لەرزێکی زۆری، لە دڵ و دەروونی خوێندکار و مامۆستا عەرەبەکاندا چاند. هێزە ئاسمانییەکانی دەوڵەتی داگیرکەری (بەعس)، بە فڕۆکەی هالیکۆپتەر، ئاسمانی نێوچەکەیان پڕکرد و بە دوای خوێندکارەکاندا دەگەڕان. بەلام هیچیان بە هیچ نەکرد و نەیاندۆزینەوە. ناچاربوون، پێوەندییکەن و بزانن، چییان دەوێ؟! (پاسۆک) دوو داواکاری هەبوو:

* سوپای (ئوردوون) لە (کوردستان) بکشێتەوە.
* خێزان و کەسوکاری پێشمەرگەکان بەرڵابکەن.

بەڵام (سەددام) ئەو پیاوە نەبوو، گیانی کۆمەڵی خوێندکاری عەرەبی لا گرنگ بێ و گوێ لە داواکارییەکانی پارتێکی کوردی بگرێ، با عەرەب و بەعسیش بن! بۆیە ئەو گرفتە، هەر وا بێ چارەسەر مایەوە و ماوەیەکی زۆری خایاند. لە ئەو کاتانەشدا، فەلەستینییەکان داوایان لە (یەکێتی) کردبوو، خوێندکارەکان بەرەڵاکەن. لەبەرئەوە لە هەموو لایەکەوە، گوشارێکی زۆریان بۆ (پاسۆک) هێنابوو. تەنانەت هێزێکی (300) کەسیان بە سەرکردایەتی (مەلابەختیار) کۆکردەوە، پەلاماری بنکە و بارەگەکانی (پاسۆک) بدەن و خوێندکارەکانیان لێ بسەنننەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، سەرکردایەتی (بەعس) دواکارییەکانی (پاسۆک)یان ڕەتکردەوە، کەچی هەر دوای ماوەیە، خۆیان سوپای (ئوردوون)یان لە (کوردستان) کێشایەوە و کەسوکاری هێندی لە پێشمەرگەکانیشیان بەرەڵاکرد، وەک بڕیارێکی خۆیان جێبەجێیانکرد، هەر وەک هیچ شتێ ڕووی نەدابێ، خوێندکارەکان نەفرێترابن و هیچ پێوەندییەکیشی، بە داواکارییەکانی (پاسۆک)ەوە نەبێ!

## پێوەندییەکی ساکار

ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، من و (جووجە) زیاتر لە یەکدی دووردەکەوتینەوە. ناکۆکییەکانی نێوانمان زیادیدەکرد. من لای خۆمەوە هەوڵمدەدا، لە ئاوێنەی دڵ، خانەکانی مێشک و کەژاوەی ئەندێشەی خۆمدا، وێنەی شێواوی بەتەواوی بسڕمەوە. ئەویش هەستی بە ئەوە کردبوو، زۆر مەیلی نەمابوو. هیچیشمان هەنگاوێکمان نەنا، تا هەوڵبدەین، پێکەوە دانیشین و گرفتەکانی نێوانمان چارەسەرکەین. ئیدی بێ ئەوەی هەستیپێبکەم، یا پلانی دانێم، تۆوی خۆشەویستییەکی نوێی دیکە، لە بڵەی هەتیوی خێرنەدیومدا دەڕوا، وردە وردە چەکەرەیدەکرد و سەریدەردەهێنا. بەڵام بێ ئەوەی بزانم، بۆ و چیم دەوێ؟

ئەو ئێوارەیەی ساڵی (1970)، لە ئاهەنگی نیشانەکردنی مامە (سالح) و (گەلاوێژ)ی دەزگیرانی بووم، گەلێ وێنەمان گرت. لە یەکێ لە ئەو وێنانەدا من و مامم و دەزگیرانەکەی دانیشتبووین، لە پشتمانەوە، (ئاوات)ی خوشکە چکۆلانەکەی خاتوو (گەلاوێژ) وەستابوو، ئەویش لە وێنەکەدا دەرچووبوو. ئەو کاتە تەمەنی (10) ساڵانبوو. ئیدی من لە ئەو ڕۆژەوە، تا ساڵی (1980) نەمبینیبووەوە. (ئاوات) کچێکی زۆر جوانبوو، تازە پەیمانگەی ژمێریاری تەواوکردبوو.

## خۆشەویستیی و ژنهێنان

ئەو کیژانەی، لە سەردەمێکی دیاریکراوی ژیانی لاوێتیمدا، خۆشمویستوون، چەن ساڵێکی تەمەنی خۆم، لەگەڵدا بەهەدەردابوو، وەک تاوس وابوون. چونکە تاوس، باڵندەیەکی زۆر ئیسکسووک و جوانە، پەڕ و باڵێکی گەلێ جوان و ڕەنگینی هەیە، بەلام نەگۆشتی دەخورێ و نە بەکەڵکی هیچیش دێ! ئاخر هەمیشە، لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانمدا، چەن کیژێکی لاواز و ترسنۆک، هەلپەرست و بێ هەڵوێستم خۆشویستووە، هەڵبەتە لە کاتێکی نالەبار و لە شوێنێکی نەگونجاودا، دڵداریمکردووە. بۆیە هەموو درەختەکانی باخی خۆشەویستیم، بێ بەربوون! بەلام <u>هەمیشە بڕوام بە ئەوە هەبووە و هەیە، خۆشەویستیی لە هەموو تەمەنێکدا، لەدایکدەبێ، چەن جارێ دووبارەدەبێتەوە، بەرۆکی مرۆ دەگرێ و وازی لێ ناهێنێ، وەک تووی گوڵەباخ دەڕوێ و گوڵی جوانی بۆنخۆش دەگرێ، سەراپای ژیانی مرۆ دەگۆڕێ و دەیرازێنێتەوە!</u>

ئەز جگە لە خۆشەویستی یەزدان، بڕوام بە هیچ جۆرە خۆشەویستییەکی نەمر نییە. هەموو خۆشەویستییەکیش، گەر ئەنجامێکی باشی نەبێ، ڕێزی لێ نەگیرێ، بەرەبەرە لەبیردەچێتەوە و وەک بیرەوەرییەک، لە ژیانی مرۆدا دەمێنێتەوە! ئەم بۆچوونەشم، لە ڕەشبینی و نائومێدییەوە نییە، بەڵکوو لە ڕیالبینی و گەشبینییەوە هاتووە، لە ئەنجامی ئەزموونێکی تایبەتی خۆم و هاوەڵەکانمەوە، لام درووستبووە و پێموایە، بەگوێرەی قۆناغەکانی تەمەن، مرۆ دەبێ، چێژ لە ژیانی تایبەتی خۆی وەرگرێ. واتە، ئەو تەمەنە کورتەی یەزدان پێی بەخشیوە، بە خۆشی و کامەرانی بەسەرببەرێ، هێندە بیر لە ناخۆشییەکان بکاتەوە، کەڵکیان لێ وەرگرێ، تا جارێکی دیکە، بەرۆکیان نەگرێتەوە! ئەگینا کەس نییە، دوای جیابوونەوە و لەدەسدانی خۆشەویستی، یا مردنی کەسێکی نزیکی بتوانێ، لەسەر ژیان بەردەوامبێ. چونکە ژیان خۆی پرۆسەیەکی سرووشتی و زیندووە، هەر بەردەوامە و هەر بەردەوامیشدەبێ، چاوەڕێی کەس ناکا و پرسیان پێ ناکا!

لەبەرئەوە بڕواناکەم، هیچ شتێ لە ژیانی مرۆدا، هێندەی خۆشەویستی و نیشتمانپەروەری ڕاستەقینە، بە تام و خۆش بێ، مرۆ چێژی لێ وەرگرێ و لە بەهەشتی دڵداری و سەرفرازیدا، بە خۆشی بژێ! بە مەرجێ ڕاست، خاوێن، بیفێڵ و بنچینەیەکی هەبێ، لەسەر بناغەی ڕێز و خۆشەویستی بەرابەری هەڵچنرابێ، وەک گوتوویانە: دڵ ئاوێنەی دڵ بێ! جا نازانم، ئەوانەی لە ژیاندا خۆیان وشککەکەوە، بڕوایان بە خۆشەویستی و ئەڤین نییە، کاتی خۆیان چۆن بەسەردەبەن، بیر لە چی دەکەنەوە و چۆن دەژین؟!

دوای ئەوەی لەگەڵ (جووجە)، پێوەندییەکەمان سەرکەوتوو نەبوو، بە هیچ شێوەیە لە ژیان و خۆشەویستی ڕاستەقینە نائومێد نەبووم. بەلام پتر بیرم لە ئەوە دەکردەوە، <u>هەر</u>

خۆشەویستییەک، زۆر درێژەیکێشا، ئەنجامەکەی باش نابێ، چونکە سەردەمەکان جیاوازن و سەردەمی (شیرین و فەرهاد، خاتووزین و کاکەمەم، لەیل و مەجنوون ...) نەماوە، هەم دونیا و هەم خەڵکیش گۆڕاون! لەبەرئەوە بیرم لە ئەوە دەکردەوە، گەر چیرۆکێکی نوێی دیکەی خۆشەویستی، لە دەرگەی دڵە ناشادەکەمی دا، ئەوا هەر زوو یەکلایەکەمەوە و خێزانێکی چکۆلانە پێکدێنم. چونکە تازە لە ئەو تەمەنەدا نەمابووم، سەرەداوی خۆشەویستییەکی دیکەی نوێی درێژخایەن، لەگەڵ هیچ کیژە کوردێکدا گرێدەم. جگە لە ئەوەی، لە ئەنجامی ئەو هەموو ئەزموونەی لە ژیانمدا کەڵەکەبووبوون، بۆم دەرکەوتبوو، هەر خۆشەویستییەک، ماوەیەکی دووروودرێژ بخایەنێ، ناکۆکی و گرفت، لەنێوان خۆشەویستەکاندا درووستدەبێ و چاوەڕوانی پاشەڕۆژێکی زۆر باشی لێ ناکرێ!

بۆ نموونە: من و (ژیان)، نزیکەی (3) ساڵ پێکەوەبووین. من و (جووجە)ش بە هەمان شێوە، نزیکەی (3) ساڵ پێوەندی خۆشەویستیمان هەبوو. بەڵام پێک نەگەیشتین و ئەوەش ئەنجامەکەی بوو. بۆیە بڕیارمدا، یەکسەر ژنبێنم!

دیارە، دوای ئەوەی ئەو شتانەم لە (جووجە) بینی، ئیدی بەیەکجاری بڕیارمدا، وازی لێ بێنم. لە ڕاستیدا، هەر لە مانگی دووەوە، هەموو ڕۆژێ هەستمدەکرد، مەیلێکی تایبەتیم بۆ (ئاوات) هەیە. لە سەرەتای مانگی مارسدا، پتر لە یەکدی نزیکبووینەوە، حەزمدەکرد، هەموو ڕۆژێ ڕووخساری جوان و شیرینی ببینم. گوێم لە دەنگە بەسۆزەکەی بێ. هەستمدەکرد، گەر ڕۆژێ نەیبینم، بیریدەکەم، لە دڵی خۆشمدا دەمگوت: تۆ بڵێی، ئەوە تۆوی خۆشەویستییەکی نوێ بێ، لە ئێنجانەی دڵمدا بڕوێ و چەکەرەبکا؟! ئەدی خۆشەویستی چییە، گەر ئەوە نیشانەکانی نەبێ؟!!

ئەوەبوو، لە مانگی (5)دا داوای (ئاوات)م کرد. دوای ماوەیەکی کورت، وەڵامیاندایەوە و قایلبوون. هەر زوو هەردووکمان، پێکەوە چووین بۆ (کەرکووک)، ئەڵقە و دیاریمان کڕی. لەبەر ئەو ڕەوشە خراپەی (کوردستان)یش، نە شەکراومان خواردەوە و نە ئاهەنگیشمانگێڕا! ڕۆژی (27 .5 .1981)یش مارەمکرد. ئیدی شەو و ڕۆژ پێکەوەبووین و لە یەکدی دانەدەبڕاین. ئەو ماوەیەمان، زۆر بە خۆشی بەسەربرد. لەگەڵ (شوان)ی هاوڕێم و (سەیران)ی دەزگیرانیدا، هەمیشە لە سەیران و گەڕان بووین. ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، پتر لێی شارەزادەبووم، ڕێز و خۆشەیستیمان، بۆ یەکدی زیاتردەبوو.

گرنگ ئەوەبوو، ماڵی خەزوورم، کوردایەتییان بە شیرەوە خواردبوو، کچ و کوڕیان، زۆر نیشتمانپەروەربوون. لەبەرئەوە ماڵەکەیان بۆ من، وەک بنکەیەکی نهێنی (پاسۆک)ی لێهات. هەموو مۆر و دەکۆمێنتەکانی (پاسۆک)م، لە ئەوێ شاردەوە. خاتوو (ئاقتاو)ی خەسووم، هەمووی بۆ حەشاردام. چونکە هیچم لێ نەدەشاردنەوە و ئەوانیش، ئاگایان لە هەموو هەڵسوکەوت و کارەکانم بوو!



سەرلەبەیانی مانگی (5)ی ساڵی (1981)، لە باخچەکەی ماڵی خەزوورم گیراوە.

## بڕیارێکی چاوەڕواننەکراو

بەعسییەکان بە هیچ جۆرێ نەیانئەتوانی، کۆنترۆڵی نێوشاری (سولەیمانی) بکەن و گیانی کادیرەکانیان بپارێزن. چونکە هەر وەک (سەددام) دەیگوت: (سولەیمانی شارێکی سەرسەختە!) لەبەرئەوە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی (بەعس) بڕیاریاندا، زانکۆی (سولەیمانی) بۆ شاری (هەولێر) بگوێزرێتەوە.
ئەو هەواڵە، هەواڵێکی زۆر ناخۆشبوو. زیانێکی زۆر گەورەی، بە زانکۆ و خەڵکی شارەکە گەیاند. کەس چاوەڕێی ئەو بڕیارە نابەجێیەی نەدەکرد. بەڵام (سەددام) پیاوێکی هێندە سەیربوو، هەرچی بە بیر و هۆشی مرۆڤدا نەدەهات، ئەو دەیکرد! بۆیە بڕیاردرا، ڕۆژی (**15. 7. 1981**)، دەس بە گواستنەوەی کەلوپەلەکانی زانکۆ بکەن.

## ڕەوشی کوردستان و شۆڕش

دوای ئەوەی ئەو بڕیارەدەرچوو، بە هیچ شێوەیە نەمدەویست، بچم بۆ (هەولێر) و پابەندی بڕیارەکەبم. جگە لە ئەوەی، ڕەوشی نێوشاری (سولەیمانی) بە تایبەتی و (کوردستان) بە گشتی، ڕۆژبەڕۆژ بەرەو خراپتردەڕۆی. لەلایەکەوە هێندەی نەمابوو، لەدایکبووانی ساڵی (**1950**)، بۆ ڕاژەکردنی سەربازی بانگکرێن. منیش لە ئەو جۆرە کەسانە نەبووم، سەربازی بۆ دەوڵەتی داگیرکەری (بەعس) بکەم و دژی گەلەکەی خۆم، چەک هەڵگرم!

لەلایەکی دیکەشەوە، (سەلاح)ی برام، پێشمەرگەی (یەکێتی) بوو، بە سەردان هاتبووەوە، نامەیەکی (ئازاد)ی بۆ هێنابووم، بۆی نووسیبووم: خۆت فریای خۆت نەکەوی، کەس فریات ناکەوی. گەر ناتەوێ، بێیتەدەرەوە، ئەوا لە (سولەیمانی) دامەنیشە و بۆ شوێنێکی دیکە برۆ. هەر بە نامەکەیدا زانیم، لەگەڵ (یەکێتی) زۆر ناکۆکن و تەنگیان پێ هەڵچنیون، پێیان لێ کردوونەتە کەوش و نەیانەوێ، سەریان پێ شۆڕکەن. بە ناچاری ماوەیە خۆم شاردەوە، لە شوێنە گشتییەکان، زۆر خۆم دەرنەدەخست. بە ڕۆژ لە زانکۆ نەدەجووڵام و تا کاژێری (5)ی ئێوارە، کارمدەکرد. ئێوارانیش لە خوێندنگەی شەو، وانەی کیمیام بە پۆلی یەک دەگوتەوە. پاشان لە ئەوێشەوە، لەگەڵ هاورێکانمدا شەوەکەمان لە یانەی فەرمانبەران بەسەردەبرد. دوایی دەرۆشتمەوە و هەر شەوەی لە ماڵی دەنووستم، بەڵام بەزۆری، لە ماڵی (شوان)ی هاوڕێم و لە (سەرچنار) لە ماڵی مامم دەمامەوە!

لەبەرئەوە هیچ چارم نەما و بڕیارمدا، خۆم یەکلایکەمەوە و بچمەدەرەوە. هەموو شتێکم لەنێوشاردا برانەوە. ترومبێلەکەم فرۆشت، ئەو پەرتووکانەی لەنێوشاردا کۆمکردبوونەوە، لەگەڵ (مەلاشوان)دا، بۆ ماڵی هاوبیرێکی دیکە گواستمانەوە، (مەلاشوان)م بە (مژدە تایەر) ناساند. تا دوای من، پێوەندی نێوشار و دەرەوە نەپچڕێ. (مژدە) لەجێی من بوو بە لێپرسراوی لقی (سولەیمانی) و هەموو شتەکانم دایە. لەگەڵ (ئاوات)یشدا ڕێککەوتین، بچینەدەرەوە، ئەویش لەگەڵم بێ و یارمەتیماندبدا. بەڵام سەبارەت ئەو بڕیارەی خۆم، هێشتا بە برادەرانی سەرکردایەتیم نەگوتبوو!

من لە ئەم بیرکردنەوە و تەگبیرکردنەدا بووم، کەچی لەپڕ لە (شاربازێڕ)، شتێکی زۆر ناخۆش و دڵتەزێن ڕوویدا، هەموو نەخشە و پلانەکانی منی، بەجاری گۆڕی، وەک دەڵێن: ڕیسەکەی کردمەوە بە خوری! چونکە (یەکێتی) و (پاسۆک)، پەلاماری یەکدیان دا، دەسیان بە خوێنی یەکدی سووربوو، سەری دونیان لە (پاسۆک) هێنایەوەیەک!

## شەڕی نێوان یەکێتیی و پاسۆک

ئەوەتەی (پاسۆک) و پارتەکانی دیکە لە (یەکێتی) جیابوونەوە، ئەندامانی سەرکردایەتی (یەکێتی) دەیانویست، هەموو (کوردستان) بەگشتی و شاری (سولەیمانی) بەتایبەتی کۆنترۆڵکەن. بەتەنیا هەر خۆیان هەبن، هیچ کەس و لایەنێکی دیکە نەبێ، هاوبەشییانبکا و ڕێی کەس نەدەن، چالاکی بنوێنێ. ئەمەش تێڕامینێکی توندڕەوانەی پەرگیرانە بوو.

لەو کاتەش سەردەمی گەشەکردن و بەهێزبوونی (پاسۆک) بوو، لاوێکی کوردپەروەری زۆر، ڕوویانتێکردبوون و کاریاندەکرد، ڕۆژبەڕۆژ پەرەیدەسەند و زیادیدەکرد. لای جەماوەری گەل، ڕێزێکی تایبەتیان هەبوو، بەتایبەتی هێشتا (پاسۆک)، لە جەنگی چەپەلی

نێوخۆوە تێوە نەگلابوو. سەرانی (یەکێتی)ش دەمێبوو، خۆیان لە هاوبیرانی (پاسۆک) دەخواردەوە و داتیان لێ دەکروشتن. چونکە سەرکردایەتی (پاسۆک)، زۆر ئازایانە و بەڕاشکاوی، لە بڵاوکراوەکانیاندا دژی جەنگی کوردکوژی، دید و بۆچوونی خۆیان دەردەبڕی. کارە خراپەکانی (یەکێتی)یان لەقاودەدا و پێوەندیشیان لەگەڵ (پارتی)، زۆر باشبوو. هەروەها لەنێوشاریشدا، کۆمەڵێ چالاکی سەربازییان نواندبوو، دەستێکی باشیشیان لە کادیرەکانی (بەعس) و هێندێ خۆفرۆشی کورد وەشاندبوو، خوێندکارەکانی زانکۆشیان فراندبوو. ئەمانە هەموویان پێکەوە، دەلاقەیەکی گەورەیان، لە پێوەندییەکانی نێوان (پاسۆک) و (یەکێتی) درووستکردبوو!

لەبەرئەوە بۆ بیانوویەک دەگەڕان، تا پەلاماری (پاسۆک)یش بدەن. لە هەر گوندێ، هاوبیرانی (پاسۆک)ی لێ بووایە و قسەیان بۆ خەڵک بکردایە، ئەوان دەچوونە سەر خەڵکی گوندەکە، هەڕەشەیان لێ دەکردن و دەیانگوت: نابێ، ڕێزیان لێ بگرن، نانیان بدەنێ و گوێ بۆ قسەکانیان ڕادێرن. بڵاوکراوەکانیان دەدڕاندن. ئەو درووشمانەی بە ناوی (پاسۆک)یشەوە، لەسەر دیواری مزگەوتی گوندەکان دەنووسران، هەموویان دەکوژاندنەوە. بە کورتییەکەی، تەنگیان پێ هەڵچنیبوون و دەیانویست، پەڕ و باڵی (پاسۆک) بکەن و توانای فڕینیان نەهێڵن!

(فارس، بێستوون و دارا)، سێ پێشمەرگەی (پاسۆک) بوون. لە نێوچەی (شارباژێڕ) لە گوندی (مامخەلان) بوون. (بێستوون) پێشمەرگەیەکی لاوی تازە پێگەیشتووی ئازای جەربەزەی دەسوەشێنی (پاسۆک) بوو، بە (بێستوونە سووری ئاسنگەر) ناسرابوو. لەنێو شاردا سێ جار، دەستی لە هێزەکانی دوژمن وەشاندبوو. سەرانی (یەکێتی)، بە ئەو جۆرە چالاکی و نەبەردانە، زۆر تەنگەتاوبووبوون و تەنگژەگرتبوونی. وایاندەزانی، لە ناوبانگ و دەسەڵاتی ئەوان کەمدەکاتەوە. یا (کوردستان) و شۆڕشەکەی، تەنیا موڵکی ئەوانە، هیچ گرووپ و پارتێکی دیکەی رامیاری نابێ، بێ پرسی ئەوان، ئەو جۆرە کارانە بکا!

لەبەرئەوە ڕۆژی (**24. 6. 1981**)، هێزێکی (یەکێتی) ژمارەیان (**36**) پێشمەرگە بوو، لە گوندی (مامەخەلان) دوزیبوویانەوە، پەلاماریاندابوون، (فارس) و (بێستوون)یان کوشت بوو. (دارا)ش منالکاربوو، ڕایکردبوو، خەڵکی گوندەکە بەزەییان پێدا هاتبووەوە، داپیرەیەک لەنێو کادانیماڵەکەی خۆیدا شاردبوویەوە. پێشمەرگەکانی (یەکێتی)ش، زۆر بە دوایدا گەڕابوون، بەڵام نەیاندۆزیبووەوە. پاشان (دارا) خۆی دەربازکردبوو، خۆی گەیاندبووە گوندی (گەرەدێ)، ڕووداوەکەی بۆ ملازم (کەریم) و ئەوان گێڕابووەوە.

ئەو کاتە زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەی سوپایی ئەفسەرەکان (کەریم، شوان، سەیفوڵڵا و نەسرەدین)، لە ئەوێ بوون. نزیکەی (**60**) پێشمەرگەشیان لەگەڵ بوو. کاتێ پێشمەرگەکان

گوێیان لە قسەکانی (ئارا) بووبوو، هەموویان گوتبوویان: یا چەک دادەنێین، یا دەبێ، تۆڵەی هاوبیرەکانمان بکەینەوە. گەر ئێستە هیچ نەکەین و بێدەنگبین، پێشمەرگەکانی (یەکێتی)، سواری سەرمان دەبن و هەموومان دەکوژن. پاشان هەر (4) ئەفسەرەکە کۆبووبووبوونەوە و بڕیاریاندابوو، تۆڵەی (فارس) و (بێستوون) بکەنەوە.

پێشمەرگەکانی (پاسۆک)، شەو لەنێو گوندەکەدا نەمابوونەوە، بەڵکوو ئێوارە بە چیاکەی پشت گوندەکەدا سەرکەوتبوون و لە ئەوێ مابوونەوە. مامۆستا (جەمال) ناوێ، لێپرسراوی دەستەیەکی پێشمەرگەی (یەکێتی) بوو، (6) پێشمەرگەی لەگەڵ بووبوو، لەنێو شاری (سولەیمانی) گەڕابوونەوە و لە (گەرەدێ) لایاندابوو. ڕۆژی (25. 6. 1981)، پێشمەرگەکانی (پاسۆک) هەرچواردەوری گوندەکەیان گرتبوو، لێیان بووبوو بە شەڕ، لە ئەنجامدا (جەمال) و پێشمەرگەکانی (یەکێتی) و پێشمەرگەیەکی (پاسۆک)یش کوژرابوون. ئەم هەواڵە جەرگبڕە، بە هەموو (کوردستان)دا بڵاوبووەوە. کۆمەڵانی خەڵک بێ ئەوەی، گوێ بە ئەوە بدەن، لەسەر چی بووە و کێ دەسپێشخەربووە، جگە لە (پارتی) دووشەشیان بوو، یەکسەر زۆربەی هەرە زۆری ڕۆڵەکانی کورد، دژی ئەو کاردانەوەیەی (پاسۆک) وەستانەوە. سەرکردایەتی (یەکێتی)ش نیازیانوابوو، پێشمەرگە و ئەندامانی (پاسۆک)، بەیەکجاری لەنێوبەرن و پاکتاویانکەن. بۆیە فرمانیان بۆ هێزەکانیان دەرکرد، لەنێوشار و شاخ، هەڕەشەی مەرگ لە هەموو ئەندامان و پێشمەرگەکانی (پاسۆک) بکەن، تا وازبێنن، کار لەگەڵ (پاسۆک) نەکەن و دانیشن، گەر وازنەهێنن، هەموویان بکوژن!

بەڕاستی، کاتێ ئەم هەواڵە جەرگبڕەم بیست، بێ ئەوەی هێشتا، هەموو ڕەهەندەکانی ئەو کارەساتە بزانم، بەجارێ تاسام، وڕبووم، ئەژنۆم شکا و جەرگم بڕا! چونکە ئەوەی من لێی دەترسام، زۆر خراپ ڕوویدا. ئاخر هەمیشە لە ئەو نامانەی بۆ سەرکردایەتیم دەنارد، هەموو جارێ پێم لەسەر خاڵێ دادەگرت، دووبارەمدەکردەوە و دەمنووسی: بە هیچ شێوەیە نابێ، (پاسۆک) خۆی لە قەرەی جەنگی نێوخۆی نێوان (پارتی) و (یەکێتی) بدا و دەبێ، دۆستایەتی هەموو لایەنەکان بکا، ڕۆڵی مامەی ڕیشسپی ببینێ و هەوڵێکی زۆریان لەگەڵ بدا، کۆتای بە ئەو ناکۆکی و جەنگە نێوخۆییەی نێوانیان بێنن. چونکە ئێمە خۆمان بە نەتەوەیی دەزانین و خەڵکی نەتەوەیش هەرگیز نابێ، بەشداری ئەو جۆرە جەنگە چەپەڵانە بکا و دەستی بەخوێنی براکانی خۆی سووربێ!

بەڵام تازە کارەساتەکە ڕوویدابوو، منیش نەمدەزانی، چۆن وەڵامی خەڵک بدەمەوە. سەیر ئەوە بوو، زۆربەی خەڵکی (سولەیمانی)، جیاوازییان لە نێوان (شێخ مەنسووری شێخ کەریمی حەفید)ی پارێزەری سەر بە (حسک) و (شێخ مەنسووری شێخ کەریمی

حەفید)ی ئەفسەری ئەندامی سەرکردایەتی (پاسوک)دا نەدەکرد. بە خۆڕای تاوانباریان دەکردین و زۆر بێویژدانانە، تفەنگیان بە تاریکەشەوە دەنا و دەیانگوت: ئەم ڕووداوە، دەسی (شێخ جەعفەر)ی پارێزگاری (سولەیمانی) تێدا هەیە، چونکە خاڵی (شێخ مەنسووری حەفید)ی پارێزەربوو، وایاندەزانی، ئەویش (پاسوک)ە، یا هەردووکیان یەک کەسن!

لە هەمووشی سەیرتر ئەوەبوو، پێش ئەوەی ئەو کارەساتە ڕوویدا، نامەم بۆ باپیرم بردبوو، یارمەتی (پاسۆک) بدا. ئەویش بڕیاریدابوو، زەکاتی ئەو ساڵەمان بداتێ. بەڵام دوای ئەو ڕووداوە، سەرم لێ دایەوە و داوای یارمەتییەکەم لێ کرد. مامە (بەکر)م گوتی: باشبوو، دواکەوتی و زەکاتەکەمان بە ئەو پیاوکوژانە نەدا، چونکە (7) پێشمەرگەی (یەکێتی)، بە دەسی ئەو جاشانەی (شێخ جەعفەر) شەهیدبوون. ئێمەش پەشیمانبووینەوە و یارمەتییان نادەین.

بەڕاستی، دوای ئەو کارە هەڵەشەیەی، ئەو برادەرانە کردیان، یەک کەس ئامادە نەبوو، نەک هەر یارمەتیمان بدا، بەڵکوو تەنانەت دانێکی خێریشمان پێدابنێ. منیش پێتاک کۆکردنەوەکەم وەستان. هەرچی چۆنێ بوو، لە (700) دینار زیاترم بۆ کۆنەکرایەوە. کاتێ ڕۆیشتیشم، پارەکەم دا بە (مژدە تایەر)، بۆیان بنێرێ.

## ئاگادارکردنەوە

ملازم (عومەر)، لێپرسراوی بیرۆی سەربازی (یەکێتی) بوو، بەپەلە نامەیەکی بۆ (مازنی عوسمان فایەقی) هاوڕێم ناردبوو، داوای لێ کردبوو، من و (شوان)ی برای ئاگادارکاتەوە، ئاگامان لە خۆمان بێ. تا دەمرم، چاکەی ئەو پیاوە کوردپەروەرەم بیرناچێتەوە و دوای ڕاپەڕینیش، شەوێ لە (لەندەن) پێکەوەبووین، زۆر سوپاسمکرد و گوتی: من ویستوومە، لە ئەوە زیاتر، خوێن نەڕژێ!

جگە لە ئەوەی ئەو کاتە، (شێخ ناسری حەفید)، لە دەرەوەبوو، هێشتا خۆیان لەسەر هیچ لایەک ساغ نەکردبووەوە، بەڵام دۆستایەتی لەگەڵ (یەکێتی)دا هەبوو. ڕۆژێ گوێی لێ دەبێ، لە چادرەکەی (نەوشیروان مستەفا)دا، هێندێ ئەندامانی سەرکردایەتی ناوی من دەهێنن و دەڵێن: (شێخ حوسێن)، لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی نێوشاری (پاسوک)ە و دەبێ، بکوژرێ. (شێخ ناسر)یش وەک دۆستێکی (پاسۆک) و هاوڕێیەکی نزیکی خۆم، بەپەلە خۆی گەیاندەبووە (ئازاد)، ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاندبوو، گوتبووی: وەڵامی بۆ بنێرن، ئاگای لە خۆی بێ و تا لایەبەلایەکدا دەکەوێ، ماوەیە خۆی بشارێتەوە، چونکە (یەکێتی) دەیکوژێ!

بێ ترومبێل هیچم بۆ نەدەکرا، چونکە نەمدەتوانی، ئیشەکانم بەپەلە راپەڕێنم. لە ئەوەش دەترسام، گەر بەپێ بگەڕێم، لە کۆڵانێ یا لەسەر جادەیەک، مناڵی بنێرن و بە فیشەکێ ساردمکاتەوە. لەبەرئەوە خێرا لادایەکم لە خوالێخۆشبوو (لەتیفی حاجی فەرەج)ی هاوڕێم کڕی و گوتی: هەر کاتێ ویستت، بیفرۆشیتەوە، خۆم لێت دەکڕمەوە. ئەو ماوەیەی لەنێو شاردا بووم، هەموو ئیشەکانی خۆمم پێ جێبەجێکرد.

رۆژی (1. 7. **1981**)، بەپەلە نامەیەکم بۆ سەرکردایەتی نووسی و بە (مەلاشوان)دا ناردم، تا بزانم، هۆی راستەقینەی ئەو کارەساتە چی بووە؟! نیازی چیان هەیە؟! بۆم نووسیبوون: هەڵەیەکی زۆر گەورەتان کردووە و گەلێ سەرزەنشتکردبوون. ئێوە لەبری دوو پێشمەرگەی (پاسۆک)، حەوت پێشمەرگەی (یەکێتی)تان کوشتووە! ئەمە هەر لە تۆڵەسەندنەوەی تیرەگەری دەچێ، لەبری مریشکێ، مانگایەک بکوژنەوە! بەلام بە هیچ شێوەیە، دەنگ و رەنگی (مەلاشوان) نەبوو. لەبەرئەوە لە تاواندا، هەم بۆنەوەی سۆراغێکی (مەلاشوان) بزانم، هەم هەواڵی ببیستم و بزانم، پلانی داهاتووی هاوبیرانی سەرکردایەتی چییە، بریارمدا، سەری لە (سیتەک) بدەم.

## گەڕان بەدوای هاوبیراندا

رۆژی (4. 7. **1981**) بوو، بە ناوی سەیرانەوە، (ئاوات)ی دەزگیرانم و ماڵی خوشکم، لەگەل خۆم برد و چووین بۆ دەوروبەری (سیتەک). لە ئەو ناوە دابەزین و بە ناوی وێنەگرتنەوە، خۆمان سەرقاڵکردبوو، تا یەکێ پەیدادەبێ. هەرچەندە نەمدەزانی، پێشمەرگەکانی (پاسۆک) لە کوێن، بەلام زۆربەی کات، لە دەوروبەری (سیتەک) و سەرڕێی (دووکانیان) بوون. بیرم لە ئەوە کردەوە، بەڵکوو لە بن دەوەنێکەوە، پێشمەرگەیەکی (پاسۆک) دەرپەڕێ و بیانبینم، تا هەواڵی بزانم. زۆر چاوەڕێمکرد و گەڕاین، هیچ کەلکی نەبوو.



ئەم وێنەیە نزیک گوندی (سیتەک) گیراوە، دوای ئەوەی (ئاوات)م نیشانەکردبوو.

بەڵام پێش ئەوەی بگەینە (سیتەک)، پێشمەرگەیەک بە جلیکانیکەوە، دەستی لی ڕاگرتم، دیاربوو، بەنزیتی دەویست. هەر لە دوورەوە ناسیمەوە، (ئاراسی حەمەلاو) بوو. ئەو کاتە پێشمەرگەی (حسک) بوو. کاتی خۆی ساڵی (**1974**)، لە هێزی (خەبات) پێکەوە پێشمەرگە بووین. دابەزیم و یەکدیمان ماچکرد. هەواڵی برادەرانی (پاسۆک)م لی پرسی، گوتی: دوای ئەوەی لەگەڵ (یەکێتی) تێکچوون، هەموویان بۆ سەرکردایەتی گەڕانەوە و کەسیان لە ئەم ناوە نەماون. ئیدی بە نائومێدی لە ڕێی (دووکانیان)ەوە گەڕامەوە!

## نامەی ملازم مەنسوور

(مەنسوور)، نامەیەکی بۆ ناردم و نووسیبووی: من لە ئەوی نەبووم و بە هیچ شێوەیە، ئاگام لە ئەو کوشتارە نییە، گەر لە ئەوی بوومایە، نەمدەهێشت، ئەو کارە ڕوویدا. بەڵام سەبارەت پلانی داهاتوویان و چۆن چارەسەری ئەو گرفتە گەورەیە دەکەن، هیچی بۆ نەنووسیبووم!

منیش تا ڕۆژی (**11. 7**)، چاوەڕێی (مەلاشوان)م کرد، بەڵام هیچ دەنگی نەبوو. ئیدی هیوابڕاویبووم. لەبەرئەوە سەرم لە ماڵی باوکی دا. باوکی بە دووچاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی: (کەمال) ڕۆی، تازە ناگەڕێتەوە. منیش دڵنیامکرد و گوتم: مەترسە، دێتەوە. کە هاتەوە، پێی بڵێ: مامۆستا (حوسێن) هاتبوو، چاوەڕێتدەکا.

ئەو برادەرانەی (یەکێتی)، زۆر بە هەڵە لە (پاسۆک) تێگەیشتبوون. وایاندەزانی، هەرچی ڕۆژی لە ڕۆژان سووکە پێوەندییەکی لەگەڵ (کاژیک)دا هەبووبێ، نەتەوەییانە بیربکاتەوە و لەگەڵ خۆیاندا نەبێ، ئیدی ئێستە لەگەڵ (پاسۆک)دا کاردەکا! بۆیە کۆمەڵی نامەیان، بۆ چەن کەسێکی وەک (شوانی عوسمان فایەق، کاوسی عەزیزبەگ، عومەری حەمەشەمەیی ...) نووسیبوو، هەڕەشەیان لی کردبوون، واز لە (پاسۆک) بێنن، ئەگینا دەیانکوژن!

لە ڕاستیدا، هیچیان کاریان لەگەڵ (پاسۆک) نەدەکرد. گەر (کاوس) و (عومەر)، ڕۆژی لە ڕۆژان (کاژیک) بووبن، ئەوا (شوان) نەک لە (کاژیک) و (پاسۆک)دا نەبوو، بەڵکوو هەرگیز لە هیچ ڕێکخستنێکی دیکەی کوردی، (کوردستانیی) و (عێراق)یشدا، کاری نەکردووە!

## بەرەو ئەورووپا

هەر لە ئەو ڕۆژەی (سەروەت) وڵاتی بەجێهێشتبوو، لە (ئەمسا) گیرسابووەوە و جێگیربووبوو، بەیتاپەیتا نامەی بۆ دەناردم و هانیدەدام، بەرەو (ئەورووپا) بکشێم و خوێندنەکەم تەواوکەم. هەر زوو پێی ڕاگەیاندم، لە (یەکێتی سۆڤێت) بەڵێنیانداوە، چەن

کورسییەکی خوێندنیان بدەنێ. منیش دوای ئەو ڕووداوانە، یەکسەر لە چوونەدەرەوە پەشیمانبوومەوە و بڕیارمدا، تا زووە خۆم ڕزگارکەم و بەرەو دەرەوەی وڵات بڕۆم. کاتێ لە ئەوی هەموو شتێکم بۆ ڕوونبووەوە، ئەو کاتە بڕیاری تەواوبدەم.

لە ئەو کاتەدا، بڕیاری گواستنەوەی زانکۆ دەرچووبوو، لە هەموو کۆلێژ و بەشەکاندا، لیژنەی گواستنەوە دامەزرابوو. منیش ئەندامی لیژنەی بەشەکەی خۆمان بووم. بە هیچ جۆرێ، مۆڵەتیان بە کەس نەدەدا، بە هیچ لایەکدا بڕوا. پەنام بۆ ڕەوانشاد دوکتۆر (خەسرەو شاڵی) برد و زۆر بە ئاشکرا، هەموو شتەکانم تێگەیاند. ئەویش گوتی: نووسراوی بنووسە، با سەرۆکی بەش واژۆیکا، تا لە دواڕۆژدا، تووشی گێچەڵ نەبم. منیش هەر ئەو ڕۆژە، داواکارییەکم نووسی و بردم بۆ سەرۆکی بەشەکەمان. دوکتۆر (خالید) هەر خوێندییەوە، گوتی: ئەکەی نەگەڕێیتەوە، تۆ مامۆستایەکی باشی، بەڵێنت دەدەمێ، ساڵی داهاتوو، یارمەتیتدەدەم و لە ماستەر وەربگیرێی.

منیش گوتم: من چۆن زانکۆ بەجێدێڵم، تەنیا مۆڵەتی یەک مانگم دەوێ و بۆ مانگی هەنگوینی، دەچم بۆ (بولگاریا)، ئیدی یەکسەر ڕازیبوو.

دوکتۆر (خالید) وایدەزانی، لەبەرئەوە بۆ دەرەوەی وڵات هەڵدێم، چونکە لە ماستەر وەرنەگیراوم. نەیدەزانی، لە چی دەترسم و لە ناو چیدیکە ڕادەکەم! ئاهەقی ناگرم، بە ئەو چەشنە بیربکاتەوە، چونکە کەس هیچی لە من نەدیبوو، هیچ جۆرە بەڵگەیەکیشم، بەدەستەوە نەدابوو. جگە لە ئەوەی (4) جار تاقیکردنەوەی ماستەرم، لە زانکۆی (سولەیمانی) دابوو، (7) جاریش لە بەشەکەی خۆمانەوە، ناوم بۆ سەرۆکایەتی زانکۆ و شالیارگەی خوێندنی باڵا لە (بەغدا) نێررابوو، تا پەسندی خوێندن لە وڵاتێکی دەرەوە پەیداکەم، بەڵام هەموو جارەکان وەرنەگیرام و هەر وەڵامیشیان نەدامەوە، وام لێهاتبوو، لەسەر ڕەتکردنەوە ڕاهاتبووم و هاوڕێکانم پێیان دەگوتم: مەگەر (11)ی ئازارێکی دیکە بێتەوە، لەماستەر وەرگیرێی، ئەگینا لە ئەوە پتر، پێویست ناکا، خۆت ماندووکەی!

پاشان دوکتۆر (خالید)، داواکارییەکەمی واژۆکرد، دوکتۆر (خەسرەو)یش زۆر پیاوانە، یارمەتیدام و لەبری ڕاگری کۆلێژی کشتوکاڵ و سەرۆکی زانکۆ، خێرا کارەکەی بۆ ڕاپەڕاندم.

چەن جارێکی دیکەش، ئیشم بە دوکتۆر (خەسرەو) بووە، هەر یارمەتیداوم. بۆ نموونە: ساڵی (1979)، داوای پڕوانامەیەکم بۆ هاوڕێیم (حەمەقەرەداخی – حەمەدۆستان) لێ کرد، یەکسەر تێلیفۆنی بۆ تۆمارگەی زانکۆ کرد و پڕوانامەکەمان وەرگرت. سووریش دەیزانی، (حەمەدۆستان) دەچێ بۆ دەرەوە و ناگەڕێتەوە!

هەر ئەو شەوە، ترومبێلەکەم بە دراوسێکەی ماڵی خەزوورم فرۆشت و هەموو ئیشەکانم جێبەجێکرد. بەیانی هاوڕێکانم (شوانی عوسمان فایەق، برایمی حەمەعەلی، کاوسی

عەزیز بەگ، نیهاد مەحموود، سەروەر عیزەت، رەفیقی حەلواچی و سەرداری برای سەروەت)، بە دوو ترومبیل، بەرەو (موسل) بەرێکەوتین. دایکم و باوکم و (ئاوات)، شەو لە ماڵی ملازم (سدقی) هاوڕێم لە (گوگجەلی) مانەوە. ئێمەش هەمووومان چووینە ئوتێل و تا بەیانی، پێکەوە دانیشتین و خواردمانەوە.

بەیانی زوو، من و (ئاوات) لە (موسل)، سواری پاسە گەورەکان بووین. لە پەنجەرەکەوە چاوم لێ بوو، دایکم و باوکم لەسەر شۆشتەکە وەستابوون، هەردووکیان دەگریان. چونکە دەیانزانی، تا رەوشی (کوردستان) وابێ، ناگەرێمەوە و یەکدی نابینینەوە! ئێمە بە پاس، بەرەو (زاخۆ) دەرچووین، (شوان) و هاوڕێ خۆشەویستەکانیشم، بە ترومبیل بە دوامانڈا هاتن. لە (زاخۆ) ئەوەی پێویستبوو، هەر زوو جێبەجێمانکرد و دوایش بۆ یادگار، (ئاوات) وێنەیەکی گرتین.



وەستاوەکان لە راستەوە (سەردار موحەممەد ئەمین، حوسێن موحەممەد عەزیز، رەوانشاد نیهاد مەحموود ئەمین، شوان عوسمان قایەق، برایمی حەمەعەلی)، دانیشتووەکان (رەفیقی حەلواچی، سەرروەت عیزەت و کاوس عەزیز)، لە بازگەکەی (برایم خەلیل) گیراوە.

ئاخر ئەو سەردەمە، هێشتا هاورێیەتی و دۆستایەتی، لەنێو کورددا پیرۆزبوو، بایەخ و شوێنی تایبەتی خۆی هەبوو، هاورێکان بە ڕاستی هاوڕێ بوون، لە ناخی دڵەوە یەکیان خۆشدەویست، دڵسۆزی یەکدی بوون، کوڕی ڕۆژی تەنگانە و لیقەومان بوون، نەک وەک ئێستە، هیچ جۆرە پێوەندییەکی دۆستانەی پیرۆز نەماوە، هەر کەسێ خەمی ژیانی خۆیەتی!

پاشان ماڵاواییم لە هاورێکانم کرد. (شوان) گریانی نەدەهات، بەڵام دەسی بە چاویەوە گرتبوو، دەیگوت: (شێخە) گیان، لێمان دووردەکەویتەوە. (نیهاد)یش گوتی: نا نا گوێ مەدەری و مەگری! منیش لەلایەکەوە دڵم پڕبووبوو، لەلایەکی دیکەشەوە، پێکەنینم بە قسەکانی (نیهاد) دەهات!

ئیدی سواربووین و ڕۆژی (13. 7. 1981)، بە ئەو شێوەیە، (کوردستان)م بەجێهێشت، ماڵاوایم لە هەموو ئاسیاو و شتێ کرد. لە کۆنترۆڵەکەی (برایم خەلیل) دەرچووین. هەر لە پردەکەی (زاخۆ) پەڕینەوە، پێمان نایە نێو خاکی باکووری (کوردستان) و دەوڵەتی داگیرکەری (توورکیا)وە، هەناسەیەکم هەڵکێشا و لە دڵی خۆمدا گوتم: ئۆخەی خوایە، چاک بەهەرزان لە دەس جەنگی چەپەڵی نێوخۆ و چنگونینۆکی خوێناوی پڕ لە قینی، ئەو دڕندە کێویانەی (بەعس) ڕزگارمبوو. ئای ئازادی و سەربەستی، چەن خۆش و پیرۆزن، بۆ دڵنیایی و هێمنی مرۆ، چەن پێویستن!

## دواوتە و پوختەی مەبەست

بەشی هەرە زۆری بەرگی دووەمی بیرەوەرییەکانم، باسی بزووتنەوەی کوردایەتی و چالاکی ڕامیاری، سەردەمێکی دیاریکراوی تەمەنی لاوێتیم دەکا و بۆ بیرەوەرییەکانی بزووتنەوەی کوردایەتیم تەرخانکردووە. بیرەوەری ئەو سەردەمانەی، کە لە نێوان ساڵانی (**1970–1981**)، کاری ڕامیاریم کردووە و بەسەر (**4**) سەردەمی جیاوازدا دابەشم کردووە:

**1**. (**1970–1972**) لە ڕیزەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان) کارمکردووە.

**2** (**1970– 1975**) لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی (کاژیک)دا بووم.

**3**. (**1974– 1975**) لە ڕیزی شۆڕشی (**11. 9. 1961**) پێشمەرگە بووم.

**4**. (**1976–1981**) لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی (پاسۆک)دا بووم.

بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، ئەم بیرەوەرییانە، مێژووی سەرانسەری ئەو پارت و ڕێکخراوانە بێ، بەڵکوو تەنیا بیرەوەری و باری سەرنجی تایبەتی خۆمن، لە سەردەمە جیاوازەکانی ژیانی خەباتی نەتەوەیی و نیشتمانی خۆمدا تۆمارمکردوون. لە هەمان کاتیشدا، وەک چەمکێ لە مێژووی تێکۆشانی نەتەوەیی و چالاکی ڕامیاری گەلەکەم وان!

زۆر کەس پرسیاریانکردووە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش دەپرسن: بۆچی (پاسۆک)، هەر لە ئەو قاوغە تەسکەی خۆیدا مایەوە، پەلوپۆی نەهاویشت، پێش نەکەوت و گەشەی نەکرد؟! لە وەڵامدا دەڵێم: ڕەنگە هۆ زۆربێ، بەڵام گەر خوێنەر بە وردی، ئەم نووسینە بخوێنێتەوە، باش لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری کادیرە پێشکەوتووەکانی وردبێتەوە، سەرنج لە پێوەندی نێوان ئەندامانی سەرکردایەتی و باری دەروونییان بدا، ئەوا زۆر بە ئاسانی، وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەسدەکەوێ و گەلێ شتی بۆ ڕووندەبێتەوە!

بە داخەوە، ئەو **(9)** هاوبیرەی ساڵی **(1976–1977)**، لە هەر سێ دانیشتنەکانی یەکەمین کۆنفرانسی (پاسۆک)دا بەشداربوون، هەموویان نەماون، بەڵکوو چواریان (ئازاد مستەفا، جەلالی حاجی حوسێن، قادر مستەفا و سەروەت موحەممەد ئەمین) کۆچیدواییانکردووە و ماڵاواییان لە خاکی نیشتمان کردووە. بەڵام جگە لە خۆم، ئەو **(4)** هاوبیرەی دیکە (فەرهاد عەبدولقادر، شێرزاد فاتیح، عیرفان عەبدوڵڵا و لیوا مەنسوور حەفید)، هێشتا لە ژیاندا ماون.

هیوادارم، ئەم بەرهەمە بە وردی بخوێننەوە، زۆر بە سنگێکی فراوان، بە دڵێکی خاوێن و بە ویژدانەوە، باری سەرنجی تایبەتی خۆیان دەربڕن. گەر هەڵەیەکی تێدابوو، بۆ مێژوو بۆم ڕاستکەنەوە، یا گەر شتێکم بیرچووبوو، بیرمان بخەنەوە، تا وێنە ڕاستینەکەی (پاسۆک)، لەبەر چاوی دۆست و دوژمن، بە شێواوی و کەموکووڕی نەمێنێتەوە، وەک خۆی چۆن بووە، وا پێشانی خوێنەر و نەوەکانی داهاتووی کورد بدرێ!

لە کۆتاییشدا دەڵێم: ئەوەی ئاگام لێی بووە، ئەوەی بیرم مابوو، زۆر ڕاشکاوانە تۆمارم کردوون. نە غەدرم لە کەس کردووە و نە بە خۆڕایش، بە شانوباڵووی کەسدا هەڵمداوە. سوپاس بۆ خوا، ویژدانم ئاسوودەیە و درۆم لەگەڵ خودی خۆمدا نەکردووە!

هەزاران سڵاو، لە گیانی پاکی ڕەوانشادانی نەتەوەکەم بێ، سەرکەوتن و سەربەرزیش، بۆ هێزی پێشمەرگە قارەمانەکانی (کوردستان) دەخوازم و هیوادارم، هەمووومان لە سایەی دەسەڵاتێکی نیشتمانپەروەری دڵسۆزی کوردیدا، بە ئازادی و دیمۆکراسی، بە خۆشی و سەربەرزی بژین ...

لەگەڵ ڕێزی بێ ئەندازەمدا

* * *

# ئەرشیفی بەڵگەنامەکان

## بەڵگەنامەی ژمارە - 1

میژووی پێوەندیکردنم بە (کاژیک)ەوە


بۆ لێژنەی پێوەندی کاژیک

سڵاوێکی گەرم و برایانە :

# بەڵگەنامەی ژمارە – 2

## نامەی لیژنەی پێوەندیی کاژیک سەبارەت بە کوشتنی (کەمال جەمال موختار)



## بەڵگەنامەی ژمارە - 3

پرسەنامەی مەکتەبی یاریدەدەری سکرتێری گشتیی ( ی. ن. ک. )، سەبارەت بە سەرەخۆشی لە بنەماڵەی (نورەی مام برایم)

**الاتحاد الوطني الكردستاني**
**مكتب**
**مساعدي الامين العام**
ژمارە: ١٩٠٩
رۆژ: ٣ / ٤ / ٢٠٠٨
کوردی: ١٤ - خەرمانان - ٢٧٠٨

**یەکێتی نیشتمانی کوردستان**
**مەکتەبی**
**یاریدەدەرانی سکرتێری گشتی**

**بەناوی خوای گەورەو میهرەبان**

**بروسکەی سەرەخۆشی**

**بەڕێز/ بنەماڵەی خوالێخۆشبوو (هەڤاڵ نوری کەریم)**

**ناسراو بە نوری مام برایم پێشمەرگەی دێرین و ماندوونەناس**

**برای کاک فەرەیدون کە بەکارەساتی دڵتەزێنی کۆچی دوایی کردووە**

بەبۆنەی کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو (**هەڤاڵ نوری**) هوە، کەلە بنەماڵەیەکی ناودارو تێکۆشەرو نیشتمان پەروەر بووە.

بەناوی جەنابی (مام جەلال)ەوە پرسەو سەرەخۆشی ئاراستەی بنەماڵەکەتان دەکەین و داواکارین لە خوای گەورە سەبووری هەموو لایەك بداتو خوالێخۆشبوو بە بەهەشتی بەرین شاد بکات.

إنا لله وإنا إليه راجعون..

**حمەی فرەج**

**یاریدەدەری سکرتێری گشتی**

**بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی**

## بەڵگەنامەی ژمارە - 4

بڵاوکراوەی سەرکردایەتی کاتیی (کاژیک)، ڕۆژی (21. 1. 1975)



## بەڵگەنامەی ژمارە - 5

پسووڵەی ئیستیخبارات



الى / من يهمه الامر

جرى استنطاق حسين محمد عزيز

العائد الى الصف الوطني

ولا مانع من اعادته الى عمله.

قيادة

الفرقة

الاستخبارات

ع. النقيب

يعقوب يوسف

رئيس الهيئة التحقيقية

## بەڵگەنامەی ژمارە - 6

بڕوانامەی دەرچوونی زانکۆ



جامعة السليمانية

بناء على اكمال السيد حسين محمد عزيز

مناهج الدراسة المقررة واجتيازه الامتحانات

المطلوبة من كلية الزراعة تقرر منحه

درجة البكالوريوس [illegible] بتقدير

جيد وذلك في ١٣٩٦/٦/٢٨ هجرية الموافق ١٩٧٦/٦/٢٦ ميلادية

# بەڵگەنامەی ژمارە - 7

کوردستان بۆکورد — بەکسانی بۆگەل
کردستان للاکراد — السیادة للشعب

# الكاژيكنامە

فلسفة حزب كاژيك في سطور

الطبعة العربية الاولى

من منشورات القيادة المركزية

لحزب كاژيك

٢٥٨٣ ك — ١٩٧١ م

**KAJYKNAME**

Glimpses of K A J Y K Ideology

1. arabic Edition

Booklet given out by the Kurdish

K A J Y K Party

2583 K. = 1971 UZ

## بەڵگەنامەی ژمارە - 8

سالی (1977) دامەزراندن لە زانکۆ



بسم الله الرحمن الرحيم

الجمهورية العراقية

وزارة التعليم العالي والبحث العلمي

جامعة السليمانية

مديرية التسجيل العامة

العدد / ٤٩١١

التاريخ / ٧ / ٨ / ١٩٧٦

الى / السيد حسين حمه عزيز

اشارة الى كتاب رئاسة جامعة السليمانية / مكتب السيد الرئيس المرقم س ٦٨٨ في ١٩٧٦/٨/٢ ·
يرجى اعلامنا عن موقفك من الخدمة العسكرية ( معفو ، دافع بدل نقدي ، مؤجل ، خاضع للخدمة ) ليتسنى لنا مفاتحة وزارة التعليم العالي والبحث العلمي لغرض تعيينك في الجامعة ·

علي احسان احمد صابر

م · المسجل العام

نسخة الى /

رئاسة جامعة السليمانية / مكتب السيد الرئيس ـ كتابكم اعلاه للتفضل بالاطلاع / مع الشكر
دائرة تجنيد السليمانية / يرجى اعلامنا عن موقف المومأ اليه من الخدمة العسكرية علماً بانه من مواليد ١٩٥٠

ملفة الطالب الشخصية

الصادرة

